ابو داود سليمان بن الاشعث السجستاني

هەزار فەرموودە لە فەرموودەکانی

# سوننەنی ئەبوداود




وەرگێڕانی
ناصح ابراهیم سازانی

بەرگی یەکەم

# هەزار فەرموده
# لە فەرمودەکانی
# سونەنی ئەبو داود

## بەرگی یەکەم

### لە فەرمودەی یەکەمەوە هەتا هەزار

نوسینی

**أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني**

**وعليها أحكام العلامة المحدث محمد بن ناصرالدين الألباني**

**علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان**

**بەرگی یەکەم**

وەرگێڕانی

**ناصح ئیبراهیم سازانی**



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەکوردی: | **هەزار فەرموده لە فەرمودەکانی سونەنی ئەبو داود** |
| نوسینـــــــــــــی: | ابو داود سليمان بن الأشعث السجستاني |
| وەرگێڕانـــــــــــی: | ناصح ئیبراهیم سازانی |
| بڵاوکردنـــــــەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی نــاوەوە: | جمعه صديق كاكه |
| خـــــــــــەت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــــــەرگ : | أمين مخلص |
| نــۆرە و ســاڵی چــاپ: | یەکەم ١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز |
| تـــــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی (١٨٥) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پلاس
www.tafseer-pub.com

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ
وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ
إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧ ﴾

**الحشر: ٧**

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَـهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

**لەدوایی دا:**

**خوای گەورەو پەروەردگار دەفەرموویت:** ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ ﴿٧﴾ ﴾ **الحشر: ٧. واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێ ی دان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن.**

**هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت:** (مَنْ أحْدَثَ في أمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[1]. **واتە: هەر کەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیاد بکات کە تیایدا نەبێت، ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و دەدرێتەدواوە.**

**پێشەوای فەرمودەناس ئەبو داود ناوی سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی بەشیری کوڕی شەددادی کوڕی عەمری ئەلئەزدەی ئەسسەجەستانییە لە ساڵی (٢٠٢)ی کۆچی لەدایك بووەو لەساڵی (٢٧٥) لە بەسرە کۆچی دوایی کردووە.**

**خاوەنی سونەنی ئەبو داودە کە زۆر لە زانایان مەتحیان کردووەو پێیان وایە کە لەدوای فەرمودە (صحيح)ەکانی پێشەوایان بوخاری و موسلیمەوە دێت.**

---

[1] - متفق عليه. اخرجه البخاري ٢٤١/٢ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ١٣٢/٥ ( ١٧١٨) ( ١٧ ) و( ١٨).

ئـەم پەرتوکـە بەنرخـەش تـا ئێـستا وەرنەگێڕراوەتـە سـەر زمـانی شـیرینی کوردی، هەرچەندە ئێمەش کوڕی ئەو مەیدانە نین بـەڵام بـە پشتیوانی خـوای گەورە بە باشمان زانی شان بدەینە بـەر ئـەو ئەرکە قورسـەو وەریگێـڕین، دەق لەسەر کتـێبی (سـنن أبـي داود حكـم علـى أحاديثـه وأثـاره وعلـق عليـه العلامـة المحـدث محمـد ناصـرالدين الألبـاني، أعتنـى بـه أبـو عبيـدة مشهور بـن حسـن آل سـلمان). چـاپی دووهـەمی سـاڵی ١٤٢٧ی کۆچـی بەرامبـەر بـە ٢٠٠٧ی زایینـی (مكتبة المعارف).

بۆ وەرگێڕانیشی سودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە.

١- (عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبـادي علق عليـه وخـرج أحاديثـه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).

٢- (بـذل المجهود في حـل أبـي داود لعلامـة المحـدث الكبير شـيخ خليـل أحمـد سهارنفوري.

٣- شرح سنن أبي داود لعبدالمحسن العباد.

٤- تفسير سنن أبي داود (معالم السنن ) لأبي سليمان الخطابي.

٥- مختصر سن أبى داود للحافظ عبدالعظيم المنذرى.

٦- ئەو فەرمودانەی کە بەڕێز مامۆستا نوری فارس وەریگێڕاون.

لـە پـەروەردگاری باڵادەسـت دەپاڕێمـەوە لێمـان وەربگرێـت بـە (صـەدەقەی جاریە)و (زانستی سوود لێ وەرگیراو).

إنه نِعمَ المَولى ونِعمَ النّصير.

وەرگێڕ

ناصح ئیبراهیم سازانی .

سلێمانی ساڵی ١٤٣٢ هـ - ٢٠١١ی ز.

# کتێبی پاکژی

## ١- (كتابُ الطهارة)

## باسی دوورکەوتنەوە و خۆ حەشاردان لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا

## ١- بَابُ التَّخَلِّي عِنْدَ قَضَاءِ الْحَاجَةِ.

١ - (حسن صحيح) عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَدَ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە دەچوو بۆ سەرئاو تەواو دووردەکەوتەوە لە خەڵك.

٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدُ اللَّه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ الْبَرَازَ انْطَلَقَ حَتَّى لاَ يَرَاهُ أَحَدٌ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبدالله)وە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدەشت و دەردا کاتێ کە بیویستایە دەست بە ئاو بگەیەنێت ئەوەندە دووردەکەوتەوە هەتا کەس نەیدەبینی و لەبەرچاو ون دەبوو.

# باسی دابینکردنی شوێنێکی نەرمان و گونجاو بۆ میزکردن

## ٢ - بَابُ الرَّجُلِ يَتَبَوَّأُ لِبَوْلِهِ

٣ - (ضعيف) عَنْ أبي التَّياح قالَ: حَدثني شيخ قالَ: لَمَّا قَدِمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ الْبَصْرَةَ، فَكَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي مُوسَى، فَكَتَبَ عَبْدُ اللَّهِ إِلَى أَبِي مُوسَى يَسْأَلُهُ عَنْ أَشْيَاءَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ أَبُو مُوسَى: (إِنِّي كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ، فَأَرَادَ أَنْ يَبُولَ فَأَتَى دَمِثًا فِي أَصْلِ جِدَارٍ، فَبَالَ ثُمَّ قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَبُولَ فَلْيَرْتَدْ لِبَوْلِهِ مَوْضِعًا).

[ضعيف الجامع الصغير: (٣١٩)، المشكاة: (٣٤٥)].

واتە: لەئەبو (تیاح) وە هاتووە کە وتوویەتی (شیخ) بۆی گێڕامەوەو وتی: کاتێ کە (عبداللە)ی کوڕی عەباس گەیشتە بەسرە خەڵك لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە فەرمودەیان دەگێڕایەوە، (عبداللە)ش دەربارەی چەند شتێ پرسیاری هەبوو لە ئەبو موسا بۆیە بۆی نوسی، ئەبو موساش وەڵامەکەی بۆ نوسیەوەو وتی: من ڕۆژێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووم ویستی میز بکات چووە بنی دیوارێکەوەو لەشوێنێکی نەرماندا میزی کرد، پاشان فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە ویستی میز بکات با شوێنێکی نەرمان

دابین بکات بۆ میزەکەی، بۆ ئەوەی پرشی میزەکەی نەگەڕێتەوە بۆی، لە نوێژی ببات).

## باسی کەسیٚ کاتیٚ کە ویستی بچێتە سەرئاو چی بڵێت

## ٣ – بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ

| |
|---|
| ٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ - قَالَ عَنْ حَمَّادٍ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ). - وَقَالَ عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ - قَالَ: (أَعُوذُ بِاللَّهِ) - مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ). |

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: هەرکاتیٚ کە پێغەمبەری خـوا صلى الله عليه وسلم بیویستایە بچێتە سەرئاو - موسەدەد راوی فەرموودەکە لە حەمادەوە گێڕاویەتیەوە، کە دەیفەرموو: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ. – هەروەها موسەدەد لە (عبد الوارث)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە - دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە خوا- لە خراپەی خراپەکارانی نێرو مێی جنۆکەکان).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رواه شُعْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ ».

واتە: ئەبو داود دەڵێت: شوعبە لە (عَبْدِ الْعَزِيز)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەکاتی چوونە سەرئاودا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي

أَعُوذُ بِكَ).

وَقَالَ مَرَّةً « أَعُوذُ بِاللَّهِ ».

واته: وه جارێكی تر شوعبه له (عَبْدِ الْعَزِيز)ەوه گێڕاویەتیەوه، كه پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (پەنا بەخوا).

(شاذ) وَقَالَ وُهَيْبٌ: « فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ ».

واته: وەهەیب لە (عَبْدِ الْعَزِيز)ەوه گێڕاویەتیەوه، كه پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەنا بگرن بەخوا).

٥- (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ).

واته: لە ئەنەسەوه هەمان فەرموودەی پێشوو هاتووه، كه وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەكاتی چوونه سەرئاودا دەیفەرموو: (خوایه پەنا دەگرم بە تۆ).

وَقَالَ شُعْبَةُ: وَقَالَ مَرَّةً: (أَعُوذُ بِاللَّهِ).

واته: شوعبه دەڵێت: جارێكی تر لە (عَبْدِ الْعَزِيز)ەوه هاتووه، كه پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (پەنا بەخوا).

٦ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ هَذِهِ الْحُشُوشَ مُحْتَضَرَةٌ فَإِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الْخَلاَءَ فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: لەسەر پێشاو و ئەو شوێنانەی کە دەستیان تێدا بە ئاو دەگەیەنن جنۆکەو شەیاتینەکان ئامادەن جا بۆیە هەرکاتێك کەسێ لەئێوە ویستی بچێتە سەرئاو با بڵێت: (خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی خراپەکارانی نێرو مێی جنۆکەکان).

## باسی کەراهیەتی رووکردنە قیبلە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا

## ٤ – بَابُ كَرَاهِيَةِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ عِنْدَ قَضَاءِ الْحَاجَةِ.

٧ - (صحيح) عَنْ سَلْمَانَ، قَالَ: قِيلَ لَهُ: لَقَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى الْخِرَاءَةَ ! قَالَ: أَجَلْ لَقَدْ نَهَانَا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، وَأَنْ لاَ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ، وَأَنْ لاَ يَسْتَنْجِيَ أَحَدُنَا بِأَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ، أَوْ يَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ عَظْمٍ.

واتە: بە سەلمانی فارسیان وت: ئێوە پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون، تەنانەت دەستوری دەست بەئاو گەیاندنیش؟ سەلمانیش وتی: بەڵێ وایە، ئەوەتە لێی قەدەغەکردووین لەکاتی دەست بەئاو گەیاندا روو بکەینە قیبلە، یان بە دەستی راست خۆمان پاك بکەینەوە، یان یەکێکمان بە سێ بەرد کەمتر خۆی پاك بکاتەوە، یا بە پاشەڕۆی ئاژەڵان وەك تەپاڵەو پشقل یان بە ئێسك و شتی وا خۆمان پاك بکەینەوە.

٨ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ بِمَنْزِلَةِ الْوَالِدِ أُعَلِّمُكُمْ فَإِذَا أَتَـى أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ فَلاَ يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلاَ يَسْـتَدْبِرْهَا وَلاَ يَسْتَطِبْ بِيَمِينِهِ، وَكَانَ يَأْمُرُ بِثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ وَيَنْهَى عَنِ الرَّوْثِ وَالرِّمَّةِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان من وەك باوك وەهام بۆ ئێوە، بۆیە فێرتان دەکەم هەرکاتێك کەسێ لەئێوە چووە سەرئاو نە ڕوو لە قیبلە بکات و نە پشتیشی تێ بکات، وە با بە دەستی ڕاست خۆی پاك نەکاتەوە، هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دەکرد بە سێ بەرد خۆ پاك بکرێتەوە، وە ڕێگری دەکرد لەوەی بە پاشەڕۆ و تەرس و ئێسکە رزیو خۆ پاك بکرێتەوە.

٩- (صحيح) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رِوَايَةً، قَالَ: (إِذَا أَتَيْـتُمُ الْغَـائِطَ فَـلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَـةَ بِغَـائِطٍ وَلاَ بَـوْلٍ، وَلَكِـنْ شَـرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا). فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَـرَاحِيضَ قَـدْ بُنِيَـتْ قِبَلَ الْقِبْلَةِ، فَكُنَّا نَنْحَرِفُ عَنْهَا وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ).

واتە: لە ئەبو ئەیوبەوە گێراویانەتەوە ، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر چوونە سەر ئاو بۆ پیسایی کردن و میز کردن ڕوو مەکەنە قیبلەو پشتیشی تێ مەکەن، بەڵکو ڕوو بکەنە خۆرهەڵات یان

خۆرئاوا). جا ئەبو ئەیوب وتی: کاتێك کە هاتینە شام بینیمان ئاودەستەکان بەرەو ڕووی قیبلە دروستکراون، جا ئێمەش لار دەبووینەوەو دوای لێ بوردنمان لە خوای گەورە دەکرد.

| |
|---|
| ١٠ - (منكر) عَنْ أَبِى مَعْقِلٍ الأَسَدِىِّ قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَتَيْنِ بِبَوْلٍ أَوْ غَائِطٍ). |

// ضعيف سنن ابن ماجة: (٦٦ / ٣١٩)، ضعيف الجامع الصغير: (٦٠١١)//.

واتە: لە ئەبی مەعقیەلی ئەسەدیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕێگری لێ کردوین بۆ پیسایی کردن و میز کردن ڕوو لە هەردوو قیبلە بکەین، واتە: کەعبەو (بيت المقدس).

| |
|---|
| ١١ - (حسن) عَنْ مَرْوَانَ الأَصْفَرِ، قَالَ: (رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، ثُمَّ جَلَسَ يَبُولُ إِلَيْهَا، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ ! أَلَيْسَ قَدْ نُهِيَ عَنْ هَذَا؟ قَالَ: بَلَى، إِنَّمَا نُهِيَ عَنْ ذَلِكَ فِى الْفَضَاءِ، فَإِذَا كَانَ بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ شَىْءٌ يَسْتُرُكَ فَلاَ بَأْسَ). |

واتە: لە مەروان (الاصْفَرِ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئیبن عومەرم بینیوە وشترەکەی پاڵ داوەو پاشان خۆی بەرەو قیبلە میزی کردووە، منیش وتم: ئەی (أَبَا عَبدُ الرَّحْمَن) ئایا بەو شێوەیە میزکردن قەدەغە نەکراوە؟ وتی: بەڵێ، قەدەغە کراوە. بەڵام ئەو قەدەغەکردنە بۆ دەشت و دەرە، ئەگەر شتێك هەبێت ببێتە بەربەست لەنێوانتاو لەنێوان قیبلەدا ئەوە قەیناکات.

## باسی روخسەت لەمەدا واتە لە
## رووكردنە قیبلەو پشت تێ كردنی لەسەرئاو

## ٥ – بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

١٢- (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، قَالَ: (لَقَدِ ارْتَقَيْتُ عَلَى ظَهْرِ الْبَيْتِ فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لِحَاجَتِهِ).

واتە: لە (عبدالله)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: چوومە سەربان پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی لەسەر دوو خشت بەرەو قودس(بيت المقدس) دەستی بەئاو دەگەیاند.

١٣ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدُ اللَّه، قَالَ: نَهَى نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِبَوْلٍ، فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعَامٍ يَسْتَقْبِلُهَا[١].

---

[١]- لای ئیمام (الخطابي: ١/١٧) (فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعَامٍ يَسْتَقْبِلُهَا) زیادەیە لەكتێبی (عون المعبود ١/ ١٤) چاپی ٢٠٠٩ی (مكتبة المعارف) علق عليه وتخرج أحاديثه شيخ مشهور بن حسن آل سلمان وەرم گرتووە.

واتە: لە جابری کوڕی (عبد الله)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لێی قەدەغەکردبووین کە بەرەو قیبلە دەستی بەئاو دەگەیاند، بەڵام ساڵێ پێش ئەوەی وەفات بکات بینیم بەرەو قیبلە میزی دەکرد.

## چۆنیەتی خۆهەڵماڵین لەسەرئاو

## ٦ - بَابُ كَيْفَ التَّكَشُّفُ عِنْدَ الْحَاجَةِ.

١٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ حَاجَةً لاَ يَرْفَعُ ثَوْبَهُ حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الأَرْضِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە دەیویست دەست بەئاو بگەیەنێت جلەکانی بەرزنەدەکردەوە هەتا تەواو لەزەوی نزیك نەبوایەتەوە.

## باسی کەراهیەتی قسەکردن لە سەرئاو

## ٧ – بَابُ كَرَاهِيَةِ الْكَلَامِ عِنْدَ الْحَاجَةِ.

١٥ - (ضعيف) عَنْ أَبُو سَعِيدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَخْرُجُ الرَّجُلاَنِ يَضْرِبَانِ الْغَائِطَ كَاشِفَيْنِ عَنْ عَوْرَتِهِمَا يَتَحَدَّثَانِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ)[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: نابێت دوو کەس لەئێوە بچنە سەرئاو شەرمگا (عورة)ی خۆیان هەڵماڵن و قسە لەگەڵ یەکتر بکەن، بەڕاستی خوا رقی هەڵدەستێت لەو کارە.

---

[١] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا لَمْ يُسْنِدْهُ إِلاَّ عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ.

## باسی ئایا دروستە کەسێك لە سەرئاو وەڵامی سەلام بداتەوە؟

## ٨ - بَابُ أَيَرُدُّ السَّلاَمَ وَهُوَ يَبُولُ.

١٦ -(حسن) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی بەئاو دەگەیاند پیاوێك بەلایدا تێپەڕی سڵاوی لێ کرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَغَيْرِهِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَيَمَّمَ ثُمَّ رَدَّ عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ).

ئەبو داود دەڵێت: لە ئیبنو عومەر و جگە لەویشەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەیەمومی کرد، پاشان وەڵامی سەلامی پیاوەکەی دایەوە.

١٧ - (صحيح) عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبُولُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى تَوَضَّأَ، ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: (إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ عَلَى طُهْرٍ). أَوْ قَالَ: (عَلَى طَهَارَةٍ).

واتــە: لـە (مُهَـاجِر)ی کـوڕی (قُنْفُـذ)ەوە هـاتووە، کـاتێ کـە هـات بـۆ خزمـەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی بەئاو دەگەیانـد، سـەلامی لـێ کـرد وەڵامـی نەدایـەوە هـەتا دەسـتنوێژی گـرت، پاشـان عـوزری بـۆ هێنایـەوەو فـەرمووی: مـن پـێم نـاخۆش بـوو بـەبێ دستنوێژ ناوی خوای گەورە بهێنم و یادی بکەم.

## باسی کەسێ بەبێ دستنوێژ یادی خوا بکات کە ئایا دروستە یان نا؟

## ٩ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يَذْكُرُ اللَّهَ تَعَالَى عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ.

**١٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ.**

واتــە: لــە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە وتویــەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لەگشت کـات و حاڵەتێکدا یـادی خـوای گەورەی دەکرد.

## باسی ئەنگوستیلەیە ناوی خوای لەسەر بێت
## ئایا دروستە ببرێتە سەرئاو؟

## ١٠ - بَابُ الْخَاتَمِ يَكُونُ فِيهِ ذِكْرُ اللَّهِ يَدْخُلُ بِهِ الْخَلاَءَ.

**١٩ -(شاذ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ وَضَعَ خَاتَمَهُ).**

// ضعيف الجامع الصغير (٤٣٩٠)، المشكاة (٣٤٣) //.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەرکاتێ بیویستایە دەست بەئاو بگەیەنێت ئەنگوستیلەکەی لەدەستی دەردەکرد – چونکە لێی نوسرابوو (لا إله إلا الله، محمد رسول الله) –.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، وَإِنَّمَا يُعْرَفُ عَنْ أَنَسٍ: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ ثُمَّ أَلْقَاهُ، وَالْوَهَمُ فِيهِ مِنْ هَمَّامٍ وَلَمْ يَرْوِهِ إِلاَّ هَمَّامٌ).**

تحقيق الألباني: منكر //
ضعيف سنن ابن ماجة (٦١ / ٣٠٣)،
ضعيف سنن الترمذي (٢٩٢ / ١٨١٧)،
ضعيف سنن النسائي (٤٠٠ / ٥٢١٣) //.

واتە: ئەبو داود دەڵێت ئەم فەرموودە (منكر)ە، بەڵکو بەم شێوەیە ناسراوە کە لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروستکردو لەدەستی کرد پاشان لەدەستی دەرکرد.

(وهم) لەم فەرمودەدا: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ وَضَعَ خَاتَمَهُ) (همام)ە چونکە جگە لەو کەس ئەم فەرمودەی نەگێڕاوەتەوە.

## باسی خۆ پاککردنەوە لە میز

## ١١- بَابُ الاِسْتِبْرَاءِ مِنَ الْبَوْلِ

٢٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى قَبْرَيْنِ فَقَالَ: (إِنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا هَذَا فَكَانَ لاَ يَسْتَنْزِهُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا هَذَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ). ثُمَّ دَعَا بِعَسِيبٍ رَطْبٍ فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هَذَا وَاحِدًا، وَعَلَى هَذَا وَاحِدًا، وَقَالَ: (لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دای بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی: ئەم دوانە ئێستا سزا دەدرێن، سزادانەکەشیان لەبەر تاوانی گەورە نیە: یەکێکیان لە پاش میزکردن خۆی پاك نەدەکردەوە، ئەوی تریشیان دوو زمانی دەکرد، واتە قسەی دەهێناو دەبرد بۆ تێکدانی خەڵك. پاشان داوای لقێ دار خورمای تەڕی کرد، بۆیان هێنا کردی بەدوو کەرتەوە لەسەر هەر گۆڕێکیان کەرتێکی چەقاند، ئینجا فەرمووی: بەڵکو سزا لەسەریان سوك بکرێت هەتا وشك دەبن.

قَالَ هَنَّادٌ (يَسْتَتِرُ)، مَكَانَ (يَسْتَنْزِهُ).

هەناد وتی: راوی وشەی (يَسْتَتِرُ) واتە: خۆپاراستنی لە جێگەی (يَسْتَنْزِهُ) واتە: خۆپاك كردنەوە هێناوە.

**٢١- (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ قَالَ: (كَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ بە هەمان مانا هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە میزەکەی.

وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: (يَسْتَنْزِهُ).

واتە: ئەبو مەعاویە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: خۆی پاك نەدەكردەوە.

**٢٢ - (صحيح موقوف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ حَسَنَةَ، قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَعَمْرُو بْنُ الْعَاصِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ وَمَعَهُ دَرَقَةٌ ثُمَّ اسْتَتَرَ بِهَا، ثُمَّ بَالَ، فَقُلْنَا: انْظُرُوا إِلَيْهِ يَبُولُ كَمَا تَبُولُ الْمَرْأَةُ ! فَسَمِعَ ذَلِكَ فَقَالَ: (أَلَمْ تَعْلَمُوا مَا لَقِيَ صَاحِبُ بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ كَانُوا إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَوْلُ قَطَعُوا مَا أَصَابَهُ الْبَوْلُ مِنْهُمْ، فَنَهَاهُمْ فَعُذِّبَ فِي قَبْرِهِ).**

واتە: لە (عَبْدِ الرَّحْمَنِ)ی کوڕی (حَسَنَة)ەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: مـن و عەمری کوڕی (عاص) دەرچوین بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـە وسلم ئەویش دەرچوو بـۆ سـەرئاو مەتاڵـە(درقـة)یـەکی پـێ بـوو لەپـەنایا خـۆی حەشـاردا پاشـان دانیشـت میـزی کـرد، وتمـان: تەماشـاکەن چـۆن وەك ئـافرەت دانیشـتووە میـز دەکـات، گـوێی لـێ بـوو فـەرمووی: ئایـا نـازانن کـابرای نـەوەی ئیسرائیل چی بەسەرهات؟ ئەگەر کەسێك لـە نـەوەکانی ئیسـرائیل میـز بـەری هـەر شـوێنێکی پۆشـاکەکەی بکەوتایـە دەبوایـە ئـەو شـوێنەی بیبڕیایـە، ئـەو کابرایە لەو کارە قەدەغـەیکردن بۆیـە لـەگۆڕدا سزادراو تۆڵەی ئـەو کـارەی لـێ سەنرایەوە.

(صحیح) قَالَ أَبو دَاوُدَ: عَنْ أَبِي مُوسَـى فِـي هَـذَا الْحَـدِيثِ قَـالَ: (جِلْدَ أَحَدِهِمْ).

واتـە: ئـەبو داود دەڵێـت: ئـەم فـەرمودە لـە ئـەبو موسـاوە هـاتووە، کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (ئەگـەر میـز بـەر پێسـتی بکەوتایە).

(منكـر) عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (جَسَدَ أَحَدِهِمْ ).

واتە: لـە ئـەبو موسـاوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـە وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر میز بەری جەستەی بکەوتایە).

## باسی میزكردن بە پێوە

## ١٢ - بَابُ الْبَوْلِ قَائِمًا.

| |
|---|
| ٢٣ - (صحيح) عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: (أَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ. |

واتە: لە (حُذَيْفَة)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە سەر سەرەنوێلكی قەومێك - ئەو شوێنەی كە خۆڵ و خاشاك و زبڵی تێ دەكرێت - بە پێوە میزی كرد، پاشان هاتە ئەم لاوەو داوای ئاوی كرد بۆیان هێنا دەستنوێژی گرت و مەسحی (خف)كاڵەكانی كرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مُسَدَّدٌ: قَالَ: فَذَهَبْتُ أَتَبَاعَدُ، فَدَعَانِي حَتَّى كُنْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ).

ئەبو داود دەڵێت: (مُسَدَّد) وتی: (حُذَيْفَة) وتویەتی: منیش ویستم لێی دووركەومەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بانگی كردم و فەرمووی: نزیك بەرەوە، منیش لێی نزیك بوومەوە - بێگومان بۆ ئەوەی ببكاتە بەربەست بۆ خۆی - .

## باسى كەسىٚ بەشەو ميز بكاتە ناو دەفريٚكەوە، پاشان لەلاى خۆى دايبنىٚ.

## ١٣ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يَبُولُ بِاللَّيْلِ فِي الإِنَاءِ ثُمَّ يَضَعُهُ عِنْدَهُ.

**٢٤ - (حسن صحيح) عَنْ رُقَيْقَةَ، عَنْ أُمِّهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: (كَانَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدَحٌ مِنْ عَيْدَانٍ تَحْتَ سَرِيرِهِ يَبُولُ فِيهِ بِاللَّيْلِ).**

واتە: لە (رُقَيْقَة)ەوە، ئەويش لە دايكيەوە گيْڕاويەتيەوە، كە وتويەتى: پيْغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم كۆتكە دار خورمايەكى هەلْكۆلْراوى هەبوو لەژيْر چارپاكەيدا دايدەنا بەشەو ميزى تىٚ دەكرد.

## باسی ئەو شوێنانەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە دەستیان تێدا بەئاو بگەیەنرێت.

## ١٤ - بَابُ الْمَوَاضِعِ الَّتِى نَهَى النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْبَوْلِ فِيهَا.

٢٥- (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اتَّقُوا اللاَّعِنَيْنِ). قَالُوا وَمَا اللاَّعِنَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (الَّذِى يَتَخَلَّى فِى طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ ظِلِّهِمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خۆتان بپارێزن لەو دوو شتەی کە مایەی نەفرین کردنن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو دوو شتە کامانەن ؟ ئەویش فەرمووی: (ئەو کەسەیە کە لەسەر ڕێگەوبانی خەڵك یان سێبەریان دەست بەئاو دەگەیەنێت). واتە: هەرکەس لەم دوو شوێنەدا دەست بەئاو بگەیەنێت دەبنە هۆی ئەوەی کە خەڵك نەفرەتی لێ بکەن.

٢٦ - (حسن) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اتَّقُوا الْمَلاَعِنَ الثَّلاَثَةَ: الْبَرَازَ فِى الْمَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ).

// قال أبو داود: هو مرسل //.

واتە: لە (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆتان لەو سیانە بپارێزن کە دەبنە هۆی نەفرەت لێ کردنی خەڵك: دەست بەئاو گەیاندن لەشوێنی ئاوهێنانی خەڵك و، لەسەر ڕێگەوبانیان و، لە سێبەردا).

## باسی میزکردن لە گەرماودا.

## ١٥ – بَابُ فِي الْبَوْلِ فِي الْمُسْتَحَمِّ.

٢٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ مُغَفَّلٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي مُسْتَحَمِّهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ).

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی موغەففەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله وسلم فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لەئێوە میز نەکاتە گەرماوەکەی و، پاشان خۆی تێدا بشوات.

(ضعيف) قَالَ أَحْمَدُ: (ثُمَّ يَتَوَضَّأُ فِيهِ فَإِنَّ عَامَّةَ الْوَسْوَاسِ مِنْهُ).

واتە: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: پاشان دەستنوێژی تێدا بگرێت، چونکە گشت وەسوەسەی شەیتان لەوەوە دروست دەبێت.

٢٨ - (صحيح) عَنْ حُمَيْدٍ الْحِمْيَرِيِّ، قَالَ: لَقِيتُ رَجُلاً صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا صَحِبَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَمْتَشِطَ أَحَدُنَا كُلَّ يَوْمٍ أَوْ يَبُولَ فِي مُغْتَسَلِهِ).

واتە: لە (حُمَيْدٍ الْحِمْيَرِى)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: گەیشتم بە پیاوێك هاوەڵێتی پێغەمبەری صلى الله علیه وسلم كردبوو وەك چۆن ئەبو هورەیرە هاوەڵێتی كردبوو، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم قەدەغەیكردبوو كە یەكێكمان هەموو رۆژێك سەر شانە بكات، یان میز بكاتە شوێنی خۆشتنی.

## باسی قەدەغەكردنی
## میزكردنە ناو كونی زەویەوە

## ١٦ - بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْبَوْلِ فِي الْجُحْرِ.

٢٩ - (ضعيف) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ: أَنَّ النَّبِيَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُبَالَ فِي الْجُحْرِ. قَالَ: قَالُوا لِقَتَادَةَ: مَا يُكْرَهُ مِنَ الْبَوْلِ فِي الْجُحْرِ؟ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّهَا مَسَاكِنُ الْجِنِّ).

// ضعيف الجامع الصغير (٦٠٠٣، ٦٣٢٤)، الإرواء (٥٥)//.

واتە: لە (عبدالله)ی كوڕی سەرجسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم قەدەغەیكردووە میز بكرێتە ناو كونی زەویەوە. وتی: وتیان بە قەتادە: لەبەر چی خراپە میز بكرێتە ناو كونی زەویەوە؟ وتی: دەڵێن: جێگای جنۆكەیە.

## باسی كەسێ كە دەرچوو لەسەرئاو چی بڵێت.

## ١٧ – بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلاَءِ.

٣٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ: (غُفْرَانَكَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەركاتێك لەسەرئاو دەربچوایە دەیفەرموو: (غُفْرَانَكَ). واتە: خودایە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەكەم.

## باسی کەراهیەتی گرتنی زەکەر
## بەدەستی راست لەکاتی خۆ پاککردنەوەدا

## ١٨ – بَابُ كَرَاهِيَةِ مَسِّ الذَّكَرِ بِالْيَمِينِ فِي الاِسْتِبْرَاءِ.

٣١ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا أَتَى الْخَلاَءَ فَلاَ يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلاَ يَشْرَبْ نَفَسًا وَاحِدًا).

واتە: لە ئەبی قەتادە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان میزی کرد با بە دەستی راستی زەکەری نەگرێت، لەسەر ئاویش با بە دەستی راستی خۆی پاك نەکاتەوە، ئەگەر ئاویشی خواردەوە با بەیەك بین نەیخواتەوە.

٣٢ - (صحيح) عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَجْعَلُ يَمِينَهُ لِطَعَامِهِ وَشَرَابِهِ وَثِيَابِهِ، وَيَجْعَلُ شِمَالَهُ لِمَا سِوَى ذَلِكَ).

واتە: لە (حَفْصَة)ی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم دەگێڕنـەوە، کە پێغەمبەری خـوا صلی الله علیـە وسـلم دەسـتی ڕاسـتی تـەرخان کردبـوو بـۆ خـواردن و خواردنــەوە و پۆشـاك لەبــەرکردن و دانـانی، وە دەسـتی چەپیشـی تەرخان کردبوو بۆ شتەکانی تر.

**٣٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْيُمْنَى لِطُهُـورِهِ وَطَعَامِـهِ، وَكَانَتْ يَدُهُ الْيُسْرَى لِخَلَائِهِ وَمَا كَانَ مِنْ أَذًى).**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خـوای لێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: دەسـتی ڕاسـتی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم بـۆ دەسـتنوێژ و خـواردن بـوو، دەستی چەپیشی بۆ سەرئاو و هەرشتێ چڵك و پیسی پێوە بوایە.

**٣٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.**

واتە: هەروەها لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ بە هەمان مانا هاتووە.

## باسی خۆ حەشاردان لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا.

## ١٩ - بَابُ الاِسْتِتَارِ فِي الْخَلاَءِ.

٣٥ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنِ اكْتَحَلَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ أَكَلَ، فَمَا تَخَلَّلَ فَلْيَلْفِظْ، وَمَا لاَكَ بِلِسَانِهِ فَلْيَبْتَلِعْ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ أَتَى الْغَائِطَ فَلْيَسْتَتِرْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ، إِلاَّ أَنْ يَجْمَعَ كَثِيبًا مِنْ رَمْلٍ، فَلْيَسْتَدْبِرْهُ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَلْعَبُ بِمَقَاعِدِ بَنِي آدَمَ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ).

// ضعيف الجامع الصغير (٥٤٦٨)، المشكاة (٣٥٢) //.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ئەوەی چاو دەرێژێت با بە تاك بیرێژێت واتە کە دەیهێنێ بەهەر چاوێکیدا با تاك بێت، ئەوەی وا دەکات ئەوە زۆر باش دەکات، ئەوەشی وا نەکات قەیناکات و گوناهی ناگات، ئەوەی بە بەرد خۆی پاك دەکاتەوە لەسەرئاو با بە چەند بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە، ئەوەی وا دەکات ئەوە زۆر باش دەکات، ئەوەشی وا نەکات قەیناکات، ئەوەی شت دەخوات

هەرچی بە چکۆڵە دەری دێنێ لەبن ددانەکانی با بیتفێتـەوە، هەرچی بـەزمان دەری دێنێ با قوتی بـدات و بیخوات، ئـەوەی وا دەکات ئـەوە زۆر بـاش دەکات، ئەوەشی وا نەکات قەیناکات، هەر کەسێ دەستی بەئاو گەیانـد بـا خـۆی حەشـار بدات، ئەگەر هەر هیچ نەبوو با هەندێ لم کۆکاتەوە و پشتی تێ بکات، چونگە شەیتان گاڵتـە دەکات بـە پاشـەڵی ئـادەمیزاد، ئـەوەی وا دەکـات ئـەوە زۆر بـاش دەکات، ئەوەشی وا نـەکات قەیناکات.

## باسی ئەو شتانەی کە قەدەغەکراون بەکاربهێنرێن بۆ خۆ پاککردنەوە

## ٢٠ – بَابُ مَا يُنْهَى عَنْهُ أَنْ يُسْتَنْجَى بِهِ.

**٣٦ - (صحيح) عَنْ رُوَيْفِعٍ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا رُوَيْفِعُ لَعَلَّ الْحَيَاةَ سَتَطُولُ بِكَ بَعْدِي، فَأَخْبِرِ النَّاسَ أَنَّهُ مَنْ عَقَدَ لِحْيَتَهُ، أَوْ تَقَلَّـدَ وَتَـرًا، أَوِ اسْتَنْجَى بِرَجِيعِ دَابَّةٍ أَوْ عَظْمٍ، فَإِنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُ بَرِيءٌ).**

واتە: لە رومەیفیعـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: ئەی رومەیفیـع لەوانەیـە تـۆ تەمـەنت درێـژ بێـت بـە خەڵك رابگەیەنە کە بەڕاستی موحەممەد صلی الله علیه وسلم بەرییە لـە هـەر کەسێ کە ڕیشی گرێ بـدات، یـان ژێـی کـەوان بکاتـە گـەردنی بـۆ چاوەزار، یـان خۆی پاك بکاتەوە بە تەپاڵەو تەرسی ولاغ یا بە ئێسك.

**٣٧ -(صحيح الإسناد) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، يَذْكُرُ ذَلِكَ وَهُوَ مَعَهُ مُرَابِطٌ بِحِصْنِ بَابُ أَلْيُونَ.**

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە (رُوَيْفِع) باسی ئەو فەرمودەیەی بۆ کردووە لەکاتێکدا کە پێکەوە بوون لە (حِصْنِ بَابُ أَلْيُونَ) واتە لە وڵاتی مصر.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حِصْنُ أَلْيُونَ عَلَى جَبَلٍ بِالْفُسْطَاطِ.**

ئەبو داود دەڵێت: (بِحِصْنِ أَلْيُون) لەسەر کێوێکە لە (فُسْطَاطِ).

**٣٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدُ اللَّهِ، قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَتَمَسَّحَ بِعَظْمٍ أَوْ بَعْرٍ.**

واتە: لە جابری کوڕی (عبداللە)وە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ڕیگری لێ کردین کە بە ئێسك یان بە پشقل خۆمان پاك بکەینەوە.

**٣٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ الْجِنِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، انْهَ أُمَّتَكَ أَنْ يَسْتَنْجُوا بِعَظْمٍ أَوْ رَوْثَةٍ أَوْ حُمَمَةٍ، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى جَعَلَ لَنَا فِيهَا رِزْقًا، قَالَ: فَنَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ.**

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە نوێنەری جنۆکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتیان: ئەی موحەممەد ریگری بکە لە ئومەتەکەت کە بە ئێسك و تەرس و خەڵوز خۆیان پاك بکەنەوە، چونکە خوای گەورە رۆزی ئێمەی لەسەر ئەوانە داناوە، وتی: جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆ پاك کردنەوەی بەوانە قەدەغەکرد.

## باسی خۆ پاککردنەوە بە بەرد.

## ٢١ - بَابُ الاسْتِنْجَاءِ بِالْحِجَارَةِ.

| |
|---|
| ٤٠ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْغَائِطِ فَلْيَذْهَبْ مَعَهُ بِثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ يَسْتَطِيبُ بِهِنَّ فَإِنَّهَا تُجْزِئُ عَنْهُ). |

واتە: لە خاتوو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەر کام لە ئێوە دەستی بەئاو گەیاند با سێ بەرد لەگەڵ خۆی بەرێت خۆی پێ پاك بکاتەوە بەڕاستی ئەوە بەسیەتی، واتە ئیتر پێویست بە شوشتن ناکات.

٤١ - (صحيح) عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الاِسْتِطَابَةِ؟ فَقَالَ: (بِثَلَاثَةِ أَحْجَـارٍ لَيْسَ فِيهَا رَجِيعٌ ).

واتە: لە خوزەیمەی کوڕی (ثابت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیار کرا سەبارەت بە خۆ پاك کردنەوە؟ ئەویش فەرمووی: بە سێ بەرد کە تەرسی وڵاغ و پیسیان پێوە نەبێت.

## باسی خۆ پاککردنەوە لە میز.

## ٢٢ - بَابُ فِي الاِسْتِبْرَاءِ.

٤٢ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: بَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ عُمَرُ خَلْفَهُ بِكُوزٍ مِـنْ مَـاءٍ فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا عُمَرُ؟). فَقَالَ هَذَا مَاءٌ تَتَوَضَّـأُ بِـهِ. قَالَ: (مَا أُمِرْتُ كُلَّمَـا بُلْـتُ أَنْ أَتَوَضَّـأَ وَلَـوْ فَعَلْـتُ لَكَانَتْ سُنَّةً ).

// المشكاة المصابيح: (٣٦٨)//.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم میزی کرد، جا عومەر هەستا لە

دەفرێکدا ئاوی بۆ برد، فەرمووی: ئەوە چییە ئەی عومەر؟ وتی: ئەوە ئاوە دەستنوێژی پێ بگرە، فەرمووی: بەوە فەرمانم پێ نەکراوە هەرکاتێك میزم کرد دەستنوێژ بگرم، ئەگەر ئەوە بکەم ئەوا دەبێتە سوننەت.

## خۆ پاککردنەوە بە ئاو.

## ٢٣ – بَابُ فِى الاِسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ.

٤٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ حَائِطًا، وَمَعَهُ غُلاَمٌ مَعَهُ مِيضَأَةٌ، وَهُوَ أَصْغَرُنَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ السِّدْرَةِ، فَقَضَى حَاجَتَهُ فَخَرَجَ عَلَيْنَا، وَقَدِ اسْتَنْجَى بِالْمَاءِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە ناو باخێك بۆ ئەوەی دەست بەئاو بگەیەنێت، منداڵێکی لە ئێمە بچوکتری لەگەڵ بوو مەسینەیەك ئاوی پێ بوو لەبن درەختێکی (نبق)دا بۆی دانا، کاتێ کە هاتەدەرەوە بەو ئاوە خۆی پاککردەوە.

٤٤ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِى أَهْلِ قُبَاءَ: (فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا). قَالَ: كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الآيَةُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنـەوە، کە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم فەرموویەتی: ئەهلی (قُبَاء) لەبەر پاك و خاوێنیان کە بە ئاو خۆیان پاك دەکردەوە خوای گەورە وەسـفیان دەکـات و ئـەم ئایەتـەی دەربارەیـان دابەزانـد: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا﴾ التوبـــة: ١٠٨. واتـــە: پیاوانێکیـــان تێدایـــە دەیانەوێت خۆیان لە هەموو کردەوەیەکی خراپ دوور بخەنـەوە و خۆیـان پـاك رابگرن.

## باسی دەست خشاندنی کەسێك لە زەوی لەدوای خۆ پاککردنەوە

## ٢٤ – بَابُ الرَّجُلِ يُدَلِّكُ يَدَهُ بِالأَرْضِ إِذَا اسْتَنْجَى

٤٥ - (حسن) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ:كَانَ النَّبِـىُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَى الْخَلاَءَ أَتَيْتُهُ بِمَـاءٍ فِـى تَـوْرٍ أَوْ رَكْـوَةٍ فَاسْتَنْجَى.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیە وسلم کاتێ دەستی بەئاو دەگەیاند، لە جەوەنەیەکدا یـان لـە جامێکـدا ئاوم بۆ دەبرد خۆی پێ پاك دەکردەوە.

﴿قَالَ أَبُو دَاوُدَ فِى حَدِيثِ وَكِيعٍ﴾: ثُـمَّ مَسَـحَ يَـدَهُ عَلَـى الأَرْضِ، ثُـمَّ أَتَيْتُهُ بِإِنَاءٍ آخَرَ فَتَوَضَّأَ.

واتە: ئـەبو داود لـە فەرمودەکـەی وەکیـع دا دەڵێـت: پاشـان دەسـتی لـەزەوی دەخشاند، منیش جەوەنەیەکی تر ئاوم بۆ دەبرد دەستنوێژی پێ دەگرت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ الأَسْوَدِ بْنِ عَامِرٍ أَتَمُّ.

واتە: ئەبوداود دەڵێت: بەڵام فەرمودەکەی ئەسوەدی کوڕی عامر تەواو ترە.

## باسی سیواك كردن

## ٢٥- بَابُ السِّوَاكِ

٤٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَرْفَعُهُ قَالَ: (لَوْلاَ أَنْ أَشُـقَّ عَلَـى الْمُؤْمِنِينَ لأَمَرْتُهُمْ بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ، وَبِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، بـە مـەرفوعی لـە پێغەمبـەرەوە صلى الله عليه وسلم کە فەرموویـەتی: (ئەگـەر قـورس نەبوایـە لەسـەر بـاوەڕداران ئـەوا فەرمانم پێ دەکردن کە نوێژی عیشا دوابخـەن، وە لەگـەڵ هـەموو نوێژێکیشدا سیواك بکەن).

٤٧ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُـولُ: (لَـوْلاَ أَنْ أَشُـقَّ عَلَـى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُـلِّ صَـلاَةٍ). قَـالَ أَبُـو

سَلَمَةَ: فَرَأَيْتُ زَيْدًا يَجْلِسُ فِي الْمَسْجِدِ، وَإِنَّ السِّوَاكَ مِنْ أُذُنِهِ مَوْضِعُ الْقَلَمِ مِنْ أُذُنِ الْكَاتِبِ، فَكُلَّمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ اسْتَاكَ).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر قورس نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوا فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا سیواک بکەن). ئەبو سەلەمە وتی: زەیدم بینی لە مزگەوت دانیشتبوو سیواکەکەی بە گوێچکەوە بوو ئەو شوێنەی کە نوسەر قەڵەمی لێ دادەنێت، هەرکاتێك هەستایە بۆ نوێژ سیواکی دەکرد.

٤٨ - (حسن) عَنْ عَبْدُاللَّه بْنِ عَبْدُاللَّه بْنِ عُمَرَ، قَالَ: قُلْتُ أَرَأَيْتَ تَوَضُّؤَ ابْنِ عُمَرَ لِكُلِّ صَلاَةٍ طَاهِرًا وَغَيْرَ طَاهِرٍ، عَمَّ ذَاكَ؟ فَقَالَ: حَدَّثَتْنِيهِ أَسْمَاءُ بِنْتُ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ حَنْظَلَةَ بْنِ أَبِي عَامِرٍ حَدَّثَهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُمِرَ بِالْوُضُوءِ لِكُلِّ صَلاَةٍ طَاهِرًا وَغَيْرَ طَاهِرٍ، فَلَمَّا شَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ أُمِرَ بِالسِّوَاكِ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَرَى أَنَّ بِهِ قُوَّةً فَكَانَ لاَ يَدَعُ الْوُضُوءَ لِكُلِّ صَلاَةٍ).

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: وتم: بۆچی ئیبنو عومەر بۆ هەموو نوێژێك

دەستنوێژی دەگرتەوە ئیتر دەستنوێژی ببوایە یان نەیبوایە، وتی: ئەسمای کچی زەیدی کوڕی خەتاب بۆی گێڕامەوە، کە (عبدالله) کوڕی (حنظلة)ی کوڕی ئەبی عامر بۆی گێڕاوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلایەن خواوە فەرمانی پێ کراوە بە دەستنوێژگرتن بۆ هەموو نوێژێك ئیتر دەستنوێژی ببوایە یان نەیبوایە، کاتێ ئەو کارەی لەسەر قورس و ناڕەحەت بوو فەرمانی پێ کرا بە سیواك کردن بۆ هەموو نوێژێك، ئیبن عومەر لەخۆی رادەبینی کە توانای ئەو کارەی هەیە بۆیە وازی لێ نەهێنا بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرتەوە.

## باسی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چۆن سیواکی بەکاردەهێنا

## ٢٦ - بَابُ كَيْفَ يَسْتَاكُ

٤٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ مُسَدَّدٌ: قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَسْتَحْمِلُهُ، فَرَأَيْتُهُ يَسْتَاكُ عَلَى لِسَانِهِ.

واتە: لە ئەبو بوردەوە، لە باوکیەوە هاتووە، موسەددەد وتی: کە وتویەتی: چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی هەڵی بگرین واتە سواری وشتری بکەین، بینیمان سیواکی دەکرد دەیهێنا بەسەر زمانیدا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ سُلَيْمَانُ: قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَسْتَاكُ، وَقَدْ وَضَعَ السِّوَاكَ عَلَى طَرَفِ لِسَانِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: (إِهْ إِهْ). يَعْنِي يَتَهَوَّعُ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: سولەیمان دەڵێت: ئەبو موسا راوی فەرمودەکە وتی: جارێ چومەژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سیواکی دەکرد، سیواکەکە بەسەری زمانیەوە بوو دەیفەرموو: (إِهْ إِهْ) وەك بڕشێتەوە ئاوا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مُسَدَّدٌ فَكَانَ حَدِيثًا طَوِيلاً اخْتَصَرْتُهُ.

ئەبو داود وتی: موسەدەد وتی فەرمودەیەکی دریژ بوو بەڵام من کورتم کردۆتەوە.

## باسی کەسێ بە سیواکی کەسێکی تر سیواك بکات

## ٢٧ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يَسْتَاكُ بِسِوَاكِ غَيْرِهِ.

٥٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَنُّ وَعِنْدَهُ رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ فَأُوحِيَ إِلَيْهِ فِي فَضْلِ السِّوَاكِ (أَنْ كَبِّرْ). أَعْطِ السِّوَاكَ أَكْبَرَهُمَا).

واتە: لە خاتوو عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سیواکی دەکرد لەو کاتەدا دوو پیاوی لەلا بوو یەکێکیان گەورەتر بوو لەوی تریان پێی گوترا سیواکەکە بداتە دەست گەورەکەیان.

## باسی شوشتنی سیواك.

## ٢٨ – بَابُ غَسْلِ السِّوَاكِ.

٥١ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَاكُ، فَيُعْطِينِى السِّوَاكَ لأَغْسِلَهُ، فَأَبْدَأُ بِهِ فَأَسْتَاكُ، ثُمَّ أَغْسِلُهُ وَأَدْفَعُهُ إِلَيْهِ.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سیواکی دەکردو سیواکەکەی دەدا بە من هەتا بۆی بشۆم، منیش لەپێشدا سیواکم پێ دەکرد، ئینجا دەمشت و دەمدایەوە دەستی.

## سیواك کردن لە فیترەتەوەیە.

## ٢٩ – بَابُ السِّوَاكِ مِنَ الْفِطْرَةِ.

٥٢ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَالاِسْتِنْشَاقُ

بِالْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ). - يَعْنِي الاسْتِنْجَاءَ بِالْمَاءِ -. قَالَ زَكَرِيَّا: قَالَ مُصْعَبٌ ﴿بْنِ شَيْبَةَ﴾: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ " إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ).

واتە: لە خاتوو عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: سوننەتی فیترەت بریتین لە دە رەوشتی پاکی پێغەمەران: سمێڵ کورت کردنەوە، ریش هێشتنەوەو بەردانەوەی، سیواك کردن، ئاو لە لوت رادان، نینۆك کردن، شوشتنی لۆچی سەر جمگە و گرێ پەنجەکان، هەڵکێشانی مووی بن باڵ، تاشینی مووی شەرمگا، تارەت گرتن بە ئاو. زەکەریا وتی: (مُصعب)ی کوڕی شەیبە وتی: دەیەمم لە بیرنەماوە ئەگەر ئاو لە دەم رادان نەبێ.

٥٣ - (حسن) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْمَضْمَضَةَ، وَالاسْتِنْشَاقَ). فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ (إِعْفَاءَ اللِّحْيَةِ) وَزَادَ: (وَالْخِتَانَ ). قَالَ: (وَالانْتِضَاحَ). وَلَمْ يَذْكُرِ (انْتِقَاصَ الْمَاءِ ). يَعْنِي الاسْتِنْجَاءَ.

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە سوننەتی فیترەتن: ئاو لە دەم و لوت رادان) بەهەمان شێوە فەرمودەکە عائیشەی رەزای خوای لێ بێ گێڕایەوە، بەڵام

باسی (ریش بەردانەوەی) نەکرد، بەڵکو (خەتەنەکردنی) بۆ زیاد کرد، راوی وتی: (وَالاِنْتِضَاح) کە بریتیە لە هەڵگرتنی کەمێك ئاو بە دەست و پژاندنی لە شەرمگا لەدوای دەستنوێژەوە، وە باسی (تارەت گرتنی) نەکرد واتە خۆ پاك کردنەوە بە ئاو.

(صحيح موقوف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَ نَحْوُهُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَقَالَ خَمْسٌ كُلُّهَا فِي الرَّأْسِ وَذَكَرَ فِيهِ: (الْفَرْقَ)، وَلَمْ يَذْكُرْ (إِعْفَاءَ اللِّحْيَةِ).

ئەبو داود دەڵێت: بە هەمان شێوە فەرموودەکە عائیشە لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، ئیبنو عەباس وتی: پێنجن هەر هەمووشیان لە سەردان، وە باسی (فَرْقَ)ی کرد واتە: ( مووی سەر کردن بەدوو بەشەوە بەشێکی بۆ لای راست و بەشەکەی تری بۆ لای چەپ)، بەڵام (باسی ریش بەردانەوەی نەکرد).

(صحيح عن طلق موقوف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَ نَحْوُ حَدِيثِ حَمَّادٍ، عَنْ طَلْقِ بْنِ حَبِيبٍ، وَمُجَاهِدٍ، وَعَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدُ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ، قَوْلُهُمْ، وَلَمْ يَذْكُرُوا: (إِعْفَاءَ اللِّحْيَةِ).

ئەبو داود دەڵێت: بە هەمان شێوە فەرموودەکەی حەمماد هاتووە، لە (طَلْق)ی حەبیب و موجاهیدەوە، وە لە بەکری کوڕی (عبدالله)ی موزەنیەوە، بە (موقوف)ی نەك بە (مرفوع)ی، بەڵام راویەکان باسی ریش بەردانەوەیان نەکردووە.

(صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِيـهِ: (وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ).

واته: له ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە فەرمودەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ریش بەردانەوەی تێدایە.

(صحيح موقوف) وَعَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِـيِّ نَحْـوُهُ ... وَذَكَـرَ: (إِعْفَـاءَ اللِّحْيَةِ وَالْخِتَانَ).

واته: وە ئیبراهیمی نەخەعیش بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە ... وە باسی ریش بەردانەوە و خەتەنەکردنی کردووە.

## سیواك کردنی کەسێ کە شەو هەستێ.

## ٣٠ - بَابُ السِّوَاكِ لِمَنْ قَامَ مِنَ اللَّيْلِ.

٥٤ - (صحيح) عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ.

واته: له (حُذَيْفَة)ەوە هاتووە، کە وتوویەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە لەخەو خەبەری دەبۆوە پێش هەموو شتێك سیواکی دەکرد.

**٥٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوضَعُ لَهُ وَضُوءُهُ وَسِوَاكُهُ، فَإِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ تَخَلَّى ثُمَّ اسْتَاكَ).**

واتە: لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە دەخەوت ئاوی دەستنوێژ و سیواکەکەی لەتەنیشت خۆیەوە دادەنا، کاتێ کە خەبەری دەبۆوە، دەستی بە ئاو دەگەیاند، پاشان سیواکی دەکرد.

**٥٦ - (حسن دون قول: (ولانهار)) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّ النَّبِيَّ كَانَ لاَ يَرْقُدُ مِنْ لَيْلٍ وَلاَ نَهَارٍ فَيَسْتَيْقِظُ إِلاَّ تَسَوَّكَ قَبْلَ أَنْ يَتَوَضَّأَ).**

// صحيح الجامع الصغير: (٤٨٥٣) //.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرکاتێ ڕاکشایە بۆ خەوتن ئیتر بەشەو بوایە یان بەرۆژ، کاتێ کە خەبەری دەبۆوە پێش ئەوەی دەستنوێژ بگرێت سیواکی دەکرد.

**٥٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عَبَّاس، قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ مِنْ مَنَامِهِ أَتَى طَهُورَهُ، فَأَخَذَ سِوَاكَهُ فَاسْتَاكَ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَاتِ:**

( إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ). آل عمران: ١٩٠. حَتَّى قَارَبَ أَنْ يَخْتِمَ السُّورَةَ أَوْ خَتَمَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَأَتَى مُصَلاَّهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى فِرَاشِهِ فَنَامَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى فِرَاشِهِ فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى فِرَاشِهِ فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، كُلُّ ذَلِكَ يَسْتَاكُ وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ.

واتە: لە (عبدالله)ی كوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: شەوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم مامەوە كاتێ كە لەخەو هەستا دەستنوێژی گرت و سیواكی كرد، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾.آل عمران:١٩٠. واتە: بەڕاستی لەدرووست كردنی ئاسمانەكان و زەویدا و لەجیاوازی و گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیرییەكان... هەتا نزیكی كۆتایی سورەتەكە یان تا كۆتایی. پاشان دەستنوێژی گرت و چووە جێگا نوێژەكەی و دوو ركات نوێژی كرد، ئینجا گەڕایەوە بۆ جێگاكەی و چەندە خوا ویستی خەوتەوە، پاشان هەستایەوە دەستنوێژی گرت و دوو ركات نوێژی كرد، ئینجا گەڕایەوە بۆ جێگاكەی و خەوتەوە، پاشان هەستایەوە دەستنوێژی گرت و دوو ركات نوێژی كرد، ئینجا گەڕایەوە بۆ جێگاكەی و خەوتەوە، پاشان هەستایەوە دەستنوێژی گرت و دوو ركات نوێژی كرد، ئینجا گەڕایەوە بۆ جێگاكەی و

خەوتـەوە، لـە هـەموو جارەکانـدا سـیواکی دەکـرد و دوو رکـات نوێـژی دەکـرد، پاشان یەك رکات نوێژی وەتری کرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ حُصَيْنٍ، قَالَ: فَتَسَوَّكَ وَتَوَضَّأَ وَهُوَ يَقُـولُ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: لە (حصين)ەوە هاتووە کە وتویـەتی: سـیواکی دەکـرد و دەستنوێژی دەگرت پاشان ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (إِنَّ فِي خَلْـقِ السَّـمَوَاتِ وَالأَرْضِ). هەتا کۆتایی سورەتەکە.

**٥٨ - (صحيح) عَنِ الْمِقْدَامِ بْـنِ شُـرَيْحٍ ، عَـنْ أَبِيـهِ، قَـالَ: قُلْـتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يَبْـدَأُ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِذَا دَخَـلَ بَيْتَـهُ؟ قَالَـتْ: (بِالسِّوَاكِ).**

واتـە: لـە میقـدامی کـوڕی شـورەیحەوە، ئـەویش لـە باوکیـەوە هـاتووە، کـە وتویەتی: بە خاتوو عائیشەم ڕەزای خـوای لـێ بـێ وت: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم کە دەهاتەوە بۆماڵەوە لەپێشدا دەستی بەچی دەکرد؟ وتـی: بـە سیواك کردن.

منتدى إقرأ الثقافي

## باسی فەرزبوونی دەستنوێژ

## ٣١ - بَابُ فَرْضِ الْوُضُوءِ

٥٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ، وَلاَ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ).

واتە: لە ئەبی مەلیحەوە، ئەویش لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: خوای گەورە خێر و سەدەقەی دزی و ناپاکی لە دەستکەوتی جەنگی(غەنیمە) وەرناگرێت، وە نوێژیش بەبێ دەستنوێژ وەرناگرێ.

٦٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: خوا نوێژی هیچ کەس لەئێوە بەبێ دەستنوێژ وەرناگرێت.

٦١ - (حسن صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ).

واتە: لە ئیمام عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: کلیلی نوێژ پاك وخاوێنی و دەست نوێژە، دابەستنیشی بە (الله اکبر)ە، بەسلاو دانەوەش تەواو دەکرێت.

## باسی دەستنوێژ تازەکدنەوەی کەسێ لەکاتێکدا کە دەستنوێژی هەبێت

## ٣٢ - بَابُ الرَّجُلِ يُجَدِّدُ الْوُضُوءَ مِنْ غَيْرِ حَدَثٍ.

٦٢ - (ضعيف) عَنْ (غُطَيْفٍ)-وَقَالَ مُحَمَّدٌ عَنْ أَبِي غُطَيْفٍ الْهُذَلِيِّ- قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، فَلَمَّا نُودِيَ بِالظُّهْرِ تَوَضَّأَ فَصَلَّى، فَلَمَّا نُودِيَ بِالْعَصْرِ تَوَضَّأَ، فَقُلْتُ لَهُ؟ فَقَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ تَوَضَّأَ عَلَى طُهْرٍ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ).

// ضعيف الجامع الصغير (٥٥٣٦ )، المشكاة (٢٩٣ ) //.

واتە: لە (غُطَيْف)ەوە- محەمەد وتی لە (أَبِي غُطَيْـفٍ الْهُـذَلِيِّ)ەوە دەگێڕنـەوە، کە وتویەتی: لەلای (عبدالله)ی کوڕی عومەر، بووم کاتێ کە بـانگی نیـوەڕۆ درا دەسـتنوێژی گـرت و نوێـژی نیـوەڕۆی کـرد، وە کـاتێ کـە بـانگی عەسـر درا دەسـتنوێژی گـرت و نوێـژی عەسـری کـرد، سـەبارەت بـە تازەکردنـەوەی دەسـتنوێژەکەی لـێم پرسـی؟ وتـی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك دەستنوێژی هەبێت و دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە خوای گەورە دە چاکەی بۆ دەنوسێت).

## باسی ئاو بەچی پیس دەبێت.

## ٣٣ – بَابُ مَا يُنَجِّسُ الْمَاءَ.

٦٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ: فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَـمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ).

واتـە: لـە (عبداللـە)ی کـوڕی عومـەرەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویەتی: سەبارەت بە حاڵەتی ئاو کە حـەیوانات و دڕنـدە دەچنەسـەری و لێـی دەخۆنـەوە لـە پێغەمبـەری خوایـان صـلی الله علیـە وسـلم پرسـی؟ ئـەویش فەرمووی: (ئەگەر ئـاو گەیشتە ڕادەی قوللـەتێن ئـیتر پیسـی هـەڵناگرێت واتـە: پیس نابێت)[١].

[١]- (قلتين) نزیکەی پێنج سەد ڕەتڵی بەغدادیە: کە بە پێوانەی ڕبەیی دەکاتە ١٩٢ لیتر واتە: نزیکەی بەرمیلێ نەوت. ڕوناکی(رب العالمين) ڕونکردنەوەی منهاج بەڕێز م.هەرتەلی

٦٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ الْمَاءِ يَكُونُ فِي الْفَلاَةِ. فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واته: (عبدالله)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت، كە سەبارەت بە ئاوێ كە لەچۆڵەوانی و دەشت و دەردا بێت پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش بەو مانایە باسی فەرمودەكەی سەرەوەی كرد. واتە: ئەگەر گەیشتنە وادەی قولەتەین ئیتر پیسی نابێت.

٦٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ، فَإِنَّهُ لاَ يَنْجُسُ ).

واته: (عبدالله)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: باوكم بۆی گێڕامەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئاو گەیشتە ڕادەی قوللەتێن ئیتر پیسی هەڵناگرێت).

## باسی ئەوەی کە سەبارەت بە بیری (بُضَاعَة)[1] هاتووە.

## ٣٤ - بَابُ مَا جَاءَ فِي بِئْرِ بُضَاعَةَ.

٦٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّهُ قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَتَوَضَّأُ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ - وَهِيَ بِئْرٌ يُطْرَحُ فِيهَا الْحِيَضُ وَلَحْمُ الْكِلَابِ وَالنَّتْنُ؟ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمَاءُ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ).

واتە: ئەبی سەعیدی خودری دەڵێت: کە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وترا: ئایا دەستنوێژ بگرین بە ئاوی بیری (بُضَاعَة)؟ - کە ئەوە بیرێکە ئافرەتان پەڕۆی بێ نوێژی خۆیانی تێ فڕێ دەدەن و گۆشتی سەگ و شتی بۆگەنی تێ دەکرێت؟! - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بێگومان ئاو پاك و پاككەرەوەیە، هیچ شتێك پیسی ناكات).

[1] - بیری (بضاعة) بیرێ بوو لە شاری مەدینە رادەی ئاوەکەی لە قوڵڵەتەین زیاتر بووە.

٦٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُقَالُ لَهُ: إِنَّهُ يُسْتَقَى لَكَ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ، وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فِيهَا لُحُومُ الْكِلاَبِ وَالْمَحَايِضُ وَعَذِرُ النَّاسِ ! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ ).

واته: ئەبی سەعیدی خودری دەڵێت: لە پێغەمەری خوام صلی علیه الله وسلم بیستووە لەکاتێکدا کە لێیان پرسی و وتیان: ئاوی بیری (بُضَاعَة)ت، بۆ دێنین کە بیرێکە گۆشتی سەگ و پەڕۆی بێ نوێژی و پیسایی خەڵکی تێدەکەوێت بەتایبەتی لەکاتی لافاودا، ئایا ئاوەکەی پاکە؟ پێغەمەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بڕاستی ئاو پاك و خاوێن کەرەوەیە هیچ شتێك پیسی ناکات).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ قُتَيْبَةَ بْنَ سَعِيدٍ، قَالَ: سَأَلْتُ قَيِّمَ بِئْرِ بُضَاعَةَ عَنْ عُمْقِهَا؟ قَالَ: أَكْثَرُ مَا يَكُونُ فِيهَا الْمَاءُ إِلَى الْعَانَةِ، قُلْتُ فَإِذَا نَقَصَ؟ قَالَ: دُونَ الْعَوْرَةِ.

واته: ئەبو داود دەڵێت: لە قوتەیبەی کوڕی سەعیدم بیست وتی: لەبیرەوان –کاربەدەستی – بیرەکەم پرسی کە بیری (بضاعة) قوڵیەکەی چەندە؟ وتی: کاتێ ئاوی زۆری تێدا بێت دەگاتە ئاستی شەرمگای ئادەمیزاد، بەڵام کاتێ کە ئاوەکەی کەمی کرد دەگاتە بەر ئەژنۆ.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَدَّرْتُ أَنَا بِئْرَ بُضَاعَةَ بِرِدَائِى مَدَدْتُهُ عَلَيْهَا، ثُمَّ ذَرَعْتُهُ، فَإِذَا عَرْضُهَا سِتَّةُ أَذْرُعٍ، وَسَأَلْتُ الَّذِى فَتَحَ لِى بَابَ الْبُسْتَانِ فَأَدْخَلَنِى إِلَيْهِ: هَلْ غُيِّرَ بِنَاؤُهَا عَمَّا كَانَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: لاَ. وَرَأَيْتُ فِيهَا مَاءً مُتَغَيِّرَ اللَّوْنِ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: بە پۆشاکەکەم ئەندازەی پانی بیری (بضاعة)م گرت، پاشان پۆشاکەکەم بە باڵی خۆم پێوایەوە پانیی بیرەکە شەش باڵ بوو، پرسیم لەوەی کە دەرگای باخەکەی بۆ کردمەوە و کردمییە ژوورەوە: ئایا بینای بیرەکە وەك خۆی ماوەو نەگۆڕاوە؟ واتە: لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم چۆن بووە هەروا ماوە و نەگۆڕاوە؟ وتی: نەخێر نەگۆڕاوە و هەروەك خۆیەتی، بینیم ڕەنگی ئاوەکەی گۆڕاوە.

## باسی ئاو پیس نابێت.

## ٣٥ – بَابُ الْمَاءِ لاَ يَجْنُبُ.

٦٨ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى جَفْنَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَتَوَضَّأَ مِنْهَا - أَوْ يَغْتَسِلَ - فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى كُنْتُ جُنُبًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْمَاءَ لاَ يَجْنُبُ ).

واتە: لە ئيبنو عەباسـەوە رەزاى خوايـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە وتويـەتى: يەكێك لە خێزانەكانى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە تەشتێكدا خـۆى شـت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هات دەستنوێژى تێدا بگرێـت – يـان خـۆى پـێ بشوات - لەو ئاوەى كە ماوەتەوە، وتـى: ئـەى پێغەمبـەرى خـوا مـن لەشـم گـران بـوو خـۆم تێـدا شـۆردووە، پێغەمبـەرى خـوا صـلى الله عليـە وسـلم فـەرمووى: (بێگومان ئاو پيس نابێت).

## باسى ميزكردنە ناو ئاوى وەستاوەوە.

## ٣٦ – بَابُ الْبَوْلِ فِى الْمَاءِ الرَّاكِدِ.

٦٩ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: (لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِى الْمَاءِ الدَّائِمِ، ثُـمَّ يَغْتَسِـلُ مِنْهُ ).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبـەر صـلى الله عليـە وسـلم فەرموويـەتى: بـا هـيچ كەسـێك لـە ئێـوە ميـز نەكاتـە نـاو ئـاوى هەميشـە وەستاوەوەو، پاشان خۆى لێ بشوات.

٧٠ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِى الْمَاءِ الـدَّائِمِ، وَلاَ يَغْتَسِلْ فِيهِ مِنَ الْجَنَابَةِ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: با هیچ كەسێك لە ئێوە میز نەكاتە ناو ئاوی هەمیشە وەستاوەوە، وە خۆی تێدا نەشوات كاتێ كە لەشگران بوو.

## باسی دەستنوێژگرتن لە بەرماوەی سەگ.

## ٣٧ – بَابُ الْوُضُوءِ بِسُؤْرِ الْكَلْبِ.

**٧١ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ" أَنْ يُغْسَلَ سَبْعَ مِرَارٍ أُولاَهُنَّ بِتُرَابٍ ).**

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری یەكێكتانەوە بەوە پاك دەبێتەوە كە حەوت جار بیشوات یەكەم جاریان بە قوڕاو.

**٧٢ - (صحيح موقوف، وصح أيضا مرفوعا) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، بِمَعْنَاهُ، وَلَمْ يَرْفَعَاهُ زَادَ: (وَإِذَا وَلَغَ الْهِرُّ غُسِلَ مَرَّةً).**

واتە: ئەبو هورەیرە بەو مانایەی سەرەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام فەرمودەكەی نەگەیاندۆتەوە سەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وە ئەمەشی بۆ زیاد كرد: ئەگەر پشیلە دەمی خستە ناو دەفری یەكێكتانەوە با یەك جار بیشوات.

**٧٣ - (صحيح لكن قوله (السَّابعَة) شاذ، والأرجح: الأولى بالتُّرَابِ)**

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، السَّابِعَةُ بِالتُّرَابِ)[1].**

واته: له ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری یەکێکتانەوە با حەوت جار بیشوات، حەوتەم جاریان بە قوڕاو.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَوْهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَلَمْ يَذْكُرُوا التُّرَابَ.**

ئەبو داود دەڵێت: لەریوایەتێکی تردا فەرموودەکەی سەرەوە لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، بەڵام باسی قوڕاوی نەکرد.

**٧٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ مُغَفَّلٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ ثُمَّ قَالَ: (مَا لَهُمْ وَلَهَا). فَرَخَّصَ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ، وَفِي كَلْبِ الْغَنَمِ، وَقَالَ: (إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مِرَارٍ، وَالثَّامِنَةُ عَفِّرُوهُ بِالتُّرَابِ).**

---

[1]- (صحيح)ە بەڵام (جاری حەوتەم بە خۆڵ بیشوات) (شاذ)ە راستیەکەی ئەوەیە (جاری یەکەمیان بە خۆڵ بیشوات) وەرم گرتووە لەکتێبی (عون المعبود ١/ ٥٥) چاپی ٢٠٠٩ی (مکتبة المعارف) علق علیه وتخرج أحادیثه شیخ مشهور.

واتە: لە ئیبنو موغەففەلەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگ، پاشان فەرمووی: (خەڵك بۆچی سەگ بگوژن یان بۆچی سەگ بکوژرێت). ئینجا رێگەی یا بەڕاگرتنی سەگی راوکەر بۆ راو وشکار، وە سەگ بۆ شوان بۆ پاسی مەڕەکانی، وە فەرمووی: (ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری یەکێکتانەوە با حەوت جار بیشوات هەشتەم جار خۆڵاوی بکات و بیشوات).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَكَذَا قَالَ ابْنُ مُغَفَّلٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو موغەففەل بەم شێوەیە گێڕاویەتیەوە.

## باسی بەرماوەی پشیلە.

## ٣٨ – بَابُ سُؤْرِ الْهِرَّةِ.

٧٥ - (حسن صحيح) عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ - وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ - أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ، قَالَتْ كَبْشَةُ فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ! فَقَالَ أَتَعْجَبِينَ يَا بِنْتَ أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ ).

واتە: لە کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیکەوە - کە ژنی ئیبنو ئەبو قەتادە بوو - دەگێڕنەوە، کە ئەبو قەتادە چۆتە ماڵیان ئاوی بۆ کردۆتە دەفرێکەوە بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێ بگرێت، لەو کاتەدا پشیلەیەك هاتووە لە ئاوەکەی خواردۆتەوە، ئەویش دەفرە ئاوەکەی بۆ لارکردۆتەوەو بۆی راگرتووە هەتا پشیلەکە تێری خواردۆتەوە، کەبشە وتی: کاتێ کە منی دی سەرنجی دەدەم وتی: ئەی کچی برام بەلاتەوە سەیرە؟! وتم: بەڵێ! وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوە پیس نیە، پشیلە لەوانەیە کە زۆر هاتوچۆتان دەکەن و تێکەڵاوتان دەبن).

٧٦ - (صحيح) عَنْ دَاوُدَ بْنِ صَالِحِ بْنِ دِينَارٍ التَّمَّارِ، عَنْ أُمِّهِ، أَنَّ مَوْلاَتَهَا أَرْسَلَتْهَا بِهَرِيسَةٍ إِلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَوَجَدْتُهَا تُصَلِّي فَأَشَارَتْ إِلَيَّ أَنْ ضَعِيهَا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَأَكَلَتْ مِنْهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَتْ أَكَلَتْ مِنْ حَيْثُ أَكَلَتِ الْهِرَّةُ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ). وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِهَا.

واتە: لە داودی کوڕی ساڵحی کوڕی دیناری تەممارەوە، لە دایکیەوە دەگێڕنەوە، کە بە خزمەتکارکەیدا چێشتی گەنمە کوتراوی بە گۆشتەوە نارد بۆ خاتوو عائیشە رەزای خوای لێ بێ، ئەویش لەوکاتەدا نوێژی دەکرد ئاماژەی بۆ کرد کە دایبنێ ئەویش داینا، پشیلەیە هات لێی خواردەوە کاتێك کە

خزمەتکارەکە پشتی هەڵکرد خاتوو عائیشەش لێی خواردەوەو وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پشیلە پیس نیە بەڵکو لەوانەیە کە زۆر هاتوچۆتان دەکەن). بێگومان پێغەمبەری خودام صلی الله علیه وسلم دیوە بە بەرماوەی پیشیلە دستنوێژی گرتووە.

## باسی دەستنوێژ گرتن بە بەرماوەی ئاوی (دەستنوێژی) ئافرەت

## ٣٩ – بَابُ الْوُضُوءِ بِفَضْلِ ﴿وَضُوءِ﴾ الْمَرْأَةِ.

| |
|---|
| ٧٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَنَحْنُ جُنُبَانِ. |

واتە: لە خاتوو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دەفرێکدا پێکەوە خۆمان شت، لەکاتێکدا کە هەردووکمان لەشگران بووین.

| |
|---|
| ٧٨ - (حسن صحيح) عَنْ أُمِّ صُبَيَّةَ الْجُهَنِيَّةِ، قَالَتِ: اخْتَلَفَتْ يَدِي وَيَدُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْوُضُوءِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ. |

واتە: لە (أُمِّ صُبَيَّةَ الْجُهَنِيَّة)ەوە – واتە لە خولەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە پێکەوە دەفرێکدا دەستنوێژمان گرت، جارێ ئەو لەپێشەوە مشتێ ئاوی دەردەهێنا جارێ من لەپێشەوە مشتێ ئاوم دەردەهێنا.

**٧٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ مُسَدَّدٌ - مِنَ الإِنَاءِ الْوَاحِدِ جَمِيعًا.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم پیاوان و ئافرەتان پێکەوە دەستنوێژیان دەگرت - موسەددەد وتی- هەموویان پێکەوە لە دەفرێکدا دەستنوێژیان دەگرت.

**٨٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: كُنَّا نَتَوَضَّأُ نَحْنُ وَالنِّسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ نُدْلِي فِيهِ أَيْدِيَنَا.**

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ئێمە و ئافرەتان پێکەوە لە دەفرێکدا دەستنوێژمان دەگرت بەدەست ئاومان لێ هەڵئەگۆزی وەك چۆن بە دۆڵچە ئاو لەبیر هەڵئەگۆزرێت.

## باسی نەهی کردن لەو کارە.

## ٤٠ – بَابُ النَّهْيِ عَنْ ذَلِكَ.

٨١ - (صحيح) عَنْ حُمَيْدٍ الْحِمْيَرِيِّ، قَالَ: لَقِيتُ رَجُلاً صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعَ سِنِينَ كَمَا صَحِبَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَغْتَسِلَ الْمَرْأَةُ بِفَضْلِ الرَّجُلِ، أَوْ يَغْتَسِلَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ الْمَرْأَةِ - زَادَ مُسَدَّدٌ - وَلْيَغْتَرِفَا جَمِيعًا.

واتە: لە حومەیدی حیمیەریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گەیشتم بە پیاوێك چوار ساڵ هاوەڵێتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کردبوو وەك چۆن ئەبو هورەیرە هاوەڵێتی کردبوو، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە پیاو بە پاشماوەی ئاوی خۆشوشتنی ئافرەت خۆی بشوات، وە ئافرەتیش بە پاشماوەی ئاوی خۆشوشتنی پیاو خۆی بشوات - موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کردووە – هەروەها پێکەوە ئاو هەڵگۆزن.

٨٢ - (صحيح) عَنِ الْحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يَتَوَضَّأَ الرَّجُلُ بِفَضْلِ طَهُورِ الْمَرْأَةِ.

واتـه: لـه حەكـەمی كـوڕی عـەمرەوه هـاتووه، كـه پێغـەمبـەر صلى الله عليـه وسلم نەهی كردووه لەوەی كه پیـاو دەسـتنوێژ بگرێـت بـه ئاوێـك كـه ئـافرەت خۆی پێ شۆردبێت یان دەستنوێژی لێ گرتبێت.

## باسی دەستنوێژ گرتن بە ئاوی دەریا.

## ٤١ – بَابُ الْوُضُوءِ بِمَاءِ الْبَحْرِ

٨٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ).

واتـه: لـه ئـەبو هـورەیرەوه هـاتووه، كـه وتویـەتی: پیاوێـك پرسـیاری لـه پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسلم ئێمه بەناو دەریادا دەڕۆین، ئاوی ڕەوانی كەم لەگەڵ خۆمان هەڵئەگرین، جا ئەگەر بەو ئاوه دەستنوێژ بگرین تینو دەبین، ئایا بە ئاوی دەریا دەسـتنوێژ بگـرین؟ پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم فـەرمووی: (دەریـا ئاوەكـەی پاكژكەرەوەیەو مرداربووەكانیشی حەڵاڵە).

## باسی دەستنوێژ گرتن بە شەراب.

## ٤٢ – بَابُ الْوُضُوءِ بِالنَّبِيذِ.

٨٤ - (ضعيف) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ لَيْلَةَ الْجِنِّ (مَا فِي إِدَاوَتِكَ )؟ قَالَ: نَبِيذٌ. قَالَ: (تَمْرَةٌ طَيِّبَةٌ وَمَاءٌ طَهُورٌ).

// المشكاة (٤٨٠ ) //.

واتە: لە (عبدالله)ی كوڕی مەسعودەوە هاتووە، كە وتویەتی: ئەو شەوەی كە جنۆكەكان وەك نوێنەر هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (جەوەنەكەت چی تێدایە)؟ وتم: شەراب، فەرمووی: (شەراب شتێك نیە ئیللا خورمایەكی پاك و ئاوێكی پاك كەرەوە نەبێت).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ شَرِيكٌ: وَلَمْ يَذْكُرْ هَنَّادٌ لَيْلَةَ الْجِنِّ.

ئەبو داود دەڵێت: (شَرِيك) وتی: (هَنَّاد) باسی شەوی جنۆكەكانی نەكرد.

٨٥ - (صحيح) عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ فَقَالَ: مَا كَانَ مَعَهُ مِنَّا أَحَدٌ.

واتە: لە عەلقەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوتم بە (عبداللە)ی کوڕی مەسعود کێ لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بوو ئەو شەوەی کە نوێنەری جنۆکەکان هاتن بۆ خزمەتی؟ وتی: کەسمان لەگەڵ نەبوو.

٨٦ - (صحيح) عَنْ عَطَاءٍ: أَنَّهُ كَرِهَ الْوُضُوءَ بِاللَّبَنِ وَالنَّبِيذِ، وَقَالَ: إِنَّ التَّيَمُّمَ أَعْجَبُ إِلَيَّ مِنْهُ.

واتە: لە (عَطَاءٍ)ەوە هاتووە، کە دەستنوێژگرتنی بەشیرو بەشەراب بەلاوە ناخۆش بووە، عَطَاء وتی: لەکاتی نەبوونی ئاودا تەیەمومم بەلاوە خۆشترە لەوەی کە بە شیر و شەراب دەستنوێژ بگرم.

٨٧ - (صحيح) عَنْ أَبُو خَلْدَة، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا الْعَالِيَةِ عَنْ رَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَنَابَةٌ وَلَيْسَ عِنْدَهُ مَاءٌ وَعِنْدَهُ نَبِيذٌ، أَيَغْتَسِلُ بِهِ؟ قَالَ: لاَ.

واتە: لە ئەبو خەلدەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بە کەسێك ئەگەر توشی لەشگرانی هات و ئاوی دەست نەکەوت بەڵام شەرابی پێ بوو؟ لە ئەبا عالیەم پرسی کە ئایا دروستە خۆی پێ بشوات یان نا؟ ئەویش وتی: نەخێر دروست نیە.

# باسی ئایا كەسێك نوێژ بكات لەكاتێكدا كە تەنگاو بێت ؟

## ٤٣ - بَابُ أَيُصَلِّى الرَّجُلُ وَهُوَ حَاقِنٌ؟

٨٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ الأَرْقَمِ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجًّا - أَوْ مُعْتَمِرًا - وَمَعَهُ النَّاسُ وَهُوَ يَؤُمُّهُمْ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَقَامَ الصَّلاَةَ صَلاَةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ قَالَ: لِيَتَقَدَّمْ أَحَدُكُمْ، - وَذَهَبَ إِلَى الْخَلاَءِ - فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَذْهَبَ الْخَلاَءَ وَقَامَتِ الصَّلاَةُ فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلاَءِ).

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی ئەرقەمەوە هاتووە، كە جارێكیان دەچوو بۆ حەج یان بۆ عەمرە كۆمەڵێ خەڵكی لەگەڵ بوو پێشنوێژی بۆ دەكردن، رۆژێكیان بۆ نوێژی بەیانی قامەتیان بۆ كرد، پاشان وتی: با یەكێكتان بچێتە پێشەوە بەرنوێژی بكات. خۆی چوو بۆ سەرئاو. كە هاتەوە وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی اللە علیە وسلم بیستووە دەیفەرموو: (كاتێ كە قامەت كرا بۆ نوێژ ئەگەر كەسێك لە ئێوە دەستی ئاوی هەبوو با بچێت دەست بەئاو بگەیەنێت).

٨٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ - قَالَ ابْنُ عِيسَى فِي حَدِيثِهِ: ابْنُ أَبِي بَكْرٍ ثُمَّ اتَّفَقُوا - أَخُو الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَائِشَةَ فَجِيءَ بِطَعَامِهَا فَقَامَ الْقَاسِمُ يُصَلِّي فَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يُصَلَّى بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ، وَلاَ وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ ).

واته: (عبدالله)ی كوڕی موحەممەد – ئیبنو عیسا لە فەرموودەكەیدا وتی: كوڕی ئەبو بەكر پاشان هەماهەنگن لەسەرئەوەی - برای قاسمی كوڕی موحەممەد، وتی: جارێك لە خزمەت خاتوو عائیشەدا بووین نانیان بۆ هێنان قاسم هەستا ویستی نوێژ بكات، عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: كەس كاتی ئامادەبوونی خواردن نوێژ نەكات، وە لە كاتێكیش دا كە تەنگاوە بە میز و پیسی.

٩٠ - (ضعيف) عَنْ ثَوْبَانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ثَلاَثٌ لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ أَنْ يَفْعَلَهُنَّ: لاَ يَؤُمُّ رَجُلٌ قَوْمًا فَيَخُصُّ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَهُمْ، فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ خَانَهُمْ، وَلاَ يَنْظُرُ فِي قَعْرِ بَيْتٍ قَبْلَ أَنْ يَسْتَأْذِنَ فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ دَخَلَ، وَلاَ يُصَلِّي وَهُوَ حَقِنٌ حَتَّى يَتَخَفَّفَ ).

// ضعيف الجامع الصغير (٢٥٦٥ )، المشكاة (١٠٧٠ ) //.

واتە: لە (ثوبـان)ەوە دەگێڕنـەوە، كە وتويـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله عليه وسلم فەرموويەتی: سێ شت ڕەوا نيـە بكرێـت لەلايـەن هـيچ كەسـێكەوە: نابێت پياوێك بەرنوێژی بۆ كۆمەڵێك بكات و تەنها بۆ خۆی بپاڕێتەوە، ئەگەر كردی ئەوە خيانـەتی لـێ كـردوون، نابێـت كـەس سـەيری ناومـاڵێ بكـات پـێش ئەوەی داوای مۆڵەت بكات و ڕێـی پـێ بـدەن، ئەگـەر كـردی ئـەوە بـەبێ پـرس چووەتە ماڵەوە، وە كەسێك كە تەنگاو بێت نابێت نوێژ بكات هەتا خۆی خـاڵی نەكاتەوە.

٩١ - (صحيح إلا جملة الـدعْوَةِ) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: (لاَ يَحِـلُّ لِرَجُـلٍ يُـؤْمِنُ بِاللَّـهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يُصَلِّىَ وَهُوَ حَقِنٌ حَتَّى يَتَخَفَّفَ ). ثُـمَّ سَاقَ نَحْوَهُ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ، قَـالَ: (وَلاَ يَحِـلُّ لِرَجُـلٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَؤُمَّ قَوْمًا إِلاَّ بِإِذْنِهِمْ، وَلاَ يَخْتَصَّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ خَانَهُمْ ).

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە دەگێڕنـەوە، كە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله عليـە وسلم فەرموويەتی: (ڕەوا نيـە بـۆ كەسـێك كـە بـاوەڕی بـەخواو بـەڕۆژی دوايـی هەبێت نوێژ بكات لەكاتێكدا كە تەنگاو بێت هەتا خۆی خاڵی نەكاتەوە). پاشان بەم گۆ(لفـظ)ەش هـاتووە، كـە دەفـەرموێت: (ڕەوا نيـە بـۆ كەسـێك كـە بـاوەڕی بـەخواو بـەڕۆژی دوايـی هـەبێت پێشـنوێژی بـۆ كۆمـەڵێك بكـات بـەبێ ئـەوەی ڕێيان پێدابێت، وە بە تەنها بۆ خۆی بپاڕێتەوەو بۆ ئـەوان نەپاڕێتـەوە، ئەگـەر كردی ئەوە خيانەتی لێكردوون).

## باسی چەندە ئاو بەسە بۆ دەستنوێژ

## ٤٤ – بَابُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الْمَاءِ فِي الْوُضُوءِ

٩٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، وَيَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە (صاع)ێك خۆی دەشت و بە مووددێك دەستنوێژی دەگرت.

٩٣ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، وَيَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ.

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە (صاع)ێك خۆی دەشت و بە مووددێك دەستنوێژی دەگرت.

٩٤ - (صحيح) عَنْ حَبِيبٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ، عَنْ جَدَّتِهِ - وَهِيَ أُمُّ عُمَارَةَ -: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ فَأُتِيَ بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ قَدْرُ ثُلُثَيِ الْمُدِّ.

واتە: حەبیبی (أَنْصَارِىّ) وتی: بیستم لە عەببادی كوڕی تەمیم، ئەویش لە دایكیەوە - (أُمُّ عُمَارَةَ) - : كە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم ویستی دەستنوێژ بگرێت لە دەفرێكدا بە ئەندازەی دووبەش لەسێ بەشی موددێك ئاویان بۆ هێنا.

| |
|---|
| ٩٥ - (ضعيف) عَنْ أَنَسٍ، قَالَ:كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ بِإِنَاءٍ يَسَعُ رَطْلَيْنِ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ. |

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بە دوو ڕەتڵ ئاو دەستنوێژی دەگرت و بە (صاع)ێكیش خۆی دەشت[1].

(صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ جَبْرٍ سَمِعْتُ أَنَسًا إِلاَّ أَنَّهُ ، قَالَ: يَتَوَضَّأُ بِمَكُّوكٍ. وَلَمْ يَذْكُرْ رَطْلَيْنِ.

واتە: لە(عبداللە)ی كوڕی جەبرەوە هاتووە، كە وتویەتی: بیستم لە ئەنەس وتی: پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم بە جام(مكوك)ێك ئاو دەستنوێژی دەگرت، دوو ڕەتڵی باس نەكرد.

قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: الصَّاعُ خَمْسَةُ أَرْطَالٍ، قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ صَاعُ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، وَهُوَ صَاعُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

---

[1] - ڕەتڵێك یەكسانە بە ١٢ أوقیە وە یەكسانە بە ٢٥٦٤ غرام- فەرهەنگی شیرینی نوێ.

ئەبو داود دەڵێت: بیستم لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەیوت: پێنج ڕەتڵ (صاع)ێكە، ئەبو داود وتی: ئەویش (صاع)ی ئیبنو ئەبی (ذئب)ە، كە (صاع)ی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بووە.

## باسی زیاد بەكارهێنانی ئاو لە دەستنوێژگرتندا.

## ٤٥ – بَابُ الإِسْرَافِ فِي الْوَضُوءِ.

٩٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي نَعَامَةَ: أَنَّ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ سَمِعَ ابْنَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلْتُهَا، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ، سَلِ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَتَعَوَّذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطُّهُورِ وَالدُّعَاءِ ).

واتە: لە (أَبِي نَعَامَةَ)ەوە هاتووە، كە (عبدالله)ی كوڕی موغەففەل گوێی لێ بووە كوڕەكەی دەیوت: خودایە داوای كۆشكە سپیەكەی لای ڕاستی بەهەشتت لێ دەكەم ئەگەر چوومە بەهەشتەوە، وتی: كوڕی خۆم داوای بەهەشت بكە لە خواو، پەنای پێ بگرە لە ئاگری دۆزەخ، چونكە من لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (لەم ئوممەتەی مندا كۆمەڵێك پەیدا دەبن لە ئاوی دەستنوێژو لە پاڕانەوەدا زیادەڕەوی دەكەن).

## باسی دەستنوێژ گرتن بەتەوای و بە باشی.

## ٤٦ – بَابُ فِي إِسْبَاغِ الْوَضُوءِ.

| |
|---|
| ٩٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى قَوْمًا وَأَعْقَابُهُمْ تَلُوحُ فَقَالَ:(وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ، أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ ). |

واتە: لە(عبداللە)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆمەڵێکی بینی پاژنەی پێیان ئاوی بەرنەکەوتبوو فەرمووی: (ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان، دەستنوێژێکی پاك و تەواو بگرن و هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژ بە باشی بشۆن.

## باسی دەستنوێژ گرتن لە دەفری مس دا.

## ٤٧ – بَابُ الْوُضُوءِ فِي آنِيَةِ الصُّفْرِ.

| |
|---|
| ٩٨ - (صحيح) عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي تَوْرٍ مِنْ شَبَهٍ. |

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروەوە هاتووە، كە خاتوو عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتویەتی: من و پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم پێكەوە خۆمان شت لە (تَوْرٍ)ێكی مس دا- ئیبنو حەجەر لە (هدى السارى)دا دەڵێت: (تَوْرٍ) دەفرێكە لەبەرد یان غەیری بەرد وەك مەنجەڵ وایە، وە لە(فتح الباري)دا دەڵێت: لە تەشت دەچێت، وە دەڵێن تەشتە - .

٩٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: خاتوو عائیشە رەزای خوای لێ بێ بە هەمان شێوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم گێڕاویەتیەوە.

١٠٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ زَيْدٍ ، قَالَ: جَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ فَتَوَضَّأَ.

واتە: لە(عبدالله)ی كوڕی زەیدەوە هاتووە، كە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم هات بۆ لامان ئێمەش لە جامۆلكەیەكی مس دا هەندێ ئاومان بۆ هێنا دەستنوێژی پێ گرت.

## باسی وتنی: (بسم الله) لەسەرەتای دەستنوێژەوە.

## ٤٨ – بَابُ التَّسْمِيَةِ عَلَى الْوُضُوءِ.

١٠١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لاَ وُضُوءَ لَهُ، وَلاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ﴿تَعَالَى﴾ عَلَيْهِ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: نوێژ بۆ کەسێك نیە کە دەستنوێژی نەبێت، هەروەها کەسێکیش لەسەرەتاوە (بسم الله)ی نەکردبێت دەستنوێژی نیە.

١٠٢ - (صحيح مقطوع) عَنِ الدَّرَاوَرْدِيِّ، قَالَ: وَذَكَرَ رَبِيعَةُ أَنَّ تَفْسِيرَ حَدِيثِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ). أَنَّهُ الَّذِي يَتَوَضَّأُ وَيَغْتَسِلُ، وَلاَ يَنْوِي وُضُوءًا لِلصَّلاَةِ، وَلاَ غُسْلاً لِلْجَنَابَةِ.

واتە: لە (الدَّرَاوَرْدِي)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: رەبیعە دەڵێت: تەفسیری ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: (لاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ

اللّٰهِ عَلَيْهِ). مەبەست لە كەسێكە كاتێ كە دەستنوێژ دەگرێت بۆ نوێژكردن نیەت ناهێنێ، هەروەها كاتێ كە خۆشی دەشوات بۆ لەشگرانی نیەت ناهێنێت.

## باسی كەسێك دەستی بخاتە ناو دەفری ئاوەوە پێش ئەوەی بیشوات

## ٤٩ – بَابُ فِي الرَّجُلِ يُدْخِلُ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهَا.

١٠٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ" فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر یەكێكتان لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەوە كە ئاوی تێدایە و بەكاری دەهێنێ، هەتا سێ جار دەستی نەشوات، چونكە نازانێ دەستی بەركوێ كەوتووە كاتێك كە لە خەودا بووە.

١٠٤ - (صحيح والأكثر على الثلاث) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِى بِهَذَا الْحَدِيثِ- قَالَ: مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا.

واتە: ئەبو هورەیرە لەریوایەتێکی تردا بە هەمان شێوە ئەم فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوە، بەڵام بە: (هەتا دوو جار یان سێ جار دەستی نەشوات).

١٠٥ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلاَ يُدْخِلْ يَدَهُ فِى الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِى أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ) أَوْ (أَيْنَ كَانَتْ تَطُوفُ يَدُهُ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەستا بادەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەوە کە ئاوی تێدایە و بەکاری دەهێنێ، هەتا سێ جار دەستی نەشوات، چونکە نازانێ دەستی بەرکوێ کەوتووە، یان دەستی گێڕاوە و بەر چی شتێکی پیس کەوتووە کاتێك لە خەودا بووە.

## باسی چۆنیەتی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

## ٥٠ – بَابُ صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

١٠٦ - (صحيح) عَنْ حُمْرَانَ بْنِ أَبَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ، قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ تَوَضَّأَ: فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ ثَلاَثًا فَغَسَلَهُمَا ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا ، وَغَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلاَثًا ، ثُمَّ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى ثَلاَثًا ، ثُمَّ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضُوئِي هَذَا ، ثُمَّ قَالَ: (مَنْ تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضُوئِي هَذَا ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).

واتە: لە حومرانی کوڕی ئەبانی (مَوْلَى)ی (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانم بینی بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: دەستەکانی سێ جار شت، سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی رادا، سێ جار دەم وچاوی شت، پاشان دەستی راستی هەتا

ئانیشکی سێ جار شوشت، دەستی چەپیشی بە هەمان شێوە، ئینجا مەسحی سەری کرد، پاشان پێی راستی تا قولەپێی سێ جار شت، پێی چەپیشی بە هەمان شێوە، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە دەستنوێژێکی وەك ئەم دەستنوێژەی منی گرت، پاشان فەرمووی: (هەرکەسێ دەستنوێژ وەك ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات دالّغە لێ نەدات لە نوێژەکەدا واتە بەخشوعەوە نوێژەکەی بکات، خوا لە هەموو گوناهەکانی رابردووی دەبورێت.

١٠٧ - (حسن صحيح) عَنْ حُمْرَان، قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ تَوَضَّأَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرِ الْمَضْمَضَةَ وَالاِسْتِنْشَاقَ، وَقَالَ فِيهِ: وَمَسَحَ رَأْسَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ هَكَذَا، وَقَالَ: (مَنْ تَوَضَّأَ دُونَ هَذَا كَفَاهُ). وَلَمْ يَذْكُرْ أَمْرَ الصَّلاَةِ.

واتە: حومران دەڵێت: پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانم رەزای خوای لێ بێ بینی دەستنوێژی گرت: بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە، بەلاّم باسی ئاو لە دەم و لوت رادانی نەکرد، وە لە فەرموودەکەیدا وتی: سێ جار مەسحی سەری کرد، پاشان هەردوو پێی هەتا قولەپێی سێ جار شت، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە بەم شێوەیە دەستنوێژێکی گرت، پاشان فەرمووی: (هەرکەسێك ئەندامەکانی دەستنوێژ جارێ یان دوو جاریش بشوات ئەوە بەسیەتی و دەستنوێژەکەی دروستە). بەلاّم باسی ئەوەی نەکرد کە پاشان دوو رکات نوێژ بکات.

١٠٨ - (حسن صحيح) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنِ الْوُضُوءِ؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ سُئِلَ عَنِ الْوُضُوءِ، فَدَعَا بِمَاءٍ، فَأُتِيَ بِمِيضَأَةٍ فَأَصْغَى عَلَى يَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ أَدْخَلَهَا فِي الْمَاءِ، فَتَمَضْمَضَ ثَلاَثًا، وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثًا، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى ثَلاَثًا، وَغَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى ثَلاَثًا ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَأَخَذَ مَاءً فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ، فَغَسَلَ بُطُونَهُمَا وَظُهُورَهُمَا مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُونَ عَنِ الْوُضُوءِ؟ هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ.

واتە: لە (عُثْمَان)ى كورِى (عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيّ)ەوە هاتووە، كە وتويەتى: سەبارەت بە دەستنوێژگرتن لە ئیبنو ئەبی مولەیكەیان پرسی؟ وتی: (عُثْمَان)ى كورِى عەففانم رەزاى خواى لێ بێ بینی دەربارەى دەستنوێژگرتن لێیان پرسی، ئەویش داواى ئاوى كرد لە دەفرێكدا ئاویان بۆ هێنا، لارى كردەوەو دەستی راستی شت، پاشان دەستی خستە ناو دەفرەكەو سێ جار ئاوى لە دەم و لوتی رادا، سێ جار دەم و چاوى شت، دەستی راستی سێ جار شت و دەستی چەپیشی سێ جار شت، پاشان دەستی خستە ناو دەفرەكەو مەسحی سەر و گوێكانی كرد و یەك جار دەرەوە و ناوەوەى گوێكانی شت، ئینجا هەردوو پێی هەتا قولەپێكانی سێ جار شت، پاشان وتی: كوان ئەوانەى كە پرسیان دەربارەى

دەستنوێژ کرد؟ من بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت.

قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: أَحَادِيثُ عُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ الصِّحَاحُ كُلُّهَا تَدُلُّ عَلَى مَسْحِ الرَّأْسِ أَنَّهُ مَرَّةٌ، فَإِنَّهُمْ ذَكَرُوا الْوُضُوءَ ثَلاَثًا، وَقَالُوا فِيهَا: وَمَسَحَ رَأْسَهُ، وَلَمْ يَذْكُرُوا عَدَدًا كَمَا ذَكَرُوا فِي غَيْرِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکانی (عُثْمَان) رەزای خوای لێ بێ هەر هەموویان راست و دروستن و هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مەسحی سەر یەك جارە، چونکە راویەکان هەر هەموویان باسی سێ جار شوشتنی ئەندامەکانی تری دەستنوێژیان کردەوە، راویەکان وتیان: سەری مەسح کرد، بەڵام باسی ژمارەیان نەکرد، وەك چۆن بۆ ئەندامەکانی تر باسی ژمارەیان کردووە.

١٠٩ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ: أَنَّ عُثْمَانَ دَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، فَأَفْرَغَ بِيَدِهِ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، ثُمَّ غَسَلَهُمَا إِلَى الْكُوعَيْنِ، قَالَ: ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثًا، وَذَكَرَ الْوُضُوءَ ثَلاَثًا، قَالَ: وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ تَوَضَّأَ مِثْلَ مَا رَأَيْتُمُونِي تَوَضَّأْتُ. ثُمَّ سَاقَ نَحْوَ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ وَأَتَمَّ.

واتە: لە ئەبو عەلقەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عُثْمَان) ڕەزای خوای لێ بێ داوای ئاوی کرد لە دەفرێکدا ئاویان بۆ هێنا دەستی ڕاستی شت پاشان دەستی خستە ناو دەفرەکەو سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی رادا، سێ جار دەم وچاوی شت، دەستی ڕاستی سێ جار شت و دەستی چەپیشی سێ جار شت، پاشان دەستی خستە ناو دەفرەکەو مەسحی سەر و گوێکانی کرد و یەك جار دەرەوە و ناوەوەی گوێکانی شت، ئینجا هەردوو پێی هەتا قولەپێکانی سێ جار شت، پاشان وتی کوان ئەوانەی پرسیاریان کرد دەربارەی دەستنوێژ من بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت. پاشان بە تەواوی وەك فەرموودەکەی زوهری گێڕایەوە.

١١٠ - (حسن صحيح) عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ ، قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، وَمَسَحَ رَأْسَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ هَذَا.

واتە: لە شەقیقی کوڕی سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانم ڕەزای خوای لێ بێ بینی قۆڵەکانی سێ جار سێ جار شت و، سێ جار مەسحی سەری کرد، پاشان وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، قَالَ: تَوَضَّأَ ثَلاَثًا فَقَطْ.

ئەبو داود دەڵێت: وەکیع لە ئیسرائیلەوە ڕیوایەتی کردووە، وەکیع وتی: تەنها سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەستنوێژی دەشت.

١١١ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ ، قَالَ: أَتَانَا عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ وَقَدْ صَلَّى، فَدَعَا بِطَهُورٍ فَقُلْنَا: مَـا يَصْـنَعُ بِـالطَّهُورِ وَقَدْ صَلَّى؟ مَا يُرِيدُ إِلاَّ أَنْ يُعَلِّمَنَا، فَـأُتِيَ بِإِنَـاءٍ فِيـهِ مَاءٌ وَطَسْتٍ، فَأَفْرَغَ مِنَ الإِنَاءِ عَلَى يَمِينِهِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثًا، فَمَضْمَضَ وَنَثَرَ مِنَ الْكَفِّ الَّذِي يَأْخُذُ فِيهِ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى ثَلاَثًا، وَغَسَلَ يَدَهُ الشِّمَالَ ثَلاَثًا، ثُمَّ جَعَـلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى ثَلاَثًا، وَرِجْلَهُ الشِّمَالَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: مَنْ سَـرَّهُ أَنْ يَعْلَمَ وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهُـوَ هَذَا.

واته: له (عَبْدِ خَيْر)ەوه هاتووه، كه وتویەتی: پێشەوا عـەلی ڕەزای خـوای لـێ بێ هات بۆ لامان نوێژی كرد، داوای ئاوی كـرد وتمـان: دەیـەوێت فێرمـان بكـات لـه دەفرێكدا ئاویـان بـۆ هێنـاو تەشـتێكیش، بەدەفرەكـه ئـاوی كـرد بەدەسـتی ڕاستیداو سێ جار دەستەكانی شت، ئینجا سێ جار ئاوی له دەم و لوتی ڕادا، به دەستی ڕاستی ئاوی له دەم و لوتی وەرداو بەدەستی چەپی مشی كـردوو لـوتی پـاك كـردەوه، ئینجـا سـێ جـار دەم و چاوی شـت، پاشـان دەسـتی ڕاسـتی هـەتا ئەنیشكی سێ جار شت، وه دەستی چەپیشی هـەتا ئەنیشكی سێ جار شت، پاشان دەستی خسته ناو ئاوەكەو یـەك جـار مەسـحی سـەری كـرد، ئینجا پێـی ڕاستی سێ جار شت و پێی چەپیشی سێ جار شت، پاشان عەلی ڕەزای خوای لێ

بێ وتی: ئەوەی پێی خۆشە دەستنوێژی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فێر بێت دەستنوێژی ئەو بەم شێوەیە بوو.

١١٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ، قَالَ: صَلَّى عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ الْغَدَاةَ، ثُمَّ دَخَلَ الرَّحْبَةَ فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتَاهُ الْغُلاَمُ بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ وَطَسْتٍ، قَالَ: فَأَخَذَ الإِنَاءَ بِيَدِهِ الْيُمْنَى فَأَفْرَغَ عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، وَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فِي الإِنَاءِ فَتَمَضْمَضَ ثَلاَثًا وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثًا، ثُمَّ سَاقَ قَرِيبًا مِنْ حَدِيثِ أَبِي عَوَانَةَ، ﴿قَالَ:﴾ ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ مُقَدَّمَهُ وَمُؤَخَّرَهُ مَرَّةً، ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ نَحْوَهُ.

واتە: لە (عَبْدِ خَيْر)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ نوێژی بەیانی کرد، پاشان چووە (رَّحْبَة)ەوە - ناوی کۆڵانێکی کوفە بووە - داوای ئاوی کرد لە دەفرێکدا ئاویان بۆ هێناو، تەشتێکیش، وتی: بە دەستی ڕاستی ئاوی کرد بەدەستی چەپیدا سێ جار دەستەکانی شت، ئینجا دەستی ڕاستی خستە ناو ئاوەکەو سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا، پاشان نزیك لە فەرمودەکەی ئەبو عەوانە فەرمودەکەی گێڕایەوە، واتە نزیك لە فەرمودەکەی پێشوو، وتی: پاشان یەك جار لە بەشی پێشەوەی سەری هەتا بەشی دواوەی مەسح کرد، ئینجا فەرمودەکەی بە شێوەی فەرمودەکەی ئەبو عەوانە گێڕاوە.

١١٣ - (صحيح) عَبْدِ خَيْرٍ ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أُتِيَ بِكُرْسِيّ فَقَعَدَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أُتِيَ بِكُوزٍ مِنْ مَاءٍ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ مَعَ الاِسْتِنْشَاقِ بِمَاءٍ وَاحِدٍ، وَذَكَرَ ﴿هَذَا﴾ الْحَدِيثَ.

واتە: لە عەبدی خەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێشەوا عەلیم ڕەزای خوای لێ بێ بینی كورسیەكیان بۆ هێنا لەسەری دانیشت، پاشان گۆزەیەك ئاویان بۆ هێنا سێ جار دەستەكانی شت، ئینجا بە یەك مشت ئاو ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا و، ڕاوی فەرموده‌كەی بە شێوەی فەرمودەی پێشوو گێڕاوە.

١١٤ - (صحيح) عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَسُئِلَ عَنْ وُضُوءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: وَمَسَحَ ﴿عَلَى﴾ رَأْسِهِ حَتَّى لَمَّا يَقْطُرْ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (زِرّ)ی كوڕی حوبەیشەوە هاتووە، كە گوێی لە پێشەوا عەلی بووە ڕەزای خوای لێ بێ كاتێ كە سەبارەت بە دەستنوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێیان پرسی؟ جا (زِرّ) بەتەواوی فەرمودەكەی پێشوی گێڕایەوەو، وتی: مەسحی سەری كرد بەڵام ئاوی لێ نەچۆڕا – ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە یەك جار مەسحی كردووە چونكە ئەگەر سێ جار بوایە ئاوی لێ دەچۆڕا - ، وە

هەردوو پێی سێ جار شت، پاشان پێشەوا عەلی وتی: دەستنوێژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە بوو.

١١٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى لَيْلَى ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ تَوَضَّأَ: فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلاَثًا ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَاحِدَةً، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدِ الرَّحْمَن)ی کوڕی ئەبو لەیلاوە هاتووە، کە وتویەتی: عەلیم رەزای خوای لێ بێ بینیوە بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: سێ جار دەم وچاوی شت، هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکی شت، وە یەك جار مەسحی سەری کرد، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە دەستنوێژی دەگرت.

١١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى حَيَّةَ ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ تَوَضَّأَ، فَذَكَرَ وُضُوءَهُ كُلَّهُ ثَلاَثًا ثَلاَثًا ، قَالَ: ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا أَحْبَبْتُ أَنْ أُرِيَكُمْ طُهُورَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: (أَبِی حَیَّة) دەڵێت: پێشەوا عەلیم رەزای خوای لێ بێ بینی بەم شێوەیە دەستنوێژی گرت: فەرموودەکەی بە تەواوی باسکرد هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژی سێ جار سێ جار شت، - وتی- : جا مەسحی سەری

كرد، پاشان هەردوو پێی هەتا قولەپێكانی سێ جار شت، ئینجا وتی: بێگومان پێم خۆش بوو كە چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خواتان صلى الله عليه وسلم فێر بكەم.

١١٧ - (حسن) عَنِ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: دَخَلَ عَلَىَّ عَلِىٌّ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ - يَعني ابنَ أبي طالبٍ - وَقَدْ أَهْرَاقَ الْمَاءَ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ، فَأَتَيْنَاهُ بِتَوْرٍ فِيهِ مَاءٌ حَتَّى وَضَعْنَاهُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ أَلاَ أُرِيكَ كَيْفَ كَانَ يَتَوَضَّأُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قُلْتُ بَلَى، قَالَ: فَأَصْغَى الإِنَاءَ عَلَى يَدِهِ فَغَسَلَهَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فَأَفْرَغَ بِهَا عَلَى الأُخْرَى، ثُمَّ غَسَلَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَيْهِ فِى الإِنَاءِ جَمِيعًا فَأَخَذَ بِهِمَا حَفْنَةً مِنْ مَاءٍ فَضَرَبَ بِهَا عَلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ أَلْقَمَ إِبْهَامَيْهِ مَا أَقْبَلَ مِنْ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ الثَّالِثَةَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَخَذَ بِكَفِّهِ الْيُمْنَى قَبْضَةً مِنْ مَاءٍ فَصَبَّهَا عَلَى نَاصِيَتِهِ فَتَرَكَهَا تَسْتَنُّ عَلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ وَظُهُورَ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَيْهِ جَمِيعًا فَأَخَذَ حَفْنَةً مِنْ مَاءٍ فَضَرَبَ بِهَا عَلَى رِجْلِهِ وَفِيهَا النَّعْلُ فَفَتَلَهَا

بِهَا، ثُمَّ الأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: قُلْتُ وَفِي النَّعْلَيْنِ، قَالَ: وَفِي النَّعْلَيْنِ، قَالَ: قُلْتُ وَفِي النَّعْلَيْنِ، قَالَ: وَفِي النَّعْلَيْنِ، قَالَ: قُلْتُ وَفِي النَّعْلَيْنِ ، قَالَ: وَفِي النَّعْلَيْنِ.

واته: له ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ لام دەستی بە ئاو گەیاندبوو دەستنوێژی نەبوو، داوای ئاوی کرد بۆ ئەوەی دەستنوێژی پێ بگرێت لە جامۆڵکەیەکی مس دا هەندێ ئاومان بۆ هێناو خستمانە بەردەستی وتی: ئەی ئیبنو عەباس دەتەوێت چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خودات صلى الله عليه وسلم نیشان بدەم؟ وتم: بەڵێ، وتی: جامولکەکەی لار کردەوەو دەستی شت ئینجا دەستی ڕاستی خستە ناو جامولکەکەو ئاوی کرد بە دەستەکەی تریدا، پاشان دەستەکانی شت، ئینجا ئاوی لە دەم و لوتی ڕادا، پاشان دەستەکانی خستەوە ناو دەفرەکە پڕی هەردوو مشتەکەی ئاوی دەرهێناو دای بە بەدەم و چاویدا، ئینجا سەری پەنجەی خستەناو گوێکانیەوەو مەسحی کرد، پاشان بەهەمان شێوە دووبارەو سێ بارەی کردەوە، پاشان بە دەستی ڕاستی هەندێ ئاوی هەلگرت و کردی نێوچاوانیدا چۆڕاوگەی ئاوەکە بە نێوچاوانیدا دەهاتە خوارەوە، ئینجا هەردوو باڵی هەتا ئەنیشکی ی سێ جار شوشت، پاشان دەستی خستە ناو ئاوەکەو یەك جار مەسحی سەری و دەرەوەی گوێکانی کرد، پاشان دەستەکانی خستەوە ناو دەفرەکە پڕی هەردوو مشتەکەی ئاوی دەرهێناو دای بە پێیدا نەعلی لەپێدا بوو بەو ئاوە سەر و ژێری نەعلەکانی بۆ پێشەوە و بۆ دواوە دەجولاند، ئینجا ئەو پێکەشی بەهەمان شێوە، وتی: گوتم هەردوو نەعلەکەی؟ وتی: هەردوو نەعلەکەی، گوتم هەردوو نەعلەکەی؟ وتی: هەردوو نەعلەکەی، گوتم هەردوو نەعلەکەی؟ وتی: هەردوو نەعلەکەی.

(صحيح) قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ شَيْبَةَ، يُشْبِهُ حَدِيثَ عَلِيّ لأَنَّهُ قَالَ فِيهِ حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ: عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّةً وَاحِدَةً.

ئەبو داود دەڵێت: وە فەرموودەی ئیبنو جورەیج، لە شەیبەوە، لە فەرموودەکەی پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دەچێت، چونکە حەجاجی کوڕی موحەممەد تێیدا وتویەتی: لە ئیبنو جورەیجەوە هاتووە، کە یەك جار مەسحی سەری کرد.

(شاذ) وَقَالَ ابْنُ وَهْبٍ فِيهِ: عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ ثَلاَثًا.

ئیبنو وهەب لە فەرموودەکەیدا دەڵێت: لە ئیبنو جورەیجەوە هاتووە، کە سێ جار مەسحی سەری کرد.

١١٨ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: لِعَبْدُ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ - وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى ﴿الْمَازِنِيِّ﴾ - هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ: نَعَمْ. فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ بَدَأَ

بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازنیەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: بە (عبداللە)ی کوڕی زەیدی کوڕی (عَاصِم)یان وت - کە دەکاتە باپیری عەمری کوڕی یەحیای مازنی - : ئایا دەتوانیت چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەری خودامان صلی الله علیه وسلم نیشان بدەیت؟ (عبداللە)ی کوڕی زەید وتی: بەڵێ، داوای ئاوی کرد ئاومان بۆ هێنا ئاوی کرد بە دەستیداو دەستەکانی شت، ئینجا سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی رادا، پاشان سێ جار دەم و چاوی شت، پاشان هەردوو دەستی هەتا ئەنیشکی دوو جار دووجار شت، ئینجا مەسحی سەری کرد بە هەردوو دەستی ئەیهێنان و ئەیبردن لەپێشی سەریەوە هەردوو دەستی ئەهێنا هەتا پشتی سەری و لەپاشاندا دەستی دەگێڕایەوە هەتا دەگەیشتە ئەو شوێنەی مەسحەکەی لێوە دەست پێکردبوو، ئینجا هەردوو پێی هەتا قولەپێکانی شت.

١١٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثًا. ثُمَّ ذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: (عبداللە)ی کوڕی زەید کوڕی (عَاصِمٍ)یش ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وتی: بە دەستێکی سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی رادا، پاشان بەهەمان شێوە فەرموودەکەی پێشوی گێڕایەوە.

١٢٠ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، أَنَّ حَبَّانَ بْنَ وَاسِعٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الْمَازِنِيَّ يَذْكُرُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ وُضُوءَهُ وَقَالَ: وَمَسَحَ رَأْسَهُ بِمَاءٍ غَيْرِ فَضْلِ يَدَيْهِ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ حَتَّى أَنْقَاهُمَا.

واتە: لە عەمری کوڕی (حَارِث)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: حەبانی کوڕی واسع بۆی گێڕامەوە، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە، لە (عبدالله)ی کوڕی زەیدی کوڕی (عَاصِم)ی مازنی بیستووە کە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بینیوە .. باسی چۆنیەتی دەسنوێژەکەی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم کردو وتی: بە ئاوی تازە مەسحی سەری دەکردەوە نەك بە بەرماوەی ئاوی دەستەکانی، وە هەردوو پێی شت هەتا خاوێنی کردنەوە.

١٢١ - (صحيح) عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَيْسَرَةَ الْحَضْرَمِيُّ، سَمِعْتُ الْمِقْدَامَ بْنَ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثًا، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا.

واتە: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی (مَيْسَرَةَ الْحَضْرَمِيُّ) دەڵێت: لە (مِقْدَام)ی كوڕی (مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ)م بیستووه دەیوت: ئاویان هێنا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەسنوێژی پێ بگرێت ئەویش بەم شێوەیە دەسنوێژی گرت: سێ جار دەستەكانی شت، پاشان سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی رادا، ئینجا سێ جار دەم وچاوی شت، پاشان سێ جار سێ جار دەستەكانی هەتا ئەنیشكی شت، ئینجا سێ جار مەسحی سەری كرد لەگەڵ دەرەوەو ناوەوەی گوێكانی.

١٢٢ - (صحيح) عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِ يكَرِبَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ، فَلَمَّا بَلَغَ مَسْحَ رَأْسِهِ وَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى مُقَدَّمِ رَأْسِهِ، فَأَمَرَّهُمَا حَتَّى بَلَغَ الْقَفَا، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ.

واتە: لە میقدامی كوڕی (مَعْدِ يكَرِب)ەوە هاتووه، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینیوە دەسنوێژی دەگرت، كاتێ كە گەیشتە مەسحی سەری هەردوو دەستی لەپێشی سەریەوە داناو هێنانی بەسەریا هەتا گەیشتە پشتی سەری، لەپاشاندا دەستی دەگێڕایەوە هەتا دەگەیشتەوە ئەو شوێنەی كە مەسحەكەی لێوە دەست پێ كردبوو.

١٢٣ - (صحيح) عَنْ الْوَلِيد، بِهَذَا الإِسْنَادِ، قَالَ: وَمَسَحَ بِأُذُنَيْهِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا. زَادَ هِشَامٌ وَأَدْخَلَ أَصَابِعَهُ فِي صِمَاخِ أُذُنَيْهِ.

واتــە: وەلیــد بــە هــەمان ســەنەد ئــەم فــەرمودەی گێڕاوەتــەوە، وتویــەتی: مەســحی دەرەوەو نــاوەوەی گوێکــانی کــرد. هیشــامیش ئەمــەی بــۆ زیــادکرد: پەنجەکانی دەخستە ناو کونی گوێکانیەوە.

١٢٤ - (صحيح) عَنِ مُغِيرَةَ بْنُ فَـرْوَةَ وَيَزِيـدُ بْـنُ أَبِـى مَالِـكٍ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ تَوَضَّأَ لِلنَّاسِ كَمَا رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ، فَلَمَّا بَلَغَ رَأْسَهُ غَـرَفَ غَرْفَـةً مِـنْ مَاءٍ، فَتَلَقَّاهَا بِشِمَالِهِ حَتَّى وَضَعَهَا عَلَى وَسَـطِ رَأْسِـهِ حَتَّى قَطَرَ الْمَاءُ أَوْ كَادَ يَقْطُرُ، ثُمَّ مَسَحَ مِـنْ مُقَدَّمِـهِ إِلَى مُؤَخَّرِهِ، وَمِنْ مُؤَخَّرِهِ إِلَى مُقَدَّمِهِ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی فەروەو یەزیـدی کـوڕی ئـەبو مالکـەوە هـاتووە، کـە وتویانە: مەعاویە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە خـەڵك وەك چۆن پێغەمبـەری خـوای صـلی الله علیـە وسـلم بـینی بـوو دەسـتنوێژی گرتبـوو بـەو شـێوەیە دەسـتنوێژێکی گـرت بـە بەرچـاویانەوە، کـاتێ کـە گەیشـتە سـەری بـە دەسـتی چـەپی هەنـدێ ئـاوی هـەڵگرت و کـردی بەنـاوەڕاسـتی سـەریدا هـەتا ئـاوی لـێ دەچۆڕا یان نزبك بوو ئاوی لێ بچۆڕێ، پاشان پێشی سەری هەتا دەگاتـە پاشـی سەری مەسح کرد وە پاشی سەری هەتا دەگاتەوە پێشی سەری دیسانەوە مەسح کرد.

١٢٥ - (صحيح) عَنِ الْوَلِيدِ، بِهَذَا الإِسْنَادِ، قَـالَ: فَتَوَضَّـأَ ثَلاَثًـا ثَلاَثًا وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ بِغَيْرِ عَدَدٍ.

واتە: بەم سەنەدە لە وەلیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەستنوێژی دەشوشت، جگە لە پێکانی کە بەبێ ژمارە شوشتنی.

١٢٦ - (صحيح) عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْتِينَا فَحَدَّثَتْنَا أَنَّهُ قَالَ: (اسْكُبِي لِي وَضُوءًا ). فَذَكَرَتْ وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَتْ فِيهِ: فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثًا، وَوَضَّأَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مَرَّةً، وَوَضَّأَ يَدَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَرَّتَيْنِ يَبْدَأُ بِمُؤَخَّرِ رَأْسِهِ ثُمَّ بِمُقَدَّمِهِ، وَبِأُذُنَيْهِ كِلْتَيْهِمَا ظُهُورِهِمَا وَبُطُونِهِمَا، وَوَضَّأَ رِجْلَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا.

واتە: لە روبەیعی کچی (معوذ)ی کوڕی عەفرائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان و قسەی بۆ کردین و فەرمووی: (ئاوی دەستنوێژ بکەن بە دەستمدا). باسی چۆنیەتی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە وتی: دەستەکانی سێ جار شت، وە سێ جار دەم وچاوی شت، وە یەك جار ئاوی لە دەم لوتی رادا، وە دەستەکانی سێ جار سێ جار شت، وە دوو جار مەسحی سەری کرد لە پاشی سەریەوە دەستی پێ کرد پاشان لەپێش سەریەوەو مەسحی دەرەوەو ناوەوەی گوێکانی کرد، وە سێ جار سێ جار هەردوو پێی شت.

**١٢٧ - (شاذ) عَنْ ابْنِ عَقِيلٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، يُغَيِّرُ بَعْضَ مَعَانِي بِشْرٍ، قَالَ فِيهِ: وَتَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثًا.**

واتە: (ابْنِ عَقِيلٍ) ئەم فەرمودەی لە بیشرەوە راوی فەرمودەکە گێڕاوەتەوە، سوفیان راوی فەرمودەکە دەڵێت: هەندێ مانای جیاوازە لەفەرمودەکەی بیشر، سوفیان لە فەرمودەکەیدا دەڵێت: سێ جار ئاوی لە دەم لوتی رادا.

**١٢٨ - (حسن) عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ عِنْدَهَا، فَمَسَحَ الرَّأْسَ كُلَّهُ مِنْ قَرْنِ الشَّعْرِ كُلَّ نَاحِيَةٍ لِمُنْصَبِّ الشَّعْرِ، لاَ يُحَرِّكُ الشَّعْرَ عَنْ هَيْئَتِهِ.**

واتە: لە روبەیعی کچی (مُعَوِّذ)ی کوڕی عەفرائەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرتووە لەلای، مەسحی هەموو سەری کردووە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، ئەوەندە لەسەرخۆ مەسحی سەری کردووە مووەکانی لەسەر شێوەی خۆیان مانەوەو تێك نەچوون.

**١٢٩ - (حسن) عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ، قَالَتْ: فَمَسَحَ رَأْسَهُ، وَمَسَحَ مَا أَقْبَلَ مِنْهُ وَمَا أَدْبَرَ، وَصُدْغَيْهِ، وَأُذُنَيْهِ مَرَّةً وَاحِدَةً.**

واتە: لە روبەیعی كچی (مُعَـوِّذ)ی كوڕی (عَفْـرَاء)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبـەری خـودام صـلى الله علیـه وسـلم بینیـوە دەسـتنوێژی دەگـرت، وتـی: لەپێشی سەریەوە هەتا پاشی سەری مەسح كرد، لەپاشـاندا دەسـتی دەگێڕایـەوە هـەتا دەگەیشـتەوە ئـەو شـوێنەی مەسـحەكەی لێـوە دەسـت پـێ كردبـوو، وە مەسحی هەردوو لاجانگی و گوێكانی یەك جار كرد.

١٣٠ - (حسـن) عَنْ الرُّبَيِّعِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَـحَ بِرَأْسِهِ مِنْ فَضْلِ مَاءٍ كَانَ فِي يَدِهِ.

واتـە: لـە روبەیعـەوە هـاتووە: كـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم مەسحی سەری كرد بەو ئاوەی كە لەدەستیدا مابۆوە.

١٣١ - (حسـن) عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ﴿ابْـنِ عَفْـرَاءَ﴾: أَنَّ النَّبِـيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ تَوَضَّـأَ فَأَدْخَـلَ إِصْـبَعَيْهِ فِـي جُحْرَيْ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە روبەیعی كچی (مُعَوِّذ)ی كوڕی عەفرائـەوە هـاتووە، كـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم دەسـتنوێژی دەگـرت سـەری هـەردوو پەنجـە توتـەی دەخستە ناو كونی گوێكانیەوە.

١٣٢ - (ضعيف) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ رَأْسَهُ مَرَّةً وَاحِدَةً، حَتَّى بَلَغَ الْقَذَالَ - وَهُوَ أَوَّلُ الْقَفَا - وَقَالَ: مُسَدَّدٌ: وَمَسَحَ رَأْسَهُ مِنْ مُقَدَّمِهِ إِلَى مُؤَخَّرِهِ، حَتَّى أَخْرَجَ يَدَيْهِ مِنْ تَحْتِ أُذُنَيْهِ[١].

واتە: لە (طَلْحَةَ)ی كوڕی (مُصَرِّف)ەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە، دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بینیوە یەك جار مەسحی سەری كرد هەتا گەیشتە كۆتایی بەشی دواوەی. موسەددەد وتی: لەپێشی سەریەوە هەتا گەیشتە كۆتایی بەشی دواوەی مەسحی كرد، هەتا لەژێر گوێكانیەوە دەستی دەرهێنا.

١٣٣ - (ضعيف جدا) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ كُلَّهُ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، قَالَ: وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ مَسْحَةً وَاحِدَةً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خودای صلى الله عليه وسلم بینیوە دەستنوێژی دەگرت، هەموو فەرمودەكەی گێڕایەوە كە سێ جار سێ جار ئەندامەكانی دەستنوێژی شتوە، وتی: بەڵام یەك جار مەسحی سەری و گوێكانی كرد.

---

[١] - قَالَ مُسَدَّدٌ فَحَدَّثْتُ بِهِ يَحْيَى فَأَنْكَرَهُ. واتە: موسەددەد وتی: ئەم فەرمودەم گێڕایەوە بۆ یەحیا ئەویش ئینكاری كرد. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ يَقُولُ ابْنُ عُيَيْنَةَ زَعَمُوا كَانَ يُنْكِرُهُ، وَيَقُولُ: أَيْشِ هَذَا طَلْحَةُ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ.

١٣٤ - (ضعيف) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، ﴿وَ﴾ ذَكَرَ وُضُوءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ الْمَأْقَيْنِ.

[المشكاة: ٤١٣].

واتە: ئەبو ئومامە فەرمودەی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم گێڕایەوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم مەسحی قولینچکی چاوەکانی کرد.

(صحيح) قَالَ: وَقَالَ: (الأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ ). قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ: يَقُولُهَا أَبُو أُمَامَةَ. قَالَ قُتَيْبَةُ: قَالَ حَمَّادٌ: لاَ أَدْرِي هُوَ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ مِنْ أَبِي أُمَامَةَ - يَعْنِي قِصَّةَ الأُذُنَيْنِ - .

راوی وتی: وە فەرمووی: (گوێکان بەشێکن لەسەر). سولەیمان وتی: ئەبو ئومامە وتویەتی. قوتەیبە وتی: حەماد وتویەتی: نازانم (گوێکان بەشێکن لەسەر) فەرمودەی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم یان وتەی ئەبو ئومامەیە.

## باسی شوشتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ سیٚ جار سیٚ جار

## ٥١ - بَابُ الْوُضُوءِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا

١٣٥ - (حسن صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ الطُّهُورُ؟ فَدَعَا بِمَاءٍ فِي إِنَاءٍ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَدْخَلَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّاحَتَيْنِ فِي أُذُنَيْهِ، وَمَسَحَ بِإِبْهَامَيْهِ عَلَى ظَاهِرِ أُذُنَيْهِ، وَبِالسَّبَّاحَتَيْنِ بَاطِنَ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاَثًا ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: (هَكَذَا الْوُضُوءُ فَمَنْ زَادَ عَلَى هَذَا أَوْ نَقَصَ، فَقَدْ أَسَاءَ وَظَلَمَ ). أَوْ (ظَلَمَ وَأَسَاءَ ).

واته: عەمری کوڕی شوعەیب، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێرم بکە دەستنوێژ چۆن دەگیرێت؟ ئەویش داوای ئاوی کرد لە دەفرێکدا بۆیان هێنا: دەستەکانی سێ جار شت، پاشان دەم وچاوی سێ جار شت، ئینجا سێ جار باڵەکانی شت، پاشان مەسحی

سەری کرد و سەری هەردوو پەنجەی شایەتومانی خستە ناو کونی گوێکانیەوە و مەسحی ناوەوەی گوێکانی کرد لەهەمان کاتدا بە پەنجە گەورەی مەسحی دەرەوەی کرد، ئینجا هەردوو پێی سێ جار سێ جار شت، پاشان فەرمووی: دەستنوێژ بەم شێوەیە دەگیرێت، ئەوەی لەمە زیاتر بکات یان لێی کەم بکات ئەوە بەڕاستی کارێکی خراپ دەکات و زوڵم و ستەم لە خۆی دەکات، یان زوڵم و ستەم لە خۆی دەکات و کارێکی خراپ دەکات.

## باسی شوشتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ

## دوو جار دوو جار

## ٥٢ - بَابُ الْوُضُوءِ مَرَّتَيْنِ.

١٣٦ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ.

واتە: ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم ئەندامەکانی دەستنوێژی دوو جار دوو جار دەشت.

١٣٧ - (حسن صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: قَالَ لَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتُحِبُّونَ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ؟ فَدَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ، فَاغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ الْيُمْنَى فَتَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ

أَخَذَ أُخْرَى فَجَمَعَ بِهَا يَدَيْهِ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثُمَّ أَخَذَ أُخْرَى فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُمْنَى، ثُمَّ أَخَذَ أُخْرَى فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُسْرَى، ثُمَّ قَبَضَ قَبْضَةً مِنَ الْمَاءِ، ثُمَّ نَفَضَ يَدَهُ ثُمَّ مَسَحَ بِهَا رَأْسَهُ وَأُذُنَيْهِ، ثُمَّ قَبَضَ قَبْضَةً أُخْرَى مِنَ الْمَاءِ فَرَشَّ عَلَى رِجْلِهِ الْيُمْنَى وَفِيهَا النَّعْلُ، ثُمَّ مَسَحَهَا بِيَدَيْهِ يَدٍ فَوْقَ الْقَدَمِ وَيَدٍ تَحْتَ النَّعْلِ، ثُمَّ صَنَعَ بِالْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە (عطاء)ی کوڕی یەسارەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ پێی وتین: پێتان خۆشە نیشانتان بدەم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ داوای ئاوی کرد لە دەفرێکدا بۆیان هێنا: بەدەستی ڕاستی هەندێ ئاوی هەلگرت و لە دەم لوتی ڕادا، پاشان هەندێ ئاوی تری هەلگرت بە هەردوو دەستی دەم وچاوی پێ شت، پاشان هەندێ ئاوی تری هەلگرت دەستی ڕاستی پێ شت، ئینجا هەندێ ئاوی تری هەلگرت دەستی چەپی پێ شت، پاشان هەندێ ئاوی تری هەلگرت و دەستی ڕاوەشان، پاشان مەسحی سەر و گوێکانی پێ کرد، ئینجا هەندێ ئاوی تری هەلگرت و کردی بە پێی ڕاستیدا لەوکاتەدا نەعلی لە پێدا بوو، ئینجا بە هەردوو دەستی مەسحی کرد بە دەستێکی پشتی پێی و بەدەستەکەی تری ژێر نەعلەکانی، پاشان پێی چەپیشی بەهەمان شێوە.

## باسى شوشتنى ئەندامەكانى دەستنوێژ يەك جار يەك جار.

## ٥٣ – بَابُ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً.

١٣٨ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِوُضُوءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً.

واته: له ئيبنو عەباسەوە رەزاى خوايان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: چۆنيەتى دەستنوێژى گرتنى پێغەمبەرى خواتان صلى الله عليه وسلم بۆ باس بكەم؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەندامەكانى دەستنوێژى يەك جار يەك جار دەشت.

## جياوازى لەنێوان (مَضْمَضَةِ) و (اسْتِنْشَاقِ)

## ٥٤ – بَابُ فِي الْفَرْقِ بَيْنَ الْمَضْمَضَةِ وَالاِسْتِنْشَاقِ

١٣٩ - (ضعيف) عَنْ طَلْحَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، وَالْمَاءُ يَسِيلُ مِنْ وَجْهِهِ وَلِحْيَتِهِ عَلَى صَدْرِهِ، فَرَأَيْتُهُ يَفْصِلُ بَيْنَ الْمَضْمَضَةِ وَالاِسْتِنْشَاقِ.

واتە: لە (طَلْحَة)ەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی دەگرت ئاو لە دەم و چاو و ریشی دەچۆڕایە سەرسنگی بینیم بەجیا ئاوی لە دەم و لوتی رادا.

## باسی مشکردن یان فم کردن

## ٥٥ – بَابُ فِي الاِسْتِنْثَارِ.

١٤٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً ثُمَّ لْيَنْثُرْ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت با ئاو لە لوتی رادا و پاشان مشی بکاتەوە.

١٤١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اسْتَنْثِرُوا مَرَّتَيْنِ بَالِغَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: دوو جار بەتوندی مش بکەن یان سێ جار.

١٤٢ - (صحيح) عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبْرَةَ ، قَالَ: كُنْتُ وَافِدَ بَنِي الْمُنْتَفِقِ - أَوْ فِي وَفْدِ بَنِي الْمُنْتَفِقِ - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ نُصَادِفْهُ فِي مَنْزِلِهِ، وَصَادَفْنَا عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ، قَالَ: فَأَمَرَتْ لَنَا بِخَزِيرَةٍ فَصُنِعَتْ لَنَا ، قَالَ: وَأُتِينَا بِقِنَاعٍ - وَلَمْ يَقُلْ قُتَيْبَةُ الْقِنَاعَ وَالْقِنَاعُ الطَّبَقُ فِيهِ تَمْرٌ - ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ:(هَلْ أَصَبْتُمْ شَيْئًا ) أَوْ (أُمِرَ لَكُمْ بِشَيْءٍ)، قَالَ: قُلْنَا نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَبَيْنَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جُلُوسٌ إِذْ دَفَعَ الرَّاعِي غَنَمَهُ إِلَى الْمُرَاحِ، وَمَعَهُ سَخْلَةٌ تَيْعَرُ فَقَالَ:(مَا وَلَّدْتَ يَا فُلاَنُ؟) قَالَ: بَهْمَةً، قَالَ: (فَاذْبَحْ لَنَا مَكَانَهَا شَاةً). ثُمَّ قَالَ: لاَ تَحْسِبَنَّ - وَلَمْ يَقُلْ لاَ تَحْسَبَنَّ - أَنَّا مِنْ أَجْلِكَ ذَبَحْنَاهَا، لَنَا غَنَمٌ مِئَةٌ، لاَ نُرِيدُ أَنْ تَزِيدَ، فَإِذَا وَلَّدَ الرَّاعِي بَهْمَةً ذَبَحْنَا مَكَانَهَا شَاةً)، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي امْرَأَةً وَإِنَّ فِي لِسَانِهَا شَيْئًا - يَعْنِي الْبَذَاءَ - ، قَالَ: (فَطَلِّقْهَا إِذًا)، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لَهَا صُحْبَةً

وَلِي مِنْهَا وَلَدٌ، قَالَ: (فَمُرْهَا) يَقُولُ: (عِظْهَا) (فَإِنْ يَكُ فِيهَا خَيْرٌ فَسَتَفْعَلُ وَلاَ تَضْرِبْ ظَعِينَتَكَ كَضَرْبِكَ أُمَيَّتَكَ). فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَخْبِرْنِي عَنْ الْوُضُوءِ. ، قَالَ: (أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ، وَبَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا ).

واتە: لە (لَقِيط)ی كوڕی (صَبْرَة)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: من نوێنەری هۆزی مونتەفیق بووم - یان یەكێ بووم لە نوێنەرانی هۆزی مونتەفیق - بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: كاتێ كە گەیشتینە ئەوێ تەشریفی لەماڵ نەبوو نەمان دی، بەڵام عائیشەی دایكی باوەڕدارانمان ڕەزای خوای لێ بێ بینی (لَقِيط) وتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمانی كرد خواردنی(خزيرة)مان بۆ دروست بكەن - كە بریتیە لە پارچە گۆشتی بچوك بچوك لەناو خوێ ئاودا دەیكوڵێنن كاتێك كە كوڵا ئاردی پێوە دەكەن- وتی: بۆمان دروستكراو لەسەر تەبەق(سینی)ەكدا بۆیان هێنایـن - قوتەیبە ڕاوی فەرمودەكە نەیوت تەبەق، تەبەق شتێكە خورمای تێدایە- پاشان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات و فەرمووی: (ئایا شتێكتان دەست كەوتووە بیخۆن، یان عائیشە فەرمانی كردووە كە شێكتان بۆ دروست بكەن؟) وتمان: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: لە كاتێكدا كە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتبووین وتووێژمان دەكرد شوانەكە مەڕەكانی هێنایەوەو دەیكردنە پەچەوە بەرخۆلەیەكی پێ بوو قاڕە قاڕی بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە شوانەكەی فەرموو: (ئەی فلان كەس چی بووە)، وتی: بەرخێكی بووە، فەرمووی: (لە جیاتیدا مەڕێكمان بۆ سەربڕن)، پاشان فەرمووی: (وا مەزانن لەبەر ئێوە سەری دەبڕین، سەد سەر

مەرمان هەیە نامەنەویت زیاد بکەن، هەر کاتێك بەرخێك لەدایك بوو لە شوێنیدا مەڕێك سەردەبڕین). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم من ژنێکی دەم درێژ (زمان پیس)م هەیە، فەرمووی: (دەی مادەم وەهایە تەلاقی بدە). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاوەڵی ژیانمەو منداڵم لێی هەیە، فەرمووی: (دەی ئامۆژگاری بکە ئەگەر خێری تێدا بێت وەری دەگرێت و بەگوێت دەکات، بەڵام لەژنەکەت مەدە وەك چۆن دەدەی لە خزمەتکارەکەت). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستنوێژم فێرم بکە؟ فەرمووی: (بە باشی دەستنوێژ بگرەو، پەنجە بخە نێوان پەنجەکانتەوەو، زۆر چاك ئاو بدە بە لوتداو چاك هەڵیمژە، مەگەر بە رۆژوو بیت) واتە ئەگەر بە رۆژوو بویت زۆر هەڵی مەمژە نەوەك بچێتە قوڕگتەوە و رۆژووەکەت بەتاڵ بێتەوە.

١٤٣ - (صحيح) عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبْرَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، وَافِدِ بَنِي الْمُنْتَفِقِ أَنَّهُ أَتَى عَائِشَةَ فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، قَالَ: فَلَمْ يَنْشَبْ أَنْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَقَلَّعُ: يَتَكَفَّأُ. وَقَالَ: عَصِيدَةٍ. مَكَانَ خَزِيرَةٍ.

واتە: لە (عَاصِمِ)ی کوڕی (لَقِيط)ی کوڕی (صَبْرَة)وە، لەباوکیەوە کە نوێنەری هۆزی مونتەفیق بوو دەگێڕنەوە، کە چووتە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ، بە هەمان مانا فەرمودەکەی گێڕایەوە، وتی: ئەوەندە نەمایەنەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات پێی بەرز دەکردەوەو دەیدا بە زەویدا واتە: پێی لەزەوی نەدەخشاند. وتی: فەرمووی: ((عَصِيدَة) واتە: حەڵوای ئارد لە جیاتی (خَزِيرَة).

١٤٤ - (صحيح) عَنْ ابْنُ جُرَيْجٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ فِيهِ: (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَمَضْمِضْ ).

واتە: ئیبنو جورەیج ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، تێیدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر دەستنوێژت گرت، ئاو لە دەمت رابدە).

## باسی پەنجە خستنە نێوان مووەکانی ریشەوە.

## ٥٦ - بَابُ تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ.

١٤٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا تَوَضَّأَ أَخَذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ، فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ، وَقَالَ: (هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ دەستنوێژی دەگرت لەپێك ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بەژێر چەناگەیەوەو بە پەنجەکانی نێوان مووەکانی ریشی پێ تەڕ دەکرد. وە دەیفەرموو: (پەروەردگارم بەم شێوەیە فەرمانی پێ کردووم).

## باسی مەسح كردنی مێزەر.

## ٥٧ – بَابُ الْمَسْحِ عَلَى الْعِمَامَةِ.

١٤٦ - (صحيح) عَنْ ثَوْبَانَ، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً، فَأَصَابَهُمُ الْبَرْدُ، فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُمْ أَنْ يَمْسَحُوا عَلَى الْعَصَائِبِ وَالتَّسَاخِينِ.

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كۆمەڵێ لە هاوەڵانی نارد بۆ كارێك تووشی سەرمایەكی زۆر هاتن، كاتێ كە گەڕانەوە بۆ خزمەتی شەكوای حاڵی خۆیان كرد لەدەست سەرما ئەویش فەرمانی پێ كردن مەسحی مێزەر و خوفەكانیان بكەن - واتە: هەر شتێك كە دەیپێچن بە سەریانەوە و هەرشتێكیش كە دەیكەنە پێیان بۆ ئەوەی قاچیان گەرم كاتەوە و سەرمایان نەبێت وەك گۆرەوی مەسحی بكەن.

١٤٧ - (ضعيف) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ قِطْرِيَّةٌ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ مِنْ تَحْتِ الْعِمَامَةِ، فَمَسَحَ مُقَدَّمَ رَأْسِهِ وَلَمْ يَنْقُضِ الْعِمَامَةَ.

//ضعيف ابن ماجة: (١٢٤ / ٥٦٤)//

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم بینیوە کاتێ کە دەستنوێژی دەگرت مێزەرەیەکی (قِطرية)ی بەسەرەوە بوو، دەستی دەکرد بە ژێر مێزەرەکەداو پێشی سەری مەسح دەکرد، مێزەرەکەی بەرزنەدەکردەوە.

## باسی شوشتنی هەردوو پێ.

## ٥٨ - بَابُ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ.

**١٤٨ - (صحيح) عَنْ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا تَوَضَّأَ يَدْلُكُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصَرِهِ.**

واتە: لە موستەوریدی کوڕی شەددادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم بینیوە کە دەستنوێژی دەگرت پەنجە توتەی دەخستە نێوان پەنجەکانی هەردوو پێیەوە.

## باسی مەسح کردن لەسەر هەردوو خوف.

## ٥٩ - بَابُ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

١٤٩ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: عَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَعَهُ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَعَدَلْتُ مَعَهُ، فَأَنَاخَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَبَرَّزَ، ثُمَّ جَاءَ فَسَكَبْتُ عَلَى يَدِهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ حَسَرَ عَنْ ذِرَاعَيْهِ فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فَأَخْرَجَهُمَا مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَهُمَا إِلَى الْمِرْفَقِ وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ رَكِبَ. فَأَقْبَلْنَا نَسِيرُ حَتَّى نَجِدَ النَّاسَ فِي الصَّلاَةِ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ فَصَلَّى بِهِمْ حِينَ كَانَ وَقْتُ الصَّلاَةِ، وَوَجَدْنَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ وَقَدْ رَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَفَّ مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَصَلَّى وَرَاءَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ الرَّكْعَةَ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلاَتِهِ. فَفَزِعَ الْمُسْلِمُونَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، لأَنَّهُمْ

سَبَقُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالصَّلاَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُمْ: (قَدْ أَصَبْتُمْ ). أَوْ (قَدْ أَحْسَنْتُمْ).

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە غەزای تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم صلى الله عليه وسلم جارێ پێش نوێژی بەیانی، لەڕێگە لایدا بۆ ئەوەی دەست بەئاو بگەیەنێت منیش لەگەڵی لامدا ئەو چوو دەستی بەئاو گەیاند، ئینجا هاتەوە لە دەفرێکدا ئاوم کرد بەدەستیدا دەستەکانی شت، پاشان دەم وچاوی شت، ئینجا قۆڵەکانی دەرخست قۆڵی جبەکەی ئەوەندە تەسك بوو بۆی هەڵنەماڵرا بۆیە دەستەکانی لەبن هەنگڵیەوە لە جبەکەی دەرهێناو هەتا ئەنیشکی شوشتنی، پاشان مەسحی سەری کرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو خوفەکانیدا، پاشان سواربوو. ڕۆشتین هەتا خەڵکەکەمان دۆزیەوە بینیمان نوێژیان دەکرد (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف بەرنوێژی بۆ دەکردن (عَبْدَ الرَّحْمَن)مان بینی ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی پێ کردبوون، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە ڕیزی موسڵمانەکانەوەو لەدوای (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفەوە کە لە ڕکاتی دووهەمدا بوو نوێژی دابەست، (عَبْدَ الرَّحْمَن) سەلامی نوێژەکەی دایەوەو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستایەوە بۆ تەواوکردنی ڕکاتی دووهەم موسڵمانان هاواریان لێ هەڵساو (سبحان الله)ی زۆریان کرد چونکە پێش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کەوتن لە نوێژدا، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەلامی دایەوە پێی فەرموون: (بێگومان پێکاتان) یان (بێگومان کارێکی چاکتان کرد) واتە: کارێکی چاکتان کرد لەسەرەتای کاتی یەکەمی نوێژەوە نوێژتان کرد و دواتان نەخست.

١٥٠ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأ وَمَسَحَ نَاصِيَتَهُ، وَذَكَرَ: فَوْقَ الْعِمَامَةِ.

واته: له موغیرەی كوڕی شوعبەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژ گرت و پێشی سەری مەسح كرد. وە موغیرە باسی كرد: كە بەسەر مێزەرەكەیەوە مەسحی كرد.

(صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَعَلَى نَاصِيَتِهِ وَعَلَى عِمَامَتِهِ.

واته: له موغیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مەسحی هەردوو خوفەكانی كرد، وە پێشی سەری مەسح كرد بەسەر مێزەرەكەیەوە.

١٥١ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَكْبِهِ، وَمَعِي إِدَاوَةٌ، فَخَرَجَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ فَتَلَقَّيْتُهُ بِالإِدَاوَةِ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ مِنْ جِبَابِ الرُّومِ ضَيِّقَةُ الْكُمَّيْنِ، فَضَاقَتْ فَادَّرَعَهُمَا ادِّرَاعًا، ثُمَّ أَهْوَيْتُ إِلَى الْخُفَّيْنِ لأَنْزِعَهُمَا، فَقَالَ لِي: « دَعِ الْخُفَّيْنِ فَإِنِّي أَدْخَلْتُ الْقَدَمَيْنِ الْخُفَّيْنِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ » فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا.

واتە: لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە هاتووە، كە وتویەتی: لەگەڵ كاروانە وشتری پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، جەوەنەیە ئاوم پێ بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ دەست بەئاو گەیاندن، كاتێ كە هاتەوە بە جەوەنە ئاوەكەوە چوومە پێشوازی، ئاوەكەم كرد بەدەستیدا، دەستەكانی و دەم و چاوی شت، ئینجا ویستی قۆڵەكانی دەركات جبەیەكی خوری لە (جِبَابِ الرُّومِ)ی لەبەردا بوو قۆڵی جبەكەی ئەوەندە تەسك بوو بۆی هەڵنەماڵرا بۆیە دەستەكانی لەبن هەنگڵیەوە لە جبەكەی دەرهێناو هەتا ئەنیشكی، شوشتنی، پاشان دەستم برد خوفەكانی لەپێ داكەنم بۆئەوەی پێكانی بشوات، پێی فەرمووم: (وازیان لێ بێنە چونكە بە دەسنوێژەوە لەپێم كردوون). جا مەسحی سەر خوفەكانی كرد.

١٥٢ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ هَذِهِ الْقِصَّةَ قَالَ: فَأَتَيْنَا النَّاسَ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ يُصَلِّي بِهِمُ الصُّبْحَ، فَلَمَّا رَأى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرَادَ أَنْ يَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَنْ يَمْضِيَ، قَالَ: فَصَلَّيْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى الرَّكْعَةَ الَّتِي سُبِقَ بِهَا، وَلَمْ يَزِدْ عَلَيْهَا شَيْئًا.

واتە: لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دواكەوت لە خەڵكەكە، بە هەمان شێوە بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە وتی: كە گەشتینە لای خەڵكەكە (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی كوڕی عەوف بەرنوێژی

نوێژی بەیانی بۆ دەكردن كاتێ كە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بینی ویستی بچێتەدواوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئاماژەی بۆ كرد كە بەردەوام بێت، موغیرە وتی: من و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەدوایەوە ركاتێ نوێژمان كرد، كاتێ كە (عَبْدَ الرَّحْمَن) سەلامی دایەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە ركاتی دووهەمی كرد، هیچی بۆ زیاد نەكرد. واتە سەجدەی سەهوی نەبرد.

(ضعيف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ وَابْنُ الزُّبَيْرِ وَابْنُ عُمَرَ يَقُولُونَ: مَنْ أَدْرَكَ الْفَرْدَ مِنَ الصَّلاَةِ عَلَيْهِ سَجْدَتَا السَّهْوِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەبو سەعیدی خودری و ئیبنو زوبەیر و ئیبنو عومەر دەڵێن: ئەو كەسەی كە لەدوای ئیمامەوە نوێژ دەكات ئەگەر بگات بە ركاتێكدا یان سێ ركات ئەوە لەسەریەتی سەجدەی سەهو ببات.

١٥٣ - (صحيح) عَنْ أَبِى عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ: أَنَّهُ شَهِدَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ يَسْأَلُ بِلاَلاً عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: كَانَ يَخْرُجُ يَقْضِي حَاجَتَهُ، فَآتِيهِ بِالْمَاءِ فَيَتَوَضَّأُ، وَيَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ وَمُوقَيْهِ.

واتە: لە ئەبو (عَبْدُ الرَّحْمَن السُّلَمِيِّ)ەوە دەگێڕنەوە، كە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی عوف لەو شوێنەدا ئامادەبووە سەبارەت بە دەستنوێژی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە بیلالیان پرسیوە؟ گوێی لەوەڵامەكەی بیلالیش بووە كە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كاتێ كە دەردەچوو بۆ دەست بەئاو

گەیاندن، ئاوم بۆ دەبرد دەستنوێژی پێ دەگرت، وە مەسحی مێزەر و سەری ئەو خوفە ئەستورەی دەکرد کە بەسەر خوفێکی تەنکەوە لەپێی کردبوو.

| |
|---|
| ١٥٤ - (حسن) عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، أَنَّ جَرِيرًا بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ فَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَقَالَ: مَا يَمْنَعُنِي أَنْ أَمْسَحَ وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ، قَالُوا: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ قَبْلَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ، قَالَ: مَا أَسْلَمْتُ إِلاَّ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ. |

واتە: ئەبو زورعەی کوڕی عەمری کوڕی جەریرەو دەڵێت: کە جەریر میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت و مەسحی خوفەکانی کرد، وتی: چی ڕێگریم لێ دەکات لەوەی کە مەسحیان نەکەم لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خودام صلی الله علیه وسلم دیوە مەسحی دەکردن، ئامادەبووان وتیان: ئەوە پێش دابەزینی سورەتی (مائدة) بووە. وتی: منیش دوای سورەتی مائیدە موسڵمان بووم.

| |
|---|
| ١٥٥ - (حسن) عَنْ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ فَلَبِسَهُمَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. |

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کە نەجاشی - پاشای حەبەشە - جووتێ خوفی ڕەشی سادەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش لەپێی کردن، پاشان دەستنوێژی گرت و دەستی تەڕی هێنا بەسەریاندا.

١٥٦ - (ضعيف) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَسِيتَ؟ قَالَ: (بَلْ أَنْتَ نَسِيتَ بِهَذَا أَمَرَنِي رَبِّي).

// المشكاة (٥٢٤)//.

واته: له موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، که وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستنوێژ دەگرت دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوفەکانیدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم له یادت چوو پێت بشۆیت؟ فەرمووی: (نا، بەڵکو تۆ لەیادت چووە، پەروەردگارم ئاوا فەرمانی پێ کردووم).

## باسی ماوەی مەسح کردن لەسەر خوف

## ٦٠ – بَابُ التَّوْقِيتِ فِي الْمَسْحِ

١٥٧ - (صحيح) عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ ).

واته: لە خوزەیمەی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: بۆ ڕێبوار لەسەفەرەکەیدا هەموو جارێ کە خوفەکانی لەپێ دەکات تا سێ ڕۆژ ماوەی هەیە مەسحیان بکات، بۆ نیشتەجێش شەو و ڕۆژێ.

١٥٨ - (ضعيف) عَنْ أُبَيِّ بْنِ عِمَارَةَ - قَالَ: يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ وَكَانَ قَدْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْقِبْلَتَيْنِ - أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قَالَ: يَوْمًا، قَالَ: (يَوْمًا ). قَالَ: وَيَوْمَيْنِ ، قَالَ: (وَيَوْمَيْنِ). قَالَ: وَثَلاَثَةً ، قَالَ: (نَعَمْ وَمَا شِئْتَ).

واتە: ئوبەیی كوڕی (عِمَارة) دەڵێت: یەحیای كوڕی ئەیوب كە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بەرەو هەردوو قیبلە نوێژی كردووە، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مەسحی سەر خوفەكان بكەین؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتی: ماوەی ڕۆژێ؟ فەرمووی: (ماوەی ڕۆژێ). وتی: ماوەی دوو ڕۆژ؟ فەرمووی: (ماوەی دوو ڕۆژ). وتی: ماوەی سێ ڕۆژ؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەوەندەی بتەوێت).

(ضعيف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ أُبَيِّ بْنِ عِمَارَةَ ، قَالَ فِيهِ: حَتَّى بَلَغَ سَبْعًا، قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَعَمْ وَمَا بَدَا لَكَ)[1].

---

[1]- قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَقَدِ اخْتُلِفَ فِي إِسْنَادِهِ وَلَيْسَ هُوَ بِالْقَوِيِّ وَرَوَاهُ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ وَيَحْيَى بْنُ إِسْحَاقَ السَّيْلَحِينِيُّ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ وَقَدِ اخْتُلِفَ فِي إِسْنَادِهِ. // ضعيف سنن ابن ماجة (١٢٢ / ٥٥٧) //.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئوبەیی کوڕی (عِمَارة) وە هاتووە، لە فەرمودەکەیدا وتویەتی: هەتا گەیشتە ماوەی حەوت ڕۆژ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەر فەرمووی: (بەڵێ هەتا چەند ڕۆژ پێویستت بێت).

## باسی مەسح کردن بەسەر گۆرەویەوە.

## ٦١ – بَابُ الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ.

**١٥٩ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ.**

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەستنوێژ دەگرت دەستی تەڕی هێنا بەسەر گۆرەوی و نەعلەکانیدا.

(حسن) قَالَ أَبُو دَاوُد: كَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيّ لاَ يُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، لأَنَّ الْمَعْرُوفَ عَنْ الْمُغِيرَةِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

ئەبو داود دەڵێت: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی مەهدی ئەم فەرمودەی نەگێڕاوەتەوە، چونکە ناسراو لەلای موغیرەی کوڕی شوعبە ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوفەکانیدا.

**(قوي بشاهده) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَ هَـذَا أَيْضًـا عَـنْ أَبِـي مُوسَـى الأَشْعَرِيِّ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ مَسَـحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ، وليسَ بلمتَّصِلِ ولاَ بِالْقَوِيِّ.**

**واتە: ئەبو داود دەڵێت: هەروەها ئەم فەرموودە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی تەڕی هێناوە بەسەر گۆرەویەکانیدا.**

**(صحيح) (عَنْ أبي مَسْعُودٍ، وَالْبَرَاءُ، وَأَنَسُ) و (حسن) (عَنْ أَبُو أُمَامَةَ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَابْنُ مَسْعُودٍ، وَالْبَرَاءُ بْنُ عَـازِبٍ، وَأَنَـسُ بْنُ مَالِكٍ، وَأَبُو أُمَامَةَ، وَسَهْلُ بْنُ سَـعْدٍ، وَعَمْـرُو بْـنُ حُرَيْثٍ، وَرُوِيَ ذَلِكَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، وَابْنِ عَبَّاسٍ.**

**واتە: ئەبو داود دەڵێت: عەلی کوڕی (أبي طالب) ڕەزای خوای لێ بێ و ئیبنو مەسعود و بەرائی کوڕی عازیب و ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەبو ئومامە و سەهلی کوڕی سەعد و عەمری کوڕی (حُرَيث) دەستی تەڕیان هێناوە بەسەر گۆرەویەکانیاندا، ئەمەش لە عومەری کوڕی ( الخطاب) و ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕدراوەتەوە.**

## ٦٢ - باب.

١٦٠ - (صحيح) عَنْ أَوْسُ بْنُ أَبِـي أَوْسٍ الثَّقَفِـيُّ: أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ تَوَضَّـأَ وَمَسَـحَ عَلَـى نَعْلَيْـهِ وَقَدَمَيْهِ. وَقَالَ عَبَّادٌ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى كِظَامَةَ قَوْمٍ - يَعْنِي الْمِيضَأَةَ -، وَلَمْ يَذْكُرْ مُسَدَّدٌ الْمِيضَأَةَ وَالْكِظَامَةَ، ثُمَّ اتَّفَقَا: فَتَوَضَّـأَ وَمَسَـحَ عَلَى نَعْلَيْهِ وَقَدَمَيْهِ.

واتە: ئەوسی كوڕی ئـەبو ئەوسـی (الثَّقَفِـيّ)دەڵێـت: جـارێ پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژ دەگرت دەستی تەڕی هێنـا بەسـەر نەعلەكانی و هەردوو پێیـدا. وە عـەبباد راوی فەرموودەكە وتـی: پێغەمبـەری خـوام صـلی الله علیـه وسـلم بـینی هاتـە لای (كِظَامَـةُ)[١]ی قـەومێك - واتـە (مِیضَـأَة)[٢] - بـەڵام موسەدەد راوی فەرموودەكە باسی (مِیضَأَةَ وَالْكِظَامَةَ)ی نـەكرد- پاشـان موسـەدەدو عەبباد هەردووكیان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە - دەسـتنوێژی گـرت و دەسـتی تەڕی هێنا بەسەر نەعلەكانی و هەردوو پێیدا.

---

[١]- (كظامـة) بیرێكـە لـە تەنیشت بیرێكـەوە كـە لـە ژێـر زەویـەوە ئاوەڕۆیـەك لەنێوانیانـدا هەبێت، لە (عون المعبود) وەرگیراوە.

[٢]- (میضأة) دەفرێكە دەستنوێژی تێدا دەگیرێ وەك جەوەنـە و مەسـینە.. لـە( شـرح صـحیح مسلم: ٣/ ١٦٣) وەرگیراوە.

## باسی چۆنیەتی مەسح کردن

## ٦٣ - بَابُ كَيْفَ الْمَسْحُ.

١٦١ - (حسن صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ. وَقَالَ غَيْرُ مُحَمَّدٍ: عَلَى ظَهْرِ الْخُفَّيْنِ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی تەڕی هێناوە بەسەر خوفەکانیدا. هەروەها جگە لە موحەممەدیش وتویەتی: دەستی تەڕی هێناوە بەسەر پشتی خوفەکانیدا.

١٦٢ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلَاهُ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ.

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: ئەگەر دین بە ڕاو بۆچوون بێ دەبێت مەسحی ژێر خوف بکرێت نەوەك سەر پشتی، بەڵام من بەچاوی خۆم دیومە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مەسحی سەر پشتی خوفەکانی خۆی دەکرد.

١٦٣ - (صحيح) عَنْ الأَعْمَشِ، بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: مَا كُنْتُ أُرَى بَاطِنَ الْقَدَمَيْنِ إِلاَّ أَحَقَّ بِالْغَسْلِ، حَتَّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى ظَهْرِ خُفَّيْهِ.

واتە: لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودە بە هەمان سەنەد هاتووە، كە وتويەتى: پێشەوا عەلى رەزاى خواى لێ بێ وتويەتى: من وام دەبينى كە مەسحى ژێر خوف شايستەترە نەوەك سەر پشتى، هەتا بەچاوى خۆم ديم پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم مەسحى سەر پشتى خوفەكانى خۆى كرد.

١٦٤ - (صحيح) عَنْ الأَعْمَشِ بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ بَاطِنُ الْقَدَمَيْنِ أَحَقَّ بِالْمَسْحِ مِنْ ظَاهِرِهِمَا، وَقَدْ مَسَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ظَهْرِ خُفَّيْهِ.

واتە: لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودە هاتووە، كە وتويەتى: ئەگەر دين بە راو بۆچوون بووايە ئەوا مەسحى ژێر پێكان شايستەتر دەبوو لە سەر پشتيان، بەڕاستى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مەسحى سەر پشتى خوفەكانى خۆى دەكرد.

(صحيح) عَنْ ابْنِ عَبْدِ خَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ ظَاهِرَ قَدَمَيْهِ وَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واته: لە ئیبنو عەبدی خەیرەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلیم بینی دەستنوێژی گرت سەر پشتی پێکانی شت و وتی: ئەگەر بە چاوی خۆم نەمدیایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیەی دەکرد، ئەوا وام دەزانی کە مەسحی ژێر خوف شایستەترە. جا فەرموودەکەی گێڕایەوە.

١٦٥ - (ضعيف) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ، قَالَ: وَضَّأْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ فَمَسَحَ أَعْلَى الْخُفَّيْنِ وَأَسْفَلَهُمَا.

واته: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە غەزای تەبوك دەستنوێژم بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گرت واتە ئاوم کرد بەدەستیدا و لە خزمەتیا بووم، مەسحی سەر و ژێری خوفەکانی خۆی کرد.

قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: وَبَلَغَنِى أَنَّهُ لَمْ يَسْمَعْ ثَوْرٌ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ رَجَاءٍ.

ئەبو داود دەڵێت: پێم گەیشتووە کە (ثَوْر) ئەم فەرموودەی لە (رَجَاء) نەبیستووە.

## باسی ئاو پڕژاندن لە نافەك.

## ٦٤ – بَابُ فِي الِانْتِضَاحِ.

١٦٦ - (صحيح) عَنْ سُفْيَانَ بْنِ الْحَكَمِ الثَّقَفِيِّ - أَوِ الْحَكَمِ بْنِ سُفْيَانَ الثَّقَفِيِّ - قَالَ: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَالَ يَتَوَضَّأُ وَيَنْتَضِحُ.

واتە: لە سوفیانی كوڕی حەكەمی (ثَقَفِيّ)ەوە - یان حەكەمی كوڕی سوفیانەوە - دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە دەستی بەئاو بگەیاندایە دەستنوێژی دەگرت و ئاوی دەپڕژاند لە نافەكی.

١٦٧ - (صحيح) عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ رَجُلٍ مِنْ ثَقِيفٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَالَ، ثُمَّ نَضَحَ فَرْجَهُ.

واتە: لە موجاهیدەوە، ئەویش لە پیاوێكی (ثَقِيف)ەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینیوە دەستی بەئاو گەیاند لە پاشاندا ئاوی پڕژاند لە نافەكی.

١٦٨ - (صحيح) عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ الْحَكَمِ أَوِ ابْنِ الْحَكَمِ ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَنَضَحَ فَرْجَهُ.

واته: له موجاهیدەوه، له حەکەمەوه، یان له ئیبنو حەکەمەوه، له باوکیەوه دەگێڕنەوه، که وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی بەئاو گەیاند له پاشاندا دەستنوێژی گرت و ئاوی پژاند له نافەکی.

## باسی کەسێ کاتێ که دەستنوێژی گرت چی بڵێت.

## ٦٥ - بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا تَوَضَّأَ.

١٦٩ - (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُدَّامَ أَنْفُسِنَا: نَتَنَاوَبُ الرِّعَايَةَ، رِعَايَةَ إِبِلِنَا، فَكَانَتْ عَلَيَّ رِعَايَةُ الإِبِلِ، فَرَوَّحْتُهَا بِالْعَشِيِّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ النَّاسَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ يُقْبِلُ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلاَّ قَدْ أَوْجَبَ). فَقُلْتُ: بَخْ

بَخْ، مَا أَجْوَدَ هَذِهِ! فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ: الَّتِي قَبْلَهَا يَا عُقْبَةُ أَجْوَدُ مِنْهَا، فَنَظَرْتُ فَإِذَا هُوَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقُلْتُ: مَا هِيَ يَا أَبَا حَفْصٍ ؟ قَالَ: إِنَّهُ قَالَ آنِفًا قَبْلَ أَنْ تَجِيءَ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ وُضُوئِهِ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، شوانی خۆمان بووین خزمەتکاری کەس نەبوین، سەرپەرشتی وشترەکانی خۆمان دەکرد، هەر رۆژەو یەکێکمان وشترەکانمان دەبرد بۆ لەوەڕگا، جارێك نۆرەی من بوو وشترەکانم برد بۆ لەوەڕگا، ئێوارە کە هێنانمەوە بۆ شوێنی حەوانەوەیان دوای ئەوەی کە ئیش و کارەکانم راپەڕاند چووم بۆ کۆڕی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا بۆ خەڵك، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (هەر کەسێك لە ئێوە بە جوانی و بەتەواوی دەستنوێژێك بگرێت، پاشان هەستێ بەگەردنکەچی و بە خشوعەوە روو بکاتە خواو دوو رکات نوێژ بکات ئیللا ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت) وتم: بەخ بەخ ئەمە چ بەخشندەییەکی گەورەیە، پیاوێ کە پێشتر لە کۆڕەکەدا بوو وتی: ئەی عوقبە لەوەش چاکتر، سەرنجمدا سەیر دەکەم عومەری کوڕی (خطاب)ە وتم: ئەو شتە چییە ئەی (أَبَا حَفْص)؟ وتی: پێش ئەوەی کە تۆ بێیت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەر

کەسێك دەستنوێژێکی جوان بگرێت پاشان بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). واتە: من شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە بێجگە لە خوا کە تەنیایەو هاوەڵی نیە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەی خوایەو پێغەمبەریەتی. ئەوا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی.

**١٧٠ - (ضعيف) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَمْرَ الرِّعَايَةِ، قَالَ عِنْدَ قَوْلِهِ: (فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ): (ثُمَّ رَفَعَ بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ). وَسَاقَ الْحَدِيثَ بِمَعْنَى حَدِيثِ مُعَاوِيَةَ.**

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی سەرپەرشتی وشترەکانی نەکرد، وتی: لەدوای: (فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ). واتە: (دەستنوێژێکی جوان بگرێت) فەرمووی: (پاشان سەری بەرزکاتەوە بۆ ئاسمان و پاشان بڵێ: - أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.. - ). راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە بە هەمان مانای فەرموودەکەی مەعاویە.

## باسی کەسێ چەند نوێژێك بکات بە یەك دەستنوێژەوە.

## ٦٦ – بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ.

١٧١ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ الْبَجَلِيِّ - قَالَ: مُحَمَّدٌ هُوَ أَبُو أَسَدِ بْنِ عَمْرٍو - قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ الْوُضُوءِ؟ فَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَكُنَّا نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ.

واتە: عەمری کوڕی عامری بەجەلی دەڵێت: - موحەممەد وتی: کە ناسراوە بە ئەبو ئەسەدی کوڕی عەمر – دەڵێت: سەبارەت بە دەستنوێژ پرسیارم کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیك؟ ئەنەس وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی تازە دەکردەوە، بەڵام ئێمە بە دەستنوێژێکەوە چەند نوێژێکمان دەکرد.

١٧٢ - (صحيح) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَوْمَ الْفَتْحِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنِّي رَأَيْتُكَ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ؟ قَالَ: (عَمْدًا صَنَعْتُهُ).

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا بە یەك دەستنوێژ هەر پێنج نوێژەکەی کرد، پێکانی نەشت لە باتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر خوفەکانیدا، عومەر پێی وت: ئەمەی ئەمڕۆ کردت نەم دیوە پێشتر بیکەیت؟ فەرمووی: (بە ئەنقەست ئەو کارەم کرد).

**باسی شوشتنی زۆربەی ئەندامەکانی دەستنوێژ یان هەندێکیان و نەشوشتنی هەندێکیان ئیتر بە قەستی بێت یان بەنەزانی وە یا ئەندامەکە وشك بێتەوە پاشان بیشوات یان ئەو شوێنە تەڕ بکات ئایا ئەو کەسەی کاری لەو جۆرە بکات حوکمی چییە، سەرلەنوێ دەستنوێژ بگرێتەوە یان ئەو شوێنە تەڕ بکات؟**

## ٦٧ - بَابُ تَفْرِيقِ الْوُضُوءِ.

**١٧٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ تَوَضَّأَ وَتَرَكَ عَلَى قَدَمَيْهِ مِثْلَ مَوْضِعِ الظُّفْرِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ ).**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت بەقەد نینۆکێکی لە پێی نەشت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاوی لێی بوو پێی فەرموو: (بچۆرەوە بەجوانی دەستنوێژەکەت بگرەوە!).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِمَعْرُوفٍ عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، وَلَمْ يَرْوِهِ إِلاَّ ابْنُ وَهْبٍ وَحْدَهُ، وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عُمَرَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ قَالَ: (ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ).

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمووده لە جەریری کوڕی حازمەوە ناسراو نیەو، جگە لە ئیبنو وەهبیش کەسی تر ریوایەتی نەکردووە، وە لە ریوایەتێکی تردا بە هەمان شێوە لە عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە فەرموویەتی: (بچۆرەوە بەجوانی دەستنوێژەکەت بگرە!).

| |
|---|
| ١٧٤ - عَنْ الْحَسَنِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَى قَتَادَةَ. |

واتە: حەسەن بە هەمان مانای فەرمودەکەی قەتادە فەرمودەکەی گێڕاوەتەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم.

| |
|---|
| ١٧٥ - (صحيح) عَنْ خَالِدٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي وَفِي ظَهْرِ قَدَمِهِ لُمْعَةٌ قَدْرُ الدِّرْهَمِ لَمْ يُصِبْهَا الْمَاءُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعِيدَ الْوُضُوءَ وَالصَّلاَةَ. |

واتە: لە خالدەوە، لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد پارچەیە لە پشتی پێی کە بەقەد درهەمێك دەبوو ئاوی بەرنەکەوتبوو، بۆیە فەرمانی پێ کرد کە دەستنوێژەکەی بگرێتەوەو نوێژەکەی بکاتەوە.

## باسی کەسێ لەنوێژدا گومانی بۆ دروست بێ دەستنوێژەکەی شکاوە

## ٦٨ – بَابُ إِذَا شَكَّ فِي الْحَدَثِ.

١٧٦ - (صحيح) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ، قَالَ: شُكِيَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ حَتَّى يُخَيَّلَ إِلَيْهِ؟ فَقَالَ: (لاَ يَنْفَتِلُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا).

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە، لە مامیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سکاڵایان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوی وا هەیە لەناو نوێژدا هەست بە شتێ دەکات ئەمە چارەی چییە؟ فەرمووی: (با نوێژەکەی نەبڕێت هەتا دەنگێ دەبیستێ یان هەست بە بۆنێ دەکات).

١٧٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَوَجَدَ حَرَكَةً فِي دُبُرِهِ أَحْدَثَ أَوْ لَمْ يُحْدِثْ؟ فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ فَلَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە لەناو نوێژدا هەستی بە جوڵەیە کرد لە پاشیەوە کە دەستنوێژەکەی شکاوە یان نا؟ وە بوو بەگرێ لەدڵیدا با نوێژەکەی نەبڕێت و بەردەوام بێت هەتا دەنگێ دەبیستێ یان هەست بە بۆن دەکات).

## باسی دەستنوێژگرتنەوە لە ماچ.

## ٦٩ – بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ الْقُبْلَةِ.

١٧٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبَّلَهَا وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

واته: لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماچی کردووە و دەستنوێژی نەگرتۆتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ مُرْسَلٌ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عَائِشَةَ شَيْئًا.

ئـەبو داود دەڵێـت: فەرموودەکـە (مُرْسَـل)ە چـونکە ئیبراهیمـی تـەیمی راوی فەرموودەکە هیچ شتێکی نەبیستووە لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا رَوَاهُ الْفِرْيَابِيُّ وَغَيْرُهُ.

ئەبو داود دەڵێت: بەم شێوەیە فیریابی و غەیری ئەویش گێڕاویانەتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَاتَ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ وَلَمْ يَبْلُغْ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَكَانَ يُكْنَى أَبَا أَسْمَاءَ.

ئەبو داود دەڵێت: ئیبراهیمی تەیمی تەمەنی نەگەیشتۆتە چل ساڵ مـردووە، بە (أَبَا أَسْمَاءَ) ناسراو بووە.

١٧٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبَّلَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قَالَ عُرْوَةُ: فَقُلْتُ لَهَا: مَنْ هِيَ إِلاَّ أَنْتِ؟ فَضَحِكَتْ.

واتـە: لـە خـاتوو عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکێك لە ژنەکانی خۆی ماچ کرد، پاشان رۆیشـت نوێـژی کـردوو دەستنوێژیشـی نەگرتـەوە. عـورووەی کـوڕی زوبێـر کـە دەکاتە خوشکەزای وتی: پێم وت: دیـارە ئـەو ژنـە هـەر خـۆت بوویـت؟ ئـەویش پێکەنی.

١٨٠ - (ضعيف) عَنْ عُرْوَةَ الْمُزَنِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: عوروەی موزەنییەوە، لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ، ئەم فەرموودە هاتووە.

## دەستنوێژ گرتنەوە لە دەستدان لە زەكەر.

## ٧٠ – بَابُ الْوُضُوءِ مِنْ مَسِّ الذَّكَرِ.

١٨١ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ يَقُولُ: دَخَلْتُ عَلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَذَكَرْنَا مَا يَكُونُ مِنْهُ الْوُضُوءُ، فَقَالَ: مَرْوَانُ وَمِنْ مَسِّ الذَّكَرِ، فَقَالَ عُرْوَةُ: مَا عَلِمْتُ ذَلِكَ، فَقَالَ مَرْوَانُ: أَخْبَرَتْنِي بُسْرَةُ بِنْتُ صَفْوَانَ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ).

واتە: لە (عبدالله)ی كوڕی ئەبو بەكرەوە دەگێڕنەوە، كە لە عوروەی بیستوە وتویەتی: چوومە خزمەت مەروانی كوڕی حەكەم، باسی ئەوەمان كرد كە پێویستە لە چ شتێك دەستنوێژ بگیرێتەوە، مەروان وتی: لە دەستدان لە زەكەر دەستنوێژ دەگیرێتەوە. عوروە وتی: ئەوەم نەزانیوە كە پێویستە دەستنوێژ بگیرێتەوە، مەروان وتی: (بُسْرَة)ی كچی (صَفْوَان) بۆی گێڕامەوە: كە گوێی لە

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە فەرموویەتی: (هەر كەسێك دەست بدات لە زەكەری با دەستنوێژ بگرێتەوە).

## باسی روخسەت لەمەدا

## ٧١ - بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

١٨٢ - (صحيح) عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِيٌّ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا تَرَى فِي مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بَعْدَ مَا يَتَوَضَّأُ فَقَالَ:(هَلْ هُوَ إِلاَّ مُضْغَةٌ مِنْهُ). أَوْ ﴿قَالَ﴾: (بَضْعَةٌ مِنْهُ ).

واتە: لە قەیسی كوڕی (طَلْق)ەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە وتویەتی: چوین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێك هات وەك دەشتەكی وابوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاو بە دەستنوێژەوە دەستی لە زەكەری بكەوێت ئایا دەستنوێژەكەی دەشكێ یان نا؟ فەرمووی: (نەخێر، چونكە ئەویش پارچە گۆشتێكە لە جەستەی خۆی). یان فەرمووی: (چونكە پارچەیەكە لە خۆی) - وەك قاچی یان پەنجەی -.

١٨٣ - (صحيح) عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ وَقَالَ: فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە قەیسی کوڕی (طَلْـق)ەوە، بـە هـەمان سـەنەد و مانـا فەرموودەکـەی پێشوو هاتووە، بـەڵام ئەمـەی بۆ زیـاد کـرد وتـی: لـە نوێـژدا دەسـت بـدات لـە زەکەری.

## باسی دەستنوێژ گرتنەوە لەدوای خواردنی گۆشتی وشتر.

## ٧٢ – بَابُ الْوُضُوءِ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ.

١٨٤ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَـازِبٍ، قَـالَ: سُـئِلَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْوُضُوءِ مِنْ لُحُـومِ الإِبِـلِ؟ فَقَالَ:(تَوَضَّـئُوا مِنْهَـا). وَسُـئِلَ عَـنْ لُحُـومِ الْغَـنَمِ؟ فَقَالَ:(لاَ تَتَوَضَّئُوا مِنْهَا). وَسُـئِلَ عَـنْ الصَّـلاَةِ فِـي مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ فَقَـالَ:(لاَ تُصَـلُّوا فِـي مَبَـارِكِ الإِبِـلِ، فَإِنَّهَا مِنَ الشَّيَاطِينِ). وَسُئِلَ عَنْ الصَّلاَةِ فِي مَـرَابِضِ الْغَنَمِ؟ فَقَالَ:(صَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ).

واتـە: لـە (الْبَـرَاءِ)ی کـوڕی عازبـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: سـەبارەت بـە دەستنوێژ گرتنەوە لەدوای خواردنی گۆشتی وشتر پرسـیار کـرا لـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ فەرمووی: (دەستنوێژ بگرنەوە). هـەروەها دەربـارەی گۆشـتی مـەڕ پرسـیاری لـێ کـرا؟ فـەرمووی: (لـەدوای خـواردنی گۆشـتی مـەڕ دەستنوێژ مەگرنەوە). وە دەربارەی نوێژکردن لە مۆڵگەی وشتردا پرسـیاری لـێ

کــرا؟ فــەرمووی: (لەمۆڵگــەی وشــتردا نوێــژ مەکــەن، چــونکە ئەوانــە لــە شەیتانەکانەوەیەو شوێنی شەیتانەکانە). هەروەها سەبارەت بە نوێژکردن لە مۆڵگەی مەڕدا پرسیاری لێ کرا؟ فەرمووی: (لەمۆڵگەی مەڕدا نوێژ بکەن، چونکە ئەوانە خێر و بەرەکەتن).

## باسی دەستنوێژ گرتنەوە لەدوای دەستدان و شوشتنی گۆشتی کاڵ و نەکولاو.

## ٧٣ – بَابُ الْوُضُوءِ مِنْ مَسِّ اللَّحْمِ النِّيءِ وَغَسْلِهِ.

١٨٥ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، قَالَ هِلاَلٌ: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَقَالَ أَيُّوبُ وَعَمْرٌو: أُرَاهُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِغُلاَمٍ ﴿وَهُوَ﴾ يَسْلُخُ شَاةً فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَنَحَّ حَتَّى أُرِيَكَ) فَأَدْخَلَ يَدَهُ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ فَدَحَسَ بِهَا حَتَّى تَوَارَتْ إِلَى الإِبْطِ، ثُمَّ مَضَى فَصَلَّى لِلنَّاسِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

واتە: لە (عَطَاء)ی کوڕی (يَزِيد اللَّيْثِيِّ)ەوە، هیلال وتی: نازانم ئیللا لە ئەبو سەعیدەوە نەبێت، وە ئەیوب و عەمر وتیان: وا دەبینین لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەلای غولامێکدا تێپەڕی مەڕێکی کەوڵ دەکرد پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (بچۆ

ئەو لاوە هەتا فێرت بکەم) جا بە هێزی خۆی لەنێوان گۆشت و پێستەکەیەوە دەستی بردە ژوورەوە هەتا بن دەستی، پاشان ڕۆشت بەرنوێژی کرد بۆ خەڵك و دەستنوێژیشی نەگرتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ - يَعْنِي لَمْ يَمَسَّ مَاءً - .

ئەبو داود دەڵێت: عەمر لە فەرموودەکەیدا ئەمەشی بۆ زیاد کرد - واتە - دەستیشی نەشت.

## باسی دەستنوێژ نەگرتنەوە لەدوای دەستدان لە گۆشتی مردارەوەبوو

## ٧٤ – بَابُ تَرْكِ الْوُضُوءِ مِنْ مَسِّ الْمَيْتَةِ

١٨٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِالسُّوقِ دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ وَالنَّاسُ كَنَفَتَيْهِ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ، ثُمَّ قَالَ: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ). وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە جابرەوە هاتووە، کە ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەناو بازاڕدا تێپەڕی موسڵمانەکانیش لەم شان و شانیەوە لەگەڵی دەڕۆیشتن، دای بەلای گیسکێکی کەڕیلەی مردارەوەبوودا، گوێچکەی گیسکەکەی گرت، پاشان فەرمووی: (کێ پێی خۆشە ئەمە بۆ ئەو بێت). پاشان فەرموودەکەی گێڕایەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم[١]

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## باسی دەستنوێژ نەگرتنەوە لەو شتانەی كە ئاگريان بەركەوتووە

## ٧٥ - بَابُ فِي تَرْكِ الْوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ.

١٨٧ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شانی مەڕێكی خوارد، پاشان هەستا نوێژی كردوو دەستنوێژیشی نەگرتەوە.

١٨٨ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: ضِفْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَأَمَرَ بِجَنْبٍ فَشُوِيَ، وَأَخَذَ الشَّفْرَةَ فَجَعَلَ يَحُزُّ لِي بِهَا مِنْهُ، قَالَ: فَجَاءَ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ، قَالَ: فَأَلْقَى الشَّفْرَةَ وَقَالَ: (مَا لَهُ تَرِبَتْ يَدَاهُ). وَقَامَ يُصَلِّي.

---

[١] - لێرەوە بەشی دووهەمی (سنن أبی داود) دەست پێ دەكات.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: شەوێکیان میوانداری پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم کرد، فەرمانی کرد لایەك یان پارچەیەکی گەورە گۆشتی مەڕی بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بیبرژێنن، چەقۆیەکی گەورەی هەلگرت و گۆشتەکەی پێ دەبڕی، موغیرە وتی: بیلال هات هەواڵی دایە بەوەی کە کاتی نوێژە، موغیرە وتی: چەقۆکەی فرێداو فەرمووی: (بۆچی بیلال پەلەی کرد چاوەڕێی نەکرد خواردنەکەم بخۆم دەستی بدرێت بە خۆڵەوە). هەستا نوێژی کرد.

زَادَ الأَنْبَارِيُّ: وَكَانَ شَارِبِي وَفَاء، فَقَصَّهُ لِي عَلَى سِوَاكٍ. أَوْ قَالَ: أَقُصُّهُ لَكَ عَلَى سِوَاكٍ.

ئەنباری ئەمە بۆ زیاد کرد: سمێڵم زۆر بوو درێژ بوو بوو لەسەر سیواکێ بۆی بڕیم، یان فەرمووی: لەسەر سیواکێ بۆت بڕم.

١٨٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: أَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتِفًا، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِمِسْحٍ كَانَ تَحْتَهُ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شانی مەڕێکی خوارد پاشان بە پەلاسێ دەستی سڕی، ئینجا هەستا نوێژی کرد.

١٩٠ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْتَهَشَ مِنْ كَتِفٍ ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە شانی مەڕێکی خوارد پاشان نوێژی کردو دەستنوێژیشی نەگرتەوە.

| |
|---|
| ١٩١ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدُ اللَّه، قَالَ: قَرَّبْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُبْزًا وَلَحْمًا، فَأَكَلَ، ثُمَّ دَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ بِهِ، ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ طَعَامِهِ فَأَكَلَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. |

واتە: لە جابری کوڕی (عبداللە)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: نان و گۆشتم خستە بەردەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەویش لێی خوارد، پاشان داوای ئاوی کرد بۆ دەستنوێژ بۆم هێنا دەستنوێژی گرت، ئینجا نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان داوای ئەو خواردنەی کرد کە لێی مابۆوە بۆم هێناو لێی خوارد، ئینجا هەستا بۆ نوێژ و دەستنوێژیشی نەگرتەوە.

| |
|---|
| ١٩٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: كَانَ آخِرُ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرْكَ الْوُضُوءِ مِمَّا غَيَّرَتِ النَّارُ. |

واتە: لە جابرەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەدوایدا داواکاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە سەر ئەوە: وازی لە دەستنوێژگرتن هێنا بۆ خواردنی ئەو خواردەمەنیەی کە بە ئاگر پوختە بکرێت.

١٩٣ – (ضعيف) عَنْ عُبَيْدُ بْنُ ثُمَامَةَ الْمُرَادِيُّ، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا مِصْرَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ فِي مَسْجِدِ مِصْرَ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي سَابِعَ سَبْعَةٍ، أَوْ سَادِسَ سِتَّةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دَارِ رَجُلٍ، فَمَرَّ بِلَالٌ، فَنَادَاهُ بِالصَّلَاةِ، فَخَرَجْنَا، فَمَرَرْنَا بِرَجُلٍ، وَبُرْمَتُهُ عَلَى النَّارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَطَابَتْ بُرْمَتُكَ؟) قَالَ: نَعَمْ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، فَتَنَاوَلَ مِنْهَا بَضْعَةً فَلَمْ يَزَلْ يَعْلِكُهَا حَتَّى أَحْرَمَ بِالصَّلَاةِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ.

واتە: عوبەیدی كوڕی (ثُمَامَة)ی موورادی دەڵێت: (عبدالله)ی كوڕی (حَارِث)ی كوڕی (جَزْء)ی كە یەكێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هات بۆ میسر، لە مزگەوتی میسردا قسەی دەكرد بۆ خەڵك گوێم لێی بوو دەیوت: بێگومان من یەكێ بووم لە حەوت كەس یان شەش كەس لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەماڵی پیاوێ بووین، بیلال تێ پەڕی و هەواڵی پێداین كە كاتی نوێژكردنە ئێمەش دەرچوین بۆ نوێژ بەلای پیاوێكدا تێ پەڕین مەنجەڵەكەی بەسەر ئاگرەوە بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (چێشتەكەت پێ گەیشتووە؟) وتی: بەڵێ بە دایك و باوكمەوە بە قوربانت بین. پارچەیەكی لێ خوارد چاوم لێی بوو بەردەوام بە دەمیەوە بوو دەیمژی هەتا نوێژ دابەسترا.

## باسی توندی لەمەدا

## ٧٦ – بَابُ التَّشْدِيدِ فِي ذَلِكَ

١٩٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْوُضُوءُ مِمَّا أَنْضَجَتِ النَّارُ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: دەستنوێژ بگرنەوە لەو خواردنەی کە بە ئاگر کوڵاوە.

١٩٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ حَدَّثَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ فَسَقَتْهُ قَدَحًا مِنْ سَوِيقٍ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَمَضْمَضَ، فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي أَلاَ تَوَضَّأُ؟ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (تَوَضَّئُوا مِمَّا غَيَّرَتِ النَّارُ ). أَوْ قَالَ: مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبا سوفیانی کوڕی سەعیدی کوڕی موغیرە بۆی گێڕاوەتەوە، کە چووە بۆ لای پوری ئوم حەبیبەی خێزانی

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەویش پەرداخێ (سَوِیق)ی بۆ هێناوەو لێی خواردووە کە خواردنێکە لە ئاردی گەنم یان جۆ دروست دەکرێت، داوای ئاوی کردووە لەدەمی راداوە، ئوم حەبیبەش وتویەتی: ئەی خوشکەزاکەم ئەوە بۆچی دەستنوێژ ناگریتەوە لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرمویێت: (دەستنوێژ بگرنەوە لە خواردنی ئەو خواردەمەنیەی کە بە ئاگر پوختە کرابێت) یان فەرمووی: (دەستنوێژ بگرنەوە لەو خواردنەی کە ئاگری بەرکەوتووە).

## باسی دەستنوێژگرتنەوەو ئاو لەدەم رادان و شۆردنی ناودەم لەدوای شیر خواردنەوە

## ٧٧ - بَابُ ﴿فِي﴾ الْوُضُوءِ مِنَ اللَّبَنِ

١٩٦ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَرِبَ لَبَنًا فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَمَضْمَضَ ثُمَّ ، قَالَ: (إِنَّ لَهُ دَسَمًا).

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کە جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شیری خواردەوە داوای ئاوی کرد لەدەمی رادا، پاشان فەرمووی: (بەڕاستی شیر چەورایی هەیە).

## روخسەت لەمەدا

## ٧٨ – بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

| |
|---|
| ١٩٧ - (حسن) عَنْ تَوْبَةَ الْعَنْبَرِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَرِبَ لَبَنًا فَلَمْ يُمَضْمِضْ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، وَصَلَّى. |

واتە: لە (تَوْبَةَ الْعَنْبَرِيِّ)ەوە، هاتووە، کە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی بیستووە، وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شیری خواردەوە نە ئاوی لەدەم راداو نە دەستنوێژی گرتەوە، وە نوێژیشی کرد.

## باسی دەستنوێژ گرتنەوە لە خوێن.

## ٧٩ – بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ الدَّمِ.

| |
|---|
| ١٩٨ - (حسن) عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِي فِي غَزْوَةِ ذَاتِ الرِّقَاعِ - فَأَصَابَ رَجُلٌ امْرَأَةَ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أُهَرِيقَ دَمًا فِي أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ، فَخَرَجَ يَتْبَعُ أَثَرَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ |

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْزِلاً، فَقَالَ: (مَنْ رَجُلٌ يَكْلَؤُنَا؟) فَانْتَدَبَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: (كُونَا بِفَمِ الشِّعْبِ). قَالَ: فَلَمَّا خَرَجَ الرَّجُلاَنِ إِلَى فَمِ الشِّعْبِ اضْطَجَعَ الْمُهَاجِرِيُّ، وَقَامَ الأَنْصَارِيُّ يُصَلِّي، وَأَتَى الرَّجُلُ، فَلَمَّا رَأَى شَخْصَهُ عَرَفَ أَنَّهُ رَبِيئَةٌ لِلْقَوْمِ، فَرَمَاهُ بِسَهْمٍ فَوَضَعَهُ فِيهِ، فَنَزَعَهُ، حَتَّى رَمَاهُ بِثَلاَثَةِ أَسْهُمٍ، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، ثُمَّ انْتَبَهَ صَاحِبُهُ، فَلَمَّا عَرَفَ أَنَّهُمْ قَدْ نَذِرُوا بِهِ هَرَبَ، وَلَمَّا رَأَى الْمُهَاجِرِيُّ مَا بِالأَنْصَارِيِّ مِنَ الدَّمَاءِ، قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! أَلاَ أَنْبَهْتَنِي أَوَّلَ مَا رَمَى! قَالَ: كُنْتُ فِي سُورَةٍ أَقْرَأُهَا، فَلَمْ أُحِبَّ أَنْ أَقْطَعَهَا.

واتە: لە جابرەوە هاتووە، كە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم دەرچووین بۆ غەزا - واتە غەزای (ذَاتِ الرِّقَاع) – پیاوێ ژنی پیاوێكی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەری كوشت، پیاوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەكە سوێندی خوارد كە واز نەهێنێ هەتا خوێنی یەكێ لە هاوەڵانی موحەممەد نەڕێژێ، شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم كەوت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە شیوێكدا دابەزی فەرمووی: (ئەم شەو كێ پاسەوانیمان دەكات). پیاوێ لە كۆچەران(مهاجرین) و پیاوێ لە یاریدەدەران(أنصار) هەستان، فەرمووی: (لە دەم كەلی شیوەكەوە بن). وتی: كاتێ كە دوو پیاوەكە گەیشتنە دەم كەلی شیوەكە شەویان دابەشكرد بۆ پاسەوانی، كۆچەرەكە لێی ڕاكشاو

خەوت، یاریدەدەرەكەش هەستا دەستی كرد بە نوێژكردن، پیاوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەكە هات كە زانی پاسەوانی قەومەكەیە تیرێكی تێ گرت و بریندارى كرد ئەویش هەر لەسەر نوێژكردن بەردەوام بوو، ئینجا تیری دووەمی تێ گرت و پێكای بەڵام ئەو نوێژەكەی نەبڕی و هەر بەردەوام بوو، پاشان تیری سێهەمی تێ گرت و پێكای ئەویش ركوع و سەجدەی برد بەو شێوەیە نوێژەكەی تەواو كرد، ئینجا هاوڕێكەی هەستان لەخەو و ئاگاداری كردەوە، پیاوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەكە زانی هاوەڵەكەی ئاگادار كردۆتەوە هەڵهات، هاوەڵەكەی كاتێ كە بە خوێنەوە بینی وتی: (سَبْحَانَ اللَّهِ!) بۆ هەر یەكەم تیر خەبەرت نەكردمەوە! وتی: سورەتێكم دەخوێند پێم خۆش بوو نەیبڕم و تەواوی بكەم!!.

## باسی دەستنوێژ گرتنەوە دوای هەستان لەخەو.

## ٨٠ - بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ النَّوْمِ.

١٩٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شُغِلَ عَنْهَا لَيْلَةً فَأَخَّرَهَا حَتَّى رَقَدْنَا فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ رَقَدْنَا، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ رَقَدْنَا، ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ:(لَيْسَ أَحَدٌ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ غَيْرَكُمْ).

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەوێ سەرقاڵ بوو لە نوێژی

خەوتنان ئەوەندە دواکەوت هەتا ئێمە لە مزگەوت لێی راکشاین، پاشان هەستاین لەخەو، ئینجا راکشاینەوە، پاشان لەژوورەکەی خۆیەوە هاتەدەرەوە بۆ لامان و فەرمووی: (کەس چاوەڕێی نوێژکردن ناکات جگە لە ئێوە).

٢٠٠ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْتَظِرُونَ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ حَتَّى تَخْفِقَ رُءُوسُهُمْ، ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلاَ يَتَوَضَّئُونَ.

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مزگەوتدا چاوەڕێی نوێژی خەوتنانیان دەکرد هەتا ملیان لار دەبۆوە لەبەر خەو، پاشان نوێژیان دەکرد و دەستنوێژیشیان نەدەگرتەوە.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ فِيهِ شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ ، قَالَ: كُنَّا نَخْفِقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

ئەبو داود دەڵێت: شوعبە فەرموودەکەیدا لە قەتادەوە ئەمەشی بۆ زیاد کردووە وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ملمان لار دەبۆوە لەبەر خەو.

(صحيح) عَنْ قَتَادَةَ بِلَفْظٍ آخَرَ.

لە قەتادەوە بە گۆیەکی تر هاتووە.

٢٠١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: أُقِيمَتْ صَلَاةُ الْعِشَاءِ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي حَاجَةً؟ فَقَامَ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَعَسَ الْقَوْمُ - أَوْ بَعْضُ الْقَوْمِ - ثُمَّ صَلَّى بِهِمْ وَلَمْ يَذْكُرْ وُضُوءًا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنان پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من ئیشێکم پێتە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەستا بە چپە قسەی لەگەڵ کرد هەتا خەڵکەکە خەو بردنیەوە یان هەندێکیان خەو بردنیەوە، پاشان بەرنوێژی بۆ کردن. بەڵام باسی دەستنوێژگرتنەوەی نەکرد.

٢٠٢ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَسْجُدُ، وَيَنَامُ وَيَنْفُخُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي وَلَا يَتَوَضَّأُ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: صَلَّيْتَ وَلَمْ تَتَوَضَّأْ وَقَدْ نِمْتَ؟ فَقَالَ:(إِنَّمَا الْوُضُوءُ عَلَى مَنْ نَامَ مُضْطَجِعًا). زَادَ عُثْمَانُ وَهَنَّادٌ (فَإِنَّهُ إِذَا اضْطَجَعَ اسْتَرْخَتْ مَفَاصِلُهُ).

[المشكاة: ٤١٣].

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی کردوو بە دانیشتنەوە خەوت و پرخەی لێ دا پاشان هەستا نوێژی کردو دەستنوێژیشی نەگرتەوە. پێم وت: بەبێ ئەوەی دەستنوێژ بگریتەوە نوێژت کرد لە کاتێکدا کە خەوت بویت،

فەرمووی: (دەستنوێژ گرتنەوە لەسەر کەسێکە کە لەسەر لاتەنیشتی راکشێ و بخەوێت). (عثمان) و (هناد) ئەمەشیان بۆ زیاد کردووە: چونکە ئەو کەسە کاتێك کە رادەکشێ جومگەکانی خاو دەبنەوە، ئەوکاتە ئاساییە کە شتێکی وەك بۆن لێ دەرچێت.

(صحيح) قَالَ أَبو دَاوُدَ: قَوْلُهُ (الْوُضُوءُ عَلَى مَنْ نَامَ مُضْطَجِعًا ). هُوَ حَدِيثٌ مُنْكَرٌ لَمْ يَرْوِهِ إِلاَّ يَزِيدُ أَبو خَالِدٍ الدَّالاَنِيُّ، عَنْ قَتَادَةَ، وَرَوَى أَوَّلَهُ جَمَاعَةٌ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَلَمْ يَذْكُرُوا شَيْئًا مِنْ هَذَا وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَحْفُوظًا وَقَالَت عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (تَنَامُ عَيْنَايَ، وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي)[١].

ئەبو داود دەڵێت: وتەی: (دەستنوێژ گرتنەوە لەسەر کەسێکە کە لەسەر لاتەنیشتی راکشێ و بخەوێت). فەرموودەیەکی (منكر)ە جگە لە یەزیدی ئەبو خالیدی دالانی، ئەویش لە قتادەوە کەسی تر ریوایەتی نەکردووە، وە سەرەتای فەرموودەکە کۆمەڵێك لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ ریوایەتیان کردووە، بەڵام باسی هیچ شتێکیان لەو شێوەیە نەکردووە، هەروەها وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دڵی پارێزراو بوو لە خەوتن - واتە دڵی

---

١- وَقَالَ شُعْبَةُ إِنَّمَا سَمِعَ قَتَادَةُ مِنْ أَبِي الْعَالِيَةِ أَرْبَعَةَ أَحَادِيثَ حَدِيثَ يُونُسَ بْنِ مَتَّى وَحَدِيثَ ابْنِ عُمَرَ فِي الصَّلاَةِ وَحَدِيثَ الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ وَحَدِيثَ ابْنِ عَبَّاسٍ حَدَّثَنِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ مِنْهُمْ عُمَرُ وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَذَكَرْتُ حَدِيثَ يَزِيدَ الدَّالاَنِيِّ لأَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ فَانْتَهَرَنِي اسْتِعْظَامًا لَهُ وَقَالَ مَا لِيَزِيدَ الدَّالاَنِيِّ يُدْخِلُ عَلَى أَصْحَابِ قَتَادَةَ وَلَمْ يَعْبَأْ بِالْحَدِيثِ.

نەدەخەوت چونکە هەمیشە ئامادە بوو بۆ وەرگرتنی وەحی. عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من چاوم دەخەوێت، بەڵام دڵم هۆشیارە ناخەوێت).

٢٠٣ - (حسن) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِى طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وِكَاءُ السَّهِ الْعَيْنَانِ، فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ ).

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو (طالب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: چاوەکان پەتی بەستنی کۆمن، جا هەرکەسێك خەوت با دەستنوێژ بگرێتەوە – چونکە دەستنوێژەکەی شکاوە.

## باسی کەسێ پیسی بەر پێی بکەوێت دەستنوێژبگرێتەوە یان نا.

## ٨١ – بَابُ فِى الرَّجُلِ يَطَأُ الأَذَى بِرِجْلِهِ.

٢٠٤ - (صحيح) عَنْ شَقِيقٍ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كُنَّا لاَ نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ، وَلاَ نَكُفُّ شَعْرًا، وَلاَ ثَوْبًا.

واتە: لە شەقیقەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عبداللە)ی کوڕی مەسعود وتویەتی: ئێمە لەو پیسیەی کە لە ڕێگادا بەر پێمان دەکەوت دەستنوێژمان

نەدەگرتـەوە، هـەروەها پـرچ و پۆشـاکمان کۆنـەدەکردەوە - ئەگـەر خـۆڵ و تـۆز بوایە شوێنەکەیان نەدەشت بەڵام ئەگەر تەڕ بوایە شوێنەکەیان دەشت -.

## باسی کەسیٚ لە نوێژدا دەستنوێژی بشکیٚ.

## ٨٢ - بَابُ مَنْ يُحْدِثُ فِي الصَّلاَةِ.

**٢٠٥ - (ضعيف) عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (إِذَا فَسَـا أَحَـدُكُمْ فِـي الصَّـلاَةِ فَلْيَنْصَرِفْ، فَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُعِدِ الصَّلاَةَ ).**

// ضعيف الجامع الصغير (٦٠٧) ، (المشكاة: ٣١٤، ١٠٠٦) //.

واتە: لە عەلی کوڕی (طَلْق)ەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: ئەگـەر کەسـێ لـەئێوە لەنوێـژدا بایـەکی لـێ بوویەوە با نوێژەکەی ببڕێـت و بـڕوات دەسـتنوێژ بگرێتـەوە، ئینجا نوێژەکـەی بکاتەوە.

# باسی دەستنوێژ گرتنەوە لە (مذي)[1]

## ٨٣ – بَابُ فِي الْمَذْيِ

٢٠٦ – (صحيح) عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً فَجَعَلْتُ أَغْتَسِلُ حَتَّى تَشَقَّقَ ظَهْرِي! فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَوْ ذُكِرَ لَهُ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَفْعَلْ إِذَا رَأَيْتَ الْمَذْيَ فَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، وَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، فَإِذَا فَضَخْتَ الْمَاءَ فَاغْتَسِلْ ).

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو (طالب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من (مذي)م زۆر بوو ئەوەندە خۆم شت هەتا لەتاو سەرما پێستی پشتم قڵیش قڵیش بوو بوو ئەو حاڵەتەم باس کرد بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - یان بۆیان باس کرد - فەرمووی: (خۆت مەشۆ ئەگەر (مذي)ت بینی زەکەرت و ئەو شوێنە بشۆ کە (مذي)یەکەی بەرکەوتووە، جا دەستنوێژبگرەوە وەك چۆن دەستنوێژ دەگریت بۆ نوێژ کردن، ئەگەر ئاو هەڵقوڵی ئەوە خۆت بشۆ.

---

[1] - ئاوێکی سپی لینجە لەکاتی بیرکردنەوە لە جیماع یان دەستبازی کردن لەگەڵ خێزاندا دێتەدەر.

٢٠٧ - (صحيح) عَنْ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَمَرَهُ أَنْ يَسْأَلَ﴿لَهُ﴾ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الرَّجُلِ إِذَا دَنَا مِنْ أَهْلِهِ فَخَرَجَ مِنْهُ الْمَذْيُ، مَاذَا عَلَيْهِ؟ فَإِنَّ عِنْدِي ابْنَتَهُ وَأَنَا أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَهُ، قَالَ الْمِقْدَادُ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ:(إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ فَلْيَنْضَحْ فَرْجَهُ، وَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ ).

واتە: پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو (طالب) ڕەزای خوای لێ بێ فەرمانی كرد بە میقدادی كوڕی ئەسوەد كە پرسیاری بۆ بكات لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بە پیاوێ ئەگەر نزیك بووە لە ژنەكەی و (مذي) دەرچوو، ئایا خۆی بشوات یان دەستنوێژ بگرێتەوە؟ پێشەوا عەلی وتی: چونكە هاوسەرەكەم (فاطمة) كچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بوو خۆم شەرم دەكەم لێی بپرسم، میقداد وتی: منیش لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی، ئەویش فەرمووی: (ئەگەر كەسێ لە ئێوە (مذي) بینی با شەرمگەی بشوات، ئینجا دەستنوێژ بگرێتەوە وەك چۆن دەستنوێژ دەگرێت بۆ نوێژ كردن).

٢٠٨ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ لِلْمِقْدَادِ _ وَذَكَرَ نَحْوَ هَذَا - قَالَ: فَسَأَلَهُ الْمِقْدَادُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لِيَغْسِلْ ذَكَرَهُ وَأُنْثَيَيْهِ).

واتە: لە عوروەوە هاتووە، کە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو (طَالِب) ڕەزای خوای لێ بێ بە میقدادی وتووە.. عوروە بەهەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە، وتی: میقدادیش لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی، ئەویش فەرمووی: (با زەکەر و گەڵ و گونی بشوات).

٢٠٩ - (إسناد صحيح) عَـنْ عَلِـيِّ بْـنِ أَبِـي طَالِـبٍ، قَـالَ: قُلْـتُ لِلْمِقْدَادِ. فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو (طالب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە میقداد. بەهەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ الْمِقْدَادِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَذْكُرْ (أُنْثَيَيْهِ).

ئەبو داود دەڵێت: لە میقدادەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی (با گەڵ و گونی بشوات)ی نەکرد.

٢١٠ - (حسن) عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، قَالَ: كُنْتُ أَلْقَى مِنَ الْمَذْيِ شِدَّةً، وَكُنْتُ أُكْثِرُ مِنْهُ الاغْتِسَالَ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (إِنَّمَا يُجْزِيكَ مِنْ ذَلِكَ الْوُضُوءُ ). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوْبِي مِنْهُ؟ قَالَ: (يَكْفِيكَ بِأَنْ تَأْخُذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ، فَتَنْضَحَ بِهَا مِنْ ثَوْبِكَ حَيْثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَهُ).

واته: له سەهلی کوڕی حونەیفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من لەبارەی (مذي)ەوە - کە ئاوێکی سپی و روون و لینجە بەهۆی زۆری ئارەزووەوە دێت و هەستی پێ ناکرێت – تووشی سەختی و ناخۆشی زۆر هاتبووم لەبەر ئەو (مذي)ە، زۆر خۆمم دەشت، باسم کرد بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و پرسیاری ئەو شتەم لێ کرد؟ ئەویش فەرمووی: (ئەوە بەسە بۆت کە دەستنوێژ بگریت، واتە خۆشوشتنی ناوێت). لەپاشدا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەی ئەگەر بەر پۆشاکەکانم کەوت چۆنە؟ فەرمووی: (بەسە مشتێ ئاو هەلگریت و بیکەیت بەو شوێنەدا کە دەزانی (مذي) بەرکەوتووە).

٢١١ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ سَعْدٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَمَّا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ وَعَنْ الْمَاءِ يَكُونُ بَعْدَ الْمَاءِ؟ فَقَالَ:(ذَاكَ الْمَذْيُ، وَكُلُّ فَحْلٍ يُمْذِي، فَتَغْسِلُ مِنْ ذَلِكَ فَرْجَكَ وَأُنْثَيَيْكَ، وَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ ).

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی سەعدی (الأَنْصَارِيّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم پرسی سەبارەت بەوەی کە چ شتێ خۆشوشتن واجب دەکات؟ هەروەها دەربارەی دەرچوونی (مـذي) لە دوای میزکردن؟ ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (ئەو ئاوەی لە دوای میزکردنەوە دەردەچێت ئەوە (مذي)ە، وە هەموو نێرێك (مذي) هەیە، جا لە (مذي) شەرمگەت بشۆ لەگەڵ گەڵ و گونت، وە دەستنوێژ بگرەوە وەك چۆن دەستنوێژ دەگریت بۆ نوێژکردن).

٢١٢ - (صحيح) عَنْ حَرَامِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ: أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا يَحِلُّ ﴿لِي﴾ مِنَ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: (لَكَ مَا فَوْقَ الإِزَارِ). وَذَكَرَ مُؤَاكَلَةَ الْحَائِضِ أَيْضًا، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە حەرامی کوڕی حەکیمەوە، لە مامیەوە هاتووە، کە لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم پرسیوە، چی ڕەوایە بیکەم لەگەڵ خێزانەکەمدا ئەگەر بێ نوێژ بوو؟ فەرمووی: (هەموو شتێکت بۆ هەیە بەڵام لەسەر پۆشاکەکەیەوە). باسی نان خواردنیشی کرد لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژدا، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٢١٣ - (ضعيف) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَمَّا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ؟ ﴿قَالَ﴾: فَقَالَ: (مَا فَوْقَ الإِزَارِ وَالتَّعَفُّفُ عَنْ ذَلِكَ أَفْضَلُ).

[(ضعيف الجامع الصغير: ٥١١٥)، (المشكاة: ٥٥٢)].

واتە: لە (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەلەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بەوەی کە پیاو لەگەڵ خێزانی خۆیدا چی بۆ ڕەوایە بیکات ئەگەر بێ نوێژ بوو لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم پرسی؟ وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (هەموو شتێکت بۆ هەیە لەسەری پۆشاکەکەیەوە بەڵام ئەگەر خۆت بەدوور بگریت چاکترە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَيْسَ هُوَ - يَعْنِي الْحَدِيثَ - بِالْقَوِيِّ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکە بە هێز نیە.

## باسی کەسیٚ کاری سەرجێگە بکات
## بەڵام ئاوی نەیەتەوە

## ٨٤ – بَابُ فِي الإكْسَالِ.

٢١٤ - (صحيح) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا جَعَلَ ذَلِكَ رُخْصَةً لِلنَّاسِ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ لِقِلَّةِ الثِّيَابِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالْغُسْلِ، وَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: بێگومان خۆنەشوشتن لەدوای ئەنجامدانی کاری سەرجێگە لەکاتێکدا کە ئاو نەیەتەوە ئەو کارە لەسەرەتای ئیسلامەوە روخسەتێ بوو بۆ خەڵك لەبەر کەمی پۆشاك، پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بە خۆشوشتن و ئەو کارەی قەدەغەکرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي (الْمَاءَ مِنَ الْمَاءِ ).

ئەبو داود دەڵێت: واتە: (خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی).

٢١٥ - (صحيح) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ الْفُتْيَا الَّتِى كَانُوا يُفْتُونَ أَنَّ الْمَاءَ مِنَ الْمَاءِ، كَانَتْ رُخْصَةً رَخَّصَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى بَدْءِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالاِغْتِسَالِ بَعْدُ.

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت: ئەو فەتوایەی کە داویانە: (خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی). ئەو کارە لەسەرەتای ئیسلامەوە روخسەتێ بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، دوای ئەوە فەرمانی کرد بە خۆشوشتن با ئاویشی نەیەتەوە.

٢١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا قَعَدَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، وَأَلْزَقَ الْخِتَانَ بِالْخِتَانِ، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر لەنێوان هەر چوارپەلیدا دانیشت، هەردوو شوێنی خەتەنە بەیەك گەیشتن - واتە سەری ئەندامی نێرینە چووە ژوورەوە بۆ ناو ئەندامی مێینە- ئەوە خۆشوشتن واجب دەبێت، ئیتر ئاوی بێتەوە یان نا.

٢١٧ - (صحيح) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ).

واتە: لە ئـەبو سـەعیدی خودریـەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئـاوی مەنی.

وَكَانَ أَبُو سَلَمَةَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

ئەبو سەلەمە ئەو کارەی کردووەو پێـی وابـووە کـە پێویسـت بـە خۆشوشـتن ناکات بە هاتنەوەی ئاوی مەنی نەبێت.

## باسی دووبارە کردنەوەی کاری سەر جێگە لەلایەن لەشگرانەوە

## ٨٥ – بَابُ فِي الْجُنُبِ يَعُودُ.

> ٢١٨ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ طَافَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ.

واتـە: لـە ئەنەسـەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم شەوێکیان گەڕا بەسەر هەموو خێزانەکانیداو یەك جار خۆی شت.

# باسی دەستنوێژگرتن لەدوای کاری سەر جێگە (جیماع)کردن

## ٨٦ - بَابُ الْوُضُوءِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ.

٢١٩ - (حسن) عَنْ أَبِي رَافِعٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ طَافَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى نِسَائِهِ، يَغْتَسِلُ عِنْدَ هَذِهِ، وَعِنْـدَ هَذِهِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ تَجْعَلُـهُ غُسْـلاً وَاحِدًا؟ قَالَ: (هَذَا أَزْكَى وَأَطْيَبُ وَأَطْهَرُ).

واتە: لە ئەبو رافعەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەوێکیان گەڕا بەسەر هەموو خێزانەکانیداو لەلای هەر یەکێکیان خۆی دەشت، ئەبو رافع وتی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆچی بۆ هەموویان یەك جار خۆت نەشت؟ ئەویش فەرمووی: ئەمەیان جوانترەو چاکترو پاکترە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ أَنَسٍ أَصَحُّ مِنْ هَذَا.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی ئەنەس کە رابوورد (صحیح) ترە لەم فەرموودەی ئەبو رافع.

٢٢٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يُعَاوِدَ فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُمَا وُضُوءًا).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك لە ئێوە چووە لای خێزانی خۆی، (جیماع)ی کرد ویستی دووبارەی بکاتەوە با لە نێوانیاندا دەستنوێژێ بگرێت.

## باسی ئایا لەشگران بۆی هەیە بخەوێت پێش ئەوەی خۆی بشوات؟

## ٨٧ - بَابُ «فِي» الْجُنُبِ يَنَامُ.

٢٢١ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ «لَهُ» رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَوَضَّأْ، وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، ثُمَّ نَمْ).

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: باوکم بۆ پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، کە لە شەودا تووشی لەشگرانی بووە، ئەویش پێی فەرموو: زەکەرت بشۆ و دەستنوێژ بگرە ئینجا بخەوە.

## باسی ئایا لەشگران بۆی هەیە بخوات پێش ئەوەی خۆی بشوات؟

## ٨٨ - بَابُ الْجُنُبِ يَأْكُلُ.

٢٢٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە لەشگران بووایە ئەگەر بیویستایە بخەوێت دەستنوێژێکی دەگرت وەك چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژکردن.

٢٢٣ - (صحيح) عَنْ الزُّهْرِيِّ، بِإِسْنَادِهِ، وَمَعْنَاهُ، زَادَ: (وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ يَدَيْهِ).

واتە: لە زوهریەوە بەهەمان سەنەد و مانا هاتووە، وە ئەمەی بۆ زیاد کردووە: (پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە لەشگران بووایە ئەگەر بیویستایە بخوات دەستەکانی دەشت). - کەواتە ئەو دوو فەرمودەی پێشەوە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە لەشگران بۆی هەیە بخوات و بخواتەوە بەبێ ئەوەی دەستنوێژبگرێت یان خۆی بشوات .

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن:
## لەشگران دەبێ دەستنوێژ بگرێ

## ٨٩ - بَابُ مَنْ قَالَ: يَتَوَضَّأُ الْجُنُبُ.

| |
|---|
| ٢٢٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ تَوَضَّأَ. تَعْنِي وَهُوَ جُنُبٌ. |

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە بیویستایە بخوات یان بخەوێت دەستنوێژی دەگرت واتە: ئەگەر لەشگران بووایە.

| |
|---|
| ٢٢٥ - (ضعيف) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِلْجُنُبِ إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ أَوْ نَامَ أَنْ يَتَوَضَّأَ. |

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم روخسەتی داوە بە لەشگران ئەگەر ویستی بخوات و بخواتەوە یان بخەوێت دەستنوێژی بگرێت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْجُنُبُ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ تَوَضَّأَ.

ئەبو داود دەڵێت: لەشگران ئەگەر ویستی بخوات با دەستنوێژ بگرێت.

## باسی ئایا دواخستنی خۆشوشتن لەلایەن لەشگرانەوە پێی گوناهبار دەبێت؟

## ٩٠ - بَابُ «فِي» الْجُنُبِ يُؤَخِّرُ الْغُسْلَ.

٢٢٦ - (صحيح) عَنْ غُضَيْفِ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَرَأَيْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ: فِي أَوَّلِ اللَّيْلِ أَوْ فِي آخِرِهِ؟ قَالَتْ: رُبَّمَا اغْتَسَلَ فِي أَوَّلِ اللَّيْلِ، وَرُبَّمَا اغْتَسَلَ فِي آخِرِهِ، قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ! الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. قُلْتُ: أَرَأَيْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوتِرُ أَوَّلَ اللَّيْلِ أَمْ فِي آخِرِهِ؟ قَالَتْ: رُبَّمَا أَوْتَرَ فِي أَوَّلِ اللَّيْلِ، وَرُبَّمَا أَوْتَرَ فِي آخِرِهِ، قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ! الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. قُلْتُ أَرَأَيْتِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ، أَمْ يَخْفِتُ بِهِ؟ قَالَتْ: رُبَّمَا جَهَرَ بِهِ، وَرُبَّمَا خَفَتَ، قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ! الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً.

واتە: (غُضَيْفِ)ی کوڕی (الْحَارِث) دەڵێت: وتم بە عائیشە پێم بڵێ

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر لەشگران بوایە لەسەرەتای شەوەوە خۆی دەشت یان لە کۆتایی شەودا؟ عائیشە وتی: جاری وا هەبوو لەسەرەتای شەوەوە خۆی دەشت، جاری واش هەبوو لە کۆتایی شەودا خۆی دەشت. وتم (الله أكبر!) گەورەیی هەر بۆ خوایە سوپاس و ستایش بۆ خوا چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.

وتم: پێم بڵێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتری دەکرد یان لە کۆتایی شەودا؟ عائیشە وتی: جاری وا هەبوو لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتری دەکرد، جاری واش هەبووە لە کۆتایی شەودا. وتم (الله أكبر!) گەورەیی هەر بۆ خوایە سوپاس و ستایش بۆ خوا چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.

وتم: ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەدەنگەوە قورئانی دەخوێند یان بە بێ دەنگی؟ عائیشە وتی: جاری وا هەبوو بەدەنگەوە قورئانی دەخوێند، جاری واش هەبووە بە بێ دەنگی. وتم (الله أكبر!) گەورەیی هەر بۆ خوایە سوپاس و ستایش بۆ خوا چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.

**٢٢٧ - (ضعيف) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَلاَ كَلْبٌ وَلاَ جُنُبٌ ).**

[ضعيف الجامع الصغير: ٦٢٠٣].

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو (طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە کە وێنە و سەگ و لەشگرانی تێدا بێت).

٢٢٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنَامُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَمَسَّ مَاءً[1].

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەخەوت لەكاتێكدا كە لەشگران بوو بەبێ ئەوەی ئاوی بەربكەوێت واتە: نە دەستنوێژی دەگرت نە خۆشی دەشت.

## باسی ئایا دروستە لەشگران قورئان بخوێنێت؟

## ٩١ - بَابُ فِي الْجُنُبِ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ.

٢٢٩ - (ضعيف) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ سَلِمَةَ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَا وَرَجُلاَنِ: رَجُلٌ مِنَّا وَرَجُلٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ - أَحْسِبُ ﴿قَالَ﴾ فَبَعَثَهُمَا عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَجْهًا وَقَالَ: إِنَّكُمَا عِلْجَانِ، فَعَالِجَا عَنْ دِينِكُمَا، ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ الْمَخْرَجَ، ثُمَّ خَرَجَ فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَخَذَ مِنْهُ حَفْنَةً فَتَمَسَّحَ بِهَا، ثُمَّ جَعَلَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ فَأَنْكَرُوا ذَلِكَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْرُجُ

---

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ وَهَمٌ.

مِنَ الْخَلاَءِ فَيُقْرِئُنَا الْقُرْآنَ، وَيَأْكُلُ مَعَنَا اللَّحْمَ، وَلَمْ يَكُنْ يَحْجُبُهُ - أَوْ قَالَ: يَحْجُزُهُ - عَنْ الْقُرْآنِ شَيْءٌ لَيْسَ الْجَنَابَةَ.

[المشكاة: ٤٦٠].

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی سەلەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: من و دوو پیاوی تر چوینە خزمەت پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو (طَالِب) رەزای خوای لێ بێ، یەکێکیان لە هۆزی ئێمە بوو ئەویشیان لە بەنی ئەسەد - وابزانم وتی: پێشەوا عەلی کارێکی پێ سپاردبوون و ناردبوونی بەلایەکدا، وتی: ئێوە دوو پیاوی ئیشکەری ئازاو لێهاتوون، تێکۆشەرن بۆ دینەکەتان، پاشان هەستا چوو بۆ سەرئاو، ئینجا هاتەدەرەوەو داوای ئاوی کرد، دەستەکانی پێ شت، پاشان دەستی کرد بە قورئان خوێندن ئینکاریان کرد، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای هاتنەدەرەوە لە سەرئاو قورئانی بۆ دەخوێندین و گۆشتی لەگەڵ دەخواردین،– واتە دەستنوێژی نەبووە هیچ بەرگری نەدەکرد (یان وتی هیچ شتێ بەرگری ئەوی نەدەکرد– لە قورئان خوێندن بێجگە لە لەشگرانی.-کەواتە بۆ لەشگران و بۆ کەسێك کە لە سەرئاو بێت قورئان خوێندن دروست نیە- .

زۆربەی فوقەهاو شەرعزانەکان دەڵێن: قورئان خوێندن لە (مصحف)دا بەبێ دەستنوێژ دروست نیە بخوێنرێت[1].

---

[1]- لەکتێبی (عون المعبود ١/ ١٧٨) وەرم گرتووە.

## باسی ئایا دروستە لەشگران لەگەڵ خەڵك تەوقە بكات؟

## ٩٢ – بَابُ فِي الْجُنُبِ يُصَافِحُ.

٢٣٠ - (صحيح) عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَهُ فَأَهْوَى إِلَيْهِ، فَقَالَ: إِنِّي جُنُبٌ، فَقَالَ: (إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ ).

واتە: لە (حُذَيْفَة)ەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێ گەیشتووە دەستی هێناوە تەوقەی لەگەڵ بكات وتویەتی: من لەشگرانم، ئەویش فەرموویەتی: (بێگومان موسڵمان پیس نابێت).

٢٣١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَأَنَا جُنُبٌ فَاخْتَنَسْتُ، فَذَهَبْتُ فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ فَقَالَ: (أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟). قَالَ: قُلْتُ إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ، فَقَالَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ! إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ ).

واته: له ئهبو هورەیرەوه هاتووه، كه وتویەتی: جارێ له یەكێ لـه رێگاكانی مەدینه تووشی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووم، لەشگران بووم، لەبەرئەوه خۆم لێ شاردەوه، چووم خۆم شت و هاتمەوه بۆ لای، فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیره! له كوێ بویت؟). وتم: راستیەكەی من لەشگران بووم بۆیه پێم خۆش نەبوو بـه لەشی پیسەوه لەخزمەتتدا دانیشم. فەرمووی: (پاك و بێگەردی بۆ خوا موسوڵمان چۆن پیس دەبێت).

## باسی ئەگەر لەشگران بچێته مزگەوتەوه حوكمی چی یه؟

## ٩٣ - بَابُ فِي الْجُنُبِ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ.

٢٣٢ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَوُجُوهُ بُيُوتِ أَصْحَابِهِ شَارِعَةٌ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: (وَجِّهُوا هَذِهِ الْبُيُوتَ عَنْ الْمَسْجِدِ). ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَصْنَعِ الْقَوْمُ شَيْئًا رَجَاءَ أَنْ تَنْزِلَ فِيهِمْ رُخْصَةٌ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ بَعْدُ فَقَالَ: (وَجِّهُوا هَذِهِ الْبُيُوتَ عَنْ الْمَسْجِدِ، فَإِنِّي لاَ أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلاَ جُنُبٍ).

[ضعيف الجامع الصغير: ٦١١٧، الإرواء: ١٩٣].

واتە: لە عائیشەوە رەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بینی دەرگای ماڵی هەندێ لە هاوەڵەكانی كە لە دەوری مزگـەوت بـوون بەسـەر مزگەوتـدا دەكرانـەوەو هاتوچـۆیان بـە مزگەوتەكەیدا دەكـرد، پێـی فـەرموون: (رووی دەرگـای ماڵـەكانتان بگـۆڕن بـۆ لایـەكی تـر بـا لەسـەر مزگـەوت نـەبن). پاشـان چووە ژوورەوە خەڵكەكە هیچ كارێكیـان نـەكرد بـە هیـوای ئـەوەی كـە روخسـەتیان پـێ بـدات، لەدواییـدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەدەرەوە بـۆ لایـان و فـەرمووی: (رووی دەرگـای ماڵـەكانتان بگـۆڕن بـۆ لایـەكی تـر، چونكە مـن رێگـەنادەم لەشـگران و ئافرەتی بێ نوێژ بچنە مزگەوتەوە).

## باسی كەسێ لەبیری چووبێ كە لەشگرانە بەرنوێژی بۆ كۆمەڵێ بكات.

## ٩٤ – بَابُ فِي الْجُنُبِ يُصَلِّي بِالْقَوْمِ وَهُوَ نَاسٍ.

٢٣٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَأَوْمَأَ بِيَدِهِ: أَنْ مَكَانَكُمْ، ثُمَّ جَاءَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَصَلَّى بِهِمْ.

واتە: لە ئەبی بەكرەوە هـاتووە، كـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم نوێژی بەیانی دابەست بە دەستی ئاماژەی كرد كە لەشـوێنی خۆتـان بمێننـەوە، رۆشت خۆی شت، پاشان كە هاتەوە ئاو لەسەری دەچۆڕا، جا سـەرلەنوێ نوێـژی دابەستەوەو بەرنوێژی بۆ كردن.

**٢٣٤ - (صحيح) عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، بِإِسْنَادِهِ، وَمَعْنَاهُ، قَالَ فِي أَوَّلِهِ: فَكَبَّرَ. وَقَالَ فِي آخِرِهِ: فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنِّي كُنْتُ جُنُبًا).**

واتە: لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە بە هەمان سەنەدو مانا هاتووە، کە وتویەتی: لە سەرەتاوە: (الله أكبر)ی کردو نوێژی دابەست، هەروەها لە کۆتایی فەرموودەکەوە وتی: کاتێ کە سڵاوی نوێژەکەی دایەوە، فەرمووی: (منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە وە من لەشگران بووم).

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلاَّهُ وَانْتَظَرْنَا أَنْ يُكَبِّرَ انْصَرَفَ، ثُمَّ قَالَ: (كَمَا أَنْتُمْ).**

ئەبو داود دەڵێت: لە ئەبو هورمیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە لە جێگا نوێژەکەیدا هەستا ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد کە نوێژ دابەستێت کەچی ڕۆشت پاشان فەرمووی: (وەك خۆتان بمێننەوە).

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ مُحَمَّدٍ مُرْسَلاً، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَكَبَّرَ، ثُمَّ أَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْقَوْمِ أَنِ اجْلِسُوا فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ. وَكَذَلِكَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَبَّرَ فِي صَلاَةٍ.**

ئەبو داود دەڵێت: لە موحەممەدەوە بە (مرسل)ی هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (الله أكبر)ی کرد، پاشان بە پەنجەی ئاماژەی کرد بۆ قەومەکە کە دانیشن، خۆشی ڕۆشت خۆی شت. هەروەها لە (عَطَاءِ)ی کوڕی یەسارەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (الله

أكبر)ی کردو نوێژی دابەست.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ عَنْ الرَّبِيعِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَبَّرَ.

هەروەها ئەبو داود دەڵێت: لە رەبیعی کوڕی موحەممەدەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (الله أكبر)ی کرد.

٢٣٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَصَفَّ النَّاسُ صُفُوفَهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى إِذَا قَامَ فِي مَقَامِهِ ذَكَرَ أَنَّهُ لَمْ يَغْتَسِلْ، فَقَالَ لِلنَّاسِ: (مَكَانَكُمْ). ثُمَّ رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ فَخَرَجَ عَلَيْنَا يَنْطُفُ رَأْسُهُ، ﴿وَ﴾قَدِ اغْتَسَلَ وَنَحْنُ صُفُوفٌ. وَهَذَا لَفْظُ ابْنِ حَرْبٍ، وَقَالَ: عَيَّاشٌ فِي حَدِيثِهِ: فَلَمْ نَزَلْ قِيَامًا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى خَرَجَ عَلَيْنَا وَقَدِ اغْتَسَلَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قامەت کرا بۆ نوێژ خەڵکەکە رێك راوەستان لە ریزەکانیاندا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هۆدەکەی خۆی هاتەدەرەوە لەنوێژگاکەی خۆیدا لەپێشمانەوە راوەستا، لەوکاتەدا بیری کەوتەوە کە لەشگرانە و خۆی نەشتووە بە خەڵکەکەی فەرموو: (لە جێگەی خۆتان بن هەتا دێمەوە). پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە کە هاتەوە بۆ لامان سەری ئاوی لێ دەتکا، هی خۆ شوشتنەکەی، ئێمەش بەردەوام بە پێوە چاوەڕێمان کرد. ئەمەش گۆ(لفظ)ی ئیبنو حەربە، وە عەیاش دەڵێ: ئێمەش بەردەوام بە پێوە چاوەڕێمان کرد هەتا خۆی شت و هاتەوە.

## باسی کەسێ کاتێ لەخەو هەستا هەست بە تەڕایی تۆماو بکات

## ٩٥ – بَابُ فِي الرَّجُلِ يَجِدُ الْبِلَّةَ فِي مَنَامِهِ.

٢٣٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا؟ قَالَ: (يَغْتَسِلُ). وَعَنْ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدِ احْتَلَمَ وَلاَ يَجِدُ الْبَلَلَ؟ قَالَ: (لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ ). فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: الْمَرْأَةُ تَرَى ذَلِكَ أَعَلَيْهَا غُسْلٌ؟ قَالَ: (نَعَمْ، إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم پرسی: ئەگەر پیاوێ تەڕایی تۆماوی هەست پێ کرد بەڵام نەیەتەوە یادی کە شەیتانی بووبێ، ئایا خۆی بشوات یان نا؟ فەرمووی: (با خۆی بشوات). وە لێشیان پرسی: ئەگەر پیاوێ وای دەزانی کە شەیتانی بووە بەڵام تەڕایی تۆماوی هەست پێ نەکرد، ئایا خۆی بشوات یان نا؟ فەرمووی: (خۆ شوشتنی لەسەر نیە). ئوم سولەیمیش وتی: ئافرەتیش هەست بەو تەڕاییە دەکات ئایا خۆ شوشتنی لەسەرە یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ، بێگومان ئافرەتان هاوشێوەی پیاوانن).

## باسی ئەگەر ئافرەت ئەوەی هەست پیٚ کرد که پیاو هەستی پیٚ دەکات

## ٩٦ – بَابُ فِي الْمَرْأَةِ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ.

٢٣٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ الأَنْصَارِيَّةَ - وَهِيَ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ ﴿عَزَّ وَجَلَّ﴾ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ! أَرَأَيْتَ الْمَرْأَةَ إِذَا رَأَتْ فِي النَّوْمِ مَا يَرَى الرَّجُلُ أَتَغْتَسِلُ أَمْ لاَ؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَعَمْ فَلْتَغْتَسِلْ إِذَا وَجَدَتِ الْمَاءَ)، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهَا فَقُلْتُ: أُفٍّ لَكِ، وَهَلْ تَرَى ذَلِكَ الْمَرْأَةُ؟! فَأَقْبَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (تَرِبَتْ يَمِينُكِ يَا عَائِشَةُ، وَمِنْ أَيْنَ يَكُونُ الشَّبَهُ؟!).

واته: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە، کە وتویەتی: ئوم سولەیمی ئەنصاری - کە دەکاتە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! خوای گەورە لە وتنی قسەی ڕەوا شەرم ناکات، ئەگەر ئافرەت هەستا لەخەو ئەوەی هەست پیٚ کرد کە پیاو هەستی پیٚ دەکات، ئایا

خۆ شوشتنی لەسەره یان نا؟ عائیشه وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بەڵێ، خۆ شوشتنی لەسەره ئەگەر تەڕایی تۆماوی هەست پێ كرد). عائیشه وتی: ڕوم تێ كردو وتم: ئۆف لەدەستی تۆ ئایا ئافرەت ئەوە دەبینێ واتە شەیتانی دەبێ؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رووی تێ كردم و فەرمووی: (ئەی عائیشه دەستت لەخاك بدات، ئەی ئەگەر شەیتانی نابێ و ئاوی نایەتەوە بەچی منداڵەكەی لەخۆی دەچێ).

## باسی ئەندازەی ئەو ئاوەی كە بەسە بۆ خۆشوشتن.

## ٩٧ – بَابُ فِي مِقْدَارِ الْمَاءِ الَّذِي يُجْزِئُ فِي الْغُسْلِ.

**٢٣٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ إِنَاءٍ هُوَ الْفَرَقُ مِنَ الْجَنَابَةِ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشگران بوایە لەدەفرێكدا خۆی دەشت كە (فَرَق)یان پێ دەوت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ الزُّهْرِيِّ، فِي هَذَا الْحَدِيثِ: قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ فِيهِ قَدْرُ الْفَرَقِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە لە زوهریەوە هاتوە، كە عائیشه وتویەتی:

جاران مـن و پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم بەیەكـەوە لـە دەفرێكـدا خۆمان دەشت بە ئەندازەی فەرەقێ ئاوی دەگرت — فەرەقیش شانزە (رطل)ە .

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى ابْنُ عُيَيْنَةَ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكٍ.

ئەبو داود دەڵێ: ئیبنو عویەینەش بە هەمان شێوە فەرموودەكەی مـالیكی گێڕاوەتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: الْفَرَقُ سِتَّةَ عَشَرَ رِطْلاً. وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: صَاعُ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ، قَالَ: فَمَنْ قَالَ: ثَمَانِيَةُ أَرْطَالٍ؟ قَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ بِمَحْفُوظٍ.

ئەبو داود دەڵێـت: لـە ئەحمـەدی كوڕی حەنبـەلم بیستووە دەیـوت: فـەرەق شانزە رەتڵە. هەروەها گوێم لێـی بـوو وتـی: صـاعی ئیبنـو ئـەبی (ذئـب) پێـنج رەتـڵ و سـێیەكە رەتڵێكـە. وتـی: ئـەوەی دەڵـێ: هەشـت رەتڵـە ئـەوە لەلایـەن فەرموودەناسانەوە نەبیستراوە بۆیە لەبەرنەكراوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ يَقُولُ: مَنْ أَعْطَى فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ بِرَطْلِنَا هَذَا خَمْسَةَ أَرْطَالٍ وَثُلُثًا فَقَدْ أَوْفَى! قِيلَ الصَّيْحَانِيُّ ثَقِيلٌ ! قَالَ: الصَّيْحَانِيُّ أَطْيَبُ، قَالَ: لاَ أَدْرِي.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئەحمەدم بیستووە دەیـوت: ئـەوەی بـەم رەتڵەی ئێمـە سەرفترە بدات كە پێنج رەتڵ و سێیەكە رەتڵێكە ئەوە تـەواوە. وتیـان خورمـای (صیحانی) قورسە وتی: خورمای (صیحانی) باشترو چاكترە، وتی نازانم.

## باسی چۆنیەتی خۆشوشتن لە لەشگرانی.

## ٩٨ – بَابُ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ.

٢٣٩ - (صحيح) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ: أَنَّهُمْ ذَكَرُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْغُسْلَ مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا أَنَا فَأُفِيضُ عَلَى رَأْسِي ثَلاَثًا). وَأَشَارَ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا.

واتە: جوبەیری کوڕی (مُطْعِم) وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم باسی خۆشوشتن لە لەشگرانی کرا، ئەویش فەرمووی: (من بەش بەحاڵی خۆم سێ مشت ئاو دەکەم بەسەرمدا) ئاماژەی کرد بە هەردوو دەستی واتە سێ جار هەردوو مشتی پڕ دەکرد لەئاو دەیکرد بە سەریدا.

٢٤٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوِ الْحِلاَبِ، فَأَخَذَ بِكَفِّهِ، فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ

الأَيْمَنِ، ثُمَّ الأَيْسَرِ، ثُمَّ أَخَذَ بِكَفَّيْهِ فَقَالَ: بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ لەشگرانی خۆی دەشت، پڕ دەوری گۆزمیە ئاوی داوا دەکرد، ئینجا پڕ مشتێ ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بەلای ڕاستی سەریدا، پاشان دەیکرد بەلای چەپی سەریدا، ئینجا بە مشت بە هەردوو دەستی ئاوی دەکرد بە سەر ناوەڕاستی سەریدا.

٢٤١ - (ضعيف جدا) عَنْ جُمَيْعُ بْنُ عُمَيْرٍ، أَحَدُ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أُمِّي وَخَالَتِي عَلَى عَائِشَةَ، فَسَأَلَتْهَا إِحْدَاهُمَا: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ عِنْدَ الْغُسْلِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، وَنَحْنُ نُفِيضُ عَلَى رُءُوسِنَا خَمْسًا مِنْ أَجْلِ الضَّفْرِ.

واتە: لە جومەیعی کوڕی عومەیرەوە هاتووە، کە یەکێ بوو لە هۆزی (تَيْمِ اللَّهِ)ی کوڕی ثَعْلَبَة)، کە وتویەتی: لەگەڵ دایکم و پورمدا چووینە خزمەتی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ، یەکێکیان لێی پرسی: لەکاتی خۆشوشتن لە لەشگرانی چیتان دەکرد؟ عائیشەش ڕەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا

صلى الله عليه وسلم لەپێشدا دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن بۆ نوێژكردن دەستنوێژی دەگرت، ئینجا سێ مشت ئاوی دەكرد بەسەریدا، بەلاّم ئێمە لەبەر پەلكەكانمان پێنج مشت ئاومان دەكرد بەسەرماندا.

٢٤٢ - عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ - قَالَ سُلَيْمَانُ يَبْدَأُ فَيُفْرِغُ مِنْ يَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ. وَقَالَ مُسَدَّدٌ: - غَسَلَ يَدَيْهِ يَصُبُّ الإِنَاءَ عَلَى يَدِهِ الْيُمْنَى - ثُمَّ اتَّفَقَا: فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، - وقَالَ مُسَدَّدٌ - يُفْرِغُ عَلَى شِمَالِهِ، وَرُبَّمَا كَنَتْ عَنِ الْفَرْجِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الإِنَاءِ فَيُخَلِّلُ شَعْرَهُ، حَتَّى إِذَا رَأَى أَنَّهُ قَدْ أَصَابَ الْبَشَرَةَ - أَوْ أَنْقَى الْبَشَرَةَ - أَفْرَغَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثًا، فَإِذَا فَضَلَ فَضْلَةٌ صَبَّهَا عَلَيْهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ بیویستایە بۆ لەشگرانی خۆی بشوات – سولەیمان وتی: بەدەستی ڕاستی ئاوی دەكرد بەدەستی چەپیدا، موسەددەد وتی: - هەردوو دەستی دەشت بە دەفركە ئاوی دەكرد بەدەستی ڕاستیدا، پاشان هەردووكیان واتە سولەیمان و موسەددەد هەماهەنگن وتیان: شەرمگەی دەشت، - موسەددەد وتی: - بەدەستی ڕاستی ئاوی دەكرد بەدەستی چەپیدا، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ هەندێ جار بە كینایە باسی شەرمگەی دەكرد، - ئینجا دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن بۆ نوێژكردن دەستنوێژی دەگرت، پاشان

هەردوو دەستی دەكرد بەناو ئاوەكەداو دەیكرد بەسەریدا پەنجەكانی دەكرد بە ناو مووەكانی سەریدا، هەتا دەیبینی ئاو گەیشتۆتە ژێر مووەكانی و پێستی سەری تەر بووە – یان پاك بۆتەوە – ئەوكاتە سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت و دەیكرد بە سەریدا، ئەگەر ئاو بمایەتەوە دەیكرد بە جەستەیدا.

٢٤٣- (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَغْتَسِلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، بَدَأَ بِكَفَّيْهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ غَسَلَ مَرَافِغَهُ وَأَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ فَإِذَا أَنْقَاهُمَا أَهْوَى بِهِمَا إِلَى حَائِطٍ، ثُمَّ يَسْتَقْبِلُ الْوُضُوءَ، وَيُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ بیویستایە بۆ لەشگرانی خۆی بشوات، لەپێشدا هەردوو دەستی دەشت ئینجا ئاوی دەكرد بە شەرمگەیدا و گەڵ و گونی بن رانی پاك دەكردەوە لە چڵك و ئارەق، جا دەستەكانی درێژ دەكرد بۆ دیوار و و دەیهێنان بە دیوارەكەداو بەگڵ خاوێنی دەكردنەوە، پاشان دەستنوێژی دەگرت و، سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت و دەیكرد بە سەریدا.

٢٤٤ - (ضعيف) عَنْ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: لَئِنْ شِئْتُمْ لأُرِيَنَّكُمْ أَثَرَ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْحَائِطِ، حَيْثُ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ.

واته: لە شەعبیەوە هاتووە، کە وتویەتی: عائیشه رەزای خوای لیّ بیّ وتی: ئەگەر بتانەویّ جیّگە دەستی پیّغەمبەری خواتان صلی الله علیه وسلم نیشان دەدەم بەو دیوارەوە لەكاتیّكدا كە بۆ لەشگرانی خۆی دەشت دەستی پیّدا دەهیّنا.

٢٤٥ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ، قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غُسْلاً يَغْتَسِلُ بِهِ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَأَكْفَأَ الإِنَاءَ عَلَى يَدِهِ الْيُمْنَى، فَغَسَلَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، ثُمَّ صَبَّ عَلَى فَرْجِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ الأَرْضَ فَغَسَلَهَا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى رَأْسِهِ وَجَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى نَاحِيَةً فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ فَنَاوَلْتُهُ الْمِنْدِيلَ فَلَمْ يَأْخُذْهُ، وَجَعَلَ يَنْفُضُ الْمَاءَ عَنْ جَسَدِهِ. قَالَ الأَعْمَش: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لإِبْرَاهِيمَ فَقَالَ: كَانُوا لاَ يَرَوْنَ بِالْمِنْدِيلِ بَأْسًا وَلَكِنْ كَانُوا يَكْرَهُونَ الْعَادَةَ.

واته: لە (مَيْمُونَة)ی خیّزانی پیّغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، کە وتویەتی: بۆ خۆشوشتنی لەشگرانی ئاوم دانا بۆ پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم، بە دەفرەکە ئاوی کرد بەدەستی راستیدا، دوو جار یان سێ جار دەستی راستی شت، پاشان ئاوی کرد بە شەرمگەیدا و بە دەستی چەپ شتی، جا دەستی هێنا بە زەویداو شتی، ئینجا ئاوی رادا لە دەم و لوتی، جا دەم و چاو و هەردوو دەستی شت، پاشان ئاوی کرد بە سەر و جەستەیدا، ئینجا شوێنەکەی گۆڕی و چووە جێگایەکی تر و پێکانی شت، منیش وشك کەرەوەم بۆ برد بۆ ئەوەی خۆی پێ وشك بکاتەوە وەری نەگرت، ئاو لە جەستەی دەتکا. ئەعمەش وتی: ئەمەم باسکرد بۆ ئیبراهیم ئەویش وتی: بەکارهێنانی وشك کەرەوە جار بەجارێ هیچی تێدا نەبوو بەلایانەوە، بەڵام پێیان باش نەبوو وەك عادەت بەکاربهێنرێت.

٢٤٦ - (ضعيف) عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: إِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يُفرِغُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى سَبْعَ مِرَارٍ، ثُمَّ يَغْسِلُ فَرْجَهُ، فَنَسِيَ مَرَّةً كَمْ أَفْرَغَ، فَسَأَلَنِي كَمْ أَفْرَغْتُ؟ فَقُلْتُ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: لاَ أُمَّ لَكَ وَمَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَدْرِيَ؟ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى جِلْدِهِ الْمَاءَ، ثُمَّ يَقُولُ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَطَهَّرُ.

واتە: لە شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئینو عەباس بۆ خۆشوشتنی لەشگرانی حەوت جار بە دەستی راستی ئاوی دەکرد بە دەستی چەپیدا، پاشان شەرمگەی پاك دەشت، جارێ بیری چوو کە چەند جار ئەندامەکانی شتووە، لێی پرسیم وتی: چەند جار ئاوم پێداکردن؟ وتم: نازانم، وتی: دایکت نەبێ

بۆچی چاوەڕێت نەكرد هەتا بیزانی، پاشان دەستنوێژی گرت وەك چۆن بۆ نوێژكردن دەستنوێژی دەگرت، ئینجا ئاوی كرد بەسەریدا، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە لە لەشگرانی خۆی پاك دەكردەوە.

| |
|---|
| ٢٤٧ - (ضعيف) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَتِ الصَّلَاةُ خَمْسِينَ، وَالْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ سَبْعَ مِرَارٍ، وَغَسْلُ الْبَوْلِ مِنَ الثَّوْبِ سَبْعَ مِرَارٍ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُ حَتَّى جُعِلَتِ الصَّلَاةُ خَمْسًا، وَالْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ مَرَّةً، وَغَسْلُ الْبَوْلِ مِنَ الثَّوْبِ مَرَّةً. |

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: لەشەوی میعراجدا پەنجا نوێژ فەرز كرا لەسەر ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە شەو و رۆژێكدا، خۆشوشتن لە لەسشگرانی حەوت جار، شوشتن و خاوێن كردنەوەی پۆشاكیش لە میز حەوت جار، بەردەوام ئەوەندە پاڕایەوە و داوای كرد لە خوای پەروەردگار كە سوكیان بكات لەسەر ئوممەتی هەتا نوێژەكانی بۆ كرا بە پێنج، ئەوانیشی بۆ كرا بە یەكی یەك جار.

| |
|---|
| ٢٤٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ تَحْتَ كُلِّ شَعْرَةٍ جَنَابَةً، فَاغْسِلُوا الشَّعْرَ، وَأَنْقُوا الْبَشَرَ ). |

[المشكاة: ٤٤٣، ضعيف الجامع الصغير: ١٨٤٧].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: لەژێر هەموو موویەکدا لەشگرانی هەیە، کەواتە مووەکان باش بشۆن و، پێست بە تەواوی خاوێن بکەنەوە لەکاتی خۆشوشتندا.

٢٤٩ - (ضعيف) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (مَنْ تَرَكَ مَوْضِعَ شَعْرَةٍ مِنْ جَنَابَةٍ لَمْ يَغْسِلْهَا، فُعِلَ بِهِ كَذَا وَكَذَا مِنَ النَّارِ). قَالَ عَلِيٌّ: فَمِنْ ثَمَّ عَادَيْتُ رَأْسِي فَمِنْ ثَمَّ عَادَيْتُ رَأْسِي ثَلاَثًا. وَكَانَ يَجُزُّ شَعْرَهُ.

[الإرواء الغليل: ١٣٣ ، ضعيف الجامع : ٥٥٢٤].

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەرکەسێ بۆ خۆشوشتنی لەشگرانی بە ئەندازەی جێگە موویەك بەجێ بێڵێت و نەیشوات ئەوە و ئەوەی پێ دەکرێت لە ئاگری دۆزەخدا، پێشەوا عەلی سێ جار لەسەریەك وتی: لەدوای ئەو هەڕەشەوە بەردەوام قژم دەبڕی و کورتم دەکردەوە بۆ ئەوەی تەڕ ببێت. ئیتر دەستوری وەها بوو قژی کورت دەکردەوە.

## باسی سەبارەت بە دەستنوێژ گرتن لەدوای خۆشوشتن.

## ٩٩ - بَابُ ﴿ فِي ﴾ الْوُضُوءِ بَعْدَ الْغُسْلِ.

**٢٥٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْتَسِلُ، وَيُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ، وَصَلاَةَ الْغَدَاةِ، وَلاَ أُرَاهُ يُحْدِثُ وُضُوءًا بَعْدَ الْغُسْلِ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە لەشگرانی خۆی دەشت، ئینجا دوو ركات نوێژی دەكرد - واتە دوو ركات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی - جا نوێژی بەیانی دەكرد، من نەم دیوە دەستنوێژی گرتبێتەوە لەدوای خۆشوشتن. - واتە لەپێش خۆشوشتندا دەستنوێژی دەگرت -.

## باسی ئایا ئافرەت كەزیەكانی بكاتەوە لەكاتی خۆشوشتندا یان نا؟

## ١٠٠ – بَابُ ﴿ فِي ﴾ الْمَرْأَةِ هَلْ تَنْقُضُ شَعَرَهَا عِنْدَ الْغُسْلِ

٢٥١ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ - وَقَالَ زُهَيْرٌ: إِنَّهَا - قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي أَفَأَنْقُضُهُ لِلْجَنَابَةِ؟ قَالَ: (إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْفِنِي عَلَيْهِ ثَلاَثًا ). وَقَالَ زُهَيْرٌ: (تَحْثِي عَلَيْهِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تُفِيضِي عَلَى سَائِرِ جَسَدِكِ، فَإِذَا أَنْتِ قَدْ طَهُرْتِ ).

واتە: لە ئوم سەلەمەوە هاتووە، كە ئافرەتێ لە موسوڵمانان – زوهەیر وتی - ئوم سەلەمە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! من ئافرەتێكم پەلكەكانم توند دەبەستم ئایا بۆ خۆشوشتنی لەشگرانی بیانكەمەوە؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بكەی بەسەرتدا، پاشان ئاو بكە بە جەستەتدا، ئەگەر ئەوەت كرد ئیتر تۆ پاك دەبیتەوە).

٢٥٢- (حسن) عن أمَ سَلمَةَ قالَتْ: أنَّ امْرأةً جَاءَتْ إلى أمَ سَلَمَة بهَذا الحدَيثْ. قالت فَسَألْتُ النبي صلى الله عليه وسلم بمعناهُ قالَ فيهِ: (وَأغمزي قُرونَكِ عِندَ كَلِّ حَفْنَةٍ).

واتە: لە ئوم سەلەمەوە هەمان فەرموودەوە هاتووە، کە وتوویەتی: ئافرەتێ هات بۆ لای ئوم سەلەمە هەمان فەرموودەی گێڕایەوە، وتی: پرسیارم بۆکرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بەهەمان مانا، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تێدا فەرمووی: (لەکاتی ئاو پێداکردندا کەزیەکانت بجوڵێنە با ئاو بگاتە بنی موەکان و تەڕ ببن).

٢٥٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَتْ إحْدَانَا إِذَا أصَابَتْهَا جَنَابَةٌ أخَذَتْ ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ، هَكَذَا - تَعْنِي بِكَفَّيْهَا جَمِيعًا - فَتَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا، وَأخَذَتْ بِيَدٍ وَاحِدَةٍ فَصَبَّتْهَا عَلَى هَذَا الشِّقِّ، وَالأُخْرَى عَلَى الشِّقِّ الآخَرِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئەگەر یەکێ لە ئێمە - واتە لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - تووشی لەشگرانی ببوایە سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت، بەم شێوەیە - عائیشە ئاماژەی کرد بە هەردوو دەستی - دەیکرد بە سەریدا، دەستێکی پڕ دەکرد لە ئاو دەیکرد بەلای

راستی سەریدا، دەستەکەی تری پڕ دەکرد لە ئاو و دەیکرد بەلای چەپی سەریدا.

> **٢٥٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كُنَّا نَغْتَسِلُ وَعَلَيْنَا الضِّمَادُ، وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحِلاَّتٌ وَمُحْرِمَاتٌ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە خۆمان دەشت بۆ لەشگرانی و، زوڵف و پەلکی سەرمان بۆنی خۆش و داو دەرمانی گیایی پێوە بوو وەك خۆی دەمایەوە چونکە نەمان دەکردنەوە، وە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین - واتە لە خێزانەکانی - ئیتر لە ئیحرامدا بوینایە یان نا.

## باسی لەشگران ئەوەندەی بەسە کە سەری بشوات بە ئەسپۆن(خِطْمِيّ)[1]

## ١٠١ - بَابُ فِي الْجُنُبِ يَغْسِلُ رَأْسَهُ بِالْخِطْمِيِّ أَيُجْزِئُهُ ذَلِكَ.

---

[1] - (خِطْمِيّ) جۆرە ڕوەکێکە تێکەڵی ئاو دەکرێت و سەری پێ دەشۆردرێت.

**٢٥٦ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَغْسِلُ رَأْسَهُ بِالْخِطْمِيِّ وَهُوَ جُنُبٌ، يَجْتَزِئُ بِذَلِكَ وَلاَ يَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ.**

[المشكاة: ٤٤٦].

**واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کاتێکدا کە لەشگران بوو بە ئەسپۆن(خِطْمِيّ) سەری دەشت و، ئەوەندەی بەس بوو، ئیتر ئاوی تری نەدەکرد بە سەریدا یان بە جەستەیدا. لەوانەیە پێش بەکارهێنانی ئەسپۆنەکە بە ئاوی ڕەوان خۆی شت بێت[١].**

---

[١]- **وەرم گرتووە لەکتێبی** (عون المعبود: (١/ ٢٠٥) **چاپی ٢٠٠٩**ی (مكتبة المعارف) علق عليه وتخرج أحاديثه شيخ مشهور.

## باسی ئەو ئاوەی کە دەردەچێت
## لە نێوان ئافرەت و پیاودا.

## ١٠٢ – بَابُ فِيمَا يَفِيضُ بَيْنَ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ مِنَ الْمَاءِ.

| |
|---|
| ٢٥٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها - فِيمَا يَفِيضُ بَيْنَ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ مِنَ الْمَاءِ - قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْخُذُ كَفًّا مِنْ مَاءٍ يَصُبُّ عَلَيَّ الْمَاءَ ثُمَّ يَأْخُذُ كَفًّا مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ يَصُبُّهُ عَلَيْهِ. |

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە سەبارەت بەو ئاوەی لە نێوان ژن و پیاودا لە (مني) و (مذي) دەردەچێت و بەر پۆشاك و جەستە دەکەوێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مشتێ ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بە (منی)ەکەدا بۆ ئەوەی لێی بکاتەوە، پاشان مشتێ ئاوی تری هەڵدەگرت و دەیکرد بە شوێنەکەیدا بۆ ئەوەی باش پاك ببێتەوە.

## باسی نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ و تێکەڵاوی کردنی

## ١٠٣ - بَابُ ﴿ فِي ﴾ مُؤَاكَلَةِ الْحَائِضِ وَمُجَامَعَتِهَا.

٢٥٨ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ الْيَهُودَ كَانَتْ إِذَا حَاضَتْ مِنْهُمُ امْرَأَةٌ أَخْرَجُوهَا مِنَ الْبَيْتِ، وَلَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُشَارِبُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهَا فِي الْبَيْتِ، فَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (جَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، وَاصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ غَيْرَ النِّكَاحِ). فَقَالَتِ الْيَهُودُ: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أَنْ يَدَعَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِنَا إِلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ. فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْيَهُودَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا، أَفَلاَ نَنْكِحُهُنَّ فِي الْمَحِيضِ؟ فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ قَدْ وَجَدَ عَلَيْهِمَا فَخَرَجَا

فَاسْتَقْبَلَتْهُمَا هَدِيَّةٌ مِنْ لَبَنٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمَا، فَسَقَاهُمَا، فَظَنَنَّا أَنَّهُ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە جولەکە هەر کاتێ ئافرەتێکیان بکەوتایەتە بێ نوێژیەوە، لە ماڵ دەریان دەکرد، نە خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵی دەخوارد، نە لە ماڵیشەوە لەگەڵی دادەنیشتن، بەڵکو پارێزیان لێ دەکردوو جێیان بۆ جیادەکردەوە، بۆیە یارانی پێغەمبەریش صلی الله علیە وسلم لەوبارەیەوە لێیان پرسی؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ رەوانە کرد: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ). واتە: وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حەیز بڵێ حەیز ئازارە، کەواتە دووربکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی حەیزدا. هەتا کۆتایی ئایەتەکە، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: لە ماڵەکاندا لەگەڵیان کۆببنەوەو، هەموو شتێکیان لەگەڵ ئەنجام بدەن جگە لە کاری جوتبون(جماع). جولەکە وتیان: ئەم پیاوە دەیەوێت لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ. جا ئوسەیدی کوڕی (حُضَيْر) و عەببادی کوڕی بیشر چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم جولەکە ئاواو ئاوا دەڵێن، ئەی بۆچی رێگامان پێ نادەی هەتا لەکاتی بێ نوێژیدا بچینە لایان و دروست ببین لەگەڵیانا؟ جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رووی گرژ کردوو رەنگی گۆڕا، هەتا وامان دەزانی کە لێیان تورە بووە، بۆیە هەردووکیان هەستان چوونە دەرەوەو رۆیشتن، لەپاشدا هەندێ شیریان بە دیاری هێنا بۆ

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەویش هەندێ لەو شیرەی نـارد بۆیـان و خواردیانەوەو تێگەیشتن کە دڵی لێیان نەیاشەوە.

٢٥٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كُنْتُ أَتَعَرَّقُ الْعَظْمَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَأُعْطِيهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضَعُ فَمَهُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي فِيهِ وَضَعْتُهُ، وَأَشْرَبُ الشَّرَابَ فَأُنَاوِلُهُ فَيَضَعُ فَمَهُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي كُنْتُ أَشْرَبُ مِنْهُ.

واتـە: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: ئێسـقانم دەکڕاندەوە لـە کاتێکدا کـە بـێ نوێـژ بـووم، پاشـان ئێسـقانەکەم دەدایـە دەسـت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەویش دەمی لە جێگەی دەمی من دادەنـا، ئـاوم دەخواردەوە لە کاتێکدا کە بـێ نوێـژ بـووم، دوای ئـەوە قاپەکـەم دەدایـە دەسـت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەویش دەمی لە جێگەی دەمی من دادەناو ئاوی دەخواردەوە.

ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر تێکـەڵاوی کردنـی ئـافرەتی بـێ نوێـژ و، پـاکێتی بەرماوەیان.

٢٦٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ رَأْسَهُ فِي حِجْرِي فَيَقْرَأُ وَأَنَا حَائِضٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەری دەخستە سەر کۆشم و قورئانی دەخوێند، لە کاتێکدا کە من بێ نوێژ بووم.

## باسی وەرگرتنی شتێ لەلایەن ئافرەتێکی بێ نوێژەوە لە مزگەوت

## ١٠٤ - بَابُ فِي الْحَائِضِ تُنَاوِلُ مِنَ الْمَسْجِدِ.

٢٦١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ). فَقُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لە ماڵەکەی خۆمدا بووم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ناو مزگەوتدا بوو پێ فەرمووم: ( (خُمْـرَة)کەم بدەرێ - (خُمْرَة) بەرماڵێکی بچوك بوو لە پەلکە خورما دروست دەکرا)، وتم: من بێ نوێژم بۆیە ناتوانم دەست درێژ بکەم بۆ ناو مزگەوت. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خۆ خوێنی بێ نوێژیەکەت لە ناو دەستتدا نیە).

# باسی ئافرەتی بێ نوێژ نوێژە فەوتاوەکانی ناگێڕێتەوە.

## ١٠٥ – بَابُ فِي الْحَائِضِ لاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ.

٢٦٢ - (صحيح) عَنْ مُعَاذَةَ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ لَقَدْ كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلاَ نَقْضِي، وَلاَ نُؤْمَرُ بِالْقَضَاءِ.

واتە: لە (مُعَاذَة)ەوە هاتووە، کە ئافرەتێ پرسیاری کرد لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئایا ئافرەتی بێ نوێژ نوێژە فەوتاوەکانی دەگێڕێتەوە؟ عائیشەش ڕەزای خوای لێ بێ وتی: بۆچی تۆ (حَرُورِيَّة)یت؟ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین کاتێ کە بێ نوێژ دەبووین نە نوێژە فەوتاوەکانمان دەگێڕایەوە، وە نە فەرمانیشمان پێ دەکرا بە گێڕانەوەیان[1].

٢٦٣- (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: هەروەها ئەم فەرموودە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە.

---

[1]- (حَرُورِية) کۆمەڵێ (خوارج)ی گومڕابوون لە فەرمانی ئیمام عەلی دەرچوون، جا (حَرُورِية) شوێنێکە نزیکەی دوو میل لە کوفەوە دوورە یەکەم کۆبونەوەیان تێدا ئەنجام دا، بۆیە ئەوەی بیروباوەڕی خەوارجی هەبووایە پێیان دەوت حەروری.

﴿قَالَ أَبُو دَاوُدَ﴾: وَزَادَ فِيهِ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کردووە: فەرمانمان پێ دەکرا بۆ گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکان، بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا بە گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکان.

## باسی چوونە لای ئافرەتی بێ نوێژ.

## ١٠٦ – بَابُ فِي إِتْيَانِ الْحَائِضِ.

٢٦٤ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ - قَالَ: (يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم – سەبارەت بە کەسێك کە دەچێتە لای خێزانەکەی و جیماعی لەگەڵ دەکات لە کاتێکدا کە بێ نوێژە - فەرموویەتی: (دەبێ دیناری، یان نیو دینار ببەخشێت). مەبەست دیناری زێڕە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَكَذَا الرِّوَايَةُ الصَّحِيحَةُ، قَالَ: « دِينَارٌ أَوْ نِصْفُ دِينَارٍ». وَرُبَّمَا لَمْ يَرْفَعْهُ شُعْبَةُ.

ئەبو داود دەڵێت: بەم ڕیوایەتە (صحیح)ە، کە فەرموویەتی: (دیناری یان

نیو دینار). لەوانەیە راوی فەرموودەکە شوعبە فەرموودەکەی نەگەیاندبێتەوە سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

٢٦٥ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: إِذَا أَصَابَهَا فِي أَوَّلِ الدَّمِ: فَدِينَارٌ، وَإِذَا أَصَابَهَا فِي انْقِطَاعِ الدَّمِ: فَنِصْفُ دِينَارٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئەگەر لەسەرەتای خوێنی بێ نوێژیەوە جیماعی لەگەڵ کرد: ئەوە دەڵێ یەک دینار ببەخشێت، بەڵام ئەگەر لە کاتی وشکایی هاتنی خوێنەکەدا بوو: ئەوە نیو دینار دەبەخشێت.

٢٦٦ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا وَقَعَ الرَّجُلُ بِأَهْلِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، فَلْيَتَصَدَّقْ بِنِصْفِ دِينَارٍ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك لەئێوە لەگەڵ خێزانی جیماعی کرد لە کاتێکدا کە خێزانەکەی بێ نوێژ بوو، ئەوە با نیو دینار ببەخشێت.

(ضعيف) عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (آمُرُهُ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِخُمُسَيْ دِينَارٍ).
وَهَذَا مُعْضَلٌ.

واتە: (عَبْدِ الْحَمِيدِ)ی کوڕی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (فەرمانی پێ کرد پێنج یەکی دینارێ ببەخشێت) . ئەم فەرموودە فەرمودەیەکی (مُعْضَل)ە.

## باسی چێژ وەرگرتن لە ئافرەتی بێ نوێژ جگە لە نێوان ناوك ئەژنۆی.

## ١٠٧ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يُصِيبُ مِنْهَا مَا دُونَ الْجِمَاعِ.

**٢٦٧ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ قَالتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُبَاشِرُ الْمَرْأَةَ مِنْ نِسَائِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، إِذَا كَانَ عَلَيْهَا إِزَارٌ إِلَى أَنْصَافِ الْفَخِذَيْنِ أَوِ الرُّكْبَتَيْنِ تَحْتَجِزُ بِهِ.**

واتە: لە (مَيْمُونَة)ەوە هاتووە، کە وتوویەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ یەکێ لە خێزانەکانی خۆی کە بێ نوێژ بوایە گەمەی لەگەڵ دەکردو چێژی لێ وەردەگرت، ئەگەر نێوان ئەژنۆ و ناوکی بە پۆشاکێ داپۆشراو بووایە.

٢٦٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: كَـانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَـأْمُرُ إِحْـدَانَا إِذَا كَانَـتْ حَائِضًا أَنْ تَتَّزِرَ، ثُـمَّ يُضَـاجِعُهَا زَوْجُهَـا. وَقَـالَ مَـرَّةً: يُبَاشِرُهَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر یەکێ لە ئێمە بێ نوێژ بوایە فەرمانی پێ دەکرد کە نێوان ئەژنۆ و ناوکی بە پۆشاکێ داپۆشێت، پاشان گەمەی لەگەڵ دەکردو چێژی لێ وەردەگرت.

٢٦٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَـتْ: كُنْـتُ أَنَـا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيتُ فِـي الشِّـعَارِ الْوَاحِدِ وَأَنَا حَائِضٌ طَامِثٌ، فَإِنْ أَصَـابَهُ مِنِّـي شَـيْءٌ غَسَلَ مَكَانَهُ وَلَمْ يَعْدُهُ، ثُمَّ صَلَّى فِيـهِ، وَإِنْ أَصَـابَ - تَعْنِي ثَوْبَهُ - مِنْهُ شَيْءٌ غَسَلَ مَكَانَهُ وَلَـمْ يَعْـدُهُ، ثُـمَّ صَلَّى فِيهِ.

واتـە: لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: مـن و پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە پۆشاکێکدا پێکەوە خەوتین لە کاتێکدا کـە مـن بـێ نوێـژ بـووم، ئەگـەر خـوێنی حەیزەکـەم بـەری بکەوتایـە تـەنها شوێنەکەی دەشت، پاشان نوێـژی پێـوە دەکـرد، ئەگـەر خـوێنی حەیزەکـەم بـەر پۆشاکەکەی بکەوتایە تەنها شوێنەکەی دەشت، پاشان نوێژی پێوە دەکرد.

٢٧٠ - (ضعيف) عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غُرَابٍ: أَنَّ عَمَّةً لَهُ حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِحْدَانَا تَحِيضُ وَلَيْسَ لَهَا وَلِزَوْجِهَا إِلاَّ فِرَاشٌ وَاحِدٌ؟ قَالَتْ: أُخْبِرُكِ بِمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: دَخَلَ لَيْلاً وَأَنَا حَائِضٌ فَمَضَى إِلَى مَسْجِدِهِ.

واتە: عومارەی کوڕی غوراب، پورێکی هەبوو بۆی گێڕاوەتەوە، کە لە عائیشەی ڕەزای خوای لێ بێ پرسیوە وتویەتی: ئەگەر یەکێ لە ئێمە بێ نوێژ بوو تەنها پێخەفێکیشیان هەبوو بۆ خۆی و بۆ مێردەکەی ئایا دروستە پێکەوە بخەون؟ عائیشەش لە وەڵامدا وتویەتی: هەواڵی ئەوەت پێ بدەم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو حاڵەتەدا چی کردووە: شەوێ هات بۆ لام من بێ نوێژ بووم، چووە مزگەوتەکەیەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: - تَعْنِي مَسْجِدَ بَيْتِهِ - فَلَمْ يَنْصَرِفْ حَتَّى غَلَبَتْنِي عَيْنِي وَأَوْجَعَهُ الْبَرْدُ فَقَالَ: (ادْنِي مِنِّي). فَقُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ، فَقَالَ: (وَإِنْ اكْشِفِي عَنْ فَخِذَيْكِ). فَكَشَفْتُ فَخِذَيَّ فَوَضَعَ خَدَّهُ وَصَدْرَهُ عَلَى فَخِذَيَّ، وَحَنَيْتُ عَلَيْهِ حَتَّى دَفِئَ وَنَامَ.

ئەبو داود دەڵێت: واتە مزگەوتی ماڵەکەی – نەگەڕایەوە هەتا خەو زۆری بۆ هێنام و ئەویش سەرمای بوو، فەرمووی: (نزیک بەرەوە لێم). وتم: من بێ نوێژم، فەرمووی: (رانت رووت بکە بۆم). منیش بۆم رووت کرد، ئەویش سەر

و سنگی نایە سەر رانم، جا ئامێزم بۆ كردەوە و گرتمە ئامێزم هەتا گەرمی بویەوەو خەوی لێ كەوت.

٢٧١ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ إِذَا حِضْتُ نَزَلْتُ عَنْ الْمِثَالِ عَلَى الْحَصِيرِ، فَلَمْ نَقْرُبْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ نَدْنُ مِنْهُ حَتَّى نَطْهُرَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: كاتێ كە بێ نوێژ دەبووم لە شوێنەكەی خۆم دادەبەزیم و لەسەر حەسیرێك دەخەوتم، نە نزیكی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەدەكەوتمەوەو نە كاری سەر جێیم لەگەڵ دەكرد، هەتا پاك دەبوومەوە.

٢٧٢ - (صحيح) عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ مِنَ الْحَائِضِ شَيْئًا، أَلْقَى عَلَى فَرْجِهَا ثَوْبًا.

واتە: لە هەندێ لە خێزانەكانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر شتێكی لە بێ نوێژ بیویستایە، پۆشاكێكی دەدا بەسەر داوێنی - پاشان چێژی لێ وەردەگرت - .

٢٧٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا فِي فَوْحِ حَيْضِنَا أَنْ نَتَّزِرَ، ثُمَّ يُبَاشِرُنَا وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْلِكُ إِرْبَهُ؟.

واته: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەکاتی بێ نوێژیدا فەرمانی پێ دەکردین بەوەی کە نێوان ئەژنۆ و ناوکمان بە باشی داپۆشین، ئینجا گەمەی لەگەڵ دەکردین و چێژی لێ وەردەگرتین، ئایا کامتان دەتوانن خۆتان بگرن، وەکو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی دەگرت.

## باسی ئافرەتیْ کە خویْن لەبەر ڕۆیشتنی بەردەوامی هەبیْ، وە ئەوانەی کە دەڵیْن: بە ئەندازەی ئەو شەو و ڕۆژانە نویْژ نەکات کە پیْشتر لەمانگیْکدا تیْیدا تووشی بیْ نویْژی بووە.

## ١٠٨ – بَابُ فِي الْمَرْأَةِ تُسْتَحَاضُ وَمَنْ قَالَ: تَدَعُ الصَّلَاةَ فِي عِدَّةِ الأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُ.

| |
|---|
| ٢٧٤ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدِّمَاءَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاسْتَفْتَتْ لَهَا أُمُّ سَلَمَةَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لِتَنْظُرْ عِدَّةَ اللَّيَالِي وَالأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا الَّذِي أَصَابَهَا، فَلْتَتْرُكِ الصَّلَاةَ قَدْرَ ذَلِكَ مِنَ الشَّهْرِ فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ فَلْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لِتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ، ثُمَّ لْتُصَلِّ فِيهِ ). |

واتە: لە ئوم سەلەمەی خیْزانی پیْغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پیْغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، ئافرەتیْك

خوێنی زۆری لەبەر دەڕۆیشت، ئوم سەلەمە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری بۆ کرد، ئەویش فەرمووی: با تەماشا بکات، بە ئەندازەی ئەو شەو و رۆژانە نوێژ نەکات کە پێشتر تێیدا تووشی حەیز دەهات لە مانگێکدا، جا ئەگەر لەو ماوەیە تێ پەڕی با خۆی بشوات و خۆی باش پاك بکاتەوەو، بە پارچە قوماشێکی پاك خۆی قایم بکات بۆ ئەوەی خوێنەکە نەیەتەدەرەوە، پاشان با نوێژ بکات.

٢٧٥ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدَّمَ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، قَالَ: (فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ، وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْتَغْتَسِلْ).

واتە: لە ئوم سەلەمەوە هاتووە، کە ئافرەتێك خوێنی زۆری لەبەر دەڕۆیشت، بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوەو وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (جا ئەگەر لەو ماوەیە تێ پەڕی و، کاتی نوێژ هاتە پێشەوە با خۆی بشوات).

٢٧٦ - (صحيح) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدِّمَاءَ، فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ اللَّيْثِ، قَالَ: (فَإِذَا خَلَّفَتْهُنَّ وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْتَغْتَسِلْ ). وَسَاقَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە، ئەویش لە پیاوێك لە یاریدەدەرانەوە هاتووە، کە ئافرەتێك خوێنی زۆری لەبەر دەڕۆیشت، بە هەمان مانا باسی

فەرمودەكەی (لَيْث)ی گێڕایەوە، فەرمووی: (جا ئەگەر لەو ماوەیە تێ پەڕی و، كاتی نوێژ هاتە پێشەوە با خۆی بشوات). بە هەمان مانا فەرمودەكەی گێڕایەوە.

**٢٧٧ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ بِإِسْنَادِ اللَّيْثِ وَبِمَعْنَاهُ، قَالَ: (فَلْتَتْرُكِ الصَّلاَةَ قَدْرَ ذَلِكَ، ثُمَّ إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْتَغْتَسِلْ، وَلْتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ، ثُمَّ تُصَلِّي).**

واتە: لە نافعەوە بە سەنەدەكەی (لَيْث) و بە هەمان مانا هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بە ئەندازەی ئەو شەو و ڕۆژانە نوێژ نەكات، پاشان ئەگەر كاتی نوێژ هاتە پێشەوە با خۆی بشوات، وە بە پارچە قوماشێكی پاك خۆی قایم بكات بۆ ئەوەی خوێنەكە نەیەتەدەرەوە، پاشان با نوێژ بكات.

**٢٧٨ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ ، قَالَ فِيهِ: (تَدَعُ الصَّلاَةَ، وَتَغْتَسِلُ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ، وَتَسْتَثْفِرُ بِثَوْبٍ وَتُصَلِّي).**

واتە: ئەم بەسەرهاتە لە ئوم سەلەمەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو ماوە نوێژ نەكات، دوای ئەوە خۆی بشوات و بە پارچە قوماشێكی پاك خۆی قایم بكات بۆ ئەوەی خوێنەكە نەیەتەدەرەوە، جا نوێژ بكات.

٢٧٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهـا أَنَّهَـا قَالَـتْ: إِنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ سَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الـدَّمِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَرَأَيْتُ مِرْكَنَهَا مَلآنَ دَمًا، فَقَـالَ لَهَـا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (امْكُثِـي قَـدْرَ مَـا كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي).

واتە: لە عائيشـەوە رەزاى خـواى لـێ بـێ هـاتووە، كـە وتويـەتى: (أُمَّ حَبِيبَـة) سـەبارەت بـە خـوێن لەبـەر رۆشـتنى بـەردەوام لـە پێغەمبـەرى صلى الله عليـه وسلم پرسى؟ - عائيشە وتى: بينيم ئەو دەفرەى كە خۆى تێدا دەشۆرى و ئـاوى دەكرد بە خۆيدا بە خوێن سـور بـوو - پێغەمبـەرى خـوا صـلى الله عليـه وسـلم پێـى فـەرموو: (بمێنـەوە بـە ئەنـدازەى ئـەوە كـە لـە كـاتى حـەيزدا دەمايتـەوە، پاشان خۆت بشۆ و نوێژ بكە.

٢٨٠ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَـالَ: أَنَّ فَاطِمَـةَ بِنْـتَ أَبِـي حُبَيْشٍ حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، فَشَكَتْ إِلَيْهِ الدَّمَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا ذَلِكَ عِـرْقٌ، فَـانْظُرِي إِذَا أَتَـى قُرْؤُكِ فَلاَ تُصَلِّي، فَإِذَا مَرَّ قُرْؤُكِ فَتَطَهَّرِي، ثُـمَّ صَـلِّي مَا بَيْنَ الْقُرْءِ إِلَى الْقُرْءِ).

واتە: لە عروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیش بۆی گێڕاوەتەوە، کە تووشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بووە، لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسیوە، ئەویش پێی فەرمووە: (ئەوە دەمارەو خوێنی بێ نوێژی نیە، ئەگەر کاتی بێ نوێژیت هات نوێژ مەکە، هەتا کاتی بێ نوێژیەکەت تێ دەپەڕێت و پاك دەبیتەوە، جا خۆت بشۆ و خۆت پاك کەرەوە، پاشان لەو کاتەوە کە خوێنت نامێنێت و پاك دەبیتەوە هەتا جارێکی تر دەکەویتە حەیزەوە نوێژ بکە).

**٢٨١ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: حَدَّثَتْنِي فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ أَنَّهَا أَمَرَتْ أَسْمَاءَ - أَوْ أَسْمَاءُ حَدَّثَتْنِي أَنَّهَا أَمَرَتْهَا فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ - أَنْ تَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا أَنْ تَقْعُدَ الأَيَّامَ الَّتِي كَانَتْ تَقْعُدُ ثُمَّ تَغْتَسِلُ.**

واتە: لە عروەی کوڕی زوبێرەوە هاتووە، کە وتویەتی: (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیش بۆی گێڕامەوە، کە فەرمانی کردووە بە (أَسْمَاءَ) - یان (أَسْمَاءَ) بۆی گێڕاوەتەوە، کە (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیش فەرمانی پێ کردووە — کە پرسیاری بۆ بکات لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کرد کە پێشتر چەند ڕۆژ دادەنیشت ئەوەندە دابنیشێت واتە بە ئەندازەی ئەو شەو و ڕۆژانە نوێژ نەکات پاشان خۆی بشوات).

(صحيح بما قبلـه) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ اسْتُحِيضَتْ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَدَعَ الصَّلَاةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلَ وَتُصَلِّيَ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: قەتادە لە عوروەی كوڕی زوبێرەوە، ئەویش لە زەینەبی كچی ئوم سەلەمەوە گێڕاویەتیەوە، كە ئوم حەبیبەی كچی جەحش خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانی پێ كرد پێشتر چەند ڕۆژ بێ نوێژ بووە بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانە نوێژ نەكات، پاشان خۆی بشوات و نوێژ بكات.

(صحيح) ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَسْمَعْ قَتَادَةُ مِنْ عُرْوَةَ شَيْئًا.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: قەتادە هیچ شتێكی لە عوروە نەبیستووە.

(صحيح) ﴿قَالَ أَبُو دَاوُدَ﴾: وَزَادَ ابْنُ عُيَيْنَةَ فِي حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَسَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَأَمَرَهَا أَنْ تَدَعَ الصَّلَاةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: (ابْنُ عُيَيْنَةَ)ە ئەمەی زیاد كردووە بۆ فەرموودەكەی زوهری، لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە ئوم حەبیبە خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمانی پێ كرد بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی كە پێشتر بێ نوێژ بووە نوێژ نەكات.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا وَهَمٌ مِـنَ ابْـنِ عُيَيْنَـةَ، لَـيْسَ هَـذَا فِـى حَـدِيثِ الْحُفَّاظِ عَنْ الزُّهْـرِيِّ، إلاَّ مَـا ذَكَـرَ سُـهَيْلُ بْـنُ أَبِـى صَالِحٍ، وَقَدْ رَوَى الْحُمَيْـدِيُّ هَـذَا الْحَـدِيثَ عَـنْ ابْـنِ عُيَيْنَةَ لَمْ يَذْكُرْ فِيهِ: (تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا ).

واتـە: ئـەبو داود دەڵێـت: ئەمـە (وهـم)ە لـە (ابْـنُ عُيَيْنَـة)ەوە ئـەم فـەرموودە ئەوانەی تێدا نیە کە لە زوهریەوە فەرموودەیان لەبەردەکرد تەنها ئەوە نـەبێت کـە سـوهەیلی کـوڕی ئـەبو سـاڵح باسـی کـردووە، حومەیـدیش ئـەم فـەرموودەی لە(ابْنُ عُيَيْنَة)ەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەوەی باس نەکردووە کە فەرموویەتی: (بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانە نوێژ نەکات کە پێشتر بێ نوێژ بووە).

(صحيح موقوف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، الْمُسْتَحَاضَـةُ تَتْـرُكُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ هاتووە، ئـەو ئافرەتـەی کـە خـوێن لەبەر ڕۆشـتنی بـەردەوامی هەیـە(مُسْتَحَاضَـة) بـە ئەنـدازەی ئـەو ڕۆژانـەی کـە پێشتر بێ نوێژ بووە نوێژ نەکات، پاشان خۆی بشوات.

(صحيح بما قبله) وَقَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْقَاسِـمِ ، عَـنْ أَبِيـهِ، إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهَا أَنْ تَتْـرُكَ الصَّـلاَةَ قَدْرَ أَقْرَائِهَا.

واتـە: لـە (عَبْـدُ الـرَّحْمَن)ی کـوڕی قاسمـەوە، لـە باوکیـەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم فـەرمانی پـێ کـرد بـە ئەنـدازەی ئـەو ڕۆژانەی کە پێشتر بێ نوێژ بووە نوێژ نەکات.

(صحيح) عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ اسْتُحِيضَتْ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ. وَرَوَى شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي الْيَقْظَانِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمُسْتَحَاضَةُ تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي).

واته: له (عِكْرِمَةَ)ەوه هاتووه، كه ئوم حەبيبەی كچی جەحش خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەبوو، بە هەمان شێوه فەرمودەكەی گێڕايەوه.
وه شورەيك له (أَبِي الْيَقْظَانِ)ەوه، ئەويش لە عەدی كوڕی (ثَابِت)ەوه، لە باوكيەوه گێڕاويەتيەوه، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، فەرمانی كردووه بەو ئافرەتەی كه خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەيە بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی كە پێشتر بێ نوێژ بووه نوێژ نەكات، پاشان خۆی بشوات و نوێژ بكات.

(صحيح) وَرَوَى الْعَلاَءُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ الْحَكَمِ عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ: أَنَّ سَوْدَةَ اسْتُحِيضَتْ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا مَضَتْ أَيَّامُهَا اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ.

واته: وه (الْعَلاَء)ی كوڕی موسەييەب له حەكەمەوه، له ئەبی جەعفەرەوه گێڕاويەتيەوه، كە سەودە خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەبوو، بۆيە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ كرد بەوەی ئەگەر لەو ڕۆژانە تێ پەڕی كە پێشتر بێ نوێژ بووه، ئەوه با خۆی بشوات و نوێژ بكات.

(صحيح) عَنْ عَلِيّ وَابْنِ عَبَّاسٍ: (الْمُسْتَحَاضَةُ تَجْلِسُ أَيَّامَ قُرْئِهَا ).

واتە: لە ئیمام عەلی و ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، ئەو ئافرەتەی کە خوێن لەبەر رۆشتنی بەردەوامی هەبێت، دەبێت بە ئەندازەی ئەو رۆژانەی کە پێشتر بێ نوێژ بووە نوێژ نەکات و رۆژوو نەگرێت.

(صحيح) وَكَذَلِكَ رَوَاهُ عَمَّارٌ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ وَطَلْقُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ

هەروەها عەماری خزمەتکاری بەنی هاشم و (طَلْق)ی کوڕی حەبیب لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویانەتەوە.

(إسناده ضعيف) وَكَذَلِكَ رَوَاهُ مَعْقِلٌ الْخَثْعَمِيُّ، عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

هەروەها مەعقیلی کوڕی (خَثْعَمِيّ)ەوە لە ئیمام عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتەوە.

(صحيح) وَكَذَلِكَ رَوَى الشَّعْبِيُّ، عَنْ قَمِيرَ امْرَأَةِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها.

هەروەها شەعبی لە قەمیر خێزانی مەسروقەوە لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَهُوَ قَوْلُ الْحَسَنِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعَطَاءٍ، وَمَكْحُولٍ، وَإِبْرَاهِيمَ، وَسَالِمٍ، وَالْقَاسِمِ: إِنَّ الْمُسْتَحَاضَةَ تَدَعُ الصَّلَاةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: ئەمە وتەی حەسەن و سەعیدی كوڕی موسەییەب و (عَطَاء) و مەكحول و ئیبراهیم و سالم و قاسمە: كە ئەو ئافرەتەی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەیە، دەبێت بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی كە پێشتر بێ نوێژ بووە نوێژ نەكات.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: ئەگەر ئافرەت خوێنی بێ نوێژی نەما ئیتر با نوێژ بكات و وازی لێ نەهێنێت.

## ١٠٩ - بَابُ مَنْ رَوَى: أَنَّ الْحَيْضَةَ إِذَا أَدْبَرَتْ لاَ تَدَعُ الصَّلاَةَ.

٢٨٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: إِنِّى امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: (إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە (فَاطِمَة)ی كچی ئەبو حوبەیش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و وتی: من ئافرەتێكم خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامم هەیەو پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژ كردن بهێنم؟ فەرمووی: (ئەوە خوێنی دەمارە، خوێنی حەیز نیە، ئەگەر

خوێنی حەیز دەستی پێ کرد ئەوە خۆت لەنوێژ بگرەوە واتە نوێژ مەکە، بەلاَم ئەگەر خوێنی حەیزەکە وشکی کردو نەما ئەوە خۆت بشۆ، پاشان ئەو خوێنە بشۆ کە لەدوای خۆشتنەکە دێت، ئینجا نوێژ بکە).

٢٨٣ - (صحيح) عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامٍ، بِإِسْنَادِ زُهَيْرٍ وَمَعْنَاهُ، وَقَالَ: (فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلاَةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا، فَاغْسِلِي الدَّمَ عَنْكِ وَصَلِّي ).

واتە: لە مالیکەوە، لە هیشامەوە، بە هەمان ئیسنادو مانای فەرموودەکەی پێشووی زوهەیر هاتووە، مالك وتی: (ئەگەر خوێنی حەیز دەستی پێ کرد ئەوە نوێژ مەکە، ئەگەر ماوەکەی تەواو بوو — واتە ئەو ماوەیەی کە پێشتر تێیدا بێ نوێژ دەبوو - ئەوا خوێنەکە بشۆ، ئینجا نوێژ بکە).

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەگەر خوێنی حەیز دەستی پێ کرد با نوێژ نەکات.

## ١١٠ – بَابُ مَنْ قَالَ: إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ تَدَعُ الصَّلاَةَ.

٢٨٤ - (ضعيف) عَنْ بُهَيَّةَ ، قَالَتْ: سَمِعْتُ امْرَأَةً تَسْأَلُ عَائِشَةَ عَنْ امْرَأَةٍ فَسَدَ حَيْضُهَا وَأُهَرِيقَتْ دَمًا، فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ آمُرَهَا فَلْتَنْظُرْ قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحِيضُ فِي كُلِّ شَهْرٍ وَحَيْضُهَا مُسْتَقِيمٌ، فَلْتَعْتَدَّ بِقَدْرِ

ذَلِكَ مِنَ الأَيَّامِ، ثُمَّ لْتَدَعِ الصَّلاَةَ فِيهِنَّ أَوْ بِقَدْرِهِنَّ، ثُمَّ لْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لْتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ، ثُمَّ لْتُصَلِّي.

واتە: لە (بُهَيَّة)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە ژنێك کە پرسیاری لە عائیشە رەزای خوای لێ بێ کرد سەبارەت بە خراپبوون تێکچوونی بێ نوێژیەکەی و خوێن لەبەر رۆشتنی؟ عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی پێ کردم کە فەرمانی پێ بکەم با تەماشا بکات بە ئەندازەی ئەو رۆژانەی کە هەموو مانگێ تێیاندا بێ نوێژ بووەو بێ نوێژیەکەی رێکوپێك بووە نوێژ نەکات، دوای ئەوە خۆی بشوات و بە پارچە قوماشێکی پاك خۆی قایم بکات بۆ ئەوەی خوێنەکە نەیەتەدەرەوە، ئینجا نوێژ بکات.

٢٨٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ خَتَنَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، اسْتُحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ فَاسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ هَذِهِ لَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، وَلَكِنْ هَذَا عِرْقٌ، فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە ئوم حەبیبەی کچی جەحش ژن خوشکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کە خێزانی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف بوو ماوەی حەوت ساڵ توشی خوێن لەبەر رۆشتنی

بەردەوام بوو، سەبارەت بەو حاڵەتە لە پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ئەوە خوێنی حەیز نیە، بەڵكو ئەوە خوێنی دەمارە، با خۆی بشوات و نوێژ بكات).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ الأَوْزَاعِىُّ فِى هَذَا الْحَدِيثِ، عَنْ الزُّهْرِىِّ، عَنْ عُرْوَةَ وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْها، قَالَتِ: اسْتُحِيضَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ - وَهِىَ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ - سَبْعَ سِنِينَ، فَأَمَرَهَا النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِى الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلِى وَصَلِّى).

واتە: ئەبو داود دەڵێت: ئەوزاعی ئەمەی بۆ زیاد كردووە، لە زوهریەوە لە عورووەوە لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: ئوم حەبیبەی كچی جەحش ژن خوشكی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم - كە خێزانی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ی كوڕی عەوف بوو بۆ ماوەی حەوت ساڵ توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ كرد و فەرمووی: (ئەگەر خوێنی حەیز دەستی پێ كرد ئەوە خۆت لەنوێژ بگرەوە واتە نوێژ مەكە، بەڵام ئەگەر خوێنی حەیزەكە وشكی كرد ئەوە خۆت بشۆ و نوێژ بكە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَمْ يَذْكُرْ هَذَا الْكَلاَمَ أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِ الزُّهْرِىِّ، غَيْرَ الأَوْزَاعِىِّ، وَرَوَاهُ عَنْ الزُّهْرِىِّ: عَمْرُو بْنُ الْحَارِثِ، وَاللَّيْثُ، وَيُونُسُ، وَابْنُ أَبِى ذِئْبٍ، وَمَعْمَرٌ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ

سَعْدٍ، وَسُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ، وَابْنُ إِسْحَاقَ، وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: وَلَمْ يَذْكُرُوا هَذَا الْكَلاَمَ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: هیچ کەسێ لە هاوەڵانی زوهری باسی ئەم قسەیان نەکردووە، جگە لە ئەوزاعی، وە ئەمانەش لە زوهریەوە گێڕاویانەتەوە: عەمری کوڕی (حَارِث) و (لَيْث) و یونس و (ابْنُ أَبِي ذِئْب) و مەعمەر و ئیبراهیمی کوڕی سەعد و سولەیمانی کوڕی (كَثِير) و ئیسحاق و سوفیانی کوڕی عویەینە: بەڵام باسی ئەمەیان نەکردووە: (إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي ).

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَإِنَّمَا هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها.

ئەبو داود دەڵێت: بەڵکو ئەمە گۆ(لَفْظ)ی فەرموودەکەی هیشامی کوڕی عورومیە، کە لە باوکیەوە، ئەویش لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە.

(صحيح) قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَزَادَ ابْنُ عُيَيْنَةَ فِيهِ أَيْضًا: أَمَرَهَا أَنْ تَدَعَ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، وَهُوَ وَهَمٌ مِنَ ابْنِ عُيَيْنَةَ، وَحَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ الزُّهْرِيِّ فِيهِ شَيْءٌ، يَقْرُبُ مِنَ الَّذِي زَادَ الأَوْزَاعِيُّ فِي حَدِيثِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: هەروەها ئیبنو عویەینەش ئەمەی بۆ زیاد کردووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد بەوەی کە لە ڕۆژانی بێ نوێژیەکەیدا نوێژ نەکات، ئەوەش (وَهَم)ە لە ئیبنو عویەینەوە، وە

فەرمودەكـەی عـەمر كـە لـە زوهریـەوە گێڕاویەتیـەوە، شـتێكی تێدایـە نزیكـە لەوەی كە ئەوزاعی تێیدا بۆی زیاد كردووە.

٢٨٦ - (حسن) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ أَبِـى حُبَـيْشٍ قَالَ: أَنَّهَا كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا كَـانَ دَمُ الْحَيْضَـةِ: فَإِنَّـهُ دَمٌ أَسْـوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَـنْ الصَّـلاَةِ، فَـإِذَا كَانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي، فَإِنَّمَا هُوَ عِرْقٌ).

واتە: لە عورەی كوڕی زوبێرەوە، دەگێڕنەوە، كە وتویـەتی: (فَاطِمَـة)ی كچـی ئـەبو حوبـەیش خـوێنی بـەردەوامی هـەبوو، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم پێی فەرموو: (ئەگەر خوێنی حەیز بێت دیارە، چونكە خـوێنێكی ڕەشـە خەسـتەو ژنـان خۆیـان باشـی دەناسـن، جـا ئەگـەر وەهـا بـوو ئـەوە خـوێنی بـێ نوێژیە، ئیتر دەست هەڵگرە لە نوێژ - واتە نوێژ مەكە -، وە ئەگەر بە جۆرێكی تر بوو ئەوا دەستنوێژ بگرەو نوێژی خۆت بكە! چونكە ئەوە خوێنی دەمارە.

قَـالَ أَبُـو دَاوُدَ: عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهـا، أَنَّ فَاطِمَـةَ كَانَـتْ تُسْتَحَاضُ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

ئەبو داود دەڵێـت: لـە عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، كـە (فَاطِمَـة) خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامی هەبوو. بە هـەمان مانـا فەرمودەكـەی پێشوی گێڕایەوە.

**(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ، قَالَ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ الْبَحْرَانِيَّ فَلاَ تُصَلِّي، وَإِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ وَلَوْ سَاعَةً، فَلْتَغْتَسِلْ وَتُصَلِّي.**

ئەبو داود دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ سەبارەت بە خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام دەگێڕنەوە،،کە وتویەتی: ئەگەر خوێنی زۆری بینی لە قوڵایی ڕەحمیەوە دەهاتەدەر ئەوە با نوێژ نەکات، بەڵام ئەگەر بینی پاك بۆتەوە با بۆ کاتژمێرێکیش بێت، خۆی بشوات و نوێژ بکات.

**(لم أره) ﴿وَ﴾قَالَ: مَكْحُولٌ إِنَّ النِّسَاءَ لاَ تَخْفَى عَلَيْهِنَّ الْحَيْضَةُ، إِنَّ دَمَهَا أَسْوَدُ غَلِيظٌ، فَإِذَا ذَهَبَ ذَلِكَ وَصَارَتْ صُفْرَةً رَقِيقَةً، فَإِنَّهَا مُسْتَحَاضَةٌ، فَلْتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّي.**

واتە: ئەبو مەکحول دەڵێت: خوێنی بێ نوێژی لەلای ئافرەتان شاراوە نیە، چونکە خوێنەکە خوێنێکی ڕەشی خەستە، ئەگەر ئەوە نەماو، بوو بە خوێنێکی زەردباوی ڕوون ئەوە (مُسْتَحَاضَةٌ)یە واتە خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامە، ئەوە با خۆی بشوات و نوێژ بکات.

**(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ، إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ تَرَكَتِ الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتِ اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ.**

واتە: ئەبو داود دەڵێت: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە هاتووە، کە (مُسْتَحَاضَةٌ) ئەگەر خوێنی بێ نوێژی دەستی پێ کرد ئەوە نوێژ نەکات، بەڵام ئەگەر نەما ئەوە خۆی بشوات و نوێژ بکات).

**وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: تَجْلِسُ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا.**

وە لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە هاتووە، کە ڕۆژانی بێ نوێژی دانیشێت، واتە با نوێژ نەکات.

**وَكَذَلِكَ رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ.**

وە هەروەها حەممادی کوڕی سەلەمە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە گێڕاویەتیەوە.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى يُونُسُ، عَنْ الْحَسَنِ: الْحَائِضُ إِذَا مَدَّ بِهَا الدَّمُ تُمْسِكُ بَعْدَ حَيْضَتِهَا يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ، فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ.**

واتە: ئەبو داود دەڵێت: یونوس لە حەسەنەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: ئافرەتی بێ نوێژ ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ لەدوای کاتی دیاریکراوی خۆی با خۆی بگرێتەوە لە نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن و قورئان خوێندن، دوای ئەوە ئیتر (مُسْتَحَاضَة)یە واتە: خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوامە.

**وَقَالَ التَّيْمِيُّ، عَنْ قَتَادَةَ: إِذَا زَادَ عَلَى أَيَّامِ حَيْضِهَا خَمْسَةُ أَيَّامٍ فَلْتُصَلِّي، قَالَ التَّيْمِيُّ: فَجَعَلْتُ أَنْقُصُ حَتَّى بَلَغْتُ يَوْمَيْنِ، فَقَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمَيْنِ فَهُوَ مِنْ حَيْضِهَا. وَسُئِلَ ابْنُ سِيرِينَ عَنْهُ فَقَالَ: النِّسَاءُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ.**

واته: وه (تَّيْمِيّ) دەڵێت: له قەتادەوه هاتووه، ئەگەر پێنج رۆژ زیادی کرد لەدوای کاتی دیاریکراوی خۆی ئەوا با نوێژ بکات، هەروەها (تَّيْمِيّ) دەڵێت: ئەو ماوەیەم کەم کردەوه هەتا گەیشته دوو رۆژ، وه وتی: ئەگەر دوو رۆژ بوو ئەوە هی بێ نوێژیەکەیەتی. سەبارەت بەو حاڵەته له ئیبنو سیرینیان پرسی؟ ئەویش وتی: ئافرەتان خۆیان باشی لێ دەزانن و لەلایان شاراوه نیه.

٢٨٧ - (حسن) عَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ، قَالَتْ: كُنْتُ أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْتَفْتِيهِ وَأُخْبِرُهُ، فَوَجَدْتُهُ فِي بَيْتِ أُخْتِي زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً، فَمَا تَرَى فِيهَا، قَدْ مَنَعَتْنِي الصَّلَاةَ وَالصَّوْمَ؟ فَقَالَ: (أَنْعَتُ لَكِ الْكُرْسُفَ فَإِنَّهُ يُذْهِبُ الدَّمَ). قَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: (فَاتَّخِذِي ثَوْبًا). فَقَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، إِنَّمَا أَثُجُّ ثَجًّا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (سَآمُرُكِ بِأَمْرَيْنِ أَيَّهُمَا فَعَلْتِ أَجْزَأَ عَنْكِ مِنَ الآخَرِ، وَإِنْ قَوِيتِ عَلَيْهِمَا فَأَنْتِ أَعْلَمُ). قَالَ لَهَا (إِنَّمَا هَذِهِ رَكْضَةٌ مِنْ رَكَضَاتِ الشَّيْطَانِ، فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ فِي عِلْمِ اللَّهِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي، حَتَّى إِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ

طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْتِ، فَصَلِّي ثَلاَثًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَوْ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا، وَصُومِي، فَإِنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُكِ، وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي ﴿فِي﴾ كُلِّ شَهْرٍ، كَمَا تَحِيضُ النِّسَاءُ، وَكَمَا يَطْهُرْنَ، مِيقَاتَ حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِنَّ، وَإِنْ قَوِيتِ عَلَى أَنْ تُؤَخِّرِي الظُّهْرَ وَتُعَجِّلِي الْعَصْرَ فَتَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَتُؤَخِّرِينَ الْمَغْرِبَ وَتُعَجِّلِينَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فَافْعَلِي، وَتَغْتَسِلِينَ مَعَ الْفَجْرِ فَافْعَلِي، وَصُومِي إِنْ قَدَرْتِ عَلَى ذَلِكَ). قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَهَذَا أَعْجَبُ الأَمْرَيْنِ إِلَيَّ).

واتە: لە حەمنەی کچی جەحشەوە هاتووە، کە وتویەتی: توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی زۆر توند و بەردەوام بووم، چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم، سەیرم کرد لە ماڵی زەینەبی کچی جەحشی خوشکم بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم توشی بێ نوێژیەکی هەمیشەیی زۆر توند بووم بە شێوەیە کە نایەڵێت نوێژ و ڕۆژووەکانم بەجێ بێنم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لۆکەت بۆ وەسف دەکەم بەکاری بهێنە چونکە خوێن دەبات). وتم: لەوە زۆرترە کە بە لۆکە بگیرسێتەوە، فەرمووی: (بە پەڕۆیەك توند بیبەستە). وتم بە خوڕ دێتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (فەرمانت پێ دەکەم

بە دوو شت هەرکامیانت کرد ئەوەی تریانت لەسەر دەکەوێت، وە ئەگەر توانات هەبوو بەسەر هەردووکیاندا ئەوە بۆ خۆت چاکتر دەزانیت). جا فەرمووی: (ئەمە لەقەیەکە لە لەقەکانی شەیتان یان پاڵێکە لە پاڵەکانی شەیتان، جا شەش رۆژ تا حەوت رۆژ بە حەیز دەژمێردرێت لە زانستی خوا دا، پاشان خۆت بشۆ، جا ئەگەر بینیت پاك بویتەتەوە، ئەوا بیست و سێ شەو یان بیست و چوار شەو بە رۆژەکانیەوە نوێژ بکەو، رۆژوو بگرە، ئەوە ئیتر لەسەرت دەکەوێت، هەروەها لە هەموو مانگێکدا بەو شێوەیە بکە، وەکو ئافرەتان چۆن تووشی حەیز دەبن، وە چی کاتێکیش پاك دەبنەوە، بەکاتی حەیز و پاکێتی ئەوان، وە ئەگەر توانیت نوێژی نیوەڕۆ درەنگ بکەیت و نوێژی عەسر زوو بکەیت، جا خۆت بشۆیت و ئەو دوو نوێژە نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە بکەیت، پاشان نوێژی ئێوارە درەنگ بکەیت و نوێژی عیشا زوو بکەیت، دوای ئەوە خۆت بشۆیت و ئەو دوو نوێژە پێکەوە بکەیت ئەوە بیکە، وە لەگەڵ نوێژی بەیانیدا هەستە خۆت بشۆو نوێژەکەی بەیانیت بکە، وە بەو شێوەیە نوێژەکانت بکەو رۆژوو بگرە ئەگەر توانیت). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەمەی دواییم پێ باشترە لەم دوو شێوەیە).

(ضعيف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ﴿وَ﴾رَوَاهُ عَمْرُو بْنُ ثَابِتٍ، عَنْ ابْنِ عَقِيلٍ، فَقَالَ: قَالَتْ حَمْنَةُ: ﴿فَقُلْتُ﴾ هَذَا أَعْجَبُ الأَمْرَيْنِ إِلَيَّ، لَمْ يَجْعَلْهُ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَعَلَهُ كَلاَمَ حَمْنَةَ.

ئەبو داود دەڵێت: عەمری کوڕی (ثابت) لە (ابْنِ عَقِيل) گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: حەمنەی وتی: ئەمەی دواییم پێ باشترە لەم دوو شێوەیە. فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نیە. وتەی حەمنەیە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَعَمْرُو بْنُ ثَابِتٍ رَافِضِياً، ﴿رَجُلُ سَوْءٍ وَلَكِنَّهُ كَانَ صَدُوقًا فِي الْحَدِيثِ، وَثَابِتُ بْنُ الْمِقْدَامِ رَجُلٌ ثِقَةٌ﴾، وَذَكَرَهُ عَنْ يَحْيَى بْنِ مَعِينٍ.

ئەبو داود دەڵێت: عەمری کوڕی (ثَابِت) پیاوێکی خراپەو (رَافِضِيّ)یە فەرمودەی لێ وەرناگیرێت – (رَافِضِيّ)کۆمەڵێکن لە شیعەکان - ، ﴿بەڵام لە گێڕانەوەی فەرموودەکەدا راستگۆیە، وە (ثَابِت)ی کوڕی میقدام پیاوێکی راستگۆیەو جێی باوەڕە﴾ لە یەحیای کوڕی مەعینەوە گێڕاویەتیەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ يَقُولُ: حَدِيثُ ابْنِ عَقِيلٍ فِي نَفْسِي مِنْهُ شَيْءٌ.

ئەبو داود دەڵێت: لە پێشەوا ئەحمەدم بیست دەیوت: شتێ لە دەروونمدا دروست بوو سەبارەت بە فەرموودەکەی (ابْنِ عَقِيل) - لە (عون المعبود: ١/ ٢٢٤)دا هاتووە کە پێشەوا ئەحمەد فەرموودەکەی بە راست و دروست داناوە.

٢٨٩ - (صحيح) عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

واتە: ئوم حەبیبە بە هەمان مانا فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە، خاتوو عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: ئیتر بۆ هەموو نوێژێك خۆی دەشت.

٢٩٠ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ فِيهِ: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

واتە: لە عوروەوە، ئەویش لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ ئـەم فـەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە فەرمودەکەیدا وتویەتی: بۆ هەموو نوێژێك خۆی دەشت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ الْقَاسِمُ بْنُ مَبْرُورٍ، عَنْ يُونُسَ، عَـنْ ابْـنِ شِـهَابٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ جَحْشٍ. وَكَذَلِكَ رَوَاهُ مَعْمَـرٌ، عَـنْ الزُّهْـرِيِّ، عَـنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، وَرُبَّمَا قَالَ مَعْمَرٌ: عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِمَعْنَاهُ.

ئەبو داود دەڵێت: قاسمی کوڕی مەبرور لـە یونوسـەوە، لـە ئیبنـو شـیهابەوە، لە (عَمْرَة)ەوە، لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ، ئەویش لە ئوم حەبیبەی کچی جەحشەوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها مەعمەر لـە زوهریـەوە، لـە (عَمْـرَة)ەوە، لـە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە، وە لەوانەیە مەعمەر وتویەتی: لە (عَمْرَة)ەوە ئەویش لە ئوم حەبیبەوە بە هەمان مانا گێڕاویەتیەوە.

وَكَذَلِكَ رَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ وَابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَمْـرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، وَقَـالَ ابْـنُ عُيَيْنَـةَ فِـي حَدِيثِهِ: وَلَمْ يَقُلْ: إِنَّ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ.

هەروەها ئیبراهیمی کوڕی سەعد و (ابْنُ عُيَيْنَة) لە زوهریەوە، لە (عَمْرَة)ەوە، لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ گێڕاویەتیـەوە، وە (ابْـنُ عُيَيْنَـة) لـە فەرموودەیەکدا وتویەتی: زوهری نەیوت پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم فەرمانی پێ کرد کە خۆی بشوات.

٢٩١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ اسْتُحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ، فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تَغْتَسِلَ، فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە ئوم حەبیبەی کچی جەحش بۆ ماوەی حەوت ساڵ تووشی نەخۆشی خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەردەوام بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد بەوەی کە خۆی بشوات، دوای ئەوە ئیتر بۆ هەموو نوێژێك خۆی دەشت.

وَكَذَلِكَ رَوَاهُ الأَوْزَاعِيُّ أَيْضًا، قَالَ فِيهِ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

وە هەروەها ئەوزاعی لە فەرمودەکەیدا وتویەتی: خاتوو عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: دوای ئەوە ئیتر بۆ هەموو نوێژێك خۆی دەشت.

٢٩٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ اسْتُحِيضَتْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا بِالْغُسْلِ لِكُلِّ صَلاَةٍ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە ئوم حەبیبەی کچی جەحش تووشی نەخۆشی خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەردەوام بوو، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، فەرمانی پێ کرد کە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات. جا ڕاوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

(صحيح دون قوله: زينب بنت جَحْشٍ والصواب أمّ حبيبة بنت جَحْشٍ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ أَبُو الْوَلِيدِ الطَّيَالِسِيُّ - وَلَمْ أَسْمَعْهُ مِنْهُ - ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ كَثِيرٍ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتِ: اسْتُحِيضَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اغْتَسِلِي لِكُلِّ صَلاَةٍ ). وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

ئەبو داود دەڵێت: هەروەها لە ئەبو وەلیدی (طَّيَالِسِيّ)ەوە — هەرچەندە من ئەم فەرمودەم لێ نەبیستووە - ، لە سولەیمانی کوڕی (كَثِيرٍ)ەوە، لە زوهریەوە، لە عورووەوە، ئەویش لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: ئوم زەینەبی کچی جەحش تووشی نەخۆشی خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەردەوام بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (بۆ هەموو نوێژێك خۆت بشۆ). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ عَبْدُ الصَّمَدِ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ كَثِيرٍ، قَالَ: (تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ ).

ئەبو داود دەڵێت: (عَبْدُ الصَّمَد)، لە سولەیمانی کوڕی (كَثِيرٍ)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا وَهَمٌ مِنْ عَبْدِ الصَّمَدِ وَالْقَوْلُ فِيهِ قَوْلُ أَبِي الْوَلِيدِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمە (وَهَم)ە لە (عَبْدُ الصَّمَد)ەوە، وتە تێیدا وتەکەی ئەبو وەلیدە.

٢٩٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَتْنِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدَّمَ - وَكَانَتْ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَتُصَلِّيَ.

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە، کە ئافرەتێ توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بوو، - خێزانی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف بوو - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات و نوێژ بکات.

(صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي الْمَرْأَةِ تَرَى مَا يَرِيبُهَا بَعْدَ الطُّهْرِ: (إِنَّمَا هِيَ - أَوْ قَالَ: إِنَّمَا هُوَ - عِرْقٌ - أَوْ قَالَ: عُرُوقٌ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە ئافرەتێک کە دوای پاک بوونەوەو خۆشتن خوێن ببینێ و گومانی لێ بکات فەرموویەتی: (ئەوە خوێنی دەمارە، یان فەرمووی: خوێنی دەمارەکانە).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ﴿وَ﴾فِي حَدِيثِ ابْنِ عَقِيلٍ الأَمْـرَانِ جَمِيعًـا، ﴿وَ﴾قَـالَ: إِنْ قَوِيـتِ فَاغْتَسِـلِي لِكُـلِّ صَـلاَةٍ وَإِلاَّ فَاجْمَعِي، كَمَا قَالَ: الْقَاسِمُ فِي حَدِيثِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە فەرموودەکەی (ابْـنِ عَقِيـلٍ)دا هەردوو فەرمانەکە هاتووە، وە وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر توانات هەبوو بۆ هەموو نوێژێك خۆت بشۆ ئەگەرنا دوو نوێژ پێکەوە کۆبکەرەوە. هەروەکو قاسم لە فەرموودەکەیدا هێناویەتی.

(صحيح) وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْقَوْلُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ عَلِيٍّ وَابْـنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم.

ئەم وتەیەش لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، ئەویش لە عەلی و ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئافرەتی (مُسْتَحَاضَة) خۆی بشوات و دوو نوێژ کۆبکاتەوە

## ١١٢ - بَابُ مَنْ قَالَ: تَجْمَعُ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ وَتَغْتَسِلُ لَهُمَا غُسْلاً.

٢٩٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها، قَالَتِ: اسْتُحِيضَتِ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، فَأُمِرَتْ أَنْ تُعَجِّلَ الْعَصْـرَ، وَتُـؤَخِّرَ الظُّهْـرَ، وَتَغْتَسِـلَ لَهُمَا غُسْلاً، وَأَنْ تُـؤَخِّرَ الْمَغْـرِبَ، وَتُعَجِّـلَ الْعِشَـاءَ، وَتَغْتَسِلَ لَهُمَا غُسْلاً، وَتَغْتَسِلَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ غُسْـلاً، فَقُلْتُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: لاَ أُحَدِّثُكَ إلا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بِشَيْءٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ئافرەتێ توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد نوێژی نیوەڕۆ درەنگ بکات و نوێژی عەسر زوو بکات، جا خۆی بشوات و ئەو دوو نوێژە نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە بکات، وە نوێژی ئێوارە درەنگ بکات و نوێژی عیشاش زوو بکات، دوای ئەوە خۆی بشوات و ئەو دوو نوێژە پێکەوە بکات، وە بۆ نوێژی

بەیانیش خۆی بشوات نوێژەکەی بەیانی بکات. عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: بە (عَبْدَ الرَّحْمَن)م وت: ئەمەت لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێراوەتەوە، وتی: هیچ شتێکت بۆ ناگێڕمەوە ئیللا لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم نەبێت.

٢٩٥ – (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ سَهْلَةَ بِنْتَ سُهَيْلٍ اسْتُحِيضَتْ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، فَلَمَّا جَهَدَهَا ذَلِكَ، أَمَرَهَا أَنْ تَجْمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِغُسْلٍ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِغُسْلٍ، وَتَغْتَسِلَ لِلصُّبْحِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە سەهلەی کچی سوهەیل توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بوو، هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەویش فەرمانی پێ کرد کە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات، کاتێك کە لەبەری سەهلە قورس و گران بوو بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات، فەرمانی پێ کرد نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر کۆبکاتەوەو خۆی بشوات و پێکەوە بیانکات، نوێژی ئێوارە و نوێژی عیشاش کۆبکاتەوەو خۆی بشوات و پێکەوە بیانکات، وە بۆ نوێژی بەیانیش خۆی بشوات و نوێژی بەیانی بکات.

(مرسل صحيح الإسناد) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ امْرَأَةً اسْتُحِيضَتْ، فَسَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَهَا، بِمَعْنَاهُ.

ئەبو داود دەڵێت: (ابْـنُ عُيَيْنَـةَ)ە لـە (عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ)ی كوڕی قاسمـەوە، لـە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، كە ئافرەتێ توشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بوو، لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ئـەویش فـەرمانی پێ كرد، جا ڕاوی بە هەمان مانا فەرمودەكەی پێشوی گێڕایەوە.

٢٩٦ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ، قَالَتْ: قُلْـتُ يَـا رَسُـولَ اللَّهِ إِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ اسْتُحِيضَتْ مُنْذُ كَـذَا وَكَذَا فَلَمْ تُصَلِّ، فَقَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا مِنَ الشَّيْطَانِ، لِتَجْلِسْ فِي مِرْكَنٍ، فَإِذَا رَأَتْ صُفْرَةً فَوْقَ الْمَاءِ فَلْتَغْتَسِـلْ لِلظُّهْـرِ وَالْعَصْرِ غُسْلاً وَاحِـدًا، وَتَغْتَسِـلْ لِلْمَغْـرِبِ وَالْعِشَـاءِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَتَغْتَسِلْ لِلْفَجْرِ غُسْلاً وَاحِـدًا، وَتَتَوَضَّـأُ فِيمَا بَيْنَ ذَلِكَ ).

واتە: (أَسْمَاء)ی كچی عومەیس دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خـوا صلی الله علیه وسلم! (فَاطِمَة)ی كچی ئـەبو حوبـەیش لـەو كاتـەوە بـۆ ئـەو كاتـە تووشـی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام بووە و نوێژ ناكـات؟ پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سەیرە (سُبْحَانَ اللَّه) ئەوە لە شەیتانەوەیە لەناو تەشت (مِرْكَن)ێكدا دانیشێت، ئەگەر خوێنێكی زەردباوی بینی سەر ئاو كـەوتبوو ئـەوە با بۆ نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر یەك جار خۆی بشوات و دەستنوێژ بگـرێ و پێكـەوە بیانكـات، وە بـۆ نوێـژی ئێـوارە و نوێـژی عیشـاش یـەك جـار خـۆی بشوات و دەستنوێژ بگرێ و پێكـەوە بیانكات، وە بـۆ نوێـژی بـەیانی یـەك جار

خۆی بشوات و دەستنوێژ بگرێ و نوێژی بەیانی بکات.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ مُجَاهِدٌ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: لَمَّا اشْتَدَّ عَلَيْهَا الْغُسْلُ أَمَرَهَا أَنْ تَجْمَعَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ.

ئەبو داود دەڵێت: موجاهید لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە، کە خۆشوشتن لەسەری قورس و گران بوو، فەرمانی پێ کرد نێوانی دوو نوێژ کۆبکاتەوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: لەدوای پاك بوونەوە لە بێ نوێژی یەك جار خۆی بشوات

## ١١٣ - بَابُ مَنْ قَالَ: تَغْتَسِلُ مَنْ طُهْرٍ إِلَى طُهْرٍ.

٢٩٧ - (صحيح) عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: (تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي، وَالْوُضُوءُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ عُثْمَانُ (وَتَصُومُ وَتُصَلِّي ).

واتە: لە عەدی کوڕی (ثابِت)ەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێرنەوە، کە سەبارەت بە ئافرەتی خوێن

لەبەر رۆیشتوو(مُسْتَحَاضَة) فەرموویەتی: (لەو رۆژانەدا کە بێ نوێژە با نوێژ نەکات، پاشان خۆی بشوات و نوێژ بکات، وە بۆ هەموو نوێژێکیش دەستنوێژ بگرێتەوە). ئەبو داود دەڵێت: (عُثْمَان) راوی فەرموودەکە ئەمەشی بۆ زیاد کرد: (وە نوێژ بکات و رۆژووش بگرێت).

٢٩٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِى حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذكَرَ خَبَرَهَا ﴿وَ﴾قَالَ: (ثُمَّ اغْتَسِلِى، ثُمَّ تَوَضَّئِى لِكُلِّ صَلاَةٍ، وَصَلِّى).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، راوی فەرموودەکە بەسەرهاتەکەی (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیشی گێڕایەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (پاشان خۆت بشۆو، ئینجا بۆ هەموو نوێژێکیش دەستنوێژ بگرەو، نوێژ بکە).

٢٩٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها فِى الْمُسْتَحَاضَةِ تَغْتَسِلُ - تَعْنِى مَرَّةً وَاحِدَةً - ثُمَّ تَوَضَّأُ إِلَى أَيَّامِ أَقْرَائِهَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ سەبارەت بە ئافرەتی خوێن لەبەر رۆیشتوو(مُسْتَحَاضَة) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خۆی بشوات و — واتە: یەك جار — ، پاشان دەستنوێژ بگرێتەوە هەتا رۆژانی بێ نوێژیەکەی دێتە پێشەوە.

**٣٠٠ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ[١].**

**واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ بەهەمان شێوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم گێراویەتیەوە.**

**(صحيح) وَرَوَى عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَيْسَرَةَ، وَبَيَانٌ، وَالْمُغِيرَةُ، وَفِرَاسٌ، وَمُجَالِدٌ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ قَمِيرَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: (تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ).**

**واتە: (عَبْدُ الْمَلِك) کوڕی مەیسەرە و، (بَيَان) و، موغیرەو، فیراس و، موجالید، لە شەعبیەوە، لە (قَمِير)ەوە، ئەویش لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە).**

---

[١] - قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ وَالأَعْمَشِ عَنْ حَبِيبٍ وَأَيُّوبَ أَبِي الْعَلاَءِ كُلُّهَا ضَعِيفَةٌ لاَ تَصِحُّ وَدَلَّ عَلَى ضَعْفِ حَدِيثِ الأَعْمَشِ عَنْ حَبِيبٍ هَذَا الْحَدِيثُ أَوْقَفَهُ حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ عَنِ الأَعْمَشِ وَأَنْكَرَ حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ أَنْ يَكُونَ حَدِيثُ حَبِيبٍ مَرْفُوعًا وَأَوْقَفَهُ أَيْضًا أَسْبَاطٌ عَنِ الأَعْمَشِ مَوْقُوفٌ عَنْ عَائِشَةَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ ابْنُ دَاوُدَ عَنِ الأَعْمَشِ مَرْفُوعًا أَوَّلُهُ وَأَنْكَرَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْوُضُوءُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَدَلَّ عَلَى ضَعْفِ حَدِيثِ حَبِيبٍ هَذَا أَنَّ رِوَايَةَ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ. فِي حَدِيثِ الْمُسْتَحَاضَةِ وَرَوَى أَبُو الْيَقْظَانِ عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَعَمَّارٌ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

(صحيح) وَرِوَايَةُ دَاوُدَ وَعَاصِمٍ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ قَمِيرَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: (تَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّةً ).

واتە: وە لە ریوایەتی داود و (عَاصِم)، لە شەعبیەوە، لە (قَمِیر)ەوە، لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو رۆژێ جارێك خۆی بشوات).

(صحيح) وَرَوَى هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

واتە: هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە گێراویەتیەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتێ کە خوێن لەبەر رۆیشوو دەبێت بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە).

وَهَذِهِ الأَحَادِيثُ كُلُّهَا ضَعِيفَةٌ إِلاَّ حَدِيثَ قَمِيرَ، وَحَدِيثَ عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ، وَحَدِيثَ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، وَالْمَعْرُوفُ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: الْغُسْلُ.

واتە: ئەم فەرمودانە هەموویان لاواز (ضعیف)ن ئیللا فەرمودەکەی قەمیر و، فەرمودەکەی (عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ) و، فەرمودەکەی هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە نەبێت، فەرمودەی ناسراو کە لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە ئەمەیە کە: (دەبێ بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات).

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: (مُسْتَحَاضَة) دەبێت لەكاتی نوێژی نیوەڕۆوە خۆی بشوات بۆ كاتی نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر.

## ١١٤ - بَابُ مَنْ قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ مَنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ.

٣٠١ - (صحيح) عَنْ سُمَيّ مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ الْقَعْقَاعَ وَزَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ أَرْسَلاَهُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ يَسْأَلُهُ: كَيْفَ تَغْتَسِلُ الْمُسْتَحَاضَةُ؟ فَقَالَ: تَغْتَسِلُ مِنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ، وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَإِنْ غَلَبَهَا الدَّمُ، اسْتَثْفَرَتْ بِثَوْبٍ.

واتە: لە (سُمَيّ مَوْلَى أَبِي بَكْر)ەوە هاتووە، كە قەعقاع و زەیدی كوڕی ئەسلەم (سُمَيّ)یان نارد بۆ لای سەعیدی كوڕی موسەییەب بۆ ئەوەی سەبارەت بە خۆشتنی ئەو ئافرەتەی كە تووشی خوێن لەبەر ڕۆشتنی بەردەوام (مُسْتَحَاضَة) بووە پرسیاری لێ بكات؟ سەعیدیش وتی: هەموو ڕۆژێ لەكاتی نوێژی نیوەڕۆوە خۆی بشوات بۆ كاتی نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، وە بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەگەر خوێن زۆری بۆ هێنا بە پارچە قوماشێكی پاك هەڵیبەستێ.

**(حسن عَنْ ابنِ عُمَـر) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَ عَنْ ابْنِ عُمَرَ، وَأَنَسِ بْـنِ مَالِكٍ: تَغْتَسِلُ مِنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ.**

ئەبو داود دەڵێت: لە ئیبنو عومەر و ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنـەوە، کە وتویانە: لـەکاتی نوێـژی نیـوەڕۆوە خـۆی بشوات بـۆ کـاتی نوێـژی نیـوەڕۆی ڕۆژی دواتر.

**(صحيح وزيادة (عَنْ امْرَأَتِهِ) شـاذ) وَكَذَلِكَ رَوَى دَاوُدُ وَعَاصِمٌ، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ امْرَأَتِهِ، عَنْ قَمِيرَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، إِلاَّ أَنَّ دَاوُدَ قَالَ: كُلَّ يَوْمٍ.**

واتــە: هــەروەها داود و (عَاصِــم)، لــە شــەعبیەوە، لــە خێزانەکەیــەوە، لــە قــەمیرەوە، لـە عائیشــەوە ڕەزای خــوای لــێ بــێ گێڕاویانەتــەوە، کــە تــەنها داود وتویەتی: (هەموو ڕۆژێك خۆی بشوات).

**(صحيح عَنْ الحسن) وَفِي حَدِيثِ عَاصِمٍ عِنْـدَ الظُّهْـرِ، وَهُـوَ قَـوْلُ سَالِمِ بْنِ عَبْدُ اللَّهِ، وَالْحَسَنِ، وَعَطَاءٍ.**

واتە: لە فەرمودەکەی (عاصم)دا هاتووە، کە لەکاتی نوێـژی نیـوەڕۆوە خـۆی بشوات. ئەمەش وتەی سالمی کوڕی (عبدالله) و حەسەن و (عَطَاء)ە.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مَالِكٌ: إِنِّي لأَظُنُّ حَدِيثَ ابْنِ الْمُسَيَّبِ: مِنْ طُهْـرٍ إِلَى طُهْرٍ، ﴿قَالَ فيه﴾: إِنَّما هُوَ: مِنْ طُهْرٍ إِلَى طُهْـرٍ، وَلَكِنِ الْوَهَمَ دَخَلَ فِيهِ، فَقَلَبَهَا النَّاسُ، مِنْ ظُهْرٍ إِلَـى ظُهْرٍ.**

ئـــەبو داود دەڵێــت: ماليــك دەڵێــت: مـــن وا دەزانم فەرمودەكــەی ئيبنـــو موسەييەب: لـەكاتی نوێـژی نيـوەڕۆوە خـۆی بشوات بـۆ كـاتی نوێـژی نيـوەڕۆی رۆژی دواتــر، - لـە فەرمودەكەيـدا وتويـەتی: - لـە پـاك بوونــەوە لـەدوای بــێ نوێژيەوە بۆ پاك بوونەوەيـەكی تـرە. بـەڵام (وَهَــم) تێكـەڵی فەرمودەكە بـووە، بۆيە خەڵك هەڵيان گێڕاوەتـەوە بـۆ لـەكاتی نوێـژی نيـوەڕۆوە بـۆ كـاتی نوێـژی نيوەڕۆی رۆژی دواتر[1].

(ضعيف) وَرَوَاهُ الْمِسْوَرُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ بْنِ يَرْبُوعٍ ، قَالَ فِيهِ: مِـنْ طُهْـرٍ إِلَـى طُهْـرٍ. فَقَلَبَهَـا النَّاسُ" مِنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ.

واتــە: وە ميسـوەری كـوڕی (عَبْـدِ الْمَلِـك)ی كـوڕی سـەعيدی كـوڕی (عَبْـدِ الرَّحْمَن)ی كوڕی (يَرْبُوع) گێڕاويەتيەوە، لـە فەرمودەكەيـدا وتويـەتی: لـە پـاك بوونەوە لەدوای بێ نوێژيەوە بۆ پاك بوونەوەيەكی تـرە. بـەڵام خـەڵك هـەڵيان گێڕاوەتەوە بۆ لەكاتی نوێژی نيوەڕۆوە بۆ كاتی نوێژی نيوەڕۆی رۆژی دواتر.

[1] - واتە وشەی (طُهْر) يان كردووە بە (ظُهْر) نوكتەيەكيان بۆ زيادكردووە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: (مُسْتَحَاضَة) دەبێت هەموو رۆژێ جارێ خۆی بشوات هەرکاتێ کە بیەوێت، نەك لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا.

## ١١٥ - بَابُ مَنْ قَالَ: تَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّةً، وَلَمْ يَقُلْ: عِنْدَ الظُّهْرِ.

| |
|---|
| ٣٠٢ - (ضعيف) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ قَـالَ: الْمُسْتَحَاضَـةُ إِذَا انْقَضَى حَيْضُهَا، اغْتَسَلَتْ كُلَّ يَـوْمٍ، وَاتَّخَـذَتْ صُـوفَةً فِيهَا سَمْنٌ أَوْ زَيْتٌ. |

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئەو ئافرەتەی کە خوێنی هەیە ئەگەر کاتی بێ نوێژیەکەی کۆتایی هات هەموو رۆژێك خۆی بشوات، وە پارچە قوماشێکی نەرم یان لۆکە بە زەیت یان رۆن چەور بکات و (فرج)ی خۆی پێ قایم بکات بۆ ئەوەی خوێنی لێ نەیەت.

## باسى ئەوانەى كە دەڵێن: (مُسْتَحَاضَة) رۆژانە خۆى بشوات.

## ١١٦ - بَابُ مَنْ قَالَ: تَغْتَسِلُ بَيْنَ الأَيَّامِ.

٣٠٣ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُثْمَانَ: أَنَّهُ سَأَلَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ الْمُسْتَحَاضَةِ؟ فَقَالَ: تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ فَتُصَلِّى، ثُمَّ تَغْتَسِلُ فِى الأَيَّامِ.

واتە: لە موحەممەدى كورِى (عُثْمَان)ەوە هاتووە، كە سەبارەت بە خۆشتنى (مُسْتَحَاضَة) لە قاسمى كورِى موحەممەديان پرسى؟ ئەويش وتويەتى: رۆژانى بێ نوێژى نوێژ نەكات، پاشان كە پاك بوويەوە خۆى بشوات و نوێژ بكات، ئينجا هەموو رۆژێك خۆى بشوات.

# باسی ئەوانەی کە دەڵێن: (مُسْتَحَاضَة) دەبێت بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێ.

## ١١٧ – بَابُ مَنْ قَالَ: تَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ.

**٣٠٤ - (حسن) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ أَبِي حُبَيْشٍ: أَنَّهَا كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا كَانَ دَمُ الْحَيْضَةِ: فَإِنَّهُ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنْ الصَّلاَةِ، فَإِذَا كَانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي، وَصَلِّي).**

واتە: لە عورەی کوڕی زوبێرەوە، دەگێڕنەوە، کە (فَاطِمَة)ی کچی ئەبو حوبەیش خوێنی بەردەوامی هەبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (ئەگەر خوێنی حەیز بێت دیارە، چونکە خوێنێکی ڕەشە خەستەو ژنان خۆیان باشی دەناسن، جا ئەگەر وەها بوو ئەوە خوێنی بێ نوێژیە، ئیتر دەست هەڵگرە لە نوێژ - واتە نوێژ مەکە -، وە ئەگەر بە جۆرێکی تر بوو ئەوا دەستنوێژ بگرەو، نوێژی خۆت بکە.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَ عَنْ الْعَلاَءِ بْنِ الْمُسَيَّبِ وَشُعْبَةَ، عَنْ الْحَكَمِ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، قَالَ: الْعَلاَءُ: عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَوْقَفَهُ شُعْبَةُ عَلَى أَبِي جَعْفَرٍ، تَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ**

ئەبو داود دەڵێت: (عَـلاَء)ی کوڕی موسـەییەب و شـوعبە هـەردووکیان ئـەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، لە حەکەمەوە، لە ئەبو جەعفـەرەوە، (عَلاَء) دەڵێت: لە پێغەمبەرەوە واتە فەرموودەکە (مرفوع)ە، (مرفوع)یش واتە دەگاتـەوە سـەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، بەڵام شوعبە لەسەر ئـەبو جەعفـەر راوەسـتاوە واتە فەرموودەکە (موقوف)ە، (موقوف)یش واتە: ناگاتەوە سەر پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم، واتە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باسی ئەوەی نەکرد کـە بـۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ بگرێتەوە.

## باسی ئەوانەی کە باسی دەستنوێژ گرتنیان نەکردووە ئیللا لەدوای نەمانی دەستنوێژە نەبێت.

## ١١٨ - بَابُ مَنْ لَمْ يَذْكُرِ الْوُضُوءَ إِلاَّ عِنْدَ الْحَدَثِ.

٣٠٥ - (صحيح) عَنْ عِكْرِمَـةَ قَـالَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَـةَ بِنْـتَ جَحْـشٍ اسْتُحِيضَتْ، فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ أَنْ تَنْتَظِرَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُـمَّ تَغْتَسِـلُ وَتُصَـلِّى، فَـإِنْ رَأَتْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ.

واتە: لە (عِكْرِمَـة)وە هـاتووە، کـە وتویـەتی: ئـوم حەبیبـەی کچی جـەحش خوێنی هەبوو، پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم فـەرمانی پـێ کـرد کـە تەماشا بکات بە ئەندازەی ئەو رۆژانەی کە پێشتر بێ نوێـژ بـووە نوێـژ نـەکات، پاشان خۆی بشوات و نوێژ بکات، ئەگەر بە هۆیەکی ترەوە دەستنوێژەکەی شـکا ئەوە با دەستنوێژ بگرێتەوە و نوێژ بکات.

٣٠٦ - (صحيح) عَنْ رَبِيعَةَ: أَنَّهُ كَانَ لاَ يَرَى عَلَى الْمُسْتَحَاضَةِ وُضُوءًا عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، إِلاَّ أَنْ يُصِيبَهَا حَدَثٌ غَيْرُ الدَّمِ فَتَوَضَّأُ.

واتە: لە (رَبِيعَة)ەوە دەگێڕنەوە، كە پێی وا نەبووە كە (مُسْتَحَاضَة) بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بە هۆیەكی ترەوە دەستنوێژەكەی شكا ئەوە با دەستنوێژ بگرێتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا قَوْلُ مَالِكٍ: يَعْنِى ابْنَ أَنَسٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش وتەی مالیكە: واتە مالیكی كوڕی ئەنەس.

## باسی ئافرەت لەدوای پاك بوونەوە خوێنی زەردو لێڵ دەبینێت.

## ١١٩ - بَابُ فِى الْمَرْأَةِ تَرَى الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ الطُّهْرِ.

٣٠٧ - (صحيح) عَنْ أُمِّ الْهُذَيْلِ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ - وَكَانَتْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَتْ: كُنَّا لاَ نَعُدُّ الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ الطُّهْرِ شَيْئًا.

واتە: لە(أُمِّ الْهُذَيْل)ەوە، لە(أُمِّ عَطِيَّة)ەوە دەگێڕنەوە– بەڵێن و پەیمانی دابوو بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كە وتویەتی: ئێمە دەستورمان وابوو لەدوای پاك بوونەوە لە بێ نوێژی ئیتر خوێنی زەردوو لێڵمان بەهیچ دانەئەنا.

**٣٠٨ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، بِمِثْلِهِ.**

واتە: لە موحەممەدی كوڕی سیرینەوە، لە (أُمِّ عَطِيَّة)ەوە، بە هەمان مانا هاتووە.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أُمُّ الْهُذَيْلِ هِيَ حَفْصَةُ بِنْتُ سِيرِينَ، كَانَ ابْنُهَا اسْمُهُ هُذَيْلٌ، وَاسْمُ زَوْجِهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ.**

ئەبو داود دەڵێت: (أُمِّ الْهُذَيْل) (حَفْصَة)ی كچی سیرینە، كوڕەكەی ناوی (هُذَيْل) بوو، مێردەكەشی ناوی (عَبْدُ الرَّحْمَن) بوو.

## باسی (مُسْتَحَاضَة) مێردەكەی لەگەڵی دروست دەبوو.

## ١٢٠ – بَابُ الْمُسْتَحَاضَةِ يَغْشَاهَا زَوْجُهَا.

**٣٠٩ - (صحيح) عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: كَانَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ تُسْتَحَاضُ، فَكَانَ زَوْجُهَا يَغْشَاهَا[1].**

واتە: لە (عِكْرِمَة)ەوە هاتووە، كە ئوم حەبیبەی كچی جەحش خوێنی بەردەوامی هەبوو، مێردەكەشی لەگەڵی دروست دەبوو.

---

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ مُعَلَّى ثِقَةٌ: وَكَانَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ لاَ يَرْوِي عَنْهُ، لأَنَّهُ كَانَ يَنْظُرُ فِي الرَّأْيِ.

٣١٠ - (حسن) عَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ: أَنَّهَا كَانَتْ مُسْتَحَاضَةً، وَكَانَ زَوْجُهَا يُجَامِعُهَا.

واتە: لە حەمنەی کچی جەحشەوە هاتووە، کە خوێنی بەردەوامی هەبووەو، مێردەکەشی لەگەڵی دروست دەبوو.

## باسی ئەوەی کە سەبارەت بە ماوەی ئافرەتی زەیسانی هاتووە.

## ١٢٢ - بَابُ مَا جَاءَ فِي وَقْتِ النُّفَسَاءِ.

٣١١ - (حسن صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ، قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، وَكُنَّا نَطْلِي عَلَى وُجُوهِنَا الْوَرْسَ - يَعْنِي مِنَ الْكَلَفِ - .

واتە: لە ئەم سەلەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، ئافرەتی زەیسانی چل ڕۆژ، یان چل شەو دادەنیشت، واتە دەستی هەڵدەگرت لە نوێژ و پەرستش و دروستبوون و کۆبونەوە لەگەڵ مێردەکەیدا، هەتا وامان لێ دەهات لەبەر زیپکەو قنجکە و پەڵەی دەم و چاو ڕووی خۆمان دەگرتە زەعفەران.

٣١٢ - (حسن) عَنْ كَثِيرِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي الأَزْدِيَّةُ - يَعْنِي مُسَّةَ - قَالَتْ: حَجَجْتُ، فَدَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! إِنَّ سَمُرَةَ بْنَ جُنْدُبٍ يَأْمُرُ النِّسَاءَ يَقْضِينَ صَلاَةَ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَتْ: لاَ يَقْضِينَ، كَانَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ نِسَاءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَقْعُدُ فِي النِّفَاسِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، لاَ يَأْمُرُهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَضَاءِ صَلاَةِ النِّفَاسِ.

واتە: لە (كَثِير)ی كوڕی زیادەوە هاتووە، كە وتویەتی: (أَزْدِيَّة) - واتە: (مُسَّة) — بۆی گێڕامەوەو وتی: حەجم كردوو پاشان چووم بۆ لای ئوم سەلەمە وتم: ئەی دایكی باوەڕداران! سەمورەی كوڕی جوندوب فەرمانی كردووە بە ئافرەتان نوێژە فەوتاوەكانی ڕۆژانی بێ نوێژی بگێڕنەوە، (أُمِّ سَلَمَة) وتی: با نەیگێڕنەوە، چونكە كاتێ كە یەكێك لە ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە زەیسان بوایە چل شەو دادەنیشت واتە نە نوێژی دەكرد نە ڕۆژووی دەگرت، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ نەدەكرد بەگێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەكانی زەیسان.

## باسی چۆنیەتی خۆشوشتن
## لەدوای پاك بوونەوە لە بێ نوێژی

## ١٢٣ - بَابُ الاغْتِسَالِ مِنَ الْحَيْضِ.

٣١٣ - (ضعيف) عَنْ أُمَيَّةَ بِنْتِ أَبِي الصَّلْتِ، عَنْ امْرَأَةٍ مِـنْ بَنِـي غِفَارٍ قَدْ سَمَّاهَا لِي، قَالَتْ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حَقِيبَةِ رَحْلِهِ، قَالَتْ: فَوَاللَّهِ لَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الصُّبْحِ، فَأَنَـاخَ، وَنَزَلْتُ عَنْ حَقِيبَةِ رَحْلِهِ، فَإِذَا بِهَـا دَمٌ مِنِّـي، فَكَانَـتْ أَوَّلَ حَيْضَةٍ حِضْتُهَا، قَالَـتْ: فَتَقَبَّضْـتُ إِلَـى النَّاقَـةِ، وَاسْتَحْيَيْتُ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ مَا بِي وَرَأَى الدَّمَ، قَالَ: (مَا لَكِ لَعَلَّكِ نُفِسْتِ؟). قُلْتُ نَعَمْ، قَالَ: (فَأَصْلِحِي مِنْ نَفْسِكِ، ثُمَّ خُـذِي إِنَـاءً مِنْ مَاءٍ، فَاطْرَحِي فِيهِ مِلْحًا، ثُمَّ اغْسِلِي مَـا أَصَـابَ الْحَقِيبَةَ مِنَ الدَّمِ، ثُمَّ عُودِي لِمَرْكَبِكِ). قَالَـتْ: فَلَمَّـا فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ، رَضَخَ لَنَا

مِنَ الْفَيْءِ، قَالَتْ: وَكَانَتْ لاَ تَطَّهَّرُ مِنْ حَيْضَةٍ إِلاَّ جَعَلَتْ فِي طَهُورِهَا مِلْحًا، وَأَوْصَتْ بِهِ أَنْ يُجْعَلَ فِي غُسْلِهَا حِينَ مَاتَتْ.

واته: لە ئومەییەی کچی (أَبِی الصَّلْت)ەوە، لە ئافرەتێکی (بَنِی غِفَار)[١]ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە پاشکۆی خۆیەوە سواری کردم لەسەر (حَقِیبَة)یە — (حَقِیبَة) لە بەشی دواوەی کۆپانی وڵاخەومیە کەل و پەلی تێدا دادەنرێت - وتی: سوێند بە خوا کاتێ کە رۆژ بوویەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دابەزی و وشترەکەی یەخ دا، منیش لەسەر (حَقِیبَة)ەکە دابەزیم بینیم جێگەی دانیشتنەکەم خوێناوی بووە بە خوێنی من، ئەوەش یەکەم جارم بوو کە بکەومە بێ نوێژیەوە[٢]، وتی: لە شەرماندا خۆم هەڵکوتایە سەر پشتی وشترەکە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو حاڵەتەی من و خوێنەکەی بینی فەرمووی: (بۆچی شەرم دەکەیت لەوانەیە کەوتبیتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە؟). وتم: بەڵێ، فەرمووی: (بۆ رێگری کردن لە خوێنەکە بە پارچە قوماشێك خۆت قایم بکە، پاشان دەفرێ ئاو هەڵبگرەو خوێی تێ بکە - بۆ ئەوەی جوان پاکی بکاتەوە - ئینجا ئەو شوێنەی (حَقِیبَة)ەکە خوێنی پێوەیە بیشۆ، جا بگەڕێرەوە بۆ سەر جێگای سواربوونەکەت). وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەڵای

---

[١] - سوهەیلی دەڵێ: ئەو ئافرەتە غیفاریە ناوی لەیلا بووە، خێزانی ئەبو (ذر)ی غیفاری بوو. (ابن عبد البر) دەڵێ: لە غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەردەچوو بۆ تەداوی کردنی بریندارەکان. (عون المعبود: (١/ ٢٣٦) چاپی ٢٠٠٩ی (مكتبة المعارف) علق عليه وخرج أحاديثه شيخ مشهور بن حسن.

[٢] - جا ئیتر مەبەستی ئەوە بێت کە لە سەفەردا یەکەم جاری بووە یان هەر یەکەم جاری بووە بکەوێتە بێ نوێژیەوە.

خەيبەرى رزگار كرد كەمێك سامانى لە تالآنيەكە پێ بەخشيم، ئومەييە وتى: ئيتر دەستورى وەها بوو كاتێ كە لە بێ نوێژى پاك دەبوويەوە خوێى دەكردە ئەو ئاوەوە كە خۆى پێ دەشت، وەسيەتيشى كرد كە وەفاتى كرد ئەو ئاوەى كە پێى دەشۆن خوێى تێ بكەن.

٣١٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: دَخَلَتْ أَسْمَاءُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَغْتَسِلُ إِحْدَانَا إِذَا طَهُرَتْ مِنَ الْمَحِيضِ؟ قَالَ: (تَأْخُذُ سِدْرَهَا وَمَاءَهَا، فَتَوَضَّأُ، ثُمَّ تَغْسِلُ رَأْسَهَا وَتَدْلُكُهُ حَتَّى يَبْلُغَ الْمَاءُ أُصُولَ شَعْرِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَى جَسَدِهَا، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَتَهَا فَتَطَهَّرُ بِهَا). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَرَفْتُ الَّذِي يَكْنِي عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ لَهَا: تَتَّبِعِينَ ﴿بِهَا﴾ آثَارَ الدَّمِ.

واتە: لە عائيشەوە رەزاى خواى لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: (أَسْمَاء) هاتە ژوورەوە بۆ لاى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم! ئەگەر يەكێ لە ئێمە پاك بوويەوە لە بێ نوێژى چۆن خۆى بشوات؟ فەرمووى: (لە پێشدا مۆرد و ئاوەكەى ئامادە بكاو، خۆى پێ پاك بكاتەوەو تارەتێكى جوان بگرێت، ئينجا دەستنوێژ بگرێت، پاشان ئاو بكا بەسەريداو دەستى تێبخات هەتا ئاو دەگاتە بنى مووەكانى و تەڕ

دمبێت، پاشان ئاو بکات بە جەستەیدا، ئینجا پارچە لۆکەیەکی میسکاوی بێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوە و تارەتی پێ بگرێت). (أَسْمَاء) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بکەمەوەو تارەتی پێ بگرم؟ عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ وتی: زانیم کە پێغەمبەر ی خوا صلی الله علیه وسلم بە کینایەوە پێی دەڵێ و ئەویش تێ ناگات بۆیە پێم وت: بیهێنە بە شوێنی خوێنەکەدا. بۆ ئەوەی شوێنەکەی پاك کاتەوەو بۆنەکەی ببڕێت.

٣١٥ - (حسن صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّهَا ذَكَرَتْ نِسَاءَ الأَنْصَارِ فَأَثْنَتْ عَلَيْهِنَّ، وَقَالَت لَهُنَّ مَعْرُوفًا، ﴿وَ﴾قَالَت: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (فِرْصَةً مُمَسَّكَةً). قَالَ مُسَدَّدٌ: كَانَ أَبُو عَوَانَةَ يَقُولُ فِرْصَةً وَكَانَ أَبُو الأَحْوَصِ يَقُولُ قَرْصَةً.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بە چاکی باسی ئافرەتانی (أَنْصَار)ی کردووە و ستایشی کردوون بە وتە بەناوبانگەکەی - ئافرەتانی یاریدەدەران(أَنْصَار) چاکترینی ئافرەتانن! چونکە شەرم و شکۆ رێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کە بۆ خۆیان پرسیار بکەن و شارەزای دین بن — هەروەها وتی: ئافرەتێکیان چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە هەمان مانای فەرمودەکەی پێشوو فەرمودەکەی گێڕایەوە، ئیللا ئەوە نەبێت کە فەرموویەتی: (بە لۆکە یان پارچە قوماشێکی پاك (فرج)ی خۆی قایم بکات

بۆ ئەوەی خوێنی لێ نەیەت). موسەددەد وتی: ئەبو عەوانە وتویەتی (فِرْصَـةً) بەڵام (أَبُو الأَحْوَصِ) وتویەتی: (قَرْصَةً).

٣١٦ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ أَسْمَاءَ سَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ، قَالَ: (فِرْصَةً مُمَسَّكَةً). قَالَتْ: كَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ قَالَ: (سُبْحَانَ اللَّـهِ! تَطَهَّـرِي بِهَا، وَاسْتَتِرِي بِثَوْبٍ). وَزَادَ وَسَأَلَتْهُ عَنْ الْغُسْـلِ مِـنَ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: (تَأْخُـذِينَ مَـاءَكِ، فَتَطَهَّـرِينَ أَحْسَـنَ الطُّهُورِ وَأَبْلَغَهُ، ثُمَّ تَصُـبِّينَ عَلَـى رَأْسِـكِ الْمَـاءَ، ثُـمَّ تَدْلُكِينَهُ حَتَّى يَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِكِ، ثُمَّ تُفِيضِـينَ عَلَيْـكِ الْمَاءَ). ﴿قَالَ﴾: وَقَالَت عَائِشَـةُ: نِعْـمَ النِّسَـاءُ نِسَـاءُ الأَنْصَارِ، لَمْ يَكُـنْ يَمْـنَعُهُنَّ الْحَيَـاءُ أَنْ يَسْـأَلْنَ عَـنَ الدِّينِ، وَيَتَفَقَّهْنَ فِيهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە (أَسْـمَاء) بەهـەمان مانا لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی، شوعبە ڕاوی فەرموودەكە وتی: (بە پارچە لۆكەیەكی میسكاوی خۆت پاك بكەرەوە). (أَسْمَاء) وتی: چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بكەمەوە؟ پێغەمبەری صلی الله علیه وسـلم فـەرمووی: (سـەیرە خۆتی پێ پاك بكـەرەوەو پارچـە قوماشـێكی نیشان دا لـە ئاسـت ڕوومەتیـدا) - مەبەستی ئەوە بوو بە پارچە قوماشێكی ئاوەها خـۆی پـاك بكاتـەوە-. شـوعبە ئەمەشـی بـۆ زیـاد كـرد: وتـی: سـەبارەت بـە خۆشوشـتن لـە لەشـگرانیش لێـی پرسی؟ فەرمووی: (لە پێشدا ئاوەكـە ئامـادە بكـە و خـۆتی پـێ پـاك بكـەرەوەو

تـارەتێكی جـوان بگـرە، ئینجـا دەسـتنوێژێكی جـوان بگـرە، پاشـان ئـاو بكـە بەسەرتداو دەستی تێبخە هەتا ئاو دەوگاتە بنی مووەكان و تەڕ دەبێت، جا ئـاو بكە بە سـەرتدا). شـوعبە وتـی: عائیشـە وتـی: ئافرەتـانی یاریـدەدەران(أَنْصَـار) چاكترینی ئافرەتانن چونكە شەرم و شكۆ رێگەی ئەوەی لێ نـەدەگرتن كـە بـۆ خۆیان پرسیار بكەن و شارەزای دین بن.

## باسی تەیەمموم

## ١٢٤ – بَابُ التَّيَمُّمِ.

٣١٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: بَعَـثَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُسَـيْدَ بْـنَ حُضَـيْرٍ وَأُنَاسًـا مَعَهُ فِـي طَلَـبِ قِـلاَدَةٍ أَضَـلَّتْهَا عَائِشَـةُ، فَحَضَـرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضُوءٍ، فَأَتَوُا النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأُنْزِلَتْ آيَـةُ التَّـيَمُّمِ، زَادَ ابْنُ نُفَيْلٍ فَقَالَ لَهَا أُسَيْدُ ﴿بْنُ حُضَيْرٍ﴾: يَرْحَمُكِ اللَّـهُ! مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ تَكْرَهِينَهُ، إِلاَّ جَعَـلَ اللَّـهُ لِلْمُسْـلِمِينَ، وَلَكِ فِيهِ فَرَجًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئوسەیدی كوڕی (حُضَـیْر) و چەند كەسێكی نـارد بـۆ

دۆزینەوەی گەردن بەندەکە کە عائیشە ونی کردبوو، کاتی نوێژ هات ئاویان دەستنەکەوت لەبەرئەوە بەبێ دەستنوێژ نوێژیان کرد، کاتێ هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی دابەزاند، ئیبنو نوفەیل ئەمەشی بۆ زیاد کرد: ئوسەیدی کوڕی (حُضَیْر) پێی وت: ئەی عائیشە بەر ڕەحمەت و بەزەیی خوا بکەویت هەر بەڵاو ناخۆشیەکت بەسەردێت و پێت ناخۆش دەبێت، خوای گەورە دەیکات بە مایەی خێر و خۆشی و بەرەکەت چ بۆ خۆت و چ بۆ موسوڵمانان.

**٣١٨ - (صحيح) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ: أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ، أَنَّهُمْ تَمَسَّحُوا وَهُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالصَّعِيدِ لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، فَضَرَبُوا بِأَكُفِّهِمُ الصَّعِيدَ ثُمَّ مَسَحُوا وُجُوهَهُمْ مَسْحَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ عَادُوا فَضَرَبُوا بِأَكُفِّهِمُ الصَّعِيدَ مَرَّةً أُخْرَى، فَمَسَحُوا بِأَيْدِيهِمْ كُلِّهَا إِلَى الْمَنَاكِبِ، وَالآبَاطِ مِنْ بُطُونِ أَيْدِيهِمْ.**

واتە: عەماری کوڕی یاسر گێڕاویەتیەوە بۆ قوتابیەکانی، کە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوون بۆ نوێژی بەیانی بە گڵێکی پاك مەسحیان کرد یەکجار بەری دەستەکانیان کێشا بە گڵێکی پاکداو هێنایان بە ڕوومەتیاندا، پاشان جارێکی تر بەری دەستەکانیان کێشا بە گڵێکی پاکداو دەستەکانیان هەتا شانیان و لە ژێر دەسیتیانەوە هەتا دەگاتە بن هەنگڵیان مەسح کرد.

٣١٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ وَهْبٍ، نَحْوَ هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: قَامَ الْمُسْلِمُونَ فَضَرَبُوا بِأَكُفِّهِمُ التُّرَابَ، وَلَمْ يَقْبِضُوا مِنَ التُّرَابِ شَيْئًا، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرِ الْمَنَاكِبَ وَالآبَاطَ، قَالَ ابْنُ اللَّيْثِ: إِلَى مَا فَوْقَ الْمِرْفَقَيْنِ.

واتە: ئەم فەرموودە بە هەمان مانا لە (ابْنِ وَهْب)ەوە هاتووە، کە وتویەتی موسوڵمانان هەستان بەری دەستەکانیان کێشا بە گڵێکی پاکدا، بەڵام بە هیچ شێوەیە گڵیان هەڵنەگرت، بە هەمان مانا گێڕایەوە، بەڵام باسی شان و بن هەنگڵی نەکرد. (ابْنُ اللَّيْث) دەڵێت: هەتا سەرووی هەردوو ئەنیشك.

٣٢٠ - (صحيح) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرَّسَ بِأُولاَتِ الْجَيْشِ وَمَعَهُ عَائِشَةُ، فَانْقَطَعَ عِقْدٌ لَهَا مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ، فَحَبَسَ النَّاسَ ابْتِغَاءُ عِقْدِهَا ذَلِكَ حَتَّى أَضَاءَ الْفَجْرُ، وَلَيْسَ مَعَ النَّاسِ مَاءٌ، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَقَالَ: حَبَسْتِ النَّاسَ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ!! فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُخْصَةَ التَّطَهُّرِ بِالصَّعِيدِ الطَّيِّبِ، فَقَامَ الْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَضَرَبُوا بِأَيْدِيهِمْ إِلَى الأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعُوا أَيْدِيَهُمْ وَلَمْ يَقْبِضُوا مِنَ التُّرَابِ شَيْئًا، فَمَسَحُوا بِهَا

وُجُوهَهُمْ وَأَيْدِيَهُمْ إِلَى الْمَنَاكِبِ وَمِــنْ بُطُــونِ أَيْــدِيهِمْ إِلَى الآبَاطِ. زَادَ ابْنُ يَحْيَــى فِــى حَدِيثِــهِ ، قَــالَ ابْــنُ شِهَابٍ فِى حَدِيثِهِ: وَلاَ يَعْتَبِرُ بِهَذَا النَّاسُ[١].

واتە: لە عەماری کوڕی یاسرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە (أُولاَتِ الْجَيْش) – شوێنێکە لە ڕێگەی مەککە نزیک شاری مەدینە - لە کۆتایی شەودا لایدا بۆ ئەوەی کەمێك بخەوێ و بحەوێتەوە، عائیشەی لەگەڵ بوو گەردن بەندەکەی پچڕاون بوو، بۆ ئەوەی گەردن بەندەکە بدۆزنەوە دواکەوتن هەتا کاتی نوێژی بەیانی هات، خەڵکەکە ئاویان پێ نەبوو بۆ ئەوەی دەستنوێژ بگرن و نوێژەکەیان بکەن، بۆیە ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ تووڕە بوو لە عائیشەو پێی وت: خەڵکەکەت گیردا ئاویان پێ نیە نوێژەکەیان بکەن، خوای گەورە ئایەتی تەیەمموی دابەزاند بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مۆڵەتی پێدان بە گڵێکی پاك دەستنوێژ بگرن، ئینجا موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم هەستان بە بەری دەستیان کێشایان بە زەویدا و دەستیان بەرزکردەوە بەڵام بە هیچ شێوەیە گڵیان هەڵنەگرت، پاشان هێنایان بە ڕوومەت و دەستەکانیاندا هەتا شانیان و لەژێر دەستەکانیانەوە هەتا دەگاتە بن هەنگڵیان. (ابْنُ يَحْيَى) لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کردو

---

[١] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ ابْنُ إِسْحَاقَ قَالَ فِيهِ عَنِ ابْــنِ عَبَّــاسٍ وَذَكَــرَ ضَــرْبَتَيْنِ كَمَــا ذَكَــرَ يُونُسُ وَرَوَاهُ مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِىِّ ضَرْبَتَيْنِ وَقَالَ مَالِكٌ عَنِ الزُّهْرِىِّ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْــنِ عَبْــدِ اللَّــهِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَمَّارٍ وَكَذَلِكَ قَالَ أَبُو أُوَيْسٍ عَنِ الزُّهْرِىِّ وَشَكَّ فِيهِ ابْنُ عُيَيْنَةَ قَالَ مَرَّةً عَنْ عُبَيْــدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ أَوْ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَمَرَّةً قَالَ عَــنْ أَبِيــهِ وَمَــرَّةً قَــالَ عَــنِ ابْــنِ عَبَّــاسٍ اضْطَرَبَ ابْنُ عُيَيْنَةَ فِيهِ وَفِى سَمَاعِهِ مِنَ الزُّهْــرِىِّ وَلَــمْ يَــذْكُرْ أَحَــدٌ مِــنْهُمْ فِــى هَــذَا الْحَــدِيثِ الضَّرْبَتَيْنِ إِلاَّ مَنْ سَمَّيْتُ.

وتی: (ابْنُ شِهَاب) لە فەرموودەکەیدا وتی: خەڵك هیچ ئیعتیبارێکیان دانەئەنا بۆ وتەی: (هەتا شانیان و لەژێر دەستەکانیانەوە هەتا دەگاتە بن هەنگڵیان).

٣٢١ - (صحيح) عَنْ شَقِيقٍ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا بَيْنَ عَبْدُ اللَّه وَأَبِى مُوسَى، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، أَمَا كَانَ يَتَيَمَّمُ؟ فَقَالَ: لاَ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ تَصْنَعُونَ بِهَذِهِ الآيَةِ الَّتِى فِى سُورَةِ الْمَائِدَةِ: ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾. فَقَالَ عَبْدُ اللَّه: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِى هَذَا لأَوْشَكُوا إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الْمَاءُ أَنْ يَتَيَمَّمُوا بِالصَّعِيدِ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: وَإِنَّمَا كَرِهْتُمْ هَذَا لِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ لِعُمَرَ بَعَثَنِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ فَتَمَرَّغْتُ فِى الصَّعِيدِ كَمَا تَتَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَصْنَعَ هَكَذَا). فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى الأَرْضِ فَنَفَضَهَا، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ عَلَى يَمِينِهِ، وَبِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، عَلَى الْكَفَّيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ

وَجْهَهُ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: أَفَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ؟.

واتە: لە شەقیقەوە هاتووە، کە وتویەتی: من لە نێوان (عبداللە)ی کوڕی مەسعود و أبو موسادا دانیشتبووم، أبو موسا وتی: ئەی (أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ) ئایا ئەگەر یەکێ لەشی گران بوو هەتا مانگێ ئاوی دەست نەکەوت بۆی هەیە تەیەمموم بکات؟ وتی: نەخێر بۆی نیە عائیشەی لەگەڵ بووە تەیەمموم بکات با مانگێکیش ئاوی نەکەوێت،با هەتا مانگێکیش ئاوی دەست نەکەوێت، أبو موسا وتی: ئەی چی دەکەیت لەگەڵ ئەم ئایەتەی سورەتی (الْمَائِدَةَ): (فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا). واتە: ئەگەر ئاویان دەست نەکەوت با تەیەمموم بکەن. (عبداللە) وتی: ئەگەر ئەم مۆڵەتەیان بدرێتێ کە لەم ئایەتەدا هاتووە، لەوانەیە کاتێ کە ئاویش سارد بێت بە گڵ تەیەمموم بکەن، أبو موسا بە (عبداللە)ی وت: ئا لەبەر ئەوە ئەمەتان پێ ناخۆشە، وتی: بەڵێ، أبو موسا بە (عبداللە)ی وت: ئایا ئەم قسەیەی عەممارت نەبیستووە کە بۆ عومەری رەزای خوای لێ بێ گێڕاوەتەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ کارێك ناردمی، تووشی لەشگرانی بووم، ئاوم دەست نەکەوت، لەبەرئەوە خۆم تلاند بەناو خۆڵدا وەکو وڵاخ، پاشان چووم بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هەواڵەکەم بۆ باسکرد، فەرمووی: (ئەی عەممار تەنها ئەوەت بەس بوو کە ئاوەها بکەیت)، پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەردوو لەپی خۆیدا بە زەویداو رای وەشاندن، پاشان بەدەستی چەپی کێشای بە پشتی دەستی راستیدا، وە بەدەستی راستیشی کێشای بە پشتی دەستی چەپیدا، ئینجا مەسحی روومەتی کرد. (عبداللە) بە أبو موسای وت: ئەی ئایا نەتدی کە عومەر متمانەی بە قسەکەی عەممار نەبوو؟.

٣٢٢ - (صحيح إلا قوله: (إلَى نِصفِ الذّرَاعِ) فإنـه شـاذ) عَـنْ عَبْـدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُمَـرَ فَجَـاءَهُ رَجُـلٌ فَقَالَ: إِنَّا نَكُونُ بِالْمَكَـانِ الشَّـهْرَ وَالشَّـهْرَيْنِ؟ فَقَـالَ عُمَرُ: أَمَّا أَنَا فَلَمْ أَكُنْ أُصَلِّي حَتَّى أَجِدَ الْمَـاءَ، قَـالَ: فَقَالَ عَمَّارٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! أَمَا تَذْكُرُ إِذْ كُنْتُ أَنَـا وَأَنْتَ فِي الإِبِلِ فَأَصَابَتْنَا جَنَابَةٌ، فَأَمَّا أَنَـا فَتَمَعَّكْـتُ فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَـهُ، فَقَالَ: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيـكَ أَنْ تَقُـولَ هَكَـذَا). وَضَـرَبَ بِيَدَيْهِ إِلَى الأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَهُمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَـا وَجْهَـهُ وَيَدَيْهِ إِلَى نِصْفِ الذِّرَاعِ؟ فَقَالَ عُمَـرُ: يَـا عَمَّـارُ اتَّـقِ اللَّهَ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! إِنْ شِئْتَ وَاللَّهِ لَمْ أَذْكُرْهُ أَبَدًا، فَقَالَ عُمَرُ: كَلاَّ وَاللَّهِ لَنُوَلِّيَنَّـكَ مِـنْ ذَلِـكَ مَـا تَوَلَّيْتَ.

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی ئەبزیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: من لەلای عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دانیشتبووم پیاوێ هات وتی: جاری وا هەیە لە شوێنێكدا مانگێ تا دوو مانگ دەمێنینەوەو ئاومان دەست ناكەوێت؟ عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەگەر من لەوێ بم نوێژ ناكەم هەتا ئاوم دەست دەكەوێت. وتی: عەماری كوڕی یاسر وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لەبیرتە من و تۆ وشترمان دەلەوەڕاند لەشمان پیس بوو، ئاومان دەست نەكەوت، لەبەرئەوە

مـن خـۆم تلانـد بـەناو خۆڵدا، جا ئەمـەم بـۆ پێغەمبـەر صلى الله عليـه وسـلم باسکرد فەرمووی: (ئەی عەمار هەر ئەمەت بەس بووە) پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەردوو لەپی خۆیدا بە زەویداو فوی لێکردن، ئینجا هێنانی بـە دەم و چاوو هەدوو دەستەکانیدا هەتا نیوەی باڵەکانی. عومەر وتی: ئەی عەمار لە خوا بترسە، عەمار وتی: ئـەی پێشـەوای بـاوەڕداران ئەگـەر پێـت خـۆش نیـە باسی بکـەم و بـە بەرژەوەنـدی نـازانی سوێند بـێ بـە خـوا ئـیتر باسـی ناکـەم، عومەر وتی: نەخێر سوێند بێ بە خوا، ئەوەی کە خۆت دەیڵێی و پێی رازیـت دەیخەینە ئەستۆی خۆتەوە خۆت و خوای خۆت.

٣٢٣ - (صحيح دون ذكر الذّراعَيْنِ والمِرْفقَيْنِ) عَـنْ عَمَّـارِ بْـنِ يَاسِرٍ، فِي هَذَا الْحَدِيثِ فَقَالَ: (يَا عَمَّـارُ! إِنَّمَـا كَـانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا). ثُمَّ ضَـرَبَ بِيَدَيْـهِ الأَرْضَ، ثُـمَّ ضَـرَبَ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ وَالذِّرَاعَيْنِ إِلَى نِصْفِ السَّـاعِدَيْنِ - وَلَـمْ يَبْلُـغ الْمِـرْفَقَيْنِ - ضَـرْبَةً وَاحِدَةً.

واتە: لە ریوایەتێکی تردا لە عەماری کوڕی یاسرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فـەرمووی: (ئـەی عـەمار تـەنها ئـەوەت بـەس بـوو کـە ئاوەها بکەیت). پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەردوو لـەپی خۆیـدا بـە زەویـداو ئینجـا یـەکێکیانی کێشا بـەوی تریانـدا، جـا هێنـانی بـە دەم و چـاوو هەدوو باڵەکانی هەتا گەیشتە نیوەی باسکەکانی بەڵام نەگەیشتە ئەنیشکەکانی پێدا کێشانی یەکەم.

٣٢٤ - (صحيح دون الشك، والمحفوظ (وَكَفيْهِ) كما يأتي) عَنْ عَمَّارٍ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، فَقَالَ: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ). وَضَرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ إِلَى الأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَ فِيهَا وَمَسَحَ بِهَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ، شَكَّ سَلَمَةُ ﴿وَ﴾قَالَ: لاَ أَدْرِي؟ فِيهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، - يَعْنِي أَوْ إِلَى الْكَفَّيْنِ - .

واتە: لە ریوایەتێکی تردا ئەم بەسەرهاتە لە عەمارەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەمار تەنها ئەوەت بەس بوو کە ئاوەها بکەیت). پاشان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەردوو لەپی خۆیدا بە زەویداو فوی پێدا کردن و مەسحی ڕوومەت و هەردوو دەستی پێ کرد. (سَلَمَة) گومانی هەبوو وتی: نازانم هەتا ئەنیشکەکانی. واتە یان هەتا هەردوو دەستی.

٣٢٥ - (صحيح دون الذِّرَاعَيْنِ و المِرفقَيْنِ) عَنْ شُعْبَةَ، بِإِسْنَادِهِ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: ثُمَّ نَفَخَ فِيهَا وَمَسَحَ بِهَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ أَوْ﴿إِلَى﴾ الذِّرَاعَيْنِ، قَالَ شُعْبَةُ: كَانَ سَلَمَةُ يَقُولُ: الْكَفَّيْنِ وَالْوَجْهَ وَالذِّرَاعَيْنِ، فَقَالَ لَهُ مَنْصُورٌ ذَاتَ يَوْمٍ: انْظُرْ مَا تَقُولُ! فَإِنَّهُ لاَ يَذْكُرُ الذِّرَاعَيْنِ غَيْرُكَ.

واتە: ئەم فەرمووده بە سەنەدی شوعبە هاتووە، دەڵێت: پاشان فوی پێدا کردن و مەسحی روومەت و دەستی پێ کرد هەتا دەگاتە ئەنیشکەکانی یان هەتا باڵەکانی. شوعبە وتی: (سَلَمَة) وتویەتی: دەستەکان و روومەت و باڵەکانی، رۆژێکیان (مَنْصُور) پێی وت: سەرنج بدە بزانە چی دەڵێی جگە لە تۆ کەس باسی باڵەکانی نەکردووە.

٣٢٦ - (صحيح) عَنْ عَمَّارٍ، فِي هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: فَقَالَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَضْرِبَ بِيَدَيْكَ إِلَى الأَرْضِ، فَتَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَكَ وَكَفَّيْكَ). وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە ریوایەتێکی تردا ئەم فەرموودە لە عەمارەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی عەمار تەنها ئەوەت بەس بوو کە هەردوو لەپی خۆت بدەیت بە زەویداو مەسحی روومەت و هەردوو دەستی پێ بکەیت. جا فەرموودەکەی گێڕایەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ (صحيح بذكر النفخ): وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي مَالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمَّارًا يَخْطُبُ بِمِثْلِهِ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: لَمْ يَنْفُخْ.

ئەبو داود دەڵێت: شوعبە لە (حُصَيْن)ەوە ئەویش لە (أَبِي مَالِك)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: بە هەمان مانا لە عەممارم بیستووە لە کاتێکدا کە وتاری دەدا تەنها ئەوەندە نەبێت کە باسی فوو پێدا کردنی نەکرد.

وَذَكَرَ حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ الْحَكَمِ، فِي هَـذَا الْحَـدِيثِ، قَالَ: ضَرَبَ بِكَفَّيْهِ إِلَى الأَرْضِ، وَنَفَخَ.

حوسەینی كوڕی موحەممەد، لە شوعبەوە، ئەویش لە حەكەمەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وتی: هەردوو لەپی خۆی دا بە زەویداو فوو پێدا كردن.

٣٢٧ - (صحيح) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ التَّيَمُّمِ؟ فَأَمَرَنِي: ضَرْبَةً وَاحِدَةً لِلْوَجْـهِ وَالْكَفَّيْنِ.

واتە: لە عەمماری كوڕی یاسرەوە هاتووە، كە وتویەتی: سەبارەت بە تەیەممووم لە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمانی پێ كردم یەك پێداكێشان بە زەویدا بەسە بۆ روومەت و هەردوو دەست.

٣٢٨ - (منكر) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ).

واتە: لە عەماری كوڕی یاسرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەتا ئەنیشكەكان).

# باسی تەیەمموم کردن
# لە شوێنی نیشتەجێ بووندا

## ١٢٥ - بَابُ التَّيَمُّمِ فِي الْحَضَرِ

٣٢٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِي الْجُهَيْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو الْجُهَيْمِ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ السَّلَامَ حَتَّى أَتَى عَلَى جِدَارٍ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: من و (عبدالله)ی کوڕی ستار نۆکەری(مَوْلَى)[١]ی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆشتین هەتا گەیشتینە لای (أَبُو الْجُهَيْم)ی کوڕی (حَارِث)ی کوڕی (الصِّمَّة الأَنْصَارِيّ)ی جا (أَبُو الْجُهَيْم) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله

---

[١]- بەندەیە ئازاد بکرێت لە لایەن کەسێکەوە پێی دەڵێن: (مَوْلَى)ی ئەو کەسە واتە بەندەی ئازاد کراو.

عليه وسلم له بیری جەمەلەوە هاتەوە، پیاوێك پێی گەیشت و سەلامی لێ كرد، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی نەدایەوە هەتا ڕۆیشتە لای دیوارێك – دەستی دا لە دیوارەكەدا – و مەسحی دەم و چاو و دەستەكانی كرد، پاشان وەڵامی سەلامەكەی دایەوە.

٣٣٠ - (ضعيف) عَنْ نَافِعٍ ، قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ فِى حَاجَةٍ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَقَضَى ابْنُ عُمَرَ حَاجَتَهُ فَكَانَ مِنْ حَدِيثِهِ يَوْمَئِذٍ أَنْ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى سِكَّةٍ مِنَ السِّكَكِ، وَقَدْ خَرَجَ مِنْ غَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى إِذَا كَادَ الرَّجُلُ أَنْ يَتَوَارَى فِى السِّكَّةِ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ عَلَى الْحَائِطِ، وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ، ثُمَّ ضَرَبَ ضَرْبَةً أُخْرَى فَمَسَحَ ذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ، وَقَالَ: (إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِى أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ السَّلاَمَ إِلاَّ أَنِّى لَمْ أَكُنْ عَلَى طُهْرٍ )[١].

واتە: لە نافعەوە هاتووە، كە وتویەتی: بۆ پێویستیەك لەگەڵ ئیبنو عومەردا دەرچووین بۆ لای ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ، ئیبنو عومەر

---

[١]- قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يَقُولُ: رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ ثَابِتٍ حَدِيثًا مُنْكَرًا فِى التَّيَمُّمِ. قَالَ ابْنُ دَاسَةَ قَالَ أَبُو دَاوُدَ لَمْ يُتَابَعْ مُحَمَّدُ بْنُ ثَابِتٍ فِى هَذِهِ الْقِصَّةِ عَلَى ضَرْبَتَيْنِ عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَوَوْهُ فِعْلَ ابْنِ عُمَرَ.

پێویستیەکەی خۆی لای ئیبنو عەباس جێبەجێکرد یەکێ لە وتەکانی لەو کاتەدا ئەوە بوو وتی: لە یەکێ لە کۆڵانەکاندا پیاوێك دای بەلای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئەویش لەو کاتەدا لەسەرئاو هاتبووەدەرەوە، سەلامی لێ کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی نەدایەوە هەتا خەریك بوو پیاوەکەی لە بەرچاو ون ببێت لە کۆڵانەکەدا، دەستی کێشا بە دیوارەکەداو مەسحی دەم و چاوی پێ کرد، پاشان جارێکی تر دەستی کێشا بە دیوارەکەداو مەسحی باسکەکانی کرد، پاشان وەڵامی سەلامی پیاوەکەی دایەوەو، فەرمووی: (هیچ شتێك ڕێگری ئەوەی لێ نەکردم کە وەڵامی سەلامەکەت بدەمەوە تەنها ئەوە نەبێت کە دەستنوێژم نەبوو).

٣٣١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْغَائِطِ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ عِنْدَ بِئْرِ جَمَلٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْحَائِطِ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الْحَائِطِ، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه لەسەرئاو هاتەوە، لە لای بیری جەمەل پیاوێکی پێگەیشت سەلامی لێ کرد، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەڵامی نەدایەوە، هەتا ڕووی کردە دیوارکەو دەستی دا بە دیوارەکەدا، پاشان مەسحی دەم و چاو و دەستەکانی کرد، ئینجا وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

## باسی تەیەمموم کردنی لەشگران.

## ١٢٦ – بَابُ الْجُنُبِ يَتَيَمَّمُ.

٣٣٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: اجْتَمَعَتْ غُنَيْمَةٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ ابْدُ فِيهَا). فَبَدَوْتُ إِلَى الرَّبَذَةِ، فَكَانَتْ تُصِيبُنِي الْجَنَابَةُ، فَأَمْكُثُ الْخَمْسَ وَالسِّتَّ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَبُو ذَرٍّ). فَسَكَتُّ، فَقَالَ: (ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ أَبَا ذَرٍ، لأُمِّكَ الْوَيْلُ). فَدَعَا لِي بِجَارِيَةٍ سَوْدَاءَ، فَجَاءَتْ بِعُسٍّ فِيهِ مَاءٌ، فَسَتَرَتْنِي بِثَوْبٍ، وَاسْتَتَرْتُ بِالرَّاحِلَةِ، وَاغْتَسَلْتُ، فَكَأَنِّي أَلْقَيْتُ عَنِّي جَبَلاً، فَقَالَ: (الصَّعِيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَلَوْ إِلَى عَشْرِ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدْتَ الْمَاءَ فَأَمِسَّهُ جِلْدَكَ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ).

واتە: لە (أَبِی ذَرّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: مەڕەکانم کۆکردەوە لە لای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: (ئەی (أَبَا ذَرّ) دەریان بکەو بیان بە بۆ لەوەڕگایە). منیش بردنم بۆ (رَّبَذَة) – دێیەکە لە نزیک مەدینە – توشی لەشگرانی بووم، پێنج تا شەش ڕۆژ مامەوە بە لەشگرانیەوە نوێژم دەکرد، کاتێ کە هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی:

(ئەی (أَبُو ذَرّ). منیش بێدەنگ بووم. فەرمووی: (ئەی (أَبَا ذَرّ) دایکت رۆڵەڕۆت بۆ بکات و هاوار بۆ دایکت). جا کەنیزەکێکی رەشی بانگ کرد ئەویش بە تەشتێکی گەورەوە کە ئاوی تێدا بوو هات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە لایەکەوە بە پۆشاکێ پەردەی بۆ کردم، منیش لە لایەکی ترەوە ولاخەکەم کرد بە پەردە بۆ خۆم و خۆم شت، لەشەرماندا وام دەزانی کێوێ بە کۆڵمەوەیە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر ئاو دەستنەکەوت گڵی پاك پاکۆکەرەوەیە بۆ دەستنوێژی موسوڵمان با دە ساڵیشی پێ بچێت، بەڵام ئەگەر ئاوت دەستکەوت خۆت بشۆ و دەستنوێژ بگرە چونکە ئەوە چاکترە خێر و پاداشتی زۆر ترە).

وَقَالَ: مُسَدَّدٌ غُنَيْمَةٌ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ عَمْرٍو أَتَمُّ.

ئەبو داود دەڵێت: مەڕەکان هی خێر و سەدەقە بوون. ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی عەمر تەواو ترە.

٣٣٣- (صحيح) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَامِرٍ، قَالَ: دَخَلْتُ فِي الإِسْلاَمِ، فَأَهَمَّنِي دِينِي، فَأَتَيْتُ أَبَا ذَرّ، فَقَالَ أَبُو ذَرّ: إِنِّي اجْتَوَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَوْدٍ وَبِغَنَمٍ، فَقَالَ لِي: (اشْرَبْ مِنْ أَلْبَانِهَا). قَال حَمَّادٌ: وَأَشُكُّ فِي (أَبْوَالِهَا). ﴿هَذَا قَوْلُ حَمَّادٍ﴾، فَقَالَ أَبُو ذَرّ: فَكُنْتُ أَعْزُبُ عَنْ الْمَاءِ وَمَعِي أَهْلِي، فَتُصِيبُنِي الْجَنَابَةُ فَأُصَلِّي بِغَيْرِ طُهُورٍ! فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ بِنِصْفِ النَّهَارِ، وَهُوَ فِي رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَهُوَ فِي ظِلِّ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: (أَبُو ذَرٍّ). فَقُلْتُ: نَعَمْ، هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (وَمَا أَهْلَكَكَ؟). قُلْتُ: إِنِّي كُنْتُ أَعْزُبُ عَنْ الْمَاءِ وَمَعِي أَهْلِي، فَتُصِيبُنِي الْجَنَابَةُ فَأُصَلِّي بِغَيْرِ طُهُورٍ! فَأَمَرَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَاءٍ فَجَاءَتْ بِهِ جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ بِعُسٍّ يَتَخَضْخَضُ، مَا هُوَ بِمَلْآنَ، فَتَسَتَّرْتُ إِلَى بَعِيرٍ، فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ " إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورٌ، وَإِنْ لَمْ تَجِدِ الْمَاءَ إِلَى عَشْرِ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدْتَ الْمَاءَ فَأَمِسَّهُ جِلْدَكَ).

واتە: لە (أَبِي قِلاَبَةَ)ەوە، لە پیاوێکی (بَنِي عَامِر)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەرەتا چوومە ناو ئیسلامەوەو موسوڵمان بووم، کاروباری دینەکەم بەلامەوە گران بوو دڵگرانی کردم، چووم بۆ لای (أَبَا ذَرّ)، (أَبُو ذَرّ) وتی: منیش دانیشتنی مەدینەم بەلاوە ناخۆش بوو یان تووشی نەخۆشی (الجَوَى) بووم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەڵەبێ وشتر و مەڕی خستە ژێر دەستمەوەو پێی فەرمووم: (لە شیرەکەیان بخۆ). حەمماد وتی: گومانم هەیە لە وشەی (أَبْوَالِهَا) واتە لە (میزەکەشیان). ئەمە وتەی حەممادە، (أَبُو ذَرّ) وتی: ئاوم لێوە دوور بوو خێزان و منداڵەکانم لەگەڵ بوون، تووشی لەشگرانی بووم بە بێ ئەوەی خۆم بشۆم و دەستنوێژ بگرم نوێژم دەکرد، لە نیوەڕۆدا چووم بۆ لای

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو كاتەدا لە ژێر سێبەری مزگەوتدا بوو كۆمەڵێ لە هاوەڵانی لەگەڵ بوو، فەرمووی: (أَبُو ذَرّ). منیش وتم: بەڵێ، بە هیلاكا چووم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (چی بە هیلاكیا بردووی؟) وتم: ئاوم لێوە دوور بوو خێزان و منداڵەكانم لەگەڵ بوو، تووشی لەشگرانی بووم بە بێ ئەوەی خۆم بشۆم و دەستنوێژ بگرم نوێژم كرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی كرد كە ئاوم بۆ بهێنن، كەنیزەكێك لە تەشتێكی گەورەدا ئاوی هێنا بەلام پڕ نەبوو بوو، ئاوەكە دەجولا، لەپاڵ وشترێكدا خۆم حەشارداو خۆم شت، پاشان هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەی (أَبَا ذَرّ) گڵی پاك پاكۆكەرەوەیە، بۆ موسوڵمان هەیە خۆی پێ بشوات و دەستنوێژی پێ بگرێت با دە ساڵیشی پێ بچێت، بەلام ئەگەر ئاوت دەستكەوت خۆت بشۆ و دەستنوێژ بگرە چونكە ئەوە چاكترە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، لَمْ يَذْكُرْ (أَبْوَالَهَا).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا لَيْسَ بِصَحِيحٍ، وَلَيْسَ فِي أَبْوَالِهَا إِلاَّ حَدِيثُ أَنَسٍ، تَفَرَّدَ بِهِ أَهْلُ الْبَصْرَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ریوایەتێكی تردا حەممادی كوڕی زید لە ئەیوبەوە گێڕاویەتیەوە، بەلام باسی (أَبْوَالَهَا)ی نەكرد. هەروەها ئەبو داود دەڵێت: ئەمە (صَحِيح) نیە (لە میزەكەیان بخۆ) ئیللا فەرموودەكەی ئەنەس نەبێت، كە تەنها لە لایەن خەڵكی بەسرەوە ریوایەت كراوە.

## باسی ئەگەر لەشگران ترسی سەرمای هەبوو، بۆی هەیە تەیەمموم بکات؟

## ١٢٦ – بَابُ إِذَا خَافَ الْجُنُبُ الْبَرْدَ، أَيَتَيَمَّمُ.

٣٣٤ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ، قَالَ: احْتَلَمْتُ فِى لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِى غَزْوَةِ ذَاتِ السَّلاَسِلِ، فَأَشْفَقْتُ ﴿إِنِ اغْتَسَلْتُ فَأَهْلِكَ﴾، فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِى الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (يَا عَمْرُو، صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ؟!). فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِى مَنَعَنِى مِنَ الاغْتِسَالِ وَقُلْتُ: إِنِّى سَمِعْتُ اللَّهَ يَقُولُ: (وَلاَ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا[1].

واتە: لە عەمری کوڕی (عاص)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە غەزای (ذات السلاسل) لە شەوێکی زۆر سارددا لەشم گران بوو، جا ترسام لەوەی کە ئەگەر خۆم بشۆم تیابچم، بۆیە تەیەممومم کرد، پاشان بەرنوێژی نوێژی بەیانیم بۆ

[1] - قَالَ أَبو دَاوُدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جُبَيْرٍ مِصْرِىٌّ مَوْلَى خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ وَلَيْسَ هُوَ ابْنَ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ.

هاوەڵـەكانم كـرد، كاتێـك كـە لـە غەزاكـە گەڕاینـەوە بەسـەرهاتەكەیان بـۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە، جا ئەویش فەرمووی: (ئەی عەمر بە لەشگرانیەوە نوێژت بە هاوەڵەكانت كرد؟) منیش پێم راگەیاند كەچی رێگری لێكـردم لـەوەی كـە خـۆم نەشـۆم و تەیـەمموم كـرد، وتم: ئـەم فەرمودەیـەی خوای گەورەم یادكەوتەوە كە دەفەرموێت: (وَلاَ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُـمْ رَحِيمًا). واتە: خۆتان مەكوژن بەڕاستی خوای گەورە زۆر بە بەزەییە بەرامبـەر بە ئێوە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێكەنی و هیچی نەفەرموو.

٣٣٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَيْسٍ مَوْلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ عَمْـرَو بْنَ الْعَاصِ كَانَ عَلَى سَرِيَّةٍ، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ نَحْوَهُ. قَالَ: فَغَسَلَ مَغَابِنَهُ، وَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ صَلَّى بِهِمْ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرِ التَّيَمُّمَ.

واتە: لە ئەبی قەیسی نۆكەر(مَوْلَى)ی عەمری كوڕی (عـاص)ەوە هـاتووە، كـە عـەمری كـوڕی (عـاص) فەرمانـدەی كۆمـەڵێك سـەرباز بـوو، بـە هـەمان مانـا فەرمودەكـەی پێشـوی گێڕایـەوە، راوی وتـی: جەسـتەی خـۆی جـوان شـت و دەستنوێژێكی گرت وەك چۆن دەستنوێژ دەگیرێـت بـۆ نوێـژ، پاشـان بەرنوێـژی بـۆ كـردن، بـە هـەمان شـێوە فەرمودەكـەی گێڕایـەوە، بـەڵام باسـی تەیـەمموی نەكرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرُوِيَتْ هَذِهِ الْقِصَّةُ عَـنْ الأَوْزَاعِـيِّ، عَـنْ حَسَّـانَ بْـنِ عَطِيَّةَ، قَالَ فِيهِ: فَتَيَمَّمَ.

ئـەبو داود دەڵێـت: پێشـەوا ئـەوزاعی ئـەم بەسـەرهاتە لـە حەسسانی کـوڕی (عَطِيَّـة)ەوە دەگێڕێتـەوە، بـەڵام لـە فەرموودەکەیـدا ئەمـەی بـۆ زیـاد کـرد وتـی: تەیەمومی کرد.

## باسی تەیەمموم کردن لەلایەن بریندارەوە.

## ١٢٧ - بَابُ فِي الْمَجْرُوحِ يَتَيَمَّمُ.

| |
|---|
| ٣٣٦ - (حسن دون قول: (إنّمَا كَانَ يَكْفِيهِ) ). عَـنْ جَـابِرٍ، قَـالَ: خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ فَشَجَّهُ فِـي رَأْسِهِ، ﴿ثُمَّ احْتَلَمَ﴾ فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَـلْ تَجِـدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِـدُ لَـكَ رُخْصَـةً وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ، فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ فَلَمَّا قَـدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُخْبِرَ بِـذَلِكَ فَقَـالَ: (قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ أَلاَّ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ، إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ - أَوْ يَعْصِبَ شَكَّ مُوسَى - عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَـةً، ثُـمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا، وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ). |

واتـە: لـە جـابرەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: دەرچـووین بـۆ سـەفەرێك جـا پیاوێکمان بەردێك دای لـە سـەری، سـەری شـکاند، پاشـان لەشـی گـران بـوو، جـا پرسیاری لە هاوەڵەکانی کـرد وتـی: ئایـا هـیچ روخسـەتێك دەبیـنن بـۆ مـن کـە

تەیەمموم بکەم؟ ئەوانیش وتیان: هیچ روخسەتێك بۆ تۆ نابینین چونکە تۆ ئاوت دەست دەکەوێت و دەتوانی خۆت بشۆیت، ئەویش خۆی شت و مرد، کاتێك کە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی ئەومیان پێ ڕاگەیاند، جا ئەویش فەرمووی: (کوشتیان خوا بیان کوژێت، ئایا بۆ پرسیاریان نەکرد کاتێك کە نەیاندەزانی، چونکە شیفای هەموو نەزانیەك پرسیار کردنە - واتە نەزانی نەخۆشیە و شیفاکەی پرسیار کردن و فێربوونە- تەنها ئەوەندەی بەس بوو کە تەیەمموم بکات و مەسحی سەر برینەکەی بکردایە، یان بە پارچە قوماشێك بیبەستایە بۆ ئەوەی تەڕ نەبێت، پاشان مەسحی بکردایە. موسا گومانی هەبوو لە: (برینەکەی ببەستایەو مەسحی بکردایە، پاشان هەموو جەستەی بشۆردایە).

٣٣٧ - (حسن) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَصَابَ رَجُلاً جُرْحٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ احْتَلَمَ، فَأُمِرَ بِالاغْتِسَالِ، فَاغْتَسَلَ، فَمَاتَ، فَبَلَغَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (قَتَلُوهُ، قَتَلَهُمُ اللَّهُ! أَلَمْ يَكُنْ شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالَ).

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم پیاوێك بریندار بوو، پاشان تووشی لەشگرانی بوو، هاوڕێکانی ئەوانەی کە لەگەڵی بوون فەرمانیان پێ کرد کە خۆی بشوات، ئەویش خۆی شت و مرد، هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (کوشتیان خوا بیان کوژێت، ئایا شیفای نەزانی پرسیارکردن نیە).

## ئەگەر كەسێك لەبەر بێ ئاوی تەیەممومی كردو نوێژی كرد، كاتی ئەو نوێژە بەسەر نەچوو بوو ئاوی دەستكەوت، ئایا نوێژەكەی بكاتەوە یان ئەو نوێژەی بەسە كە بە تەیەممومی كردوویەتی؟

## ١٢٨ – بَابُ فِي الْمُتَيَمِّمِ يَجِدُ الْمَاءَ بَعْدَ مَا يُصَلِّي فِي الْوَقْتِ.

٣٣٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: خَرَجَ رَجُلَانِ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ، فَتَيَمَّمَا صَعِيدًا طَيِّبًا، فَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا الْمَاءَ فِي الْوَقْتِ، فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلَاةَ وَالْوُضُوءَ، وَلَمْ يُعِدِ الآخَرُ، ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لِلَّذِي لَمْ يُعِدْ: (أَصَبْتَ السُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلَاتُكَ). وَقَالَ لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ: (لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ)[1].

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَغَيْرُ ابْنِ نَافِعٍ يَرْوِيهِ عَنِ اللَّيْثِ عَنْ عَمِيرَةَ بْنِ أَبِي نَاجِيَةَ عَنْ بَكْرِ بْنِ سَوَادَةَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَذِكْرُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ لَيْسَ بِمَحْفُوظٍ وَهُوَ مُرْسَلٌ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، كە وتویەتی: دوو پیاو چوونە سەفەرێك، كاتی نوێژ هاتوو ئاویان پێ نەبوو، هەردووكیان بە گڵێكی پاك تەیەممومیان كرد و نوێژەكەیان كرد، هێشتا كاتی ئەو نوێژە بەسەر نەچوو بوو ئاویان دەستكەوت، یەكێكیان بە ئاوەكە دەستنوێژی گرت و نوێژەكەی كردەوە، ئەوی تریان نوێژەكەی نەكردەوە، كاتێ گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەومیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش بەوەیان كە نوێژەكەی نەكردەوە فەرمووی: (سوننەتت پێكاو نوێژەكەشت بری كەوتووە). بەوی تریان كە دەستنوێژی گرت و نوێژەكەی كردەوە فەرمووی: (تۆ دوو پاداشتت بۆ نوسراوە).

**٣٣٩ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.**

واتە: لە (عَطَاء)ی كوڕی یەسارەوە هاتووە، كە دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بە هەمان مانا فەرموودەكەی گێڕایەوە.

# باسی خۆشتنی رۆژی هەینی

## ١٢٩ - بَابُ فِي الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

٣٤٠ - (صحيح) عَنْ أَبُو سَلَمَةَ بْـنُ عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ: أَنَّ أَبَـا هُرَيْـرَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّـابِ بَيْنَـا هُـوَ يَخْطُـبُ يَـوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ دَخَلَ رَجُـلٌ فَقَـالَ عُمَـرُ: أَتَحْتَبِسُـونَ عَـنْ الصَّلاَةِ؟! فَقَالَ الرَّجُلُ: مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ سَـمِعْتُ النِّـدَاءَ فَتَوَضَّأْتُ، فَقَالَ عُمَرُ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟! أَوَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُـولُ: (إِذَا أَتَـى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ).

واتـە: لـە ئـەبو سـەلەمەی کـوڕی (عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ)ەوە هـاتووە، ئـەویش ئـەبو هورەیرە بۆی گێڕاوەتەوە، کە جارێ عومەری کوڕی (الْخَطَّاب) رەزای خوای لـێ بێ وتاری هەینی دەدا لەو کاتەدا پیاوێ هاتە ژووری مزگەوتەوە، عومـەر وتـی: بـۆ دوادەکـەون لـە نوێـژ؟ - واتـە بـۆ لـە یەکـەم کـاتی نوێـژەوە ئامـادە نـابن؟ - پیاوەکە وتی: هەرکە گوێم لە بانگ بـوو خێـرا دەسـتنوێژم گـرت و ئامـادەبووم بۆ نوێژ، عومەر وتی: هەر دەستنوێژ و بەس؟! ئەی خۆشـتن، ئایـا نەتبیسـتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات).

٣٤١ - (صحيح) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَـى كُـلِّ مُحْتَلِمٍ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خۆشۆردنی رۆژی هەینی پێویست(واجب)ە لەسەر هەموو موسڵمانێكی باڵغ و پێگەیشتوو).

٣٤٢ - (صحيح) عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ، وَعَلَى كُـلِّ مَـنْ رَاحَ إِلَى الْجُمُعَةِ الْغُسْلُ ).

واتە: لە (حَفْصَة)وە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (چوون بۆ نوێژی هەینی لەسەر هەموو موسڵمانێكی باڵغ و پێگەیشتوو فەرزو پێویستە، ئەوەشی دەچێت خۆشتنی لەسەرە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِذَا اغْتَسَلَ الرَّجُلُ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، أَجْزَأَهُ مِنْ غُسْـلِ الْجُمُعَةِ، وَإِنْ أَجْنَبَ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر دوای خۆر هەڵهاتن خۆی بشوات ئەوە بری خۆشوشتن بۆ نوێژی هەینی دەكەوێ و ئەوەندەی بەسە با لەشگرانیش بێت - واتە بۆ هەردووكیان یەك خۆشوشتن بەسە بۆ لەشگرانی و بۆ نوێژی هەینی-.

٣٤٣ - (حسن) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ قَالاَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ، وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَلَمْ يَتَخَطَّ أَعْنَاقَ النَّاسِ، ثُمَّ صَلَّى مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ: كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ جُمُعَتِهِ الَّتِي قَبْلَهَا). قَالَ: وَيَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. وَيَقُولُ: (إِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات، پۆشاکی جوان و پاکوخاوێنی لەبەر بکات، بۆنی خۆش لەخۆی بدات ئەگەر لە لای هەبوو، لە پاشاندا هات بۆ نوێژی هەینی و، هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵکدا، چەندەی خوا لەسەری نوسیوە نوێژ بکات، ئینجا بێدەنگ بێت لە کاتێکدا کە ئیمامەکەی دەچێتە سەر مینبەر هەتا وتارەکەی تەواو دەکات و پێشنوێژیان بۆ دەکات و سەلام دەداتەوە، ئەوە دەبێتە کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لە نێوانی ئەو جومعەیە و جومعەکەی پێشوودا هەیبووە. ڕاوی وتی: ئەبو هورمیرە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سێ ڕۆژی زیاتریش) هەروەها فەرمووی: (پاداشتی چاکەش یەك بە دەیە) — واتە دە ڕۆژ - .

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ سَلَمَةَ أَتَمُّ، وَلَمْ يَذْكُرْ حَمَّادٌ كَلاَمَ أَبِي هُرَيْرَةَ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی سەلەمە تەواو ترە – واتە ئەم فەرمودەی کە باسکرا - بەڵام حەمماد باسی وتەکەی ئەبو هورەیرەی نەکرد.

**٣٤٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَالسِّوَاكُ، وَيَمَسُّ مِنَ الطِّيبِ مَا قُدِّرَ لَهُ). إِلاَّ أَنَّ بُكَيْرًا لَمْ يَذْكُرْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ، وَقَالَ فِي الطِّيبِ: (وَلَوْ مِنْ طِيبِ الْمَرْأَةِ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو پێگەیشتوویەك، وە سیواك کردنیش، وە بۆنی خۆشیش لەخۆی بدات هەر چەندێك توانای لێ بێت). تەنها ئەوە نەبێت کە راوی فەرمودەکە (بُکَیْر) باسی (عَبْدَ الرَّحْمَن)ی نەکرد، وە سەبارەت بە بۆنی خۆش فەرمووی: (با لە بۆنی خۆشی ژنەکەیشی بێت).

٣٤٥ - (صحيح) عَنْ أَوْسُ بْنُ أَوْسٍ الثَّقَفِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ، فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا).

واتە: لە ئەوسی کوڕی ئەوسی (الثَّقَفِيِّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیست دەیفەرموو: (هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات و پێش وەخت ئامادە بێت بۆ نوێژ، بە پیادە بڕوات نەك بە سواری، لە نزیك ئیمامەوە دانیشێت، بەبێ دەنگی و قسەی نابەجێ نەکات، بۆ هەموو هەنگاوێکی خێر و پاداشتی یەك ساڵی هەیە، کە بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بووبێ و، بە شەو شەونوێژ بکات).

٣٤٦ - (صحيح) عَنْ أَوْسٍ الثَّقَفِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ غَسَلَ رَأْسَهُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ). ثُمَّ سَاقَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئەوسی (الثَّقَفِيِّ)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی دا سەر و جەستەی بە تەواوی بشوات). پاشان فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٣٤٧ - (حسن) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَمَسَّ مِنْ طِيبِ امْرَأَتِهِ إِنْ كَانَ لَهَا، وَلَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ لَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ وَلَمْ يَلْغُ عِنْدَ الْمَوْعِظَةِ، كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهُمَا، وَمَنْ لَغَا وَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، كَانَتْ لَهُ ظُهْرًا).

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەمری کوڕی (الْعَاص)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات، چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات لەو بۆنەی کە ژنەکەی لەخۆی دەدات ئەگەر هەیبوو، پۆشاکی جوان و پاکوخاوێنی لەبەر بکات، هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵکدا، لەکاتی وتاردا قسەی نابەجێ نەکات، دەبێتە کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لەنێوانی ئەو جومعەیە و جومعەکەی پێشوودا هەیبووە، بەڵام ئەوەی قسەی نابەجێ بکاو، هەنگاو بنێت بەسەر خەڵکدا، ئەوە بەس نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەنوسرێت.

٣٤٨ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ أَرْبَعٍ مِنَ الْجَنَابَةِ وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَمِنَ الْحِجَامَةِ وَمِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە، کە پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەم چوار شتە خۆی دەشت: بۆ لەشگرانی، بۆ رۆژی هەینی، لە کەڵەشاخ گرتن و، بۆ شتنی مردوو.

٣٤٩ - (صحيح مقطوع) عَنْ عَلِيُّ بْنُ حَوْشَبٍ، قَالَ: سَأَلْتُ مَكْحُولاً عَنْ هَذَا الْقَوْلِ: (غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ). فَقَالَ: غَسَّلَ رَأْسَهُ وَ﴿غَسَلَ﴾ جَسَدَهُ.

واتە: لە عەلی کوڕی حەوشەبەوە هاتووە، کە وتویەتی: دەربارەی ئەم وتە: (غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ). لە مەکحولم پرسی؟ ئەویش وتی: سەر و جەستەی بە تەواوی بشوات.

٣٥٠ - (صحيح مقطوع) عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ﴿فِي (غَسَّلَ﴾ وَاغْتَسَلَ؟). قَالَ: قَالَ سَعِيدٌ: غَسَّلَ رَأْسَهُ وَغَسَلَ جَسَدَهُ.

واتە: سەبارەت بە (غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ)ە لە سەعیدی کوڕی (عَبْدِ الْعَزِيز)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەعید وتی: سەر و جەستەی بە تەواوی بشوات.

٣٥١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ، ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَـرَّبَ بَدَنَـةً، وَمَـنْ رَاحَ فِـي السَّـاعَةِ الثَّانِيَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَـرَةً، وَمَـنْ رَاحَ فِـي السَّـاعَةِ الثَّالِثَةِ، فَكَأَنَّمَا قَـرَّبَ كَبْشًـا أَقْـرَنَ، وَمَـنْ رَاحَ فِـي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَـنْ رَاحَ فِـي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ، فَكَأَنَّمَا قَـرَّبَ بَيْضَـةً، فَـإِذَا خَـرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسلم فەرموویـەتی: (هەرکەسـێ ڕۆژی هـەینی خـۆی بشـوات، پاشـان لەسـەعاتی یەکەمدا ئامادەبێ لـە مزگەوتـدا وەك وشـترێ بکات بـەخێر ئاوایـە، ئـەوەی لـە سەعاتی دووهەمدا بڕوات وەك ئەوە وایـە مانگایـەك بکات بـەخێر، ئـەوەی لـە سـەعاتی سـێهەمدا بـڕوات وەك ئـەوە وایـە بـەرانێکی شـاخدار بکـات بـەخێر، ئەوەی لە سەعاتی چوارهەمدا بڕوات وەك ئـەوە وایـە مریشکێ بکات بـەخێر، ئەوەی لە سـەعاتی پێنجەمـدا بـڕوات وەك هێلکەیـەك بکـات بـەخێر وایـە، کـە ئیمام چووە سەر مینبەر ئیتر مەلائیکەکان دەڕۆن گوێ لە وتارەکە دەگرن.

# باسی روخسەتی وازهێنان لە خۆشوشتنی رۆژی هەینی

## ١٣٠ – بَابُ فِي الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

٣٥٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها، قَالتْ: كَانَ النَّاسُ مُهَّانَ أَنْفُسِهِمْ، فَيَرُوحُونَ إِلَى الْجُمُعَةِ بِهَيْئَتِهِمْ، فَقِيلَ لَهُمْ: لَوِ اغْتَسَلْتُمْ.

واته: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەسەرەتاوە خەڵك خزمەتکاری خۆیان بوون و خۆیان کاری خۆیان ئەنجام دەداو خزمەتکاریان نەبوو، بۆیە بەو شێوەوە دەچوون بۆ نوێژی هەینی واتە بە جل و بەرگی کارەوە، پێیان دەوترا: خۆزگا خۆتان بشتایە جا بهاتنایە بۆ نوێژی هەینی، چونکە ئەوە چاکتر و تەواوترە.

٣٥٣ - (حسن) عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّ أُنَاسًا مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ جَاءُوا فَقَالُوا: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! أَتَرَى الْغُسْلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبًا؟ قَالَ: لاَ وَلَكِنَّهُ أَطْهَرُ وَخَيْرٌ لِمَنِ اغْتَسَلَ، وَمَنْ لَمْ يَغْتَسِلْ فَلَيْسَ عَلَيْهِ بِوَاجِبٍ، وَسَأُخْبِرُكُمْ كَيْفَ بَدْءُ الْغُسْلِ: كَانَ النَّاسُ مَجْهُودِينَ يَلْبَسُونَ الصُّوفَ، وَيَعْمَلُونَ عَلَى ظُهُورِهِمْ، وَكَانَ مَسْجِدُهُمْ ضَيِّقًا

مُقَارِبَ السَّقْفِ، إِنَّمَا هُوَ عَرِيشٌ فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي يَوْمٍ حَارٍّ وَعَرِقَ النَّاسُ فِي ذَلِكَ الصُّوفِ، حَتَّى ثَارَتْ مِنْهُمْ رِيَاحٌ آذَى بِذَلِكَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، فَلَمَّا وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِلْكَ الرِّيحَ قَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ! إِذَا كَانَ هَذَا الْيَوْمُ فَاغْتَسِلُوا، وَلْيَمَسَّ أَحَدُكُمْ أَفْضَلَ مَا يَجِدُ مِنْ دُهْنِهِ وَطِيبِهِ). قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ثُمَّ جَاءَ اللَّهُ بِالْخَيْرِ، وَلَبِسُوا غَيْرَ الصُّوفِ، وَكُفُوا الْعَمَلَ، وَوُسِّعَ مَسْجِدُهُمْ، وَذَهَبَ بَعْضُ الَّذِي كَانَ يُؤْذِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا مِنَ الْعَرَقِ.

واتە: لە (عِكْرِمَة)ەوە هاتووە، كە خەڵكی عێراق هاتن بۆ لای ئیبنو عەباس و پێیان وت: ئەی ئیبنو عەباس ئایا تۆ پێت وایە كە خۆشتنی ڕۆژی هەینی واجبە؟ وتی: نەخێر، بەڵكو ئەوە پاكترە بۆ جەستە، وە خێرترە بۆ كەسێك كە خۆی بشوات، ئەوەی خۆی نەشوات لەسەری واجب نیە، پێتان بڵێم كە خۆشتنی چۆن دەستی پێ كرد؟ خەڵك جل و بەرگی خوریان لەبەردەكرد، حەماڵ بوون و ئیش و كاریان پێوە دەكرد ماندوو دەبوون و ئارەقیان دەكردەوە، ئەو كاتە مزگەوتەكەیان تەنگ بوو سەقفەكەی بە لاسكی گەڵای خورما گیرا بوو بەرز نەبوو، لە ڕۆژێكی گەرمادا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ مزگوت، خەڵكیش بەو بەرگە خوریانەوە ئارەقیان دەكردەوە، بۆنی ناخۆشیان لێ دەهات بۆیە بە هۆی ئەو بۆنەوە هەندێكیان بوو

بوون بە هۆی نارەحەتکردنی هەندێکی تریان، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەی بینی فەرمووی: (ئەی خەڵکینە ئەگەر ڕۆژی هەینی بوو هاتن بۆ نوێژی هەینی با هەر یەکێ لە ئێوە چاکترین بۆنی خۆش لە خۆی بدات). ئیبنو عەباس دەڵێت: کاتێ کە خوا دەرووی خێری کردەوە و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان گەیشتە وڵاتان و خێرو بێر زۆر بوو، دەوڵەمەند بوون پۆشاکی جگە لە خوریان دەپۆشی و کاری قورسیان نەدەکرد، مزگەوتەکەیان فراوان کرد، ئیتر ئەوە نەما.

٣٥٤ - (حسن) عَنْ سَمُرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَهُوَ أَفْضَلُ).

واتە: لە سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك تەنها دەستنوێژ بگرێت بۆ نوێژی هەینی ئەوە تەواوەو چاکی کردووە، ئەوەش کە خۆی دەشوات دیارە ئەوە چاکتر و خێرترە).

## باسی کەسێك کە موسڵمان ببێت فەرمانی پیٚ دەکرێت بە خۆشتن

## ١٣١ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ فَيُؤْمَرُ بِالْغُسْلِ.

٣٥٥ - (صحيح) عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ الإِسْلاَمَ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ.

واتە: لە قەیسی کوڕی عاصمەوە هاتووە، کە وتویەتی: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتم: دەمەوێت موسڵمان ببم، فەرمانی پیٚ کردم کە بە ئاو و مۆرد(سدر) خۆم بشۆم.

٣٥٦ - (حسن) عَنْ عُثَيْمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: قَدْ أَسْلَمْتُ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الْكُفْرِ). يَقُولُ احْلِقْ. قَالَ: وَأَخْبَرَنِي آخَرُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لآخَرَ مَعَهُ: (أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الْكُفْرِ وَاخْتَتِنْ).

واتە: لە (عُثَيْم) کوڕی (کُلَيْب)ەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتووە، کە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتی: بێگومان موسوڵمان بووم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (سەرت چاك بکە). — واتە ئەو مووەی کە بە کافری پەروەردەت کردووە بیتاشە- وتی: بیتاشم. راوی وتی: بێجگە لە باپیری (عُثَيْم)، یەکێکی تر لە هاوەڵان بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە یەکێکی تر کە لەگەڵی بوو فەرمووی: (سەرت چاك بکەو خۆت خەتەنە بکە).

## باسی شوشتنی ئەو پۆشاکەی کە ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا لەبەریا بووە.

## ١٣٢ – بَابُ الْمَرْأَةِ تَغْسِلُ ثَوْبَهَا الَّذِي تَلْبَسُهُ فِي حَيْضِهَا.

٣٥٧ - (صحيح) عَنْ مُعَاذَةَ، قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا عَنْ الْحَائِضِ يُصِيبُ ثَوْبَهَا الدَّمُ؟ قَالَتْ: تَغْسِلُهُ، فَإِنْ لَمْ يَذْهَبْ أَثَرُهُ فَلْتُغَيِّرْهُ بِشَيْءٍ مِنَ صُفْرَةٍ، قَالَتْ: وَلَقَدْ كُنْتُ أَحِيضُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَ حِيَضٍ جَمِيعًا لاَ أَغْسِلُ لِي ثَوْبًا.

واتە: لە (مُعَاذة)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بە ئافرەتی بێ نوێژ ئەگەر خوێنی بێ نوێژیەکەی بەر پۆشاکەکەی بکەوێت لە عائیشەم رەزای

خوای لێ بێ پرسی؟ وتی: واجبە بیشوات ئەگەر شوێنەواری خوێنەکەی ما با بەشتێکی زەرد وەك زەعفەران رەنگەکەی بگۆڕێت. عائیشە وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سێ جار کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە ئەو پۆشاکەی کە لە بەرمدا بوو خوێنی بەرنەکەوت بۆیە نەمشت و نوێژم پێوە دەکرد.

٣٥٨ - (صحيح) عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: مَا كَانَ لإِحْدَانَا إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ تَحِيضُ فِيهِ، فَإِنْ أَصَابَهُ شَىْءٌ مِنْ دَمٍ بَلَّتْهُ بِرِيقِهَا، ثُمَّ قَصَعَتْهُ بِرِيقِهَا.

واتە: لە موجاهیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: هەر یەکێ لە ئێمە - واتە لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - تەنها یەك پۆشاکی هەبوو لە کاتی بێ نوێژیدا لەبەریا بوو، ئەگەر شتێك لە خوێنی بەرکەوتایە تفی لێ دەدا پاشان دەیپرواند.

٣٥٩ - (ضعيف) عَنْ جَدَّةِ بَكَّارِ بْنِ يَحْيَى، قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَسَأَلَتْهَا امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ عَنِ الصَّلاَةِ فِى ثَوْبِ الْحَائِضِ؟ فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: قَدْ كَانَ يُصِيبُنَا الْحَيْضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَلْبَثُ إِحْدَانَا أَيَّامَ حَيْضِهَا، ثُمَّ تَطْهُرُ فَتَنْظُرُ الثَّوْبَ الَّذِى كَانَتْ تَقْلِبُ فِيهِ، فَإِنْ أَصَابَهُ دَمٌ غَسَلْنَاهُ وَصَلَّيْنَا فِيهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَصَابَهُ شَىْءٌ تَرَكْنَاهُ وَلَمْ يَمْنَعْنَا ذَلِكَ مِنْ

أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِ، وَأَمَّا الْمُمْتَشِطَةُ فَكَانَتْ إِحْدَانَا تَكُونُ مُمْتَشِطَةً، فَإِذَا اغْتَسَلَتْ لَمْ تَنْقُضْ ذَلِكَ، وَلَكِنَّهَا تَحْفِنُ عَلَى رَأْسِهَا ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ، فَإِذَا رَأَتِ الْبَلَلَ فِي أُصُولِ الشَّعْرِ دَلَكَتْهُ، ثُمَّ أَفَاضَتْ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهَا.

واته: لە نەنكی (بَكّار)ی كوڕی یەحیاوە هاتووە، كە وتویەتی: چووم بۆ لای ئوم سەلەمە لەو كاتەدا ئافرەتێكی قورەیشی لەبارەی نوێژكردن بە پۆشاكی ئافرەتی بێ نوێژەوە لێی پرسی؟ ئوم سەلەمەش وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە تووشی بێ نوێژی دەهاتین هەر یەكێ لە ئێمە لە ڕۆژانی بێ نوێژیدا پۆشاكەكەی لەبەر دەكرد، پاشان كە پاك دەبووەوە سەیری پۆشاكەكەی دەكرد ئەگەر خوێنی پێوە بوایە دەمانشت و نوێژمان پێوە دەكرد، ئەگەر هیچی پێوە نەبوایە وازمان لێ دەهێنا و نەماندەشت، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ڕێگری ئەوەی لێ نەدەكردین، بەلاّم سەبارەت بە ئافرەتێ كە قژی شانەكراو بێت، هەر یەكێ لە ئێمە كە قژی شانەكراو بوایە كاتێ كە خۆی بشتایە پەلكەكانی نەدەكردەوە بەڵكو سێ مشت ئاوی پێدا دەكردن، كاتێ كە هەستی دەكرد تەڕایی گەیشتۆتە بنی مووەكانی پەنجەی تێ دەخست، پاشان ئاوی دەكرد بە باقی جەستەیدا.

٣٦٠ - (حسن صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: سَمِعْتُ امْرَأَةً تَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ تَصْنَعُ إِحْدَانَا بِثَوْبِهَا إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ، أَتُصَلِّي فِيهِ؟ قَالَ: (تَنْظُرُ، فَإِنْ رَأَتْ فِيهِ دَمًا، فَلْتَقْرُصْهُ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، وَلْتَنْضَحْ مَا لَمْ تَرَ، وَلْتُصَلِّي فِيهِ).

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە هاتووە، کە وتویەتی: گوێم لیّ بوو ئافرەتێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: هەر یەکێ لە ئێمە چی بکات لەو پۆشاکەی کە لە رۆژانی بێ نوێژیدا لەبەریدا بووە ئەگەر بینی پاك بوو، ئایا نوێژی پێوە بکات یان نا؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سەیری بکات ئەگەر خوێنی پێوە بینی با پێشەکی بیپروێنێت - ئەگەر وشك بوو — ئینجا بە ئاویشەوە چاك لەنێوان پەنجەکانیدا بیپروێنێت، لەپاشدا بەچاکی بە ئاو بیشوات بۆ ئەوەی شوێنەواری نەمێنێ، ئینجا نوێژی پێوە بکات).

**٣٦١ - (ضعيف) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: (إِذَا أَصَابَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ مِنَ الْحَيْضِ فَلْتَقْرِصْهُ، ثُمَّ لْتَنْضَحْهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ لْتُصَلِّي).**

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئافرەتێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەگەر یەکێ لە ئێمە ئەو پۆشاکەی کە لە رۆژانی بێ نوێژیدا لەبەریدا بووە خوێنی پێوە بوو چی لێ بکات؟ ئەویش فەرمووی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە خوێنی بێ نوێژی بەر پۆشاکەکەی کەوت با بیپروێنێت - ئەگەر وشك بوو — ، ئینجا بە ئاویشەوە چاك لەنێوان پەنجەکانیدا بیپروێنێت، لەپاشدا بەچاکی بە ئاو بیشوات، ئینجا نوێژی پێوە بکات).

| |
|---|
| ٣٦٢ - (صحيح) عَـنْ هِشَـامٍ، بِهَـذَا الْمَعْنَـى، قَـالَ: (حُتِّيـهِ، ثُـمَّ اقْرُصِيهِ بِالْمَاءِ، ثُمَّ انْضَحِيهِ). |

واته: لە هیشامەوە، بە هەمان مانا هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (پێشەكی بیپروێنە، ئینجا بە ئاویشەوە چاك لەنێوان پەنجەكانتدا بیپروێنە، لەپاشدا بەچاكی بە ئاو بیشۆ).

| |
|---|
| ٣٦٣ - (صحيح) عَنْ عَدِيٍّ بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أُمَّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ تَقُولُ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يَكُونُ فِي الثَّوْبِ؟ قَالَ: (حُكِّيهِ بِضِلْعٍ، وَاغْسِلِيهِ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ). |

واته: لە عەدی كوڕی دینارەوە هاتووە، كە وتویەتی: گوێم لە ئوم قەیسی كچی (مِحْصَن) بوو دەیوت: لەبارەی خوێنی بێ نوێژیەوە كە بە پۆشاكەوە بێت لە پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم پرسی؟ ئەویش فەرمووی: (بە دارێ بیماڵەو، بە ئاو و مۆرد بیشۆ).

| |
|---|
| ٣٦٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: قَدْ كَانَ يَكُونُ لإِحْدَانَا الدِّرْعُ فِيهِ تَحِيضُ، وَفِيهِ تُصِيبُهَا الْجَنَابَةُ، ثُمَّ تَرَى فِيهِ قَطْرَةً مِنْ دَمٍ فَتَقْصَعُهُ بِرِيقِهَا. |

واته: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: بێگومان هەر یەكێ لە ئێمە پۆشاكێكی هەبوو لە ڕۆژانی بێ نوێژیدا لەبەریدا بوو پێیەوە

تووشی لەشگرانیش دەهات، پاشان ئەگەر دڵۆپێ خوێنی پێوە بدیایە تفی خۆی لێ دەداو بەسەری پەنجەکانی دەیپرواند و لایدەبرد.

٣٦٥ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: أَنَّ خَوْلَةَ بِنْتَ يَسَارٍ أَتَتِ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِى إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، وَأَنَا أَحِيضُ فِيهِ، فَكَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: (إِذَا طَهُرْتِ فَاغْسِلِيهِ، ثُمَّ صَلِّى فِيهِ). فَقَالَتْ: فَإِنْ لَمْ يَخْرُجِ الدَّمُ؟ قَالَ: (يَكْفِيكِ غَسْلُ الدَّمِ، وَلاَ يَضُرُّكِ أَثَرُهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە خەولەی کچی یەسار هاتە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، من تەنها یەك جل و بەرگم هەیە، وە بەو جلەیشەوە تووشی بێ نوێژی دەبم چی بکەم؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (جا ئەگەر پاك بویتەوە شوێنی خوێنەکە بشۆ، پاشان نوێژی پێوە بکە). خەولە وتی: ئەی ئەگەر شوێنەواری هەر مایەوە؟ فەرمووی: (تەنها ئەوەندەت بەسە کە شوێنی خوێنەکە بشۆیت، شوێنەواری هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنێت).

## باسی نوێژکردن بە پۆشاکێکەوە جیماعی پێوەکرابێت.

## ١٣٣ – بَابُ الصَّلاَةِ فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُصِيبُ أَهْلَهُ فِيهِ.

٣٦٦ - (صحيح) عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ: أَنَّهُ سَأَلَ أُخْتَهُ أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُهَا فِيهِ؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِ أَذًى.

واتە: لە مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێڕنەوە، کە لە خوشکەکەی ئوم حەبیبەی خێزانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسیوە: ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو پۆشاکەی کە جیماعی پێوەدەکرد نوێژی کردووە؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر پیسی پێوە نەدیبێت.

## باسی نوێژکردن لەسەر پۆشاکی ئافرەتاندا.

## ١٣٤– بَابُ الصَّلاَةِ فِي شُعُرِ النِّسَاءِ.

٣٦٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُصَلِّي فِي شُعُرِنَا، أَوْ: فِي لُحُفِنَا، قَالَ: عُبَيْدُ اللَّهِ شَكَّ أَبِي.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەسەر ئەو پۆشاکانەی کە لەبەرمان دەکرد، یان لەسەر ئەو داپۆشەرانەی کە خۆمان پێ دادەپۆشی لەکاتی خەوتندا نوێژی نەدەکرد. (عُبَيْدُ اللَّهِ)ی کوڕی (مُعَاذ) وتی: باوکم گومانی هەبوو لە ئەم گۆیە: (فِي شُعُرِنَا، أَوْ: فِي لُحُفِنَا).

٣٦٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يُصَلِّي فِي مَلاَحِفِنَا. قَالَ حَمَّادٌ: وَسَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ أَبِي صَدَقَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْهُ، فَلَمْ يُحَدِّثْنِي وَقَالَ: سَمِعْتُهُ مُنْذُ زَمَانٍ، وَلاَ أَدْرِي مِمَّنْ سَمِعْتُهُ، وَلاَ أَدْرِي أَسَمِعْتُهُ مِنْ ثَبَتٍ أَمْ لاَ، فَسَلُوا عَنْهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە پۆشاك و پێخەفی ئێمەدا نوێژی نەدەکرد. حەمماد دەڵێت: بیستم لە سەعیدی کوڕی (أَبِي صَدَقَة) دەیوت: لەوبارەوە لە موحەممەدم پرسی – واتە ئیبنو سیرین - بۆی نەگێڕامەوە، وە وتی: زەمانێکی زۆرە بیستوومە، نازانم لە کێم بیستووە لە کەسێکم بیستووە کە عادل و باوەڕ پێکراوە یان نا، بڕۆن لە زانایەکی فەرموودەناسی جگە لە من بپرسن.

## باسی روخست لەمەدا واتە نوێژكردن لەسەر پۆشاكی ئافرەتاندا.

## ١٣٥ - بَابُ فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

**٣٦٩ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى وَعَلَيْهِ مِرْطٌ، وَعَلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ مِنْهُ وَهِيَ حَائِضٌ، وَهُوَ يُصَلِّي وَهُوَ عَلَيْهِ.**

واتە: لە (مَيْمُونَة)ی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، كە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەكرد شاڵینەیە(مِرْط)[1] یان پۆشاكێكی پێچابوو بە خۆیەوە، لەو كاتەدا بەشێك لەو (مِرْط)ە بە یەكێ لە خێزانەكانیەوە بوو بێ نوێژیش بوو كە لە تەنیشتیەوە بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی پێوە دەكرد.

**٣٧٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ، وَأَنَا إِلَى جَنْبِهِ، وَأَنَا حَائِضٌ، وَعَلَيَّ مِرْطٌ لِي، وَعَلَيْهِ بَعْضُهُ.**

---

[1] - (مِرْط) پۆشاكێكە وەك عەبا لە خوری و كەتان و ئاوریشم دروست دەكرێت.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەونوێژی دەکرد منیش لە تەنیشتیەوە بووم و بێ نوێژیش بووم، شاڵینەیەکم پێچابوو بە خۆمەوە، هەندێکیشی بەوەوە بوو.

## باسی ئەگەر (مەنی) بەر پۆشاك بکەوێت – حوکمی چیە؟ پێویست دەکات پاك بکرێتەوە یان نا؟

## ١٣٦ – بَابُ الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ.

٣٧١ - (صحيح) عَنْ هَمَّامِ بْنِ آلْحَارِثِ" أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَاحْتَلَمَ، فَأَبْصَرَتْهُ جَارِيَةٌ لِعَائِشَةَ وَهُوَ يَغْسِلُ أَثَرَ الْجَنَابَةِ مِنْ ثَوْبِهِ - أَوْ يَغْسِلُ ثَوْبَهُ - فَأَخْبَرَتْ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَأَنَا أَفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-[1].

واتە: لە هەممامی کوڕی (حَارِث)ەوە هاتووە، کە لە لای عائیشە بووە ڕەزای خوای لێ بێ، پێشتر ئیحتیلام بوو بوو شوێنەواری بە پۆشاکەکەیەوە بوو، کەنیزەکێکی عائیشە چاوی لێ بوو – هەممام - شوێنەواری (مەنییەکەی) دەشت بە پۆشاکەکەیەوە - یان پۆشاکەکەی دەشت - ئەوەی بۆ عائیشە گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بە دەستی خۆم (مەنی)م بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم ئەپرواند.

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ الأَعْمَشُ كَمَا رَوَاهُ الْحَكَمُ.

٣٧٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ، قَالَتْ: كُنْتُ أَفْرُكُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُصَلِّي فِيهِ[1].

واتە: لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە دەستی خۆم (مەنی)م بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ئەپرواند، ئینجا ئەچوو نوێژی پێوە دەکرد.

٣٧٣ - (صحيح) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ: إِنَّهَا كَانَتْ تَغْسِلُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَتْ: ثُمَّ أَرَى فِيهِ بُقْعَةً أَوْ بُقَعًا.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە هاتووە، کە وتویەتی: گوێم لە عائیشە بوو ڕەزای خوای لێ بێ باسی ئەوەی دەکرد کە (مەنی) بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم شۆردووە، عائیشە وتی: پاشان شوێنەواری شتنەکەم بە پۆشاکەکەیەوە دەبینی.

---

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَافَقَهُ مُغِيرَةُ، وَأَبُو مَعْشَرٍ، وَوَاصِلٌ.

## باسی ئەگەر میزی كوڕی شیرە خۆرە بەر پۆشاك بكەوێت.

## ١٣٨ - بَابُ بَوْلِ الصَّبِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ.

٣٧٤ - (صحيح) عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ: أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حِجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ.

واتە: لە ئوم قەیسی كچی (مِحْصَن)ەوە هاتووە، كە كوڕێكی كۆرپەی بچوكی هەبوو نانی نەدەخوارد - واتە شیرەخۆرە بوو- بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر كۆشی خۆی داینا، میزی كرد بە پۆشاكەكەیدا، داوای ئاوی كردو ئاوەكەی پرژاند لە پۆشاكەكەی و، نەیشت.

٣٧٥ - (حسن صحيح) عَنْ لُبَابَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، قَالَتْ: كَانَ الْحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَالَ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: الْبَسْ ثَوْبًا

وَأَعْطِنِي إِزَارَكَ حَتَّى أَغْسِلَهُ، قَالَ: (إِنَّمَا يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الأُنْثَى، وَيُنْضَحُ مِنْ بَوْلِ الذَّكَرِ).

واتە: لە لوبابەی كچی (حارِث)ەوە دەگێڕنەوە،،كە وتویەتی: حوسەینی كوڕی عەلی ڕەزای خوای لێ بێ لە كۆشی پێغەمبەری خوادا بوو صلى الله عليه وسلم میزی پێدا كرد، منیش وتم: پۆشاكێك لەبەر بكەو پۆشاكەكەتم بدەرێ با بۆتی بشۆم، فەرمووی: (میزی كچ دەشۆردرێت، بەلاّم هی كوڕ ئاوی لێ دەپژێنرێت).

٣٧٦ - (صحيح) عَنْ أَبُو السَّمْحِ، قَالَ: كُنْتُ أَخْدُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَغْتَسِلَ، قَالَ: (وَلِّنِي قَفَاكَ). فَأُوَلِّيهِ قَفَايَ فَأَسْتُرُهُ بِهِ، فَأُتِيَ بِحَسَنٍ أَوْ حُسَيْنٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، فَبَالَ عَلَى صَدْرِهِ، فَجِئْتُ أَغْسِلُهُ فَقَالَ: (يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ، وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلاَمِ).

واتە: لە ئەبو سەمحەوە هاتووە، كە وتویەتی: مـن خزمەتكاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بووم كاتێ كە بیوستایە خۆی بشوات، دەیفەرموو: (رووت وەرگێڕەو پشتم تێ بكە). منش رووم وەردەگێڕا بۆ لایەكی تر ئەویش پشتمی دەكردە بەربەست بۆ ئەوەی نەبینرێت و لە پەنایدا خۆی دەشت، حەسەن یان حوسەینیان ڕەزای خوایان لێ بێ هێنا بۆ لای، جا میزی كرد بەسەر سنگیدا، منیش هاتم بیشۆم، فەرمووی: (میزی كچ دەشۆردرێت، بەلاّم هی كوڕ ئاوی لێ دەپژێنرێت).

عَنْ الْحَسَنِ ، قَالَ: الأَبْوَالُ كُلُّهَا سَوَاءٌ.

واتە: لە حەسەنی - (بصري)- ەوە هاتووە، کە وتویەتی: میزەکان هەر هەموویان وەك یەکن - واتە جیاوازی نیە لە پیسیاندا هی کچ بێت یان کوڕ، هی گەورە بێت یان بچوك -.

| |
|---|
| ٣٧٧ - (صحيح موقوف) عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ، وَيُنْضَحُ مِنْ بَوْلِ الْغُلاَمِ، مَا لَمْ يَطْعَمْ. |

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: میزی کچ ئەگەر بەر پۆشاك بکەوێت دەشۆردرێت، بەڵام میزی کوڕی شیرەخۆرە ئاوی لێ دەپژێنرێت ئەگەر نان نەخوات.

| |
|---|
| ٣٧٨ - (صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ: (مَا لَمْ يَطْعَمْ). زَادَ قَالَ قَتَادَةُ: هَذَا مَا لَمْ يَطْعَمَا الطَّعَامَ، فَإِذَا طَعِمَا غُسِلاَ جَمِيعًا. |

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: بە هەمان مانا باسەکەی گێڕایەوە، بەڵام ڕاوی باسی (ئەگەر خواردن نەخوات)ی نەکرد. ڕاوی فەرموودەکە ئەمەشی بۆ زیاد کرد قەتادە دەڵێت: ئەم حوکمە ئەگەر خواردن نەخۆن، بەڵام ئەگەر خواردن بخۆن ئەو کاتە میزی هەردووکیان دەشۆردرێت - ئەگەر بەر پۆشاك بکەوێت - .

٣٧٩ - (صحيح) عَنْ الْحَسَنِ، عَنْ أُمِّـهِ قَالَـتْ: أَنَّهَـا أَبْصَـرَتْ أُمَّ سَلَمَةَ تَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى بَوْلِ الْغُلاَمِ مَا لَمْ يَطْعَمْ، فَـإِذَا طَعِمَ غَسَلَتْهُ، وَكَانَتْ تَغْسِلُ بَوْلَ الْجَارِيَةِ.

واته: له حهسهنی - (بصري)- هوه، لـه دایکیـهوه هـاتووه، کـه وتویـهتی: ئـوم سـهلهمهی دیـوه ئـاوی دهکـرد بـه میـزی کـوڕی شـیرهخۆرهدا ئهگـهر نـانی نهخواردایه، بهڵام ئهگهر نانی بخواردایه دهیشۆری، بێگومان ئوم سهلهمه میزی کچی دهشۆرد.

## باسی ئەگەر زەوی میزی بەربکەوێت.

## ١٣٨ – بَابُ الأَرْضِ يُصِيبُهَا الْبَوْلُ.

٣٨٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ أَعْرَابِيًّا دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَرَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ، فَصَلَّى، - قَالَ ابْـنُ عَبْدَةَ رَكْعَتَيْنِ - ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّـدًا، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا! فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: (لَقَدْ تَحَجَّرْتَ وَاسِعًا). ثُمَّ لَمْ يَلْبَثْ أَنْ بَالَ فِي نَاحِيَـةِ الْمَسْجِدِ، فَأَسْرَعَ النَّاسُ إِلَيْهِ، فَنَهَـاهُمُ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (إِنَّمَـا بُعِثْـتُمْ مُيَسِّـرِينَ، وَلَـمْ

تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ، صُبُّوا عَلَيْهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ). أَوْ قَالَ: (ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوتدا دانیشتبوو، عەرەبێکی دەشتەکی هاتە ژوورەوە نوێژی کرد — ئیبنو عەبدە وتی دوو رکات نوێژی کرد- پاشان وتی: خودایە بەزەیت بێتەوە بە من و بە موحەممەد دا، لەگەڵ ئێمەدا بەزەیت بە هیچ کەسێکی تردا نەیەتەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە کابرای دەشتەکی فەرموو: (بەڕاستی فراوانەکەت کەمکردەوە، واتە رەحمەتی فراوانی خوات کەمکردەوە). هەستا میزی کردە لایەکی مزگەوتەوە، خەڵکەکەش هەستان بۆی، بۆ ئەوەی لێی بدەن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: وازی لێ بهێنن و دۆڵچەیەك ئاو بکەن بەسەر میزەکەیدا، بەڕاستی ئێوە بۆ ئاسانکاری رەوانەکراون، رەوانە نەکراون کە زەحمتکار بن و باری شانی خەڵك قورس و گران بکەن.

٣٨١ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ مَعْقِلِ بْنِ مُقَرِّنٍ، قَالَ: صَلَّى أَعْرَابِيٌّ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ فِيهِ: وَقَالَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - : (خُذُوا مَا بَالَ عَلَيْهِ مِنَ التُّرَابِ فَأَلْقُوهُ، وَأَهْرِيقُوا عَلَى مَكَانِهِ مَاءً)[١].

[١]- قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ مُرْسَلٌ، ابْنُ مَعْقِلٍ لَمْ يُدْرِكِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتـە: لـە (عبداللـە)ی کـوڕی مەعقـەلی کـوڕی موقرینـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیـە وسلم نوێـژی کـرد. جـا بـە هـەمان شـێوە بەسـەرهاتی - میـزی کـابرای دەشـتەکی — گێڕایـەوە، لـە فەرموودەکەیـدا وتـی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرمووی: (ئەو گڵەی کە میزی بەرکەوتوە لایبەن و فڕێی بدەنە شوێنێکی تـر، پاشان ئاو بکەن بە جێگەکەیدا).

## باسی زەوی پاکە ئەگەر وشك بێتەوە.

## ١٣٩ - بَابُ فِي طُهُورِ الأَرْضِ إِذَا يَبِسَتْ.

٣٨٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكُنْتُ فَتًى شَابًّا عَزَبًا، وَكَانَتِ الْكِلاَبُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم، گەنجێکی ڕەبـەن بـووم شـەو لـە مزگـەوت دەمامـەوە، سـەگ میزیـان دەکـرد و بـەناو مزگەوتـدا دەهاتن و دەچوون، هەرگیز ئاویشیان لێ نەدەپژاند.

## باسی ئەگەر داوێنی کراس پیسی بەرکەوت.

## ١٤١ – بَابُ فِي الأَذَى يُصِيبُ الذَّيْلَ.

٣٨٣ - (صحيح) عَنْ أُمِّ وَلَدٍ لإِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: أَنَّهَا سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيْلِي، وَأَمْشِي فِي الْمَكَانِ الْقَذِرِ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ).

واتە: لە (أُمِّ وَلَد)ی ئیبراهیمی کوڕی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە لە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسیوەو وتویەتی: من ئافرەتێکم داوێنی کراسەکەم درێژەو بە شوێنی پیسدا تێدەپەڕم چی بکەم؟ ئوم سەلەمە وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (دواتر ئەگەر خشا لەزەوی پاك ئەوە پاکی دەکاتەوە).

٣٨٤ - (صحيح) عَنْ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ! إِنَّ لَنَا طَرِيقًا إِلَى الْمَسْجِدِ مُنْتِنَةً، فَكَيْفَ نَفْعَلُ إِذَا مُطِرْنَا؟ قَالَ: (أَلَيْس بَعْدَهَا طَرِيقٌ هِيَ أَطْيَبُ مِنْهَا) ، قَالَتْ: قُلْتُ بَلَى، قَالَ: (فَهَذِهِ بِهَذِهِ).

واتە: لە ئافرەتێکی (بَنِی عَبْدِ الأَشْهَلِ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی مزگەوتەکەمان بۆگەنە، کە باران باری چی بکەین؟ فەرمووی: (ئایا لەدوای ئەوەوە ڕێگەی لەو پاکتر نیە؟) وتی: وتم: بەڵێ هەیە، فەرمووی: (دەی ئەو پاکە ئەوی تر پاك دەکاتەوە).

## باسی ئەگەر نەعل پیسی پێوە بوو.

## ١٤٢ – بَابُ فِي الأَذَى يُصِيبُ النَّعْلَ.

٣٨٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلَيْهِ الأَذَى، فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە نەعلەوە پێی نا لە پیسی، ئەوە خاك پاکی دەکاتەوە).

٣٨٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ، قَالَ: (إِذَا وَطِئَ الأَذَى بِخُفَّيْهِ فَطَهُورُهُمَا التُّرَابُ).

واتە: ئەبو هورەیرە، بە هەمان مانا گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە خوفەوە پێی نا لە پیسی، ئەوە خاك پاکی دەکاتەوە).

**٣٨٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.**

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ بە هەمان مانا گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

## باسی دووبارەکردنەوەی نوێژ ئەگەر پیسی بینرا بە پۆشاکەوە

## ١٤٣ - بَابُ الإِعَادَةِ مِنَ النَّجَاسَةِ تَكُونُ فِي الثَّوْبِ.

**٣٨٨ - (ضعيف) عَنْ أُمِّ جَحْدَرٍ الْعَامِرِيَّةِ: أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ؟ فَقَالَتْ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْنَا شِعَارُنَا، وَقَدْ أَلْقَيْنَا فَوْقَهُ كِسَاءً، فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ الْكِسَاءَ فَلَبِسَهُ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْغَدَاةَ، ثُمَّ**

جَلَسَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَـذِهِ لُمْعَـةٌ مِـنْ دَمٍ، فَقَبَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ عَلَـى مَـا يَلِيهَا، فَبَعَثَ بِهَا إِلَيَّ مَصْرُورَةً فِي يَدِ الْغُلَامِ، فَقَـالَ: (اغْسِلِي هَذِهِ وَأَجِفِّيهَا، ثُمَّ أَرْسِلِي بِهَا إِلَيَّ). فَـدَعَوْتُ بِقَصْعَتِي فَغَسَلْتُهَا، ثُمَّ أَجْفَفْتُهَا فَأَحَرْتُهَا إِلَيْـهِ، فَجَـاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنِصْفِ النَّهَارِ وَهِـيَ عَلَيْهِ.

واتـە: لـە ئـوم جەحـدەری عامریـەوە هاتووە، کـە سـەبارەت بـە خـوێنی بـۆ نوێژی لە عائیشەی ڕەزای خوای لێ بێ پرسیوە؟ ئەویش وتویـەتی: مـن لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا صـلی الله علیـە وسـلم بـووم پۆشـاکێکمان پێـوە بـوو عەبایەکیشمان دابـوو بەسـەر پۆشـاکەکەدا، کـاتێ کـە ڕۆژ بوویـەوە عەباکـەی هەڵگرت و لەبەری کرد، پاشان دەرچوو بۆ نوێـژی بـەیانی نوێـژی کـرد، ئینجـ دانیشت، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم! ئـەوە پەڵەیـە خوێنە بە پۆشاکەکەتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شوێنەکەی بـە دەست گرت و بە کۆ کراوەیـی دای بـە دەسـت غوڵامێکـەوەو، فـەرمووی: (ئەمـە بەرە بۆ عائیشە با بۆم بشوات و وشکی کاتەوە، پاشان بە تۆدا بۆم بنێرێتـەوە) جـا داوای (لەگـەنێ) تەشـتێکم کـردوو بـۆم شـت، پاشـان وشـکم کـردەوەو بـۆم ناردەوە، پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـە وسـلم لـە نیـوەڕۆدا هات و لەبەریـد بوو.

## باسی ئەگەر تف بەر پۆشاك بكەوێت.

## ١٤٣ – بَابُ الْبُصَاقِ يُصِيبُ الثَّوْبَ.

٣٨٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، قَالَ: بَزَقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَوْبِهِ وَحَكَّ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ.

واتە: لە (أَبِي نَضْرَة)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تفی داوە لە پۆشاکەکەی و بە بەشێکی بەشەکەی تری پرواندووە.

٣٩٠ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمِثْلِهِ.

واتە: ئەنەس بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

## سەرەتای کتێبی نوێژ.

## ٢ – أولُ كتابِ الصَّلاَةِ.

### باسی فەرزی نوێژ

### ١ – بَابُ فرض الصَّلاَةِ.

٣٩١ - (صحيح) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللّٰهِ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرَ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنْ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ). قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: (لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ). قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صِيَامَ شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: (لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ). قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

الصَّدَقَةَ، قَالَ: فَهَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: (لاَ، إلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ). فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ).

واتە: لە (طَلحَةَ)ی کوڕی (عُبَيْد اللّه)وە هاتووە، کە وتویەتی: پیاوێکی خەڵکی نەجد هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، قژی گژ و ئاڵۆسکاو بوو دەنگی دەبیستراو لێی تێ نەدەگەیشتی چی دەڵێ، هەتا نزیك بوویەوە، دەرکەوت کە دەربارەی ئیسلام پرسیار دەکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە وەڵامدا فەرمووی: (پێنج نوێژ لە شەو و رۆژێکدا). پیاوەکە وتی: جگە لەمانە هیچی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: (نەخێر، مەگەر نوێژی سوننەت بکەیت زیاد لە فەرزەکە). راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی رۆژووی مانگی رەمەزانی بۆ کرد. پیاوەکە وتی: جگە لەمە هیچی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: (نەخێر، مەگەر رۆژووی سوننەت بگریت زیاد لە فەرزەکە). راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی خێر و سەدەقەی بۆ کرد. پیاوەکە وتی: جگە لەمە هیچی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: (نەخێر، مەگەر خۆت خێر و سەدەقەی زیاتر بکەیت). پیاوەکە رووی وەرگێڕاو رۆشت لەبەر خۆیەوە دەیوت: سوێند بە خوا نە لێی زیاد دەکەم وە نە لێی کەم دەکەم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر راست بکات رزگاری بووە).

٣٩٢ - (شاذ بزيادة وأبيه) عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ نَافِعِ بْنِ مَالِكِ بْـنِ أَبِـي عَامِرٍ، بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: (أَفْلَحَ - وَأَبِيـهِ - إِنْ صَدَقَ، دَخَلَ الْجَنَّةَ - وَأَبِيهِ - إِنْ صَدَقَ)[١].

واتە: ئەبی سوهەیلی نافعی کوڕی مالکی کوڕی ئەبی عامر بە هەمان سەنەد ئـەم فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویەتی: (سوێند بێ ئەگەر راست بکات رزگاری بووە، سوێند بـێ دەچـێتە بەهەشتەوە ئەگەر راست بکات).

## باسی کاتەکانی نوێژ.

## ٢ - بَابُ فِي الْمَوَاقِيتِ.

٣٩٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّنِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ عِنْدَ الْبَيْـتِ مَرَّتَيْنِ: فَصَلَّى بِيَ الظُّهْرَ حِينَ زَالَتِ الشَّـمْسُ وَكَانَـتْ قَدْرَ الشِّرَاكِ، وَصَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّـهُ مِثْلَـهُ، وَصَلَّى بِيَ - يَعْنِي الْمَغْـرِبَ - حِـينَ أَفْطَـرَ الصَّـائِمُ،

[١] - (أَفْلَحَ وَأَبِيهِ) ئەم سوێندە زۆرجار بەزمانی عەرەبەکاندا دەهات بـۆ جـەختکردن(توکیـد)، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نـەهی لـێ کـرد، لەوانەیـە ئـەم روداوە پـێش نەهی لێ کردنەکە بێت یا هەر وەك عادەتی بە زمانیدا هاتبێت. (معالم السنن) پێشەوا (خطابي).

وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى بِيَ الْفَجْرَ حِينَ حَرُمَ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ عَلَى الصَّائِمِ، فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ صَلَّى بِيَ الظُّهْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّهُ مِثْلَهُ، وَصَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّهُ مِثْلَيْهِ، وَصَلَّى بِيَ الْمَغْرِبَ حِينَ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَصَلَّى بِيَ الْفَجْرَ فَأَسْفَرَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا وَقْتُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِكَ، وَالْوَقْتُ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت دوو رۆژ لەلای کەعبە ماڵی خوا بەرنوێژی نوێژەکانی بۆ کردم:

لە رۆژی یەکەمدا: بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم لەو کاتەی کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، کە سێبەر بە ئەندازەی قەیتانێ دەبوو، وە ئەو کاتە بەرنوێژی عەسری بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی بوو، وە ئەو کاتە بەرنوێژی شێوانی بۆ کردم کە رۆژووەوان رۆژوو دەشکێنێ و خۆر ئاوا دەبێ، وە ئەو کاتە بەرنوێژی عیشای بۆ کردم کە سورایی کەناری ئاسمان ون بوو، وە ئەو کاتە بەرنوێژی بەیانی بۆ کردم کە خواردن و خواردنەوە لەسەر رۆژووەوان یاساغ دەبێت و شەبەق دەدات.

بەڵام لە رۆژی دووهەمدا: ئەو کاتە بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی بوو، وە ئەو کاتە بەرنوێژی نوێژی عەسری بۆ کردم کە سێبەری هەموو شتێك دوو ئەوەندەی خۆی بوو، وە ئەو

کاتە بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ کردم کە ڕۆژووەوان ڕۆژوو دەشکێنێ و خۆر ئاوا دەبێ، وە ئەو کاتە بەرنوێژی نوێژی عیشای بۆ کردم کە سێیەکی شەو دەڕوات، وە ئەو کاتە بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردم کە سەرزەوی ڕووناك دەبێتەوەو کەناری ڕۆژهەلات زەرد هەلدەگەڕێت، پاشان جبریل ئاوڕی لێ دامەوەو فەرمووی: ئەی موحەممەد، ئەوەی ڕابورد کاتی نوێژی پێغەمبەرانی پێش تۆ بوو، کاتی نوێژی تۆیش لە نێوان ئەم دوو کاتەی ڕابردوودایە.

٣٩٤ - (حسن) عَنْ ابْنَ شِهَابٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَانَ قَاعِدًا عَلَى الْمِنْبَرِ فَأَخَّرَ الْعَصْرَ شَيْئًا، فَقَالَ لَهُ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَمَا إِنَّ جِبْرِيلَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَخْبَرَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَقْتِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَا تَقُولُ؟ فَقَالَ عُرْوَةُ: سَمِعْتُ بَشِيرَ بْنَ أَبِي مَسْعُودٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (نَزَلَ جِبْرِيلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَنِي بِوَقْتِ الصَّلاَةِ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ). يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ: خَمْسَ صَلَوَاتٍ فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ، وَرُبَّمَا أَخَّرَهَا حِينَ يَشْتَدُّ الْحَرُّ، وَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ

بَيْضَاءُ قَبْلَ أَنْ تَدْخُلَهَا الصُّفْرَةُ، فَيَنْصَرِفُ الرَّجُلُ مِنَ الصَّلاَةِ فَيَأْتِي ذَا الْحُلَيْفَةِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَيُصَلِّي الْمَغْرِبَ حِينَ تَسْقُطُ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّي الْعِشَاءَ حِينَ يَسْوَدُّ الأُفُقُ، وَرُبَّمَا أَخَّرَهَا حَتَّى يَجْتَمِعَ النَّاسُ، وَصَلَّى الصُّبْحَ مَرَّةً بِغَلَسٍ، ثُمَّ صَلَّى مَرَّةً أُخْرَى فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ كَانَتْ صَلاَتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ التَّغْلِيسَ حَتَّى مَاتَ، وَلَمْ يَعُدْ إِلَى أَنْ يُسْفِرَ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە هاتووە، کە جارێ عومەری کوڕی (عَبْدِ الْعَزِيزِ) لەسەر مینبەر دانیشتبوو، کەمێك نوێژی عەسری دواخست، عوروەی کوڕی زوبێر – ئینکاری کردوو - پێی وت: جیبریل هەواڵی کاتەکانی نوێژی داوە بە موحەممەد صلى الله عليه وسلم واتە کاتەکانی دیایکردووە بۆی - عومەر وتی: ئەوە تۆ دەڵێی چی.

عوروە وتی: بیستم لە بەشیری کوڕی ئەبی مەسعود دەیوت: لە (أَبَا مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيّ)م بیستووە دەیوت: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (جیبریل دابەزی و هەواڵی کاتەکانی نوێژی پێدام، نوێژم لەگەڵ کرد، پاشان نوێژم لەگەڵ کرد، پاشان نوێژم لەگەڵ کرد، پاشان نوێژم لەگەڵ کرد، پاشان نوێژم لەگەڵ کرد، بە پەنجەکانی پێنج فەرزەی نوێژی ژمارد، جا پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دی نوێژی نیوەڕۆی کرد کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، هەندێ جاریش دوای ئەخست ئەگەر گەرما زۆر بەتین بوایە، وە بینیم نوێژی عەسری کرد کاتێ کە خۆر سپی و روون و هێشتا بەرز بوو پێش زەردەپەڕ، کەسێك نوێژی عەسری دەکردو دەچوو بۆ (ذا

الْحُلَيْفَة) – شوێنێکە شەش یان حەوت میل لە مەدینەوە دوورە – دەگەیشتە ئەوێ پێش خۆرئاوا بوون، ئینجا نوێژی شێوانی کرد لە کاتی خۆرئاوا بووندا، پاشان نوێژی عیشای کرد کاتێ کە ئاسۆ رەش و تاریک بوو، هەندێ جاریش دوای دەخست هەتا خەڵك کۆدەبوونەوە، جارێ بە تاریکی نوێژی بەیانی کرد، پاشان جارێکی تر دنیا رووناك بوو نوێژی بەیانی کرد، پاشان لەدوای ئەو نوێژەوە ئیتر نەگەڕایەوە سەری و هەر بە تاریکی نوێژی بەیانی دەکرد هەتا وەفاتی کرد.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ الزُّهْرِيِّ: مَعْمَرٌ، وَمَالِكٌ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، وَشُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، وَاللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، وَغَيْرُهُمْ، لَمْ يَذْكُرُوا الْوَقْتَ الَّذِي صَلَّى فِيهِ وَلَمْ يُفَسِّرُوهُ. وَكَذَلِكَ أَيْضًا رَوَاهُ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، وَحَبِيبُ بْنُ أَبِي مَرْزُوقٍ، عَنْ عُرْوَةَ نَحْوَ رِوَايَةِ مَعْمَرٍ وَأَصْحَابِهِ، إِلاَّ أَنَّ حَبِيبًا لَمْ يَذْكُرْ بَشِيرًا.**

واتە: ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە زوهریەوە: مەعمەر و، مالیك و، ئیبنو عویەینەو، شوعەیبی کوڕی حەمزەو، (لَّیْث)ی کوڕی سەعد و، جگە لەوانیش، بەڵام باسی ئەو کاتەیان نەکرد کە نوێژی تێدا دەکرد. هەروەها هیشامی کوڕی عوروەو، حەبیبی کوڕی ئەبو مەرزوق، لە عوروە گێڕاویانەتەوە، وەك ریواتەکەی مەعمەر و هاوەڵەکانی، بەڵام حەبیب باسی بەشیری نەکرد.

(صحيح) عَنْ جَابِرٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقْتَ الْمَغْرِبِ قَالَ: ثُمَّ جَاءَهُ لِلْمَغْرِبِ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ - يَعْنِي: مِنَ الْغَدِ - وَقْتًا وَاحِدًا.

واتە: لە جابرەوە هاتووە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی نوێژی شێوان فەرمووی: (پاشان هاتەوە بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ کردم لە کاتی خۆر ئاوا بووندا — واتە: دووەم ڕۆژ — لە هەمان کاتدا).

(حسن) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ثُمَّ صَلَّى بِيَ الْمَغْرِبَ — يَعْنِي: مِنَ الْغَدِ - وَقْتًا وَاحِدًا[1].

ئەبو داود دەڵێت: هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (پاشان دووەم ڕۆژ هاتەوەو لە هەمان کاتدا بەرنوێژی نوێژی شێوانی بۆ کردم).

٣٩٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ سَائِلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ﴿عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلاَةِ﴾ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، حَتَّى أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ لِلْفَجْرِ حِينَ انْشَقَّ الْفَجْرُ، فَصَلَّى حِينَ كَانَ الرَّجُلُ لاَ يَعْرِفُ وَجْهَ صَاحِبِهِ - أَوْ إِنَّ الرَّجُلَ لاَ يَعْرِفُ مَنْ إِلَى جَنْبِهِ - ، ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ

[1]- (حسن) وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، مِنْ حَدِيثِ حَسَّانَ بْنِ عَطِيَّةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

الظُّهْرَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، حَتَّى قَالَ الْقَائِلُ: انْتَصَفَ النَّهَارُ - وَهُوَ أَعْلَمُ - ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ مُرْتَفِعَةٌ، وَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ: صَلَّى الْفَجْرَ وَانْصَرَفَ فَقُلْنَا: أَطَلَعَتِ الشَّمْسُ؟ فَأَقَامَ الظُّهْرَ فِي وَقْتِ الْعَصْرِ الَّذِي كَانَ قَبْلَهُ، وَصَلَّى الْعَصْرَ وَقَدِ اصْفَرَّتِ الشَّمْسُ - أَوْ قَالَ: أَمْسَى - وَصَلَّى الْمَغْرِبَ قَبْلَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قَالَ: (أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ؟ الْوَقْتُ فِيمَا بَيْنَ هَذَيْنِ).

واتە: لە ئەبی موساوە هاتووە، کە پرسیارکەرێ – سەبارەت بە کاتەکانی نوێژ - لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ئەویش وەڵامی نەدایەوە هەتا لەکاتی بەرەبەیاندا فەرمانی کرد بە بیلال کە قامەت بکات بۆ نوێژی بەیانی، نوێژی بەیانی کرد لە کاتێکدا کە کەس بە روخساردا هاورێکەی نەدەناسیەوە، یان پیاو نەیدەزانی کێ لە تەنیشتیەوەیەتی واتە ئەوەندە تاریک بوو- ، پاشان فەرمانی کرد بە بیلال قامەت بکات بۆ نوێژی نیوەڕۆ کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا هەتا کەسێك دەیوت رۆژ نیوە بووە، ئینجا فەرمانی کرد بە بیلال کە قامەت بکات بۆ نوێژی عەسر لە کاتێکدا کە خۆر روون و بەتین و بەرز بوو، پاشان فەرمانی کرد بە بیلال کە قامەت بکات بۆ

نوێژی شێوان كاتێ كە خۆر ئاوا بوو، ئینجا فەرمانی كرد بە بیلال كە قامەت بكات بۆ نوێژی عیشا كاتێ كە روناكیە سورەكەی كەناری رۆژئاوا ون بوو.

بۆ رۆژی دواتر: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانی كرد كاتێ كە لێ بوویەوە وتمان: ئایا خۆر هەڵنەهاتووە؟ ئینجا - فەرمانی كرد بە بیلال- قامەتی كرد بۆ نوێژی نیوەڕۆ لە كاتی عەسری رۆژی پێشودا، پاشان قامەتی كرد بۆ نوێژی عەسر لە كاتێكدا كە خۆر زەرد بوو — یان وتی ئێوارە هات - ، ئینجا نوێژی شێوانی كرد پێش ئەوەی روناكیە سورەكە ون بێت، پاشان نوێژی عیشای كرد هەتا سێیەكی شەو، ئینجا فەرمووی: (كوا ئەو كەسەی كە سەبارەت بە كاتەكانی نوێژ پرسیاری كرد؟ لە نێوان ئەم دوو كاتانەدا كاتی پێنج فەرزەی نوێژەكانە).

قَالَ أَبو دَاوُدَ: عَنْ جَابِرٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَغْرِبِ، بِنَحْوِ هَذَا، قَالَ: ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ، قَالَ بَعْضُهُمْ: إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِلَى شَطْرِهِ. وَكَذَلِكَ رَوَاهُ ابْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

ئەبو داود دەڵێت: لە جابرەوە هاتووە، بۆ نوێژی شێوان بە هەمان شێوە، فەرمووی: پاشان نوێژی عیشای كرد، هەندێكیان وتیان: سێیەكی شەو، وە هەندێكی تریان وتیان: نیوەی شەو. هەروەها بەو شێوەیەش ئیبنو بورەیدە لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

٣٩٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عَمْرٍو، عَـنْ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَـالَ: (وَقْـتُ الظُّهْـرِ مَـا لَـمْ تَحْضُـرِ الْعَصْرُ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْـفَرَّ الشَّـمْسُ، وَوَقْـتُ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَسْقُطْ فَوْرُ الشَّفَقِ، وَوَقْتُ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْـفِ اللَّيْـلِ، وَوَقْـتُ صَـلاَةِ الْفَجْـرِ مَـا لَـمْ تَطْلُـع الشَّمْسُ).

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەمرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کاتی نوێژی نیوەڕۆ هەتا کاتی نوێژی عەسر نەیەت، وە کاتی عەسر هەتا خۆر زەرد هەڵنەگەڕێت، وە کاتی نوێژی شێوان هەتا ڕووناکیە سورەکەی کەناری ئاسمان بمێنێ و ون نەبێت، وە کاتی عیشا هەتا نیوە شەوە، وە کاتی بەیانیش هەتا خۆر هەڵنەیەت).

## باسی کاتی نوێژەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و چۆنیەتی نوێژکردنی؟

## ٣ - بَابُ فِي وَقْتِ صَلَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَيْفَ كَانَ يُصَلِّيهَا؟

**٣٩٧ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو - وَهُوَ ابْنُ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ - قَالَ: سَأَلْنَا جَابِرًا عَنْ وَقْتِ صَلَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَالْعِشَاءَ: إِذَا كَثُرَ النَّاسُ عَجَّلَ، وَإِذَا قَلُّوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ بِغَلَسٍ.**

واته: له موحەممەدی کوڕی عەمرەوه – کە کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ە - هاتووه، کە وتویەتی: لە جابرمان پرسی دەربارەی کاتی نوێژکردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم؟ ئەویش وتی: له گەرمای نیوەڕۆدا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، کە نوێژی عەسری دەکرد هێشتا خۆر بە گوڕ بوو، کە خۆر ئاوا دەبوو نوێژی شێوانی دەکرد، وه نوێژی عیشاش: ئەگەر نوێژخوێنان

زۆر بوونایە زوو دەیکرد، بەڵام ئەگەر کەم بوونایە درەنگ دەیکرد و دوای دەخست، بە تاریکیش نوێژی بەیانی دەکرد.

٣٩٨ - (صحيح) عَنْ أَبِى بَرْزَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى الظُّهْرَ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّى الْعَصْرَ وَإِنَّ أَحَدَنَا لَيَذْهَبُ إِلَى أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَيَرْجِعُ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، وَنَسِيتُ الْمَغْرِبَ، وَكَانَ لاَ يُبَالِى تَأْخِيرَ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ. قَالَ: وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا، وَكَانَ يُصَلِّى الصُّبْحَ وَمَا يَعْرِفُ أَحَدُنَا جَلِيسَهُ الَّذِى كَانَ يَعْرِفُهُ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِيهَا مِنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ.

واتە: لە ئەبو بەرزەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆی کرد کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان ترازا، وە نوێژی عەسری کرد کە ئەگەر یەکێ لە ئێمە بڕۆشتایە بۆ ئەوپەڕی مەدینەو بگەڕایەتەوە هێشتا خۆر بەگوڕ بوو، وە نوێژی شێوانم لەبیر نەماوە، وە نوێژی عیشا دەربەست نەبوو ئەگەر دوا بکەوتایە بۆ سێیەکی شەو. راوی وتی: پاشان ئەبو بەرزە وتی: بۆ نیوەی شەویش. راوی وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خەوتنی پێش نوێژی عیشای پێ ناخۆش بوو، هەروەها قسەکردنی دوای نوێژی عیشاشی پێ ناخۆش بوو، وە کاتێ نوێژی بەیانی دەکرد کە هەر یەکێ لە ئێمە هاونشینی خۆی نەدەناسیەوە، وە لە شەست ئایەتەوە بۆ سەد ئایەتی تێدا دەخوێند.

## باسی سەبارەت بە کاتی نوێژی نیوەڕۆ

## ٤ – بَابُ فِي وَقْتِ صَلاَةِ الظُّهْرِ.

٣٩٩ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدُ اللَّه، قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّى الظُّهْرَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَآخُذُ قَبْضَةً مِنَ الْحَصَى لِتَبْرُدَ فِى كَفِّي، أَضَعُهَا لِجَبْهَتِى أَسْجُدُ عَلَيْهَا لِشِدَّةِ الْحَرِّ.

واتە: لە جابری کوڕی (عبداللە)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆم کرد، لەتاو گەرما مشتێ وردە بەردی هەڵگرت بۆ ئەوەی لەناو مشتیدا فێنك بێتەوە لە جێگە سەجدەکەیدا دایناو سەجدەی لەسەر برد.

٤٠٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ، قَالَ: كَانَتْ قَدْرُ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى الصَّيْفِ ثَلاَثَةَ أَقْدَامٍ إِلَى خَمْسَةِ أَقْدَامٍ، وَفِى الشِّتَاءِ خَمْسَةَ أَقْدَامٍ إِلَى سَبْعَةِ أَقْدَامٍ.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعودەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە هاویندا ئەوکاتە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کە سێبەر

لە سێ پێوە تا پێنج پێ دەبوو، وە لە زستاندا ئەوكاتە نوێژی نیوەڕۆی دەكرد كە سێبەر لە پێنج پێوە تا حەوت پێ دەبوو.

٤٠١ - (صحيح) عَنْ أَبَا ذَرّ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُؤَذِّنَ الظُّهْرَ، فَقَالَ: (أَبْرِدْ). ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِّنَ، فَقَالَ: (أَبْرِدْ). مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاَةِ).

واتە: لە (أَبَا ذَرّ)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە سەفەرێكدا لە خزمەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووین، بانگبێژ ویستی بانگی نیوەڕۆ بدات، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ساردی كەرەوە). دیسان ویستی بانگ بدات، پێی فەرموو: (ساردی كەرەوە). دووجار تا سێ جار بەو شێوەیە هەتا سێبەری تەپۆڵكەكانمان بینی، پاشان فەرمووی: (بەڕاستی گەرمای توند هەناسەی دۆزەخە، هەركاتێ گەرما زۆر توند بوو بە نوێژەكانتان ساردی بكەنەوە). - واتە نوێژەكانتان دوا بخەن هەتا گەرما نامێنێ - .

٤٠٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنْ الصَّلاَةِ). - قَالَ ابْنُ مَوْهَبٍ: بِالصَّلاَةِ - فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکاتێ گەرما زۆر توند بوو بە نوێژەکانتان ساردی بکەنەوە). - ئیبنو مەوهەب دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: بە نوێژ - چونکە بەڕاستی گەرمای توند هەناسەی دۆزەخە.

٤٠٣ - (حسن صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ بِلاَلاً كَانَ يُؤَذِّنُ الظُّهْرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیلال کاتێ بانگی نیوەڕۆی دەدا کە خۆر لە ناوەندی ئاسمان دەترازا.

## باسی سەبارەت بە کاتی نوێژی عەسر

## ٥ - بَابُ فِي وَقْتِ صَلاَةِ الْعَصْرِ.

٤٠٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، وَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی عەسری دەکرد کە هێشتا خۆر بەرز و بەتین و بە شەوق بوو،

ڕێبوارێـك دەچـوو بـۆ عـەوالی - چـەند گونـدێك بـوون لـە دەوری مەدینـە - دەگەیشتە ئەویّ کە هێشتا هەر خۆر بەرز بوو.

٤٠٥ - (صحيح مقطوع) عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: وَالْعَوَالِي عَلَى مِيلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ، قَالَ: وَأَحْسَبُهُ قَالَ: أَوْ أَرْبَعَةٍ.

واتە: لە زوهریەوە هاتووە، کە وتویەتی: عەوالی دوو تا سێ میل دوربـوو لـە مەدینەوە. وتی: وا دەزانم وتی: یان چوار میل.

٤٠٦ - (صحيح مقطوع) عَنْ خَيْثَمَةَ، قَالَ: حَيَاتُهَا: أَنْ تَجِدَ حَرَّهَا.

واتە: لـە(خَيْثَمَـة)ەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: ژیـانی: واتـە خـۆر گـوڕ و تینـی مابێت.

٤٠٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِهَا، قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی عەسری دەکـرد پـێش ئـەوەی تیشکی خـۆر لـە ژوورەکەیدا بەرزبێتەوە.

٤٠٨ - (ضعيف) عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ، قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ فَكَانَ يُؤَخِّرُ الْعَصْرَ مَـا دَامَتِ الشَّمْسُ بَيْضَاءَ نَقِيَّةً.

واتە: لە عەلی کوڕی شەیبانەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە مەدینە چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، نوێژی عەسری دوادەخست مادام خۆر سپی و روون بوایە.

٤٠٩ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: (حَبَسُونَا عَنْ صَلاَةِ الْوُسْطَى: صَلاَةِ الْعَصْرِ، مَلأَ اللَّـهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رۆژی غەزای (خەندەق) فەرمووی: (رێگەی نوێژی ناوەڕاستیان لێ گرتین: نوێژی عەسر، خوای گەورە ماڵ و گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر).

٤١٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي يُونُسَ مَوْلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّـهُ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفًا، وَقَالَـتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَـذِهِ الآيَـةَ فَـآذِنِّي (حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ

وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ) فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَصَلاَةِ الْعَصْرِ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ، ثُمَّ قَالَتْ عَائِشَةُ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبی یونس نۆكەر(مَوْلَى)ی عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: خاتوو عائیشە فەرمانی پێ كردم كە قورئان(مُصْحَف)ێكی بۆ بنوسمەوە وتیشی: هەر كاتێ گەیشتیتە ئەم ئایەتە: (حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ). ﴿البقرة:٢٣٨﴾[1]. ئاگادارم بكەرەوە، كاتێ كە گەیشتمە ئایەتەكە ئاگادارم كردەوە، خاتوو عائیشە ئایەتەكەی بۆ خوێندمەوە: (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَصَلاَةِ الْعَصْرِ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ)[2]. پاشان وتی: بەم شێوەیە لە پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بیستووە[3].

٤١١ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي صَلاَةً أَشَدَّ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

---

[1]- واتە: ئاگاداری نوێژەكانتان بكەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەراست.

[2]- واتە: ئاگاداری نوێژەكانتان بكەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەراست نوێژی عەسر، لە نوێژدابوەستن بۆ خوا بە گەردنكەچی.

[3]- خاتوو عائیشە (وَصَلاَةِ الْعَصْر)ی بۆ زیاد كرد، بەلاّم ئەمە خوێندنەوەیەكی دەگمەنە(القراءة شاذة)و (متواتر) نیە ئەوەی لە (مُصْحَف)دا چەسپاوە ئەمەیە: (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ).

وَسَلَّمَ مِنْهَا، فَنَزَلَتْ: (حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ). وَقَالَ: (إِنَّ قَبْلَهَا صَلاَتَيْنِ وَبَعْدَهَا صَلاَتَيْنِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە کاتی گەرمای نیوەڕۆدا نوێژی نیوەڕۆی کرد، هیچ نوێژێ وەك ئەو نوێژە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم قورس و گران نەبوو – چونکە لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا بوو - ، ئەم ئایەتە دابەزی: (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى). البقرة: ٢٣٨ . جا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (دوو نوێژ لە پێشیەوەیەتی و دوو نوێژیش لە دوایەوەیەتی).

٤١٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْفَجْرِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس فریای رکاتێك لە نوێژی عەسر بکەوێت پێش ئاوابوونی خۆر ئەوە گەیشتووە بە نوێژی عەسردا، وە ئەوەی فریای رکاتێك لە نوێژی بەیانی بکەوێت پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت ئەوە گەیشتووە بە نوێژی بەیانیدا).

٤١٣ - (صحيح) عَنْ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَقَامَ يُصَلِّي الْعَصْرَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ ذَكَرْنَا تَعْجِيلَ الصَّلاَةِ، - أَوْ: ذَكَرَهَا - فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، يَجْلِسُ أَحَدُهُمْ حَتَّى إِذَا اصْفَرَّتِ الشَّمْسُ فَكَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ - أَوْ: عَلَى قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ - قَامَ فَنَقَرَ أَرْبَعًا، لاَ يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً).

واتە: لە (الْعَلاَءِ)ی کوڕی (عَبْد الرَّحْمَن)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە دوای نوێژی نیوەڕۆ چوین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك لە یەکەم کاتی خۆیدا هەستا نوێژی عەسری کرد، کاتێ کە لە نوێژ بوویەوە، وتمان زوو نوێژت کرد، - یان: ئەنەس باسی نوێژکردنی لە یەکەم کاتی خۆیدا وەبیرهێنایەوەو - وتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بووم کە سەبارەت بەدواخستنی نوێژی عەسر بۆ کاتی نزیك بوونەوە لە ئاوابوونی خۆر دەیفەرموو: (ئەوە نوێژی مونافیقەکانە، ئەوە نوێژی مونافیقەکانە، ئەوە نوێژی مونافیقەکانە، یەکێ لەوان دادەنیشێ هەتا کاتی زەردەپەڕ و نزیك بوونەوە لە ئاوابوونی خۆر لە نێوان دوو شاخەکەی شەیتانەوە، ئەو کاتە هەڵئەسێ چوار دەنووك بەزەویدا دەدات واتە ئەوەندە بە پەلە نوێژەکەی دەکات، یادی خودای تێدا ناکات مەگەر کەمێك نەبێت).

٤١٤ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیّ بیّ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەركەسێك نوێژی عەسر نەكات و بیفەوتێنیّ، وەك ئەوە وایە هەرچی سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵ و كەس و كاری هەیە لەدەستی بدات.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: (أُتِرَ). وَاخْتُلِفَ عَلَى أَيُّوبَ فِيهِ، وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: عَنْ سَالِمٍ ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (وُتِرَ).

ئەبو داود دەڵێت: (عُبَيْدُ اللَّهِ) كوڕی عومەر وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (أُتِرَ) لە جیاتی (وُتِرَ). ئەمەش ریوایەتێكی جیاوازە لەوەی ئەیوب، بەڵام زوهری لە سالمەوە، لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (وُتِرَ).

٤١٥ - (صحيح) عَنْ الْوَلِيدِ ، قَالَ: قَالَ أَبُو عَمْرٍو - يَعْنِي الأَوْزَاعِيَّ - وَذَلِكَ أَنْ تَرَى مَا عَلَى الأَرْضِ مِنَ الشَّمْسِ صَفْرَاءَ.

واتە: لە وەلیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو عەمر - واتە ئەوزاعی - وتویەتی: فەوتاندنی نوێژی عەسر، واتە ئەو کاتە نوێژ بکرێت کە خۆر زەرد دەبێت و بەهۆیەوە هەرچی لەسەر زەویدایە زەرد ببێت.

## باسی سەبارەت بە کاتی نوێژی شێوان

## ٦ - بَابُ فِي وَقْتِ الْمَغْرِبِ

٤١٦ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ نَرْمِي فَيَرَى أَحَدُنَا مَوْضِعَ نَبْلِهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم نوێژی شێوانمان دەکرد، کاتێ کە لە نوێژ دەبووینەوە رەمیمان دەکرد هەر یەکێ لە ئێمە جێگەی تیرەکەی خۆی دەبینی کە بەرکوێ کەوتووە - واتە ئەوەندە رووناك بوو، وە مەبەست ئەوەیە لە یەکەم کاتی خۆیدا نوێژیان دەکرد - .

٤١٧ - (صحيح) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ سَاعَةَ تَغْرُبُ الشَّمْسُ إِذَا غَابَ حَاجِبُهَا.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە کاتی خۆر ئاوا بووندا نوێژی شێوانی دەکرد، واتە کاتێ کە نووکی خۆر ئاوا دەبوو.

٤١٨ - (حسن صحيح) عَنْ مَرْثَدِ بْنِ عَبْدُ اللَّه، قَالَ: ﴿لَمَّا﴾ قَدِمَ عَلَيْنَا أَبُو أَيُّوبَ غَازِيًا - وَعُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ يَوْمَئِذٍ عَلَى مِصْرَ - ، فَأَخَّرَ الْمَغْرِبَ، فَقَامَ إِلَيْهِ أَبُو أَيُّوبَ فَقَالَ ﴿لَهُ﴾ مَا هَذِهِ الصَّلاَةُ يَا عُقْبَةُ؟! فَقَالَ: شُغِلْنَا، قَالَ: أَمَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ - أَوْ قَالَ: عَلَى الْفِطْرَةِ - مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ إِلَى أَنْ تَشْتَبِكَ النُّجُومُ؟!).

واتە: لە (مَرْثَدِ)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەبو ئەیوب لە غەزا گەڕایەوە هات بۆ لامان لە میسر - لەو کاتەدا عوقبەی کوڕی عامیر ئەمیر و کاربەدەستی میسر بوو، نوێژی شێوانی دواخست، ئەبو ئەیوب ئینکاری کردو هەستایەوەو پێی وت: ئەی عوقبە ئەم نوێژە چییە؟! عوقبە وتی: سەرقاڵ بووین بۆیە نەمان توانی لە یەکەم کاتی خۆیدا بیکەین، ئەبو ئەیوب وتی: مەگەر نەتبیستووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەردەوام ئوممەتی من لەسەر خێر و چاکەن – یان فەرمووی: لەسەر سوننەتن - هەتا نوێژی شێوان دوانەخەن بۆ ئەو کاتەی کە ئەستێرەکان هەموویان هەڵدێن و دەچن بەناو یەکدا). - واتە هەتا دنیا تاریک نەبێت -.

## باسی سەبارەت بە کاتی نوێژی عیشا

## ٧ - بَابُ فِي وَقْتِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ.

٤١٩ - (صحيح) عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِوَقْتِ هَذِهِ الصَّلاَةِ: صَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّيهَا لِسُقُوطِ الْقَمَرِ لِثَالِثَةٍ.

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: من زاناترین کەسم بە کاتی ئەم نوێژە: نوێژی عیشا، لە سێهەم شەوی سەرەتای مانگەوە کەی مانگ ئاوابوایە ئەوکاتە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی عیشای دەکرد.

٤٢٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: مَكَثْنَا ذَاتَ لَيْلَةٍ نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِصَلاَةِ الْعِشَاءِ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا حِينَ ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، أَوْ بَعْدَهُ، فَلاَ نَدْرِي أَشَيْءٌ شَغَلَهُ أَمْ غَيْرُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ حِينَ خَرَجَ: (أَتَنْتَظِرُونَ هَذِهِ الصَّلاَةَ لَوْلاَ أَنْ تَثْقُلَ عَلَى أُمَّتِي لَصَلَّيْتُ بِهِمْ هَذِهِ السَّاعَةَ). ثُمَّ أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ فَأَقَامَ الصَّلاَةَ.

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: شەوێكیان لە مزگەوتدا چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان صلی الله علیە وسلم دەكرد بۆ ئەوەی بێت بەرنوێژی عیشامان بۆ بكات، كاتێ كە سێیەكی شەو تێپەڕی، یان دوای سێیەكی شەو، لە ژوورەكەی هاتە دەرەوە بۆ لامان، ئیتر نازانم شتێ سەرقاڵی كرد یان هەر خۆی دەیویست دوای بخات؟ كاتێ كە دەرچوو فەرمووی: (ئایا چاوەڕێی ئەم نوێژە دەكەن؟ ئەگەر قورس گران نەبوایە لەسەر ئوممەتم هەمیشە لەم كاتەدا نوێژی عیشام پێ دەكردن). پاشان فەرمانی كرد بە بانگبێژ قامەتی كرد بۆ نوێژ.

٤٢١ - (صحيح) عَنْ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، قَالَ: أَبْقَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلاَةِ الْعَتَمَةِ، فَأَخَّرَ حَتَّى ظَنَّ الظَّانُّ أَنَّهُ لَيْسَ بِخَارِجٍ، وَالْقَائِلُ مِنَّا يَقُولُ: صَلَّى، فَإِنَّا لَكَذَلِكَ حَتَّى خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا لَهُ كَمَا قَالُوا، فَقَالَ ﴿لَهُمْ﴾: (أَعْتِمُوا بِهَذِهِ الصَّلاَةِ، فَإِنَّكُمْ قَدْ فُضِّلْتُمْ بِهَا عَلَى سَائِرِ الأُمَمِ، وَلَمْ تُصَلِّهَا أُمَّةٌ قَبْلَكُمْ).

واتە: لە (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەلەوە هاتووە، كە وتویەتی: چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان صلی الله علیە وسلم دەكرد بۆ ئەوەی بێت و بەرنوێژی نوێژی عیشامان بۆ بكات، ئەوەندە دواكەوت هەتا گومان بەر پێی وابوو كە ئیتر نایەتەدەرەوە بۆ مزگەوت، یەكێ لە ئێمە دەیوت: نوێژی عیشای كردووە، لەسەر ئەو حاڵەتە ماینەوە هەتا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هاتەدەرەوە بۆ لامان، ئەوەی كە وتیان بۆیان گێڕایەوە، ئەویش پێی فەرموون: (ئەم نوێژە

دوابخەن و لەتاريكيدا ئەنجامی بدەن، چونكە ئێوە بەم نوێژە فەزڵتان دراوە بەسەر گەل و نەتەوەكانی تردا، هيچ كام لە گەل و نەتەوەكانی پێش ئێوە ئەم نوێژەيان بەم شێوەيە نەكردووە).

٤٢٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْعَتَمَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ حَتَّى مَضَى نَحْوٌ مِنْ شَطْرِ اللَّيْلِ، فَقَالَ: (خُذُوا مَقَاعِدَكُمْ). فَأَخَذْنَا مَقَاعِدَنَا، فَقَالَ: (إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَأَخَذُوا مَضَاجِعَهُمْ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلاَةَ، وَلَوْلاَ ضَعْفُ الضَّعِيفِ وَسَقَمُ السَّقِيمِ لأَخَّرْتُ هَذِهِ الصَّلاَةَ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ).

واتە: لە ئەبو سەعيدی خودريەوە هاتووە، كە وتويەتی: جارێ ويستمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله عليه وسلم نوێژی عيشا بە كۆمەڵ بكەين، ئەويش لە ژوورەكەی نەهاتەدەرەو بۆ مزگەوت هەتا نزيكەی نيوە شەو- واتە هەتا دواكاتی نوێژی عيشا – جا هاتەدەرەوە، فەرمووی: (شوێنی خۆتان بگرن - واتە ريزببن بۆ نوێژ- ). ئێمەش شوێنی خۆمانمان گرت، فەرمووی: (خەڵكانی جگە لە ئێوە نوێژی عيشايان كردو خەوتن، ئێوەش لەوكاتەوە كە چاوەڕوانن بۆ ئەوەی نوێژی عيشا بە كۆمەڵ بكەن، هەر لە نوێژدان - واتە وەك ئەوە وايە لەو كاتەوە نوێژتان كردبێت-، ئەگەر لەبەر لاوازی لاوازەكان و نەخۆشی نەخۆشەكان نەبوايە ئەم نوێژەم دوادەخست بۆ نيوە شەو).

# باسی سەبارەت بە کاتی نوێژی بەیانی

## ٨ – بَابُ فِي وَقْتِ الصُّبْحِ.

٤٢٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها ، أَنَّهَا قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُصَلِّي الصُّبْحَ فَيَنْصَرِفُ النِّسَاءُ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ مَا يُعْرَفْنَ مِنَ الْغَلَسِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانی دەکرد، لەدوای نوێژ ئافرەتان چارۆکەو شاڵینەکانیان دەپێچا لە خۆیانەوەو دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەبەر تاریکی کەس نەیدەناسینەوە. واتە کەس نەیدەزانی کە ئایا پیاون یان ئافرەتن.

٤٢٤ - (حسن صحيح) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَصْبِحُوا بِالصُّبْحِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لأُجُورِكُمْ). أَوْ: (أَعْظَمُ لِلأَجْرِ).

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی بەیانی بکەن لە کاتی دەرکەوتنی بەرەبەیاندا، چونکە ئەوە پاداشتەکەی گەورەترە بۆتان) یان (پاداشتەکەی گەورەترە).

# باسی پارێزگاری لەکاتی نوێژەکان

## ٩ - بَابُ ﴿الْمُحَافَظَةِ عَلَى الصَّلَوَاتِ﴾.

**٤٢٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ الصُّنَابِحِيِّ، قَالَ: زَعَمَ أَبُو مُحَمَّدٍ أَنَّ الْوِتْرَ وَاجِبٌ، فَقَالَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ: كَذَبَ أَبُو مُحَمَّدٍ، أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (خَمْسُ صَلَوَاتٍ افْتَرَضَهُنَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، مَنْ أَحْسَنَ وُضُوءَهُنَّ، وَصَلاَّهُنَّ لِوَقْتِهِنَّ، وَأَتَمَّ رُكُوعَهُنَّ، وَخُشُوعَهُنَّ، كَانَ لَهُ عَلَى اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ، وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ، فَلَيْسَ لَهُ عَلَى اللَّهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ، وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی (الصُنابحیَ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو موحەممەد پێی وابوو کە نوێژی تاك (وتر) واجبە، عوبادەی (صَّامِت) وتی: ئەبو موحەممەد هەڵەی کردووەو، شایەتی دەدەم کە من بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (ئەو پێنج نوێژەی کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەرتان، هەرکەسێ بەچاکی و بە رێکوپێکی دەستنوێژ بگرێ، لەکاتی خویدا بەخشوعەوە نوێژەکانی بکات، سەجدەکانیان و رکوعەکانیان بەتەواوی ئەنجام بدات، ئەو کەسە خوای گەورە پەیمانی داوە لێی خۆش ببێ، بەڵام ئەگەر وای نەکرد ئەوا هیچ بەڵێنێك لە نێوان خوای گەورە و ئەودا نیە، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، وە یان سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەسێنێ).

٤٢٦ - (صحيح) عَنْ أُمِّ فَرْوَةَ ، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا)[1].

واته: له (أُمِّ فَرْوَة)وه هاتووه، كه وتويەتی: لە پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم پرسی کە چ کردەوەیە خێرو گەورەیە لەلای خوا؟ ئەویش فەرمووی: (نوێژکردن لە یەکەم کاتی خۆیدا).

٤٢٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ فَضَالَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ فِيمَا عَلَّمَنِي: (وَحَافِظْ عَلَى الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ). قَالَ قُلْتُ: إِنَّ هَذِهِ سَاعَاتٌ لِي فِيهَا أَشْغَالٌ، فَمُرْنِي بِأَمْرٍ جَامِعٍ إِذَا أَنَا فَعَلْتُهُ أَجْزَأَ عَنِّي، فَقَالَ: (حَافِظْ عَلَى الْعَصْرَيْنِ). - وَمَا كَانَتْ مِنْ لُغَتِنَا - فَقُلْتُ وَمَا الْعَصْرَانِ؟ فَقَالَ: (صَلاَةٌ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَصَلاَةٌ قَبْلَ غُرُوبِهَا).

واته: له (عبدالله)ی کوڕی (فَضَالَة)ەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کارەکانی ئیسلام و ئەحکامەکانی فێری

---

[1] - قَالَ الْخُزَاعِيُّ فِي حَدِيثِهِ عَنْ عَمَّةٍ لَهُ يُقَالُ لَهَا أُمُّ فَرْوَةَ قَدْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ سُئِلَ.

دەكـردم، بێگومـان یـەكێ لەوانـەی كـە فێـری دەكـردم بریتـی بـوو لـەوەی كـە فەرمانی پێ كردم: (پارێزگاری لە پێنج فەرزەی نوێـژ بكـە - واتـە بەردەوامبـە لەسەریان و لە یەكەم كاتی خۆیاندا بە جەماعەت بیانكە -). (فَضَالَة) وتـی: وتم لەم كاتانەدا زۆر سەرقاڵم بە ئیش و كاری دنیـاوە، بۆیـە شـتێكم فێـر بكـە كـە خێـر و پاداشـتەكەی ئەوەنـدە زۆر بێـت بیكـەم و بەسـم بێـت، فـەرمووی: (پارێزگاری لە دوو عەسرەكە بكە). ئەمەش لە زمانی ئێمەدا نـەبوو بۆیـە وتم: ئـەو دوو عەسـرە كامانـەن؟ فـەرمووی: (نوێـژكردن لـە پـێش خۆركـەوتن و لـە پێش خۆرئاوا بووندا – واتە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر - ).

٤٢٨ - (صحيح) عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَـالَ: سَـأَلَهُ رَجُـلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ صَـلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّـمْسِ، وَقَبْـلَ أَنْ تَغْـرُبَ). قَـالَ: أَنْـتَ سَمِعْتَهُ مِنْهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. كُـلَّ ذَلِـكَ يَقُـولُ سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي. فَقَالَ الرَّجُلُ: وَأَنَـا سَـمِعْتُهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ذَلِكَ.

واتـە: لـە عومـارەی كـوڕی (رُؤَيْبَـة)ەوە، لـە باوكیـەوە هـاتووە، كـە وتویـەتی: پیـاوێكی خـەڵكی بەسـرە پرسـیاری كـرد لـە عومـارەو پێـی وت: چـیت لـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیستووە بۆم باس بكە؟ عومـارەیش وتـی:

لە پێغەمبەری خودام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (ئاگری دۆزەخ کەسێ ناسوتێنێت کە پێش خۆرکەوتن و پێش خۆرئاوا بوون نوێژ بکات). - واتە نوێژی بەیانی و عەسر، بۆیە ئەم دوو کاتەی تایبەت کردووە چونکە کاتی نوێژی بەیانی کاتی خەوتنەو، عەسریش کاتی بازرگانی و کاسبیە - . سێ جار وتی: تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بیستووە؟ عومارە وتی: بەڵێ، بە گوێی خۆم بیستم و بە دڵیش لەبەرم کرد، پیاوێکیش وتی: منیش بیستم لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە ئەمەی فەرموو.

**٤٢٩ - (حسن) عَنْ أَبَا قَتَادَةَ بْنَ رِبْعِيّ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنِّي فَرَضْتُ عَلَى أُمَّتِكَ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، وَعَهِدْتُ عِنْدِي عَهْدًا: أَنَّهُ مَنْ جَاءَ يُحَافِظُ عَلَيْهِنَّ لِوَقْتِهِنَّ أَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهِنَّ فَلاَ عَهْدَ لَهُ عِنْدِي).**

واتە: لە (أَبَا قَتَادَة)ی کوڕی (رِبْعِيّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: من پێنج نوێژم لەسەر ئومەتی تۆ داناوە، وە پەیمانیشم کردووە لەگەڵ خۆم: کە هەرکەسێ بەچاکی و بە رێك و پێکی لەکاتی خویاندا بیانکات ئەوە دەیخەمە بەهەشتەوە، وە هەرکەسێکیش ئاگاداریان نەکات، ئەوە هیچ پەیمان و بەڵێنێکی لەسەر من نیە).

٤٣٠ - (حسن) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَمْسٌ مَنْ جَاءَ بِهِنَّ مَعَ إِيمَانٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ: مَنْ حَافَظَ عَلَى الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، عَلَى وُضُوئِهِنَّ، وَرُكُوعِهِنَّ، وَسُجُودِهِنَّ، وَمَوَاقِيتِهِنَّ، وَصَامَ رَمَضَانَ، وَحَجَّ الْبَيْتَ" إِنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً، وَأَعْطَى الزَّكَاةَ طَيِّبَةً بِهَا نَفْسُهُ، وَأَدَّى الأَمَانَةَ). قَالُوا: يَا أَبَا الدَّرْدَاءِ! وَمَا أَدَاءُ الأَمَانَةِ؟ قَالَ: الْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ.

واتە: لە (أَبِي الدَّرْدَاء)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەم پێنجەوە بێت لەگەڵ ئیماندا دەچێتە بەهەشتەوە: واتە ئەوەی پارێزگاری لە پێنج فەرزەی نوێژ و، دەستنوێژەکانیان و، سەجدەکانیان و، رکوعەکانیان و، کاتەکانیان بکات، رۆژووی مانگی رەمەزان بگرێت، حەج بکات ئەگەر توانای هەبوو، زەکاتی دارایی و سامانەکەی دەربکات بە رەزامەندی خۆی و بە پێ خۆش بوونەوە، ئەمانەت بپارێزێت، وتیان ئەی (أَبِي الدَّرْدَاء)! پاراستنی ئەمانەت چییە؟ وتی خۆشتنە لە لەشگرانی.

## باسی ئەگەر پێشنوێژ لەکاتی خۆی نوێژی دواخست

## ١٠ – بَابُ إِذَا أَخَّرَ الإِمَامُ الصَّلَاةَ عَنْ الْوَقْتِ.

٤٣١ - (صحيح) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُمِيتُونَ الصَّلَاةَ). أَوْ قَالَ: (يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ؟). قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: (صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّهِ، فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ).

واتە: لە (أَبِي ذَرّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووم: (ئەی (أَبَا ذَرّ) حاڵت چۆن دەبێت و چی دەکەیت ئەگەر ئەمیرانێکتان هەبوو نوێژیان دەمراند - ئەگەر لەکاتی یەکەمی خۆیاندا نەکرێن بە مردوو وەسف دەکرێن، بەڵام ئەگەر لەکاتی یەکەمی خۆیاندا ئەنجامدران ئەوە وەك زیندوو وان - یان فەرمووی: (نوێژیان دوادەخست)؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم! چ فەرمانێکم پێ دەکەیت کە بیکەم؟ فەرمووی: (ئەگەر پێشنوێژ نوێژی دواخست تۆ بە تەنیا نوێژەکانت لەکاتی خۆیاندا بکە، ئەگەر ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵیش بویت لەگەڵیان نوێژ بکە، چونکە ئەوە بۆ تۆ دەبێتە نوێژی سوننەت(نَافِلَة) یان زیادە نوێژ - و نوێژەکەش کە بە تەنیا دەیکەیت بەر فەرزەکە دەکەوێت - ).

٤٣٢ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الأَوْدِيِّ، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ الْيَمَنَ: رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْنَا، قَالَ: فَسَمِعْتُ تَكْبِيرَهُ مَعَ الْفَجْرِ، رَجُلٌ أَجَشُّ الصَّوْتِ، قَالَ: - فَأُلْقِيَتْ عَلَيْهِ مَحَبَّتِي، فَمَا فَارَقْتُهُ حَتَّى دَفَنْتُهُ بِالشَّامِ مَيْتًا، ثُمَّ نَظَرْتُ إِلَى أَفْقَهِ النَّاسِ بَعْدَهُ، فَأَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَلَزِمْتُهُ حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَيْفَ بِكُمْ إِذَا أَتَتْ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ يُصَلُّونَ الصَّلاَةَ لِغَيْرِ مِيقَاتِهَا؟). قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (صَلِّ الصَّلاَةَ لِمِيقَاتِهَا، وَاجْعَلْ صَلاَتَكَ مَعَهُمْ سُبْحَةً).

واتە: لە عەمری کوڕی (مَيْمُونٍ الأَوْدِيّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەل کە نێردراوی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو بۆسەر خەڵکی یەمەن لەگەڵ نوێژی بەیانیدا گەیشتە لامان، گوێم لێ بوو بەدەنگێکی گڕ (الله أكبر)ی کرد ئیتر لەو کاتەوە خوای گەورە خۆشەویستی خستە دڵمەوەو پابەند بووم پێوەی و لێی جودانەبوومەوە هەتا وەفاتی کردو لە شام نێژرا، دوای ئەو گەڕام بەدوای زانایەکی تێگەیشتوو لە دیندا لە هاوەڵان، هەتا ڕێم کەوت لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعود بەویشەوە پابەند بووم هەتا وەفاتی کرد، جا (عبدالله) وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: حاڵتان چۆن دەبێت و چی دەکەن ئەگەر ئەمیرانێکتان هەبوو نوێژەکانیان لەکاتی

یەکەمی خۆیاندا ئەنجام نەدەداو دوایان دەخستن؟ - مەبەستی ئەوەبوو کە ئایا ئێوەش لەگەڵ ئەوان نوێژ دەکەن یان لەکاتی یەکەمی خۆیدا دەیکەن- وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ! چ فەرمانێکم پێ دەکەیت کە بیکەم ئەگەر هەتا ئەو کاتە لە ژیاندا مام؟ فەرمووی: (لەکاتی خۆیاندا نوێژەکانت بکە، ئەگەر ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ بویت لەگەڵیان نوێژ بکە، چونکە ئەوە بۆ تۆ دەبێتە نوێژی سوننەت(سُبْحَة) یان زیادە نوێژ).

٤٣٣ - (صحيح) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهَا سَتَكُونُ عَلَيْكُمْ بَعْدِي أُمَرَاءُ، تَشْغَلُهُمْ أَشْيَاءُ عَنْ الصَّلاَةِ لِوَقْتِهَا، حَتَّى يَذْهَبَ وَقْتُهَا فَصَلُّوا الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُصَلِّي مَعَهُمْ؟ قَالَ: (نَعَمْ إِنْ شِئْتَ). وَقَالَ سُفْيَانُ: إِنْ أَدْرَكْتُهَا مَعَهُمْ أَأُصَلِّي مَعَهُمْ؟ قَالَ: (نَعَمْ إِنْ شِئْتَ).

واتە: لە عوبادەی کوڕی (صَّامِت)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (دوای من ئەمیرانێکتان دەبن، چەند شتانێك سەرقاڵیان دەکات و ئەبنە هۆی ئەوە نوێژ دوابخەن تا کاتەکەی دەڕوات، جا ئێوە نوێژەکانتان لەکاتی خۆیاندا بکەن). پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ! ئایا نوێژیان لەگەڵ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر ویستت).

وە سوفیان وتی: ئەگەر هەتا ئەو کاتە لە ژیاندا مام ئامادەی نوێژیان بووم لەگەڵیان نوێژ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەگەر ویستت).

٤٣٤ - (صحيح) عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ وَقَّاصٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَكُونُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ مِنْ بَعْدِي يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ، فَهِيَ لَكُمْ، وَهِيَ عَلَيْهِمْ، فَصَلُّوا مَعَهُمْ مَا صَلَّوُا الْقِبْلَةَ).

واتە: لە (قَبِيصَة)ی کوڕی (وَقَّاص)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (دوای من ئەمیرانێکتان دەبن، کە نوێژ دوادەخەن و لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا نایکەن، ئەگەر ئێوە لەکاتی خۆیدا نوێژتان کرد بوو لەگەڵیان نوێژ بکەن چونکە خێر و پاداشتی دەبێت بۆتان، گوناهی دواکەوتنیشی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان، لەگەڵیان نوێژ بکەن مادام ڕرودەکەنە قیبلە).

## باسی کەسیّ کە لەبەر خەوتن نویّژیّك نەكات یان لە بیری چوو

## ١١ - بَابُ فِي مَنْ نَامَ عَنْ الصَّلاَةِ أَوْ نَسِيَهَا.

٤٣٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَفَلَ مِنْ غَزْوَةِ خَيْبَرَ، فَسَارَ لَيْلَةً حَتَّى إِذَا أَدْرَكَنَا الْكَرَى عَرَّسَ، وَقَالَ لِبِلاَلٍ: (اكْلأْ لَنَا اللَّيْلَ). قَالَ: فَغَلَبَتْ بِلاَلاً عَيْنَاهُ وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَى رَاحِلَتِهِ فَلَمْ يَسْتَيْقِظِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ بِلاَلٌ، وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى إِذَا ضَرَبَتْهُمُ الشَّمْسُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلَهُمُ اسْتِيقَاظًا، فَفَزِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (يَا بِلاَلُ؟!). فَقَالَ: أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَاقْتَادُوا رَوَاحِلَهُمْ شَيْئًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ لَهُمُ الصَّلاَةَ، وَصَلَّى بِهِمُ الصُّبْحَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: (مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، فَإِنَّ اللَّهَ

تَعَالَى قَالَ: (وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ) ﴿طـه:١٤﴾. ).
قَالَ يُونُسُ: وَكَانَ ابْنُ شِهَابٍ يَقْرَؤُهَا كَذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ لە غەزای خەیبەر گەڕایەوە بۆ مەدینە شەویان بەسەردا هات هەتا خەو دەیبردنەوەو باوێشکیان دەدا، لە کۆتایی شەودا لایاندا بۆ ئەوەی کەمێك بحەوێنەوەو بخەون، بە بیلالی فەرموو: (ئەمشەو پاسەوانمان بە واتە خەبەرمان بکەرەوە بۆ نوێژی بەیانی). بیلال خەو زۆری بۆ هێنا پاڵی دا بە کۆپانی وڵاخەکەیەوە بەبێ ویستی خۆی خەوی لێ کەوت، ئیتر نە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و، نە بیلال و، نە هیچ کەسێك لە هاوەڵانی خەبەریان نەبووەوە بۆ نوێژی بەیانی هەتا خۆر لێی دان، یەکەم کەسێ کە خەبەری بوویەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو راچڵەکی و فەرمووی: (ئەی بیلال– بۆ خەوتی و خەبەرت نەکردینەوە بۆ نوێژ-؟!). بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خۆم و دایك و باوکمەوە بە قوربانت بین ئەوەی کە تۆی خەواند منیشی خەواند، جڵەوی وڵاخەکانیان گرت و کەمێك رۆشتن، پاشان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرت و فەرمانی کرد بە بیلال کە قامەتیان بۆ بکات، بەرنوێژی بەیانی بۆ کردن کاتێ کە لە نوێژ بوونەوە، فەرمووی: (هەرکەسێك لە بیری چوو نوێژێك بکات، هەر کاتێك هاتەوە بیری با نوێژەکە بکات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ). واتە: بە تایبەتی ئاگاداری نوێژەکەت بکەو لەکاتی خۆیا بیکە بۆ یادکردن و ناوبردنی من[١]. یونس دەڵێت: ئیبنو شەهاب بەم شێوەیە دەیخوێندەوە - واتە: بە (لِذِكْرِی) -.

---

[١]- (لِذِكْرِی) خوێندنەوەیەکی دەگمەن(شاذة) بەڵام (لِذِكْرِي) موتەواترە.

(شاذ والأصح للذكرى) قَالَ أَحْمَدُ: قَالَ عَنْبَسَةُ - يَعْنِى عَنْ يُونُسَ - فِى هَـذَا الْحَـدِيثِ (لِـذِكْرِي). وَقَـالَ: أَحْمَـدُ الْكَـرَى النُّعَاسُ.

ئەحمەد دەڵێت: عەنبەسە دەڵێت - واتە لە یونسەوە - بـە (لِـذِكْرِي) هـاتووە لە فەرمووكەدا. وە ئەحمەدیش دەڵێت: (الْكَرَى) باوێشكدانە.

٤٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، فِى هَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَحَوَّلُوا عَنْ مَكَانِكُمُ الَّذِى أَصَابَتْكُمْ فِيهِ الْغَفْلَةُ). قَالَ: فَأَمَرَ بِلاَلاً، فَأَذَّنَ، وَأَقَامَ، وَصَلَّى[1].

واتە: ئەم بەسەرهاتە لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبـەری خوا صلى الله عليـه وسلم فەرموویـەتی: (لـەو جێگایـەدا بگوێزنـەوە کـە تێیـدا خەوتن و تووشی غەفڵەت و بێ ئاگایی هاتن). راوی وتـی: فـەرمانی کـرد بـە بیلال، بانگی داو قامەتی بۆ کردن و، نوێژیان کرد.

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ رَوَاهُ مَالِكٌ وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ وَالأَوْزَاعِىُّ وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ عَنْ مَعْمَرٍ وَابْنِ إِسْحَاقَ لَمْ يَذْكُرْ أَحَدٌ مِنْهُمُ الأَذَانَ فِى حَدِيثِ الزُّهْرِىِّ هَذَا وَلَمْ يُسْنِدْهُ مِنْهُمْ إِلاَّ الأَوْزَاعِىُّ وَأَبَانُ الْعَطَّارُ عَنْ مَعْمَرٍ.

٤٣٧ - (صحيح) عَنْ أَبُو قَتَادَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي سَفَرٍ لَهُ، فَمَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمِلْتُ مَعَهُ، فَقَالَ: (انْظُرْ). فَقُلْتُ: هَذَا رَاكِبٌ، هَذَانِ رَاكِبَانِ، هَؤُلاَءِ ثَلاَثَةٌ، حَتَّى صِرْنَا سَبْعَةً، فَقَالَ: (احْفَظُوا عَلَيْنَا صَلاَتَنَا). يَعْنِي صَلاَةَ الْفَجْرِ فَضُرِبَ عَلَى آذَانِهِمْ، فَمَا أَيْقَظَهُمْ إِلاَّ حَرُّ الشَّمْسِ، فَقَامُوا فَسَارُوا هُنَيَّةً، ثُمَّ نَزَلُوا فَتَوَضَّئُوا، وَأَذَّنَ بِلاَلٌ فَصَلَّوْا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ صَلَّوُا الْفَجْرَ وَرَكِبُوا، فَقَالَ: بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: قَدْ فَرَّطْنَا فِي صَلاَتِنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهُ لاَ تَفْرِيطَ فِي النَّوْمِ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ، فَإِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ عَنْ صَلاَةٍ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَذْكُرُهَا، وَمِنَ الْغَدِ لِلْوَقْتِ).

واتە: لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەفەرێکیدا لایدا منیش لەگەڵیدا لامدا، فەرمووی: (سەیرکە). — لە ریوایەتی پێشەوا (مسلم)دا هاتووە فەرمووی: بزانە کەس دەبینی - وتم: ئەوە سوارێکە، ئەوانەش دوو سواری ترن، ئەوانەش سیانن، هەتا گەیشتینە حەوت سوار، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ ئاگادار دەبێت بۆ ئەوەی خەبەرمان بکاتەوە بۆ نوێژ هەتا لەکاتی خۆیدا نوێژەکەمان بکەین و لەکاتی خۆی دوای نەخەین). واتە بۆ نوێژی بەیانی، ئیتر خەوتن و پەردە درا بەسەر گوێیانداو هیچیان گوێ لێ نەبوو، وە هیچ شتێ وە خەبەری نەهێنان تەنها

گەرمای خۆر نەبێت، جا هەستان و بە هێواشی کەمێك ڕۆشتن، پاشان دابەزین دەستنوێژیان گرت، بیلال بانگی داو دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێـژی بـەیانیان کرد، پاشان نوێژی بەیانیشیان کردو سواربوون، هەندێکیان بە هەندێکی تریـان وت: لە نوێژەکەماندا کەمتەرخەمیمان نواند، پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسلم فەرمووی: (کەمتەرخەمی لـە خەوتنـدا نیـە، بـەڵکو کەمتەرخـەمی کـاتی بەخەبەر بوونە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە لە بیری چوو نوێژێك بکات، هـەر کاتێـك هاتەوە بیری با نوێژەکە بکات، واتە با بشگاتە کاتی هەمان نوێژ لە سبەینێشدا - بۆ نموونە ئەگەر یەکێ لەبیری چوو نوێژی بەیانی بکات ئەگەر ڕۆژی دواتر لە هـەمان کاتـدا هاتـەوە یـادی یەکـەم جـار نوێـژە فەوتاوەکـە بکـات، وە لـەکاتی دیاریکراوی خۆیدا هەمان نوێژیش بکات و دوای نەخات).

٤٣٨ - (شاذ) عَنْ أَبُو قَتَادَةَ الأَنْصَارِيُّ فَارِسُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَيْشَ الأُمَرَاءِ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: فَلَمْ تُوقِظْنَا إِلاَّ الشَّمْسُ طَالِعَةً، فَقُمْنَا وَهِلِينَ لِصَلاَتِنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (رُوَيْدًا رُوَيْدًا). حَتَّى إِذَا تَعَالَتِ الشَّمْسُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يَرْكَعُ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَلْيَرْكَعْهُمَا). فَقَامَ مَنْ كَانَ يَرْكَعُهُمَا وَمَنْ لَمْ يَكُنْ يَرْكَعُهُمَا فَرَكَعَهُمَا، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُنَادَى

بِالصَّلاَةِ، فَنُودِيَ بِهَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِنَا فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: (أَلاَ إِنَّا نَحْمَدُ اللَّهَ أَنَّا لَمْ نَكُنْ فِي شَيْءٍ مِنْ أُمُورِ الـدُّنْيَا يَشْـغَلُنَا عَـنْ صَلاَتِنَا، وَلَكِنَّ أَرْوَاحَنَا كَانَـتْ بِيَـدِ اللَّـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ، فَأَرْسَلَهَا أَنَّى شَاءَ، فَمَنْ أَدْرَكَ مِنْكُمْ صَلاَةَ الْغَدَاةِ مِنْ غَدٍ صَالِحًا، فَلْيَقْضِ مَعَهَا مِثْلَهَا).

واتە: لە (أَبُو قَتَادَةَ الأَنْصَارِيّ) سوارچاکی پێغەمبـەری خـواوە صـلی الله علیـە وسـلم هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم سـوپای سەرکردەکان(الأُمَرَاء)ی نارد بۆ جەنگ، ئەبو قـەتادە باسـی هـەمان بەسـەرهاتی کـردو وتـی: هـیچ شـتێ وە خەبـەری نـەهێناین تـەنها هـەلاَتنی خـۆر نـەبێت، راچـڵەکین و هەسـتاین بـۆ نوێـژەکانمان — چـونکە خـۆر هـەڵهاتبوو نوێـژی بەیانیان نەکردبوو - ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کەمێك هێواش و لەسەرخۆ بن). — واتە فەرمانی پێ کردن لە لەسـەرخۆ بـڕۆن - هـەتا خـۆر بەرزبوویـەوە، فـەرمووی: (ئـەوەی ئەیـەوێت دوو رکـات نوێـژی سـوننەتی پێش بەیانی بکات با بیکات). جا ئەوانەی کە دوو رکـات نوێـژە سـوننەتەکەیان کردوو ئەوانەش کە نەیانکرد هەرهەموویان هەسـتان، پاشـان پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد کە بانگ بدەن بۆ نوێژ، بانگیان دا بـۆ نوێـژ، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا بەرنوێـژی نوێـژە فەوتاوەکـەی بۆ کردین کاتێ کە لە نوێژ بوویەوە رووی تـێ کـردین و فـەرمووی: (ئاگـاداربن پێویسـتە ئێمـە سـوپاس و ستایشـی خـوا بکـەین کـە کـاری دنیـایی سـەرقاڵی نـەکردین لـە نوێژەکـەمان دوابکـەوین بـەڵکو رۆحـەکانمان بـە دەسـتی خـوای گەورەیەو بۆ کوێی بوێت دەینێرێت، ئەگەر یەکێ لە ئێوە لە بیری چوو نوێـژی

بەیانی بکات، رۆژی دواتر لە هەمان کاتدا بیری کەوتەوە یەکەم جار نوێژە فەوتاوەکە بکات، دوای ئەوە نوێژی بەیانی هەمان رۆژ بکات لەکاتی خۆیدا).

٤٣٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ فِي هَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَكُمْ حَيْثُ شَاءَ، وَرَدَّهَا حَيْثُ شَاءَ، قُمْ فَأَذِّنْ بِالصَّلاَةِ). فَقَامُوا فَتَطَهَّرُوا، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ، قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ.

واتە: ئەم هەواڵە لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە کەی بیەوێت رۆحەکانتان دەکێشێ و کەی بیەوێت دەیگێڕێتەوە بۆ جەستەتان، - ئەی بیلال - هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ). جا هەستان دەستنوێژیان گرت، هەتا لێ بوونەوە لە دەستنوێژ گرتن خۆر بەرز بوویەوە، ئەوکاتە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەستا بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد.

٤٤٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ، قَالَ: فَتَوَضَّأَ حِينَ ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى بِهِمْ.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی ئەبو قەتادەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بە هەمان مانا هێناویەتی، وتی: دەستنوێژیان گرت لە کاتێدا کە خۆر بەرز بوویەوە بەرنوێژی بۆ کردن.

٤٤١ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ، أَنْ تُؤَخِّرَ صَلاَةً حَتَّى يَدْخُلَ وَقْتُ أُخْرَى).

واتە: لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە خەودا کەمتەرخەمی نیە، بەڵکو کەمتەرخەمی لەوەدایە کە یەکێك بە خەبەربێت و نوێژ نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت).

٤٤٢ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك نوێژێکی لەیاد چوو هەرکاتێك کەوتەوە یادی بیکاتەوە، هیچ شتێك تاوانی نوێژە نەکراوەکە لانابات تەنها کردنی نوێژێکی وەك خۆی نەبێت).

٤٤٣ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَنَامُوا عَنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَاسْتَيْقَظُوا بِحَرِّ الشَّمْسِ، فَارْتَفَعُوا قَلِيلاً حَتَّى

استَقلَّتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَمَرَ مُؤَذِّنًا فَأَذَّنَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، ثُمَّ أَقَامَ ثُمَّ صَلَّى الْفَجْرَ.

واتە: لە (عِمْرَان كوڕی حُصَيْن)ەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەفەرێكی شەودا خەوتن و بۆ نوێژی بەیانی بە گەرمای خۆر خەبەریان بوویەوە، كەمێك ڕۆشتن هەتا خۆر بەرز بوویەوە، پاشان فەرمانی كرد بە بانگبێژ بانگ بدات، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو ركات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی كرد، ئینجا بانگبێژ قامەتی كرد، پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی بەیانی كرد – واتە: بەرنوێژی بۆ كردن و بە كۆمەڵ نوێژیان كرد-.

٤٤٤ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَنَامَ عَنْ الصُّبْحِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (تَنَحَّوا عَنْ هَذَا الْمَكَانِ). قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ تَوَضَّئُوا وَصَلَّوْا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الصُّبْحِ).

واتە: لە عەمری كوڕی ئومەییەی (الضَّمْرِیّ)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووین لە هەندێ لە سەفەرەكانیدا، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خەوت و خەبەری نەبوویەوە

بۆ نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵهات ئەوکاتە هەستا لەخەو فەرمووی: (لەو جێگایەدا بگوێزنەوە)[١]. راوی وتی: پاشان فەرمانی کرد بە بیلال بانگ بدات، ئینجا دەستنوێژیان گرت و دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانیان کرد، ئینجا فەرمانی کرد بە بیلال کە قامەت بکات، جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەستا بەرنوێژی بۆ کردن.

٤٤٥ - (صحيح) عَنْ ذِي مِخْبَرٍ الْحَبَشِيِّ، وَكَانَ يَخْدُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْخَبَرِ قَالَ: فَتَوَضَّأَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وُضُوءًا لَمْ يَلْثْ مِنْهُ التُّرَابُ، ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ غَيْرَ عَجِلٍ، ثُمَّ قَالَ لِبِلاَلٍ: (أَقِمِ الصَّلاَةَ). ثُمَّ صَلَّى ﴿الْفَرْضَ﴾ وَهُوَ غَيْرُ عَجِلٍ.

واتە: ئەم هەواڵە لە (ذِی مِخْبَرٍ الْحَبَشِیّ)ەوە، کە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە هاتووە، کە وتویەتی: دەستنوێژێکی گرت - واتە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - ئاوی دەستنوێژەکە تێکەڵی گڵەکە نەبوو، ئینجا فەرمانی کرد بە بیلال کە بانگ بدات، جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەستا دوو رکات نوێژی کرد بەبێ ئەوەی پەلە بکات، پاشان بە بیلالی فەرموو: (قامەت بکە بۆ نوێژ). ئینجا نوێژە فەرزەکەی ئەنجامدا بەبێ ئەوەی پەلە بکات.

---

[١] - ئیتر لەبەر ئەوە بووە کە خۆر تەواو بەرزبێتەوە چونکە هەتا خۆر بەرز نەبێتەوە نوێژکردن کەراهەتی هەیە، یان لەبەر ئەوە بووە کە ئەو شوێنە شەیتانی لێ بووە.

٤٤٦ - (شاذ) عَنْ ذِی مِخْبَرِ بْنِ أَخِی النَّجَاشِیِّ، فِی هَذَا الْخَبَرِ قَالَ: فَأَذَّنَ وَهُوَ غَیْرُ عَجِلٍ.

واتە: ئەم هەواڵە لە (مِخْبَـر)ی بـرازای نەجاشیـەوە هـاتووە، كـە وتویـەتی: بیلال بانگی دا بەبێ ئەوەی پەلە بكات.

٤٤٧ - (صحیح) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ، قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ زَمَنَ الْحُدَیْبِیَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ یَكْلَؤُنَا). فَقَالَ: بِلاَلٌ أَنَا، فَنَامُوا حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَاسْتَیْقَظَ النَّبِیُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (افْعَلُوا كَمَا كُنْتُمْ تَفْعَلُونَ). قَالَ: فَفَعَلْنَا، قَالَ: (فَكَذَلِكَ فَافْعَلُوا، لِمَنْ نَامَ أَوْ نَسِیَ).

واتـە: لـە (عبداللـە)ی كـوڕی مەسـعوودەوە هـاتووە، كـە وتویـەتی: لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله علیـە وسـلم لـە غـەزای حودەیبیـە گەڕاینـەوە شـەو بەسەردا هات لاماندا بۆ ئەوەی بحەوێنەوەو بخەوین، پێغەمبەری خوا صـلى الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (كـێ پاسـەوانیمان دەكـات؟ — هـەتا بـۆ نوێـژی بـەیانی خەبـەرمان بكاتـەوەو نوێژەكـەمان نەفـەوتێت-). بـیلال وتـی: مـن، خـەوی لـێ كەوت و خەبەری نەبووەوە هەتا خۆر هەڵهات، ئەوكاتە پێغەمبەر صلى الله علیە وسـلم لەخـەو هەسـتاو فـەرمووی: (ڕۆژانـی تـر پـێش خۆرهـەڵاتن بـۆ نوێـژی بەیانی چیتان دەكرد ئێستاش ئـەوە بكـەن). — واتـە دەسـتنوێژ بگـرن و بـانگ

بـدەن و قامـەت بكـەن و ئینجـا نوێژەكـەتان بكـەن - وتیـان: ئێمـەش بـەو شێوەیەمان كرد، جا فەرمووی: (ئەوەی خەوت كاتێ كە خەبـەری بویـەوە یـان ئەوەی لە یادی چوو كەوتەوە یادی با بەو شێوەیە بكات كە ئێمە كردمان).

## باسی سەبارەت بە دروستكردنی مزگەوت

## ١٢ – بَابُ فِي بِنَاءِ الْمَسَاجِدِ.

٤٤٨ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أُمِرْتُ بِتَشْيِيدِ الْمَسَاجِدِ). قَـالَ ابْـنُ عَبَّاسٍ: لَتُزَخْرِفُنَّهَا كَمَا زَخْرَفَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى.

واتـە: لـە ئیبنـو عەباسـەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (فـەرمانم پـێ نـەدراوە مزگەوتـەكان زیـاد لـە پێویسـت بەرزكەمـەوە). ئیبنـو عـەباس وتـی: ئایـا مزگەوتەكان دەڕازێننەوە وەك چۆن گاور و جوەكـان كەنیسـەو پەرسـتگاكانیان دەڕازاندەوە.

٤٤٩ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ).

واتـە: لـە ئەنەسـەوە هـاتووە، كـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیـە وسـلم فەرموویەتی: (قیامـەت نایـەت هـەتا خـەڵك خـۆی بـە مزگـەوت دروسـتكردن و

رازاندنەوەیەوە هەڵئەکێشێت). - واتە هەرکەسەو شانازی بە مزگەوتەکەی خۆیەوە دەکات - .

٤٥٠ - (صحيح) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِى الْعَاصِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يَجْعَلَ مَسْجِدَ الطَّائِفِ حَيْثُ كَانَ طَوَاغِيتُهُمْ.

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی (أَبِى الْعَاص)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردوە پەرستگاکەی (طَّائِف) کە پێشتر بتیان تێدا دەپەرست، بۆیان بکات بە مزگەوت بۆ ئەوەی خواپەرستی تێدا بکەن.

٤٥١ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ أَنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَبْنِيًّا بِاللَّبِنِ وَالْجَرِيدِ، وَعَمَدُهُ - قَالَ مُجَاهِدٌ: عُمُدُهُ - مِنْ خَشَبِ النَّخْلِ، فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئًا، وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ: وَبَنَاهُ عَلَى بِنَائِهِ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّبِنِ وَالْجَرِيدِ، وَأَعَادَ عَمَدَهُ. - وَقَالَ مُجَاهِدٌ: عُمُدَهُ - خَشَبًا، وَغَيَّرَهُ عُثْمَانُ، فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً، وَبَنَى جِدَارَهُ بِالْحِجَارَةِ الْمَنْقُوشَةِ وَالْقَصَّةِ، وَجَعَلَ عَمَدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ وَسَقَّفَهُ بِالسَّاجِ، قَالَ مُجَاهِدٌ: وَسَقْفُهُ السَّاجُ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْقَصَّةُ الْجِصُّ.

واتە: لە نافعەوە هاتووە، كە (عبدالله)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ بۆی گێڕاوەتەوە، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم مزگەوتەكەی كە بە مزگەوتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناسراوە بە خشت و پەلكە خورما دروست كرابوو، - موجاهید وتی: كۆڵەكەكانی لە تەختەی دارخورما بوون- پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی خۆیدا هیچی بۆ زیاد نەكرد، بەلام پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەستكاری كردوو لە پانی و بەرزی بۆی زیاد كرد، بەلام هەروەك سەردەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دیوارەكەی بە خشت و پەلكە خورما دروست كردو دارەڕاو پەردووەكەی لە دارخورمای تازە دانایەوە، - موجاهید وتی: كۆڵەكەكانی لە دارخورما بوون- بەلام لەپاشدا پێشەوا عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ دەستكاریەكی چاكی كردوو زۆر شتی گۆڕی و زۆری بۆ زیاد كرد، دیوارەكانی بە بەردی نەخشاو و گەچ دروست كرد، لەجیاتی كۆڵەكە پایەی بە بەردی نەقاری نەخشین دانا، وە بە داری ساج سەقفەكەی دارەڕا كرد. موجاهید وتی: سەقفەكەی بە داری ساج دارەڕا كرد. ئەبو داود دەڵێت: (الْقَصَّة) واتە: گەچ.

٤٥٢ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ مَسْجِدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَتْ سَوَارِيهِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ جُذُوعِ النَّخْلِ، أَعْلاَهُ مُظَلَّلٌ بِجَرِيدِ النَّخْلِ، ثُمَّ إِنَّهَا نَخِرَتْ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ، فَبَنَاهَا بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَبِجَرِيدِ النَّخْلِ، ثُمَّ إِنَّهَا نَخِرَتْ فِي خِلاَفَةِ عُثْمَانَ، فَبَنَاهَا بِالآجُرِّ فَلَمْ تَزَلْ ثَابِتَةً حَتَّى الآنَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەی لە ساقی دارخورما بوو، بە پەلکە خورماش سێبەری بۆ کرا بوو واتە سەقفەکەی بە پەلکە خورما داپۆشرا بوو، پاشان لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشید ئەبو بەکردا ڕەزای خوای لێ بێ کۆڵەکەکان ڕزین و لە ساقی دارخورمای تازە وەك خۆی دروستی کردنەوەو هیچی لێ نەگۆڕی، ئینجا لە سەردەمی خەلیفە ڕاشید عوسماندا ڕەزای خوای لێ بێ دیسانەوە ڕزینەوە، جا بە خشتی سورۆکراو دروستی کردنەوە، ئیتر لەو کاتەوە چەسپاوەو هەتا ئێستاش هەر بەو شێوەیەیە.

٤٥٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ فَنَزَلَ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فَأَقَامَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِينَ سُيُوفَهُمْ، فَقَالَ أَنَسٌ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ. وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، وَإِنَّهُ أَمَرَ بِبِنَاءِ الْمَسْجِدِ، فَأَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ فَقَالَ: (يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا). فَقَالُوا وَاللَّهِ لاَ

نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ أَنَسٌ: وَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ لَكُمْ: كَانَتْ فِيهِ قُبُورُ الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَتْ فِيهِ خِرَبٌ، وَكَانَ فِيهِ نَخْلٌ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وَبِالْخِرَبِ فَسُوِّيَتْ، وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ، فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ الْمَسْجِدِ، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً، وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَهُمْ وَهُوَ يَقُولُ:

اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ
فَانْصُرِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ مەدینە، لەسەروی مەدینەوە دابەزی لەناو هۆزێکدا کە پێیان دەوتن: نەوەی عەمری کوڕی عەوف چواردە شەو لەناویاندا مایەوە، پاشان ناردی بەدوای پیاوماقوڵانی (بَنِي النَّجَّار)دا، ئەوانیش هاتن شمشێرەکانیان لە ملدا بوو، ئەنەس وتی: هەر دەڵێی ئێستا چاوم لە پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم بەسەر وشترەکەیەوە ئەبو بەکر لە پاشکۆیدایەو پیاوماقوڵانی (بَنِي النَّجَّار) دەورەیان داوە هەتا گەیشتە بەردەم ماڵی ئەبو ئەیوب. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەرشوێنێك کاتی نوێژ بهاتایە نوێژی دەکرد، لە مۆڵگە یان پەچەی مەڕدا نوێژی کرد، پاشان فەرمانی کرد بەدروستکردنی مزگەوت، جا ناردی بەدوای پیاوماقوڵانی (بَنِي

النَّجَّار)دا، ئەوانیش هاتن و پێی فەرموون: (ئەی (بَنِی النَّجَّار) مامەڵەی ئەم باخە خورمایەتانم لەگەڵ بکەن). وتیان: سوێند بێ بە خوا نرخی ئەوە تەنها لەخوای گەورە داوادەکەین، ئەنەس وتی: باخەکە ئەمانەی تێدابوو دار خورماو، گۆڕی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران و، چەند کەلاوەیەك، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بە بڕینی دارخورماکان و، هەڵتەکاندنی گۆڕی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران و، کەلاوەکانیش تەخت کران و جێگاکەیان پڕکرایەوە، دارخورماکانیان لەلای قیبلەوە ریز کرد، دوولاکەی بە بەرد دانرا، جا هاوەڵان بەردیان دەگواستەوەو سروودیان دەخوێندەوە پێغەمبەریشیان لەگەڵ بوو ئەویش دەیفەرموو:

خودایە خێر هەر خێری دوارۆژە، دەی کۆچەران و یاریدەدەران سەرکەوتووکە.

٤٥٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ مَوْضِعُ الْمَسْجِدِ حَائِطًا لِبَنِي النَّجَّارِ فِيهِ حَرْثٌ وَنَخْلٌ وَقُبُورُ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ثَامِنُونِي بِهِ). فَقَالُوا لاَ نَبْغِي بِهِ ثَمَنًا، فَقُطِعَ النَّخْلُ، وَسُوِّيَ الْحَرْثُ، وَنُبِشَ قُبُورُ الْمُشْرِكِينَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: (فَاغْفِرْ). مَكَانَ (فَانْصُرْ)[1].

---

[1]- قَالَ مُوسَى وَحَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ بِنَحْوِهِ وَكَانَ عَبْدُ الْوَارِثِ يَقُولُ خِرَبٌ وَزَعَمَ عَبْدُ الْوَارِثِ أَنَّهُ أَفَادَ حَمَّادًا هَذَا الْحَدِيثَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتووە، كە وتویەتی: شوێنی مزگەوتەكە باخێكی (بَنِی النَّجَّار) بوو، دار خورماو گۆڕی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران و كشتوكاڵی تێدابوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مامەڵەی ئەم باخەتانم لەگەڵ بكەن). وتیان: نرخی ئەو باخەمان ناوێت، جا دارخورماكانیان بڕیی و، كشتوكاڵەكەیان تەخت كرد، گۆڕی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرانیان هەڵتەكاند، جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەكەی گێڕایەوە، بەلاّم لە جیاتی: (فَانْصُرْ). وتی: (فَاغْفِرْ).

## باسی دروستكردنی مزگەوت لەناو هۆز و گەڕەك و ماڵەكاندا.

## ١٣ – بَابُ اتِّخَاذِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ.

٤٥٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبِنَاءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی داوە بە دروستكردنی مزگەوتەكان لەناو هۆز و گەڕەك و ماڵەكاندا، هەروەها پاك بكرێنەوەو بۆن خۆش بكرێت.

٤٥٦ - (صحيح) عَنْ سَمُرَةَ: أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى ابْنِه أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُنَا بِالْمَسَاجِدِ أَنْ نَصْنَعَهَا فِي دورِنَا، وَنُصْلِحَ صَنْعَتَهَا وَنُطَهِّرَهَا.

واتە: لە سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە نامەیەکی نوسیووە بۆ کوڕەکەی بەم شێوەیە: لەدوایدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی داوە بە دروستکردنی مزگەوت بە شێوەیەکی چاك لە گەڕەك و لەناو هۆز و ماڵەکاندا، وە پاك بکرێتەوە.

## باسی چرای مزگەوتەکان و ڕووناك کردنەوەیان.

## ١٤ - بَابُ فِي السُّرُجِ فِي الْمَسَاجِدِ.

٤٥٧ - (ضعيف) عَنْ مَيْمُونَةَ مَوْلاَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفْتِنَا فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ائْتُوهُ فَصَلُّوا فِيهِ). - وَكَانَتِ الْبِلاَدُ إِذْ ذَاكَ حَرْبًا - فَإِنْ لَمْ تَأْتُوهُ وَتُصَلُّوا فِيهِ، فَابْعَثُوا بِزَيْتٍ يُسْرَجُ فِي قَنَادِيلِهِ).

واتە: لە (مَيْمُونَة)ی کارەکەری پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ! حوکمی سەفەرکردنمان

بۆ (بَيْتِ الْمَقْدِسِ) بۆ روون بكەرەوە كە ئایا دروستە سەفەر بكەین یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ بڕۆن بۆ ئەوێ و نوێژی تێدا بكەن) – لەوكاتەدا وڵات جەنگی تێدا بوو – (ئەگەر بۆشتان نەكرا بڕۆن نوێژی تێدا بكەن، زەیت بنێرن بۆ ئەوەی بیكەنە چراكانی و بگرێن).

## باسی بەرد لەناو مزگەوتدا.

## ١٥ – بَابُ فِي حَصَى الْمَسْجِدِ.

٤٥٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي الْوَلِيدِ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ الْحَصَى الَّذِي فِي الْمَسْجِدِ؟ فَقَالَ: مُطِرْنَا ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ مُبْتَلَّةً، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالْحَصَى فِي ثَوْبِهِ فَيَبْسُطُهُ تَحْتَهُ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ قَالَ: (مَا أَحْسَنَ هَذَا).

واتە: لە ئەبو وەلیدەوە هاتووە، كە وتویەتی: سەبارەت بەو بەردەی كە لەناو مزگەوتدا - دادەنرێت بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بكرێت كە ئایا دروستە یان نا؟ - لە ئیبنو عومەرم پرسی؟ ئەویش وتی: شەوێكیان باران باری و زەوی تەڕ كرد، پیاوێ كە دەهات بۆ مزگەوت بەردێكی خستبووە ناو پۆشاكەكەی و دەیخستە ژێر خۆی – واتە شوێنە تەڕەكە بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بكات و قوڕاوی نەبێت - ، كاتێ كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە نوێژ بوویەوە فەرمووی: (ئەمە چەند شتێكی چاكە).

٤٥٩ – (صحيح مقطوع) عَنْ أَبِي صَالِحٍ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَخْرَجَ الْحَصَى مِنَ الْمَسْجِدِ يُنَاشِدُهُ.

واتە: لە (أَبِى صَالِح)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: خەڵکی دەڵێن: ئەگەر پیاوێ بەرد لە مزگەوت بباتە دەرەوە بەردەکە لە خوا دەپاڕێتەوە کە نەیباتەدەرەوە.

٤٦٠ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، - قَالَ أَبُو بَدْرٍ: أُرَاهُ قَدْ رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: (إِنَّ الْحَصَاةَ لَتُنَاشِدُ الَّذِي يُخْرِجُهَا مِنَ الْمَسْجِدِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، - ئەبو بەدر وتویەتی: وا ئەزانم راوی فەرموودەکەی بەرزکردۆتەوە هەتا گەیاندویەتیە سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: (بێگومان ئەو بەردەی کە لە مزگەوت دەبرێتە دەرەوە لە خوا دەپاڕێتەوە کە هیچ کەسێ نەیباتەدەرەوە).

## باسی گسکدان و پاککردنەوەی مزگەوت.

## ١٦ – بَابُ فِي كَنْسِ الْمَسْجِدِ.

٤٦١ - (ضعيف) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عُرِضَتْ عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتِي حَتَّى الْقَذَاةُ يُخْرِجُهَا الرَّجُلُ مِنَ الْمَسْجِدِ، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي فَلَمْ أَرَ ذَنْبًا أَعْظَمَ مِنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيَهَا رَجُلٌ ثُمَّ نَسِيَهَا ). ﴿المشكاة: ٧٢٠﴾.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پاداشتی ئوممەتم نیشاندرا هەتا پاداشتی پوش یان خۆڵ یا هەرشتێك کە بکەوێتە چاووە کە لە مزگەوتدا کەوتبێت و کەسێك ببیباتە دەرەوە، وە گوناهو تاوانی ئوممەتم نیشاندرا هیچ گوناهو تاوانێکم نەدی گەورەتر بێت لەو تاوانەی کە کەسێك سورەتێ یان ئایەتێکی قورئانی لەبەر بووبێ و پاشان لەیادی بکات و کاری پێ نەکات).

# باسی تێکەڵاونەبونی پیاوان و ئافرەتان لە مزگەوتدا

## ١٧ - بَابُ فِي اعْتِزَالِ النِّسَاءِ فِي الْمَسَاجِدِ عَنْ الرِّجَالِ

**٤٦٢ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْ تَرَكْنَا هَذَا الْبَابَ لِلنِّسَاءِ). قَالَ نَافِعٌ: فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ ابْنُ عُمَرَ حَتَّى مَاتَ[١].**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر ئەو دەرگایەمان تایبەت بکردایە بۆ ئافرەتان چاکتر بوو، بۆ ئەوەی پیاوان و ئافرەتان لەکاتی چوونەژوورەوە بۆ مزگەوت و هاتنەدەرەوەدا تێکەڵاو نەبوونایە). نافع وتی: ئیتر ئیبنو عومەر لەو دەرگاوە نەچووە ژوورەوە هەتا وەفاتی کرد.

**٤٦٣ - (ضعيف الإسناد) عَنْ نَافِعٍ ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: فَذَكَرَهُ بِمَعْنَاهُ، وَهُوَ أَصَحُّ.**

واتە: لە نافعەوە هاتووە، کە وتویەتی: عومەری کوڕی (خَطّاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی، ڕاوی بە هەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە، ئەمەش ڕاستترە.

---

[١]- وَقَالَ غَيْرُ عَبْدِ الْوَارِثِ: قَالَ عُمَرُ، وَهُوَ أَصَحُّ.

٤٦٤ - (ضعيف) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَانَ يَنْهَى أَنْ يُدْخَلَ مِنْ بَابِ النِّسَاءِ.

واتە: لە نافعەوە هاتووە، کە عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ قەدەغەی کردبوو پیاوان لە دەرگای ئافرەتانەوە بچنەژوورەوە بۆ مزگەوت.

## باسی ئەگەر کەسێ ویستی بچێتە مزگەوتەوە چی بلێت؟

## ١٨ - بَابُ فِيمَا يَقُولُهُ الرَّجُلُ عِنْدَ دُخُولِهِ الْمَسْجِدَ.

٤٦٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ - أَوْ أَبَا أُسَيْدٍ الأَنْصَارِيَّ - يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، فَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ ).

واتە: لە (عَبْدِ الْمَلِكِ)ی کوڕی سەعیدی کوڕی سوەیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە (أَبَا حُمَيْدٍ) یان (أَبَا أُسَيْدٍ الأَنْصَارِيّ) دەیوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە ویستی بچێتە مزگەوتەوە با سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، پاشان بڵێ:

(اللّٰهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە: خودایە دەرگاكانی رەحمەت و میهرەبانی خۆتم بۆ بكەرەوە. كاتێكیش كە هاتەدەرەوە بڵێ: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ). واتە: خودایە داوای بەخشش و بەهرەی خۆتت لێ دەكەم.

٤٦٦ - (صحيح) عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ ، قَالَ: لَقِيتُ عُقْبَةَ بْنَ مُسْلِمٍ فَقُلْتُ لَهُ: بَلَغَنِي أَنَّكَ حَدَّثْتَ عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَالَ: (أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). قَالَ: أَقَطُّ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: (فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ، قَالَ الشَّيْطَانُ: حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ).

واتە: لە (حَيْوَة)ی كوڕی شورەیحەوە هاتووە، كە وتویەتی: گەیشتم بە عوقبەی كوڕی موسلیم پێم وت: پێم گەیشتووە كە تۆ ئەمەت گێڕاوەتەوە لە (عبدالله)ی كوڕی عەمری كوڕی (عَاص)ەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ دەچووە مزگەوتەوە دەیفەرموو: (پەنا دەگرم بە خوای گەورەو، رووی پیرۆزی و، دەسەڵاتی هەمیشەیی، لە شەیتانی نەفرین كراو. فەرمووی: ئەگەر ئەمەی وت، شەیتان دەڵێ: ئەمڕۆ بە بەردەوامی لە خراپەی من پارێزراوە). عوقبە بە (حَيْوَة)ی وت: ئەو فەرموودەی كە لە منەوە پێت گەیشتووە هەر ئەوەندەیە؟ وتم: بەڵێ، عوقبە وتی: فەرموودەكە ئەمەشی لەسەرە: (هەركەس ئەوە بڵێ، شەیتان دەڵێ: ئەوە ئیتر ئەمڕۆ لە من پارێزراویت).

## باسی ئەوەی سەبارەت بەنوێژكردن لەكاتی چوونە مزگەوت هاتووە.

## ١٩ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ.

**٤٦٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُصَلِّ سَجْدَتَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَجْلِسَ).**

واتە: لە ئەبی قەتادەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس لە ئێوە كاتێ كە هات بۆ مزگەوت، با پێش ئەوەی دابنیشێت دوو ركات نوێژ بكات).

**٤٦٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ، زَادَ: (ثُمَّ لْيَقْعُدْ بَعْدُ إِنْ شَاءَ، أَوْ لِيَذْهَبْ لِحَاجَتِهِ).**

واتە: لە ئەبی قەتادەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە هاتووە، بەڵام ئەمەشی بۆ زیادكردووە: (- دوای ئەوەی كە دوو ركات نوێژی كرد - پاشان ئەگەر ویستی با دابنیشێت، یان بچێت بەدەم كاری خۆیەوە).

## باسی فەزڵی دانیشتن و مانەوە لە مزگەوتدا.

## ٢٠ – بَابُ فِي فَضْلِ الْقُعُودِ فِي الْمَسْجِدِ.

٤٦٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ، أَوْ يَقُومْ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەردەوام مەلائیکە سڵاوات لەسەر کەسێ لە ئێوە دەدەن مادەم لە شوێنی نوێژەکەی بمێنێتەوەو دەسنوێژەکەی بمێنێ و پووچەڵ نەبێتەوە، یان هەتا هەڵنەسێت، دەڵێن: خودایە لێی خۆشبە، خودایە رەحمەت برێژە بەسەریدا).

٤٧٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتِ الصَّلاَةُ تَحْبِسُهُ، لاَ يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ الصَّلاَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەسێك لە ئێوە ئەگەر لە مزگەوتدا بمێنێتەوە

بەردەوام بە نوێژ بۆی حسابە مادەم نوێژ گیری دابێت و چاوەڕوانی نوێژ بکات، وە هیچ شتێك ڕێگری نەبێت کە بگەڕێتەوە بۆ ناو خانەوادەو کەس و کاری جگە لە نوێژ).

٤٧١ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَزَالُ الْعَبْدُ فِى صَلاَةٍ مَا كَانَ فِى مُصَلاَّهُ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، تَقُولُ الْمَلاَئِكَةُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، حَتَّى يَنْصَرِفَ أَوْ يُحْدِثَ). فَقِيلَ: مَا يُحْدِثُ؟ قَالَ: يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بەندە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە بەردەوام لە نوێژدایەو بە نوێژ بۆی حسابە مادەم چاوەڕوانی نوێژ بکات، مەلائیکە دەڵێن: خودایە لێی خۆشبە، خودایە ڕەحمەت بڕێژە بەسەریدا، هەتا دەستنوێژی هەبێت یان دەڕوات). وتیان: (يُحْدِث) مانای چییە؟ فەرمووی: تسە یان تڕ.

٤٧٢ - (حسن) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَتَى الْمَسْجِدَ لِشَىْءٍ فَهُوَ حَظُّهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بە نیەتی هەر شتێکەوە بێت بۆ مزگەوت ئەوەی بۆ دەنوسرێت).

## باسی كەراهیەتی بانگەواز
## بۆ شتی ونبوو لە مزگەوتدا.

## ٢١ - بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ إِنْشَادِ الضَّالَّةِ فِي الْمَسْجِدِ.

**٤٧٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: لاَ أَدَّاهَا اللَّهُ إِلَيْكَ، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم بیستووە دەیفەرموو: (ئەگەر بەرگوێتان كەوت یەكێك لەمزگەوتدا بانگەوازی كرد بۆ شتی ونبوو، بڵێن: یاخوا نەیدۆزیتەوە، چونكە مزگەوتەكان بۆ ئەمە دروست نەكراون).

## باسی تف و بەڵغەم رۆكردن لە مزگەوتدا.

## ٢٢ – بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ الْبُزَاقِ فِي الْمَسْجِدِ.

٤٧٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (التَّفْلُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهُ أَنْ تُوَارِيَهُ).

واتە: ئەوەی لە دەم بێتە دەرەوە رۆكردنی لە مزگەوتدا گوناهە، كەفارەتی ئەو گوناهەش تەنها شاردنەوەیەتی.

٤٧٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: تف رۆكردن لە مزگەوتدا گوناهە، كەفارەتی ئەو گوناهەش تەنها شاردنەوەیەتی.

٤٧٦ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (النُّخَاعَةُ فِي الْمَسْجِدِ). فَذَكَرَ مِثْلَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (بەڵغەم و چڵم ڕۆکردن لە مزگەوتدا گوناهە..) ڕاوی بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٤٧٧ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ،، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ دَخَلَ هَذَا الْمَسْجِدَ فَبَزَقَ فِيهِ أَوْ تَنَخَّمَ، فَلْيَحْفِرْ فَلْيَدْفِنْهُ، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلْيَبْزُقْ فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ لْيَخْرُجْ بِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی هاتە ئەم مزگەوتەوە ئەگەر تف یان بەڵغەم و چڵمی ڕۆکرد با چاڵێکی بۆ هەڵکەنێ و بیشارێتەوە، ئەگەر ئەو کارەی نەکرد ئەوا با بیکاتە ناو پۆشاکەکەیەوە، پاشان کاتێ کە چووەدەرەوە لە مزگەوت دەریکات و فرێی بدات.

٤٧٨ - (صحيح) عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدُ اللَّهِ الْمُحَارِبِيِّ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا قَامَ الرَّجُلُ إِلَى الصَّلاَةِ) - أَوْ (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ) - ، فَلاَ يَبْزُقْ أَمَامَهُ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ تِلْقَاءِ يَسَارِهِ إِنْ كَانَ فَارِغًا، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ لْيَقُلْ بِهِ).

واتە: لە (طَارِق)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّـهِ الْمُحَارِبِيّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژکردن، یان نوێژی کرد با تف نەکاتە بەردەمی، هەروەها نەیکاتە لای راستی، بەڵکو با بەلای چەپدا تف بکات ئەگەر چۆڵ بوو شیاو بوو، یان لەژێر پێی چەپیدا رۆی بکات و پێی پێدا بهێنێ).

٤٧٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ يَوْمًا إِذْ رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَتَغَيَّظَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ حَكَّهَا، قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: فَدَعَا بِزَعْفَرَانٍ فَلَطَّخَهُ بِهِ، وَقَالَ: (إِنَّ اللَّـهَ قِبَلَ وَجْهِ أَحَدِكُمْ إِذَا صَلَّى، فَلاَ يَبْزُقْ بَيْنَ يَدَيْهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا بەڵغەمێکی بەرووی قیبلەوە بینی - واتە بەدیواری پێشەوە کە نوێژخوێنان لەکاتی نوێژدا رووی تێ دەکەن - لە خەڵکەکە تووڕە بوو جا بەشتێ کڕاندی و لێی کردەوە، راوی فەرموودەکە وتی: پێم وایە داوای زەعفەرانی کرد تێوەیدا، فەرمووی: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژکردن با تف نەکاتە بەردەمی، چونکە رووی لە قیبلەیە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ نَافِعٍ، نَحْوَ حَمَّادٍ: إِلاَّ أَنَّهُ لَمْ يَذْكُرُوا الزَّعْفَرَانَ، وَرَوَاهُ مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، وَأَثْبَتَ الزَّعْفَرَانَ فِيهِ، وَذَكَرَ يَحْيَى بْنُ سُلَيْمٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ الْخَلُوقَ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ریوایەتێکی تردا بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی

حەماد لە نافعەوە هاتوو، بەلام باسی زەعفەرانی نەکرد. وە مەعمەر لە ئەیوبەوە گێڕاویەتیەوە بەلام لە فەرموودەکەدا زەعفەرانی سەلماندووە، وە یەحیای کوڕی سولەیم، لە (عبداللە)وە، ئەویش لە نافعەوە، لە جیاتی زەعفەران فەرمووی: (خَلُوق)ی تێوەدا کە ئەویش بۆنێکی خۆشە.

٤٨٠ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُحِبُّ الْعَرَاجِينَ، وَلاَ يَزَالُ فِى يَدِهِ مِنْهَا، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ فَرَأَى نُخَامَةً فِى قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَحَكَّهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ مُغْضَبًا فَقَالَ: (أَيَسُرُّ أَحَدَكُمْ أَنْ يُبْصَقَ فِى وَجْهِهِ، إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَإِنَّمَا يَسْتَقْبِلُ رَبَّهُ جَلَّ وَعَزَّ، وَالْمَلَكُ عَنْ يَمِينِهِ، فَلاَ يَتْفُلْ عَنْ يَمِينِهِ، وَلاَ فِى قِبْلَتِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ، فَإِنْ عَجِلَ بِهِ أَمْرٌ فَلْيَقُلْ هَكَذَا). وَوَصَفَ لَنَا ابْنُ عَجْلاَنَ ذَلِكَ: أَنْ يَتْفُلَ فِى ثَوْبِهِ، ثُمَّ يَرُدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم حەزی لە لاسکەکانی بۆشکە خورمای وشك بوو، کاتێ کە چووە مزگەوتەوە بەدەستیەوە بوو، بەلغەمێکی بەڕووی قیبلەوە بینی بە لاسکەکە کراندی و لێی کردەوە، جا بە توڕەییەوە رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: (یەکێ لە ئێوە بەلایەوە چۆنە ئەگەر تف بکرێتە رووخساری، دەی کەسێك لە ئێوە کاتێ کە رووی لە قیبلە بوو ئەوە لە خوا دەپاڕێتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ

دەکات، وە مەلائیکەش لەلای راستیەوەن، کەواتە با رووەو قیبلە و بەلای راستیدا تف رۆنەکات، بەڵکو بەلای چەپیدا رۆی بکات یان بیکاتە ژێر پێیەوە، ئەگەر هەر ناچار بوو با ئاوا بکات .. ئیبنو عجلان وەسفی ئەوەمان بۆ دەکات و دەڵێ: واتە با بیکاتە پۆشاکەکەی خۆیەوەو بیدات بەسەر یەکدا.

٤٨١ - (صحيح) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرًا - يَعْنِي ابْنَ عَبْدُ اللَّه - وَهُوَ فِي مَسْجِدِهِ فَقَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَسْجِدِنَا هَذَا، وَفِي يَدِهِ عُرْجُونُ ابْنِ طَابٍ، فَنَظَرَ فَرَأَى فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ نُخَامَةً، فَأَقْبَلَ عَلَيْهَا فَحَتَّهَا بِالْعُرْجُونِ، ثُمَّ قَالَ: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يُعْرِضَ اللَّهُ عَنْهُ بِوَجْهِهِ). ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَلاَ يَبْصُقَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْزُقْ عَنْ يَسَارِهِ، تَحْتَ رِجْلِهِ الْيُسْرَى، فَإِنْ عَجِلَتْ بِهِ بَادِرَةٌ، فَلْيَقُلْ: بِثَوْبِهِ هَكَذَا). وَوَضَعَهُ عَلَى فِيهِ، ثُمَّ دَلَكَهُ، ثُمَّ قَالَ: (أَرُونِي عَبِيرًا). فَقَامَ فَتًى مِنَ الْحَيِّ يَشْتَدُّ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِخَلُوقٍ فِي رَاحَتِهِ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَعَلَهُ عَلَى رَأْسِ الْعُرْجُونِ، ثُمَّ لَطَخَ بِهِ عَلَى أَثَرِ النُّخَامَةِ، قَالَ جَابِرٌ: فَمِنْ هُنَاكَ جَعَلْتُمُ الْخَلُوقَ فِي مَسَاجِدِكُمْ.

واتە: لە عوبادەی کوڕی (صَّامِت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: چوین بۆلای جابری کوڕی (عبداللە) لەوکاتەدا لە مزگەوتی هۆزەکەیدا یان گەڕەکەکەی خۆیدا بوو، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هات بۆلامان لەم مزگەوتەدا لاسکێکی بۆشکە خورمای وشکی (ابْنِ طَابٍ)[1]ی بەدەستەوە بوو، چاوی گێڕا بینی بەڵغەمێك بەرووی قیبلەوەیە، چوو بەرەو لای و بە لاسکەکە کراندی و لێی کردەوە، جا فەرمووی: (کێ لە ئێوە دەیەوێت خوای گەورە رووی لێ وەرگێڕێت). - کەواتە با تف و بەڵغەم و چڵم رۆنەکات بەرەو قیبلە - ، پاشان فەرمووی: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژکردن و رووی لە قیبلە بوو، ئەوە لە خوا دەپاڕێتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ دەکات، دەی با تف نەکاتە بەردەمی، هەروەها بەلای راستیدا، بەڵکو بەلای چەپیدا رۆی بکات یان بیکاتە ژێر پێی چەپیەوە، ئەگەر هەر ناچار بوو با ئاوا بکات پۆشاکەکەی نا بە دەمیەوەو دای بەسەر یەکدا ئینجا پروانـدی. پاشان فەرمووی: (عەبیرم بۆ بێنن)[2]. لاوێکی گەڕەکەکە بە هەڵەداوان چوو بۆ ناو کەسوکاری و (خَلُوق)[3]ی بۆ هێنا، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم (خَلُوق)ەکەی کرد بەسەر لاسکی بۆشکە خورما وشکەکەداو هێنای بە شوێنەواری بەڵغەمەکەدا. جابر وتی: لەبەرئەوە با (خَلُوق) لە مزگەوتەکەتاندا هەبێت.

---

[1]- پیاوێکی خەڵکی مەدینە بوو جۆری خورماکەیان دەدایە پاڵ ئەو.

[2]- (عبیر) بۆنێکی خۆشە وەك زەعفەران وایە.

[3]- (خَلُوق) بۆنێکی خۆشە وەك زەعفەران وایە.

٤٨٢ - (حسن) عَنْ أَبِى سَهْلَةَ السَّائِبِ بْنِ خَلاَّدٍ - قَالَ أَحْمَدُ: - مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنَّ رَجُلاً أَمَّ قَوْمًا فَبَصَقَ فِى الْقِبْلَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْظُرُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: حِينَ فَرَغَ (لاَ يُصَلِّى لَكُمْ). فَأَرَادَ بَعْدَ ذَلِكَ أَنْ يُصَلِّىَ لَهُمْ، فَمَنَعُوهُ وَأَخْبَرُوهُ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: (نَعَمْ). وَحَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: (إِنَّكَ آذَيْتَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ).

واتە: لە ئەبو سەهلەی سائیبی کوڕی خەلادەوە هاتووە، – ئەحمەد وتی: کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بووە - پیاوێ بەرنوێژی بۆ کۆمەڵێك دەکرد، بەرەو رووی قیبلە تفی رۆکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاوی لێی بوو کاتێ کە لێ بوویەوە فەرمووی: (با لە ئەمڕۆ بەدواوە بەرنوێژیتان بۆ نەکات). دوای ئەوە ویستی بەرنوێژیان بۆ بکات رێگریان لێ کردو هەواڵی وتەکەی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم پێدا، ئەویش ئەوەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی: ئایا تۆ رێگریت لێ کردووم؟ فەرمووی: (بەڵێ). پێم وایە پێشی فەرموو: (چونکە تۆ ئازاری خواو پێغەمبەرەکەیت دا).

٤٨٣ - (صحيح) عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَبَزَقَ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى.

واتە: لە (مُطَرِّف)ەوە لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا نوێژی دەکرد، چاوم لێی بوو تفی رۆکردە ژێر پێی چەپیەوە.

٤٨٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْعَلاَءِ، عَنْ أَبِيهِ، بِمَعْنَاهُ زَادَ: ثُمَّ دَلَكَهُ بِنَعْلِهِ.

واتە: لە (أَبِي الْعَلاَء)ەوە، لە باوکیەوە، بەهەمان مانا هاتووە، بەلام ئەمەی بۆ زیاد کرد: پاشان بە نەعلەکانی شێلای.

٤٨٥ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: رَأَيْتُ وَاثِلَةَ بْنَ الأَسْقَعِ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ بَصَقَ عَلَى الْبُورِيِّ، ثُمَّ مَسَحَهُ بِرِجْلِهِ، فَقِيلَ لَهُ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: لأَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە مزگەوتی دیمەشق (وَاثِلَة)ی کوڕی (الأَسْقَع)م بینی تفی رۆکردە سەر حەسیر، پاشان پێکانی هێنا بەسەریدا، پێیان وت: ئەو کارەت بۆ کرد؟ وتی: چونکە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینوە بەو شێوەی کردووە.

## باسی چونەژورەوەی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر بۆ ناو مزگەوت.

## ٢٣ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُشْرِكِ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ.

٤٨٦ – (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ - وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ - فَقُلْنَا لَهُ: هَذَا الأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ! فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ أَجَبْتُكَ). فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي سَائِلُكَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: پیاوێ بە سواری وشترەکەیەوە هاتە مزگەوت وشترەکەی یەخدا واتە داینیشاند، پاشان بەستیەوەو وتی: کێتان مەحەممەدن؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناو هەواڵەکانیدا شانی دادابوو، وتیان: ئەو سپیەیە کە شانی داداوە، پیاوەکە وتی: ئەی کوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)!. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (گوێم لێتە ئەوەی دەتەوێ بیڵێ). پیاوەکە پێی دەوت: ئەی مەحەممەد من لێت دەپرسم. جا ئەنەس فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٤٨٧ - (حسن) عَنْ ابْنِ عَبَّاس، قَالَ: بَعَثَ بَنُو سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ ضِمَامَ بْنَ ثَعْلَبَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدِمَ عَلَيْهِ فَأَنَاخَ بَعِيرَهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، قَالَ: فَقَالَ: أَيُّكُمْ ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ). قَالَ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ!. وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: هۆزی (بَنُو سَعْدِ)ی کوڕی (بَكْر)ی (ضِمَام)ی کوڕی (ثَعْلَبَة)یان بە نوێنەری نارد بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە چووە خزمەتی لەبەردەم دەرگای مزگەوت وشترەکەی یەخدا، پاشان پەلی بەستەوە، پاشان چوەژوورەوە بۆ ناو مزگەوت، بە هەمان شێوە فەرمودەکەی گێڕایەوە، ئیبنو عەباس وتی: (ضِمَام) وتی: کێتان کوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِب)ن؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من کوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِب)م). وتی: ئەی کوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِب)!. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٤٨٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: الْيَهُودُ أَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ فِي أَصْحَابِهِ، فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ - فِي رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ زَنَيَا مِنْهُمْ -.

واتـه: لـه ئـهبو هـورەیرەوە هـاتووە، کـه وتویـەتی: جولەکـە هـاتن بـۆلای پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم، لەوکاتـەدا ئـەویش لـە مزگـەوت لـەناو هەواڵەکانیدا دانیشتبوو، وتیان: ئەی (أَبَا الْقَاسِمِ)! بۆمان بدوێ سەبارەت بـە ژن و پیاوێ کە زینا بکەن.

## باسی ئەو شوێنانەی کە دروست نیە نوێژیان تێدا بکرێت.

## ٢٤ - بَابُ فِي الْمَوَاضِعِ الَّتِي لاَ تَجُوزُ فِيهَا الصَّلاَةُ.

**٤٨٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (جُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا).**

واته: له (أَبِي ذَرٍّ)ەوە هاتووە، که وتویەتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسلم فەرموویەتی: (زەویم بۆ کراوە بە پاکۆکەر و مزگەوت).

**٤٩٠ - (ضعيف) عَنْ أَبِي صَالِحٍ الْغِفَارِيِّ: أَنَّ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مَرَّ بِبَابِلَ وَهُوَ يَسِيرُ، فَجَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ يُؤَذِّنُ بِصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَلَمَّا بَرَزَ مِنْهَا أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: إِنَّ حِبِّي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانِي أَنْ أُصَلِّيَ فِي الْمَقْبُرَةِ، وَنَهَانِي أَنْ أُصَلِّيَ فِي أَرْضِ بَابِلَ، فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ.**

واتە: لە (أَبِی صَالِحٍ الْغِفَارِیِّ)ەوە هاتووە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بە بابل دا تێپەڕی و رێی دەکرد، بانگبێژ هات وتی قوربان کاتی نوێژی عەسرە بانگ بدەم، کاتێ کە لە بابل دەرچوو فەرمانی کرد بە بانگبێژ کە بانگ بدات و قامەت بکات، جا پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بەرنوێژی بۆ کردن، کاتێ کە لە نوێژ بوویەوە فەرمووی: خۆشەویستم رێگری لێ کردووم کە لە گۆڕستاندا نوێژ بکەم، هەروەها رێگریشی لێ کردووم کە لە زەوی بابل دا نوێژ بکەم، چونکە بەر غەزەبی خوا کەوتووەو نەفرەتی لێکراوە.

٤٩١ - عَنْ عَلِیٍّ، بِمَعْنَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ ، قَالَ: فَلَمَّا خَرَجَ، مَكَانَ: فَلَمَّا بَرَزَ.

واتە: لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ بە هەمان مانای فەرموودەکەی سولەیمانی کوری داود هاتووە، بەڵام ئەحمەدی کوڕی سالح لە جیاتی (فَلَمَّا بَرَزَ). وتی: (فَلَمَّا خَرَجَ)- کە هەمان مانایان هەیە - .

٤٩٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ، إِلاَّ الْحَمَّامَ وَالْمَقْبُرَةَ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زەوی هەمووی مزگەوتە – واتە دروستە نوێژی تێدا بکرێت – تەنها گەرماو و گۆڕستان نەبێت).

## باسی قەدەغەكردنی نوێژكردن
## لە مۆڵگەی وشتردا.

## ٢٥ – بَابُ النَّهْيِ عَنْ الصَّلاَةِ فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ.

٤٩٣ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الصَّلاَةِ فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ فَقَالَ: (لاَ تُصَلُّوا فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ، فَإِنَّهَا مِنَ الشَّيَاطِينِ). وَسُئِلَ عَنْ الصَّلاَةِ فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ فَقَالَ: (صَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ).

واتە: لە بەرائی كوڕی عازبەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی سەبارەت بە نوێژكردن لە مۆڵگەی وشتردا؟ ئەویش فەرمووی: (لە مۆڵگەی وشتردا نوێژ مەكەن، چونكە ئەوانە لە شەیتانەكانەوەیە و شوێنی شەیتانەكانە). هەروەها سەبارەت بە نوێژكردن لە مۆڵگەی مەڕدا – پەچەی ڕان - لێیان پرسی؟ فەرمووی: (لەمۆڵگەی مەڕدا نوێژ بكەن، چونكە ئەوانە بەرەكەتن).

## باسی کەی فەرمان دەکرێت
## بە منداڵ نوێژ بکات.

## ٢٦ - بَابُ مَتَى يُؤْمَرُ الْغُلاَمُ بِالصَّلاَةِ.

| |
|---|
| ٤٩٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلاَةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ، وَإِذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا). |

واتە: لە (عَبْدِ الْمَلِكِ کوڕی الرَّبِيعِ کوڕی سَبْرَةَ)ەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان لەحەوت ساڵیدا نوێژ بکەن، وە لە دە ساڵیدا بەلێدانێکی سوك لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد).

| |
|---|
| ٤٩٥ - (حسن صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِينَ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ). |

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان لەحەوت ساڵیدا نوێژ بکەن، وە لە دە ساڵیدا بەلێدانێکی سوك لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد، جێگەشیان جیابکەنەوە با بەیەکەوە نەخەون.

٤٩٦ - (حسن) عَنْ دَاوُدُ بْنُ سَوَّارٍ الْمُزَنِيُّ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، وَزَادَ: (وَإِذَا زَوَّجَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ عَبْدَهُ أَوْ أَجِيرَهُ، فَلاَ يَنْظُرْ إِلَى مَا دُونَ السُّرَّةِ وَفَوْقَ الرُّكْبَةِ).

واتە: لە (دَاوُدُ کوڕی سَوَّارٍ الْمُزَنِيّ)ەوە بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیادکردووە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە کەنیزەکەکەی خۆی مارە کرد بۆ بەندەکەی یان بۆ خزمەتکارەکەی ئەو کەسەی کە بەکرێ کاری بۆ دەکات، ئەوا با سەیری نێوان ئەژنۆ و ناوکی کەنیزەکەکەی نەکات. -چونکە لەو حاڵەتەدا دەبێتە کەنیزەکێکی بێگانە، بە مانایەکی تر با کەنیزەکەکە سەیری نێوان ئەژنۆ و ناوکی گەورەکەی نەکات).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهِمَ وَكِيعٌ فِي اسْمِهِ، وَرَوَى عَنْهُ أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ هَذَا الْحَدِيثَ فَقَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَمْزَةَ سَوَّارٌ الصَّيْرَفِيُّ.

ئەبو داود دەڵێت: وەکیع راوی فەرمودەکە ناوی شێخەکەی لێ تێك چووە، ئەبو داودی (طَّيَالِسِيّ)یش ئەم فەرمودەی لێ گێڕاوەتەوە وتویەتی: ئەبو حەمزەی (سَوَّارٌ الصَّيْرَفِيُّ)ی بۆی گێڕامەوە.

٤٩٧ - (ضعيف) عَنْ هِشَامُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنِى مُعَاذُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ الْجُهَنِىُّ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَيْهِ فَقَالَ: لامْرَأَتِهِ مَتَى يُصَلِّى الصَّبِىُّ؟ فَقَالَتْ: كَانَ رَجُلٌ مِنَّا يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (إِذَا عَرَفَ يَمِينَهُ مِنْ شِمَالِهِ، فَمُرُوهُ بِالصَّلاَةِ).

واتە: هیشامی کوڕی سەعد وتی: چوینە لای (مُعَاذ)ی کوڕی (عبداللە)ی کوڕی (خُبَيْبٍ الْجُهَنِىّ)، لەوکاتەدا (مُعَاذ) بە ژنەکەی وت: کەی فەرمان دەکرێت بە منداڵ نوێژ بکات؟ ئەویش وتی: یەکێ لە ئێمە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێڕاویەتیەوە، کە لەوبارەوە لێیان پرسیوە؟ ئەویش فەرمویەتی: (ئەگەر منداڵ ڕاست و چەپی خۆی ناسی فەرمانی پێ بکەن بە نوێژکردن).

## باسی سەرەتای بانگدان.

## ٢٧ - بَابُ بَدْءِ الأَذَانِ.

٤٩٨ - (حسن) عَنْ أَبِى عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: اهْتَمَّ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلصَّلاَةِ، كَيْفَ يَجْمَعُ النَّاسَ لَهَا؟ فَقِيلَ لَهُ: انْصِبْ رَايَةً عِنْدَ حُضُورِ الصَّلاَةِ، فَإِذَا رَأَوْهَا آذَنَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا فَلَمْ يُعْجِبْهُ ذَلِكَ، قَالَ: فَذُكِرَ لَهُ الْقُنْعُ - يَعْنِى

الشَّبُّورَ - وَقَالَ زِيَادٌ: شَبُّورَ الْيَهُودِ - فَلَمْ يُعْجِبْهُ ذَلِكَ، وَقَالَ: « هُوَ مِنْ أَمْرِ الْيَهُودِ ». قَالَ: فَذُكِرَ لَهُ النَّاقُوسُ فَقَالَ: « هُوَ مِنْ أَمْرِ النَّصَارَى ». فَانْصَرَفَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ وَهُوَ مُهْتَمٌّ لِهَمِّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُرِيَ الأَذَانَ فِي مَنَامِهِ، قَالَ: فَغَدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ ﴿لَهُ﴾: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَبَيْنَ نَائِمٍ وَيَقْظَانَ إِذْ أَتَانِي آتٍ فَأَرَانِي الأَذَانَ، قَالَ: وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَدْ رَآهُ قَبْلَ ذَلِكَ، فَكَتَمَهُ عِشْرِينَ يَوْمًا، قَالَ: ثُمَّ أَخْبَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ: « مَا مَنَعَكَ أَنْ تُخْبِرَنِي ». فَقَالَ: سَبَقَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، فَاسْتَحْيَيْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « يَا بِلاَلُ، قُمْ فَانْظُرْ مَا يَأْمُرُكَ بِهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ فَافْعَلْهُ ». قَالَ: فَأَذَّنَ بِلاَلٌ، قَالَ أَبُو بِشْرٍ: فَأَخْبَرَنِي أَبُو عُمَيْرٍ أَنَّ الأَنْصَارَ تَزْعُمُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ لَوْلاَ أَنَّهُ كَانَ يَوْمَئِذٍ مَرِيضًا لَجَعَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ مُؤَذِّنًا.

واتە: لە ئەبو عومەیری کوڕی ئەنەسەوە، لە پورێکیەوە کە لە

یاریدەدەران(أَنْصَار) بوو هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زۆر بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی کە چۆن خەڵك کۆبکاتەوە بۆ نوێژ، هەندێ لە هاوەڵان پێیان وت: لەکاتی نوێژدا ئاڵایەك بەرزبکرێتەوە بۆ ئەوەی هەرکە موسوڵمانان بینیان یەکتر ئاگادار بکەنەوەو بێن بۆ نوێژ، ئەو کارەی پێ ناخۆش بوو بەدڵی نەبوو - چونکە بە شەوا نەدەبینراو، ئەوانەی کە خەریکی ئیش و کار بوون نەیاندەبینی و پێویستیان بەوە بوو کە گوێیان لێی بێ یان هەواڵیان بدەنێ - ، ئەبو عومەیر وتی: جا باسی کەڕەنایان بۆ کرد، زیاد وتی: کەڕەنای جولەکە، ئەو کارەشی پێ ناخۆش بوو بەدڵی نەبوو- چونکە خۆچواندن بوو بە جوەکان - ، فەرمووی: (کەڕەنا لە کاری جولەکەکانە). جا باسی زەنگیان بۆ کرد، فەرمووی: (زەنگیش لە کاری گاورەکانە). (عبداللە)ی کوڕی زەیدی کوڕی (عَبْدِ رَبِّهِ) گرنگی زۆری دەدا بەو بە پەرۆشیەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو، لەخەودا چۆنیەتی بانگدانی بینی، ئەبو عومەیر وتی: لەکاتی نوێژی بەیانیدا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نێوان خەوتن و بەخەبەربووندا بووم - واتە خەوێکی سوك - مەلائیکەیە هات و بانگدانی فێر کردم، ئەبو عومەیر وتی: عومەری کوڕی (خَطَّابِ) رەزای خوای لێ بێ پێشتر ئەو خەوەی دی بوو بەڵام بیست رۆژ شاردیەوەو باسی نەکرد، - ئەبو عومەیر وتی - جا عومەر رەزای خوای لێ بێ خەوەکەی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (چی رێگری لێ کردی کە ئەو خەوەم بۆ باس نەکەیت؟). وتی: (عبداللە)ی کوڕی زەید پێشم کەوت، بۆیە شەرمم دەکرد بۆت باس بکەم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی بیلال هەستە بچۆرە شوێنێکی بەرز سەیرکە بزانە (عبداللە)ی کوڕی زەید چ فەرمانێکت پێ دەکات جێ بەجێی بکە). راوی وتی: بیلال بانگی فەرموو. راوی وتی: ئەبو بیشر وتی: ئەبو عومەیر بۆی

گێڕامەوە، كە یاریدەدەران(أَنْصَار) پێیان وابوو ئەگەر (عبداللە)ی كوڕی زەید لەوكاتەدا نەخۆش نەبوایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوی دەكرد بە بانگبێژ.

٤٩٩ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ: لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالنَّاقُوسِ يُعْمَلُ لِيُضْرَبَ بِهِ لِلنَّاسِ لِجَمْعِ الصَّلاَةِ، طَافَ بِي - وَأَنَا نَائِمٌ - رَجُلٌ يَحْمِلُ نَاقُوسًا فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ أَتَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ فَقُلْتُ: نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: أَفَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ لَهُ: بَلَى، قَالَ: فَقَالَ: تَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، قَالَ: ثُمَّ اسْتَأْخَرَ عَنِّي غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ قَالَ: وَتَقُولُ إِذَا أَقَمْتَ الصَّلاَةَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَدْ

قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَلَمَّا أَصْبَحْتُ، أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا رَأَيْتُ، فَقَالَ: «إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقُمْ مَعَ بِلاَلٍ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ، فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ». فَقُمْتُ مَعَ بِلاَلٍ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيهِ عَلَيْهِ وَيُؤَذِّنُ بِهِ، قَالَ: فَسَمِعَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ وَيَقُولُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا رَأَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «فَلِلَّهِ الْحَمْدُ».

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی زەیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڕیاریدا زەنگ لێ بدرێت بۆ بانگ کردن بۆ نوێژ – کە خۆیشی حەزی لێ نەدەکرد، چونکە لە کاری گاورەکان دەچوو- جا لەخەومدا پیاوێ بەدەورمدا دەسوڕایەوە دوو جلی سەوزی لەبەردا بوو وە زەنگێکی بەدەستەوە بوو، منیش پێم وت: ئەی بەندەی خوا ئایا ئەو زەنگە نافرۆشیت؟ وتی: تۆ بۆ چیتە؟ وتم: بانگی خەڵکی پێ دەکەین بۆ نوێژ، ئەویش وتی: ئایا شتێکت پێ نیشان نەدەم لەوە چاکتر بێت؟ وتم: بەڵێ، جا وتی بڵێن: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، الله أَكْبَرُ. لاَ

إِلَهَ إِلاَّ اللهُ). پاشان کەمێ دوورکەوتەوەو جارێکی تر گەڕایەوەو وتی: ئەگەر نوێژ دابەسترا - واتە بۆ قامەتیش - بڵێن: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ). جا بەیانی هە ستام و هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەم خەوە حەقە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، هەستە لەگەڵ بیلال بڕۆ چۆنت بینیوە بۆی بڵێ با بانگ بدات، چونکە دەنگی ئەو لە دەنگی تۆ بەرزترە، (عبداللە)ی کوڕی زەید وتی: عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ لە ماڵی خۆیەوە کە گوێی لە بانگ بوو بە پەلە هات پۆشاکەکەی رادەکێشا بەدوای خۆیا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ناردووە وەك ئەمەم بە چاوی خۆم دی لە خەودا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سوپاس و ستایش بۆ خوا).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَكَذَا رِوَايَةُ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنِ زَيْدٍ، وَقَالَ فِيهِ ابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ: «اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ».

ئەبو داود دەڵێت: ریوایەتی زوهری لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ئەویش لە (عبداللە)ی کوڕی زیدەوە وەك ئەو گۆ(لفظ)ە یە کە لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمیەوە هاتووە، کە ئەویش چوار جار: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ) کردنە لە یەکەم جاردا. هەروەها وەك ئەویش ریوایەتی موحەممەدی کوڕی ئیسحاقە لە زوهریەوە،

چونكە چوار (الله أكبر)ی تێدایە، كەواتە هەردوو ڕیوایەتەكەی موحەممەدی كوڕی ئیسحاق هەماهەنگن لەسەر چوار (الله أكبر) لە یەكەم جاردا.

(صحيح ولكن الأصح تربيع التبكير) وَقَالَ مَعْمَرٌ وَيُونُسُ، عَنْ الزُّهْرِيِّ فِيه: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ لَمْ يُثَنِّيَا.

واتە: مەعمەر و یونس دەڵێن: لە زوهریەوە لە فەرمووودەكەدا هاتووە كە: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) دووجارە نەك چوار.

٥٠٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي سُنَّةَ الأَذَانِ؟ قَالَ: فَمَسَحَ مُقَدَّمَ رَأْسِي، وَقَالَ: « تَقُولُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، تَرْفَعُ بِهَا صَوْتَكَ، ثُمَّ تَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، تَخْفِضُ بِهَا صَوْتَكَ، ثُمَّ تَرْفَعُ صَوْتَكَ بِالشَّهَادَةِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، فَإِنْ كَانَ صَلاَةَ الصُّبْحِ قُلْتَ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ».

واتە: لە (أَبُو مَحْذُورَةَ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێری سوننەتی بانگدانم بکە؟ وتی: دەستی هێنا بە بەشی پێشەوەی سەرماو فەرمووی: بڵێ: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ). دەنگت بەرزکەرەوە، پاشان لەبەر خۆتەوە بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ). جا لەکاتی شایەتیداندا دەنگت بەرزکەرەوە بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ). ئەگەر بانگی بەیانی بوو بڵێ: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ).

**٥٠١ - (صحيح دون قول: فكَانَ أبُو مَحْذُورَةَ لاَ يَجُزُّ) عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَ هَذَا الْخَبَرِ، وَفِيهِ: « الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فِي الأُولَى مِنَ الصُّبْحِ ».**

واتە: (أَبُو مَحْذُورَةَ) وەك فەرموودەکەی پێشوو هێناویەتی، بەڵام لە بانگی یەکەمی بەیانیدا بۆ نوێژ: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ)ی تێدایە.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ مُسَدَّدٍ أَبْيَنُ، قَالَ فِيهِ: ﴿قَالَ﴾: وَعَلَّمَنِي الإِقَامَةَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ: « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ**

مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ».

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی موسەدەد رونترە، تێیدا هاتووە کە وتویەتی: وتی: قامەتیشی فێر کردم دووجار دووجار: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله).

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَقَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: « وَإِذَا أَقَمْتَ الصَّلاَةَ فَقُلْهَا مَرَّتَيْنِ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ أَسَمِعْتَ ». قَالَ: فَكَانَ أَبُو مَحْذُورَةَ لاَ يَجُزُّ نَاصِيَتَهُ، وَلاَ يَفْرِقُهَا، لأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ عَلَيْهَا.

ئەبو داود دەڵێت: (عَبْدُ الرَّزَّاق) وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە (أَبُو مَحْذُورَة)ی فەرموو: (کاتێ کە قامەتت کرد دووجار بڵێ: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، گوێت لێ بوو). وە (عَبْدُ الرَّزَّاق) وتی: (أبو محذورة) پێشی سەری نەدەبڕی و، لەناوەڕاستدا نەیدەکرد بە دوو بەشەوە، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی هێنا بەسەریا.

٥٠٢ - (حسن صحيح) عَنْ أَبَا مَحْذُورَةَ، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَّمَهُ الأَذَانَ تِسْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، وَالإِقَامَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، الأَذَانُ: « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَالإِقَامَةُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ».

واتە: لە (أَبَا مَحْذُورَةَ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێری بانگدانی کردم، نۆزدە وشە بوو، وە فێری قامەتیشی کردم حەڤدە وشە بوو، بانگ ئەمەیە: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ،

الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إلاّ الله). وه قامـەتیش ئـەمەیـه: (الله أَكْبَـرُ الله أَكْبَـرُ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاّ الله، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاّ الله، أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَـى الصَّـلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَـدْ قَامَـتِ الصَّـلاَةُ، الله أَكْبَـرُ الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إلاّ الله).

**٥٠٣ - (صحيح) عَنْ أَبِى مَحْذُورَةَ ، قَالَ: أَلْقَى عَلَـىَّ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ التَّأْذِينَ هُوَ بِنَفْسِهِ فَقَالَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ، أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ اللَّـهِ». ﴿مَـرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ﴾، قَالَ: (ثُمَّ ارْجِعْ فَمُدَّ مِنْ صَوْتِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّـهِ، حَـىَّ عَلَـى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَـىَّ عَلَـى الْفَـلاَحِ، حَـىَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ».**

واتە: لە (أَبِى مَحْذُورَةَ)ەوە هاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم خۆی بەم شێوەیە فێری بانگدانی کـردم فـەرمووی: (بڵـێ: الله أَكْبَـرُ الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاّ الله، أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ الله). دووجـار دووجار، فـەرمووی:

پاشان دووبارەی بکەرەوەو دەنگت درێژکەرەوە (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ الله، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ الله، حَـيَّ عَلَـى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إلاَّ الله).

٥٠٤ - (صحيح) عَنْ أَبِى مَحْذُورَةَ ، قَالَ: أَلْقَى عَلَـىَّ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَذَانَ حَرْفًا حَرْفًا: « اللَّهُ أَكْبَـرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَـرُ، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّـلاَةِ، حَيَّ عَلَـى الصَّـلاَةِ، حَـيَّ عَلَـى الْفَـلاَحِ، حَـيَّ عَلَـى الْفَلاَحِ». قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ فِى الْفَجْرِ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ.

واتە: لە (أَبِى مَحْذُورَةَ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی وشە بە وشە بەم شێوەیە فێری بانگدانی کردم: (الله أَكْبَـرُ الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) چوار جار. (أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاَّ الله، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إلاَّ الله) دووجار، (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ الله) دووجار، (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) دووجار، (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) دووجار. راوی وتی: (أَبِى مَحْذُورَةَ) لە بانگی بەیاندا لەدوای: (حَيَّ عَلَى الْفَـلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)، دەیوت: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ). واتە: دووجار.

٥٠٥ - (صحيح بتربيع التكبير) عَنْ أَبِى مَحْذُورَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَّمَهُ الأَذَانَ يَقُولُ « اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ». ثُمَّ ذَكَرَ مِثْلَ أَذَانِ حَدِيثِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ، وَمَعْنَاهُ.

واتە: لە (أَبِى مَحْذُورَةَ)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە فێری بانگدانی فێرکردووەو فەرموویەتی: بڵێ: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله). پاشان راوی بە هەمان ماناو شێوەی بانگی فەرموودەکەی ئیبنو جورەیج لە (عَبْدِ الْعَزِيزِ)ی کوڕی (عَبْدِ الْمَلِكِ)ەوە گێڕایەوە، — واتە: دووجار: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) نەك چوار جار-.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَفِى حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ أَبِى مَحْذُورَةَ، قُلْتُ: حَدِّثْنِى عَنْ أَذَانِ أَبِيكَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَذَكَرَ، فَقَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ». قَطُّ.

ئەبو داود دەڵێت: وە لە فەرموودەکەی مالیکی کوڕی دینار‌دا دووجار (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) هاتووە، کە وتویەتی: لە (ابْنَ أَبِى مَحْذُورَةَ)م پرسی؟ وتم: بانگەکەی باوکتم بۆ باس بکە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فێری کرد؟

جا باسی کرد بۆی و وتی: دووجار (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَـرُ)ی کـرد، واتـه لـه دووجـار زیاتری نەوت.

(منكر: والمحفوظ الترجيع في الشهادتين) وَكَذَلِكَ حَـدِيثُ جَعْفَـرِ بْـنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ ابْنِ أَبِى مَحْذُورَةَ، عَنْ عَمِّهِ، عَـنْ جَـدِّهِ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: «ثُمَّ تَرَجَّعْ فَتَرَفَّعْ صَوْتَكَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّـهُ أَكْبَرُ».

واتــه: وه فەرموودەکــەی مــالیکی کــوڕی دینـــار وەك فەرموودەکــەی جەعفەری کوڕی سولەیمان وایـه، لـه دووجـار وتنـی: (اللهُ أَكْبَـرُ اللهُ أَكْبَـر)دا کـه ئەویش لە (ابْنَ أَبِي مَحْذُورَةَ)ەوە، لە مامیەوە، لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوە، تەنها ئـەوە نـەبێت کـە جەعفـەر وتویـەتی: (پاشـان دووبـارەی بکـەرەوەو دەنگـت بەرزبکەرەوەو بڵێ: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ).

٥٠٦ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْـنَ أَبِـى لَيْلَـى، قَالَ: أُحِيلَـتِ الصَّـلاَةُ ثَلاَثَـةَ أَحْـوَالٍ، قَـالَ: وَحَـدَّثَنَا أَصْحَابُنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: «لَقَدْ أَعْجَبَنِى أَنْ تَكُونَ صَلاَةُ الْمُسْـلِمِينَ - أَوْ قَـالَ: الْمُؤْمِنِينَ - وَاحِدَةً حَتَّى لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَبُثَّ رِجَالاً فِى الدُّورِ يُنَادُونَ النَّاسَ بِحِينِ الصَّلاَةِ، وَحَتَّـى هَمَمْـتُ أَنْ آمُرَ رِجَالاً يَقُومُونَ عَلَـى الآطَـامِ يُنَـادُونَ الْمُسْـلِمِينَ بِحِينِ الصَّلاَةِ، حَتَّى نَقَسُوا أَوْ كَادُوا أَنْ يَنْقُسُوا». قَالَ:

فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي لَمَّا رَجَعْتُ لِمَا رَأَيْتُ مِنَ اهْتِمَامِكَ رَأَيْتُ رَجُلاً كَأَنَّ عَلَيْهِ ثَوْبَيْنِ أَخْضَرَيْنِ، فَقَامَ عَلَى الْمَسْجِدِ فَأَذَّنَ، ثُمَّ قَعَدَ قَعْدَةً، ثُمَّ قَامَ: فَقَالَ مِثْلَهَا إِلاَّ أَنَّهُ يَقُولُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، وَلَوْلاَ أَنْ يَقُولَ النَّاسُ - قَالَ: ابْنُ الْمُثَنَّى أَنْ تَقُولُوا - لَقُلْتُ إِنِّي كُنْتُ يَقْظَانًا غَيْرَ نَائِمٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: - وَقَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى - لَقَدْ أَرَاكَ اللَّهُ ﴿عَزَّ وَجَلَّ﴾ خَيْرًا - وَلَمْ يَقُلْ عَمْرٌو: لَقَدْ أَرَاكَ اللَّهُ خَيْرًا ، فَمُرْ بِلاَلاً فَلْيُؤَذِّنْ، فَقَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذِي رَأَى، وَلَكِنِّي لَمَّا سُبِقْتُ اسْتَحْيَيْتُ. قَالَ: وَحَدَّثَنَا أَصْحَابُنَا ، قَالَ: وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا جَاءَ يَسْأَلُ فَيُخْبَرُ بِمَا سُبِقَ مِنْ صَلاَتِهِ، وَإِنَّهُمْ قَامُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَيْنِ قَائِمٍ وَرَاكِعٍ وَقَاعِدٍ وَمُصَلٍّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: ابْنُ الْمُثَنَّى - قَالَ عَمْرٌو: وَحَدَّثَنِي بِهَا حُصَيْنٌ، عَنْ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، حَتَّى جَاءَ مُعَاذٌ ، قَالَ شُعْبَةُ: - وَقَدْ سَمِعْتُهَا مِنْ حُصَيْنٍ - فَقَالَ لاَ أَرَاهُ عَلَى حَالٍ إِلَى قَوْلِهِ كَذَلِكَ فَافْعَلُوا.

واته: لە عەمری کوڕی موڕڕەوە هاتووە، کە وتویەتی، لە (ابْـنَ أَبِـی لَیْلَـی)م بیست وتی: سێ جار نوێژ لە حاڵەتێکەوە گۆڕاوە بۆ حاڵەتێکی تر واتە سێ جار گۆڕانی بەسەردا هاتووە – بێگومان ئەو گۆڕانانە بانگیش دەگرێتەوە - ، وتی: هاوەڵانمان گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە خۆشیاندا سەرسام بووم کە بینیم نوێژی موسوڵمانان – یان باوەڕداران – یەکە واتە بە کۆمەڵ نوێژ دەکەن، هەتا نیازم کرد چەند کەسێك بڵاوبکەمەوە بەناو کۆڵانەکاندا بۆ ئەوەی هەواڵی کاتی نوێژ بە خەڵك ڕابگەیەنن، وە هەتا نیازم کرد فەرمان بدەم بە پیاوانێك کە هەستن بچنە سەر بینا بەرزەکان یان سەر قەڵاکان بۆ ئەوەی هەواڵی کاتی نوێژ بە موسوڵمانان ڕابگەیەنن، واتە زەنگ لێ بدەن، یان ویستیان زەنگ لێ بدەن، یا نزیك بوو زەنگ لێ بدەن). (ابْنَ أَبِی لَیْلَی) وتی: تاکو پیاوێ لە یاریدەدەران - بەناوی (عبدالله)ی کوڕی زەید- هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە تۆم بەو بەپەرۆشیەوە دی بۆ کۆبوونەوەی خەڵك بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، لەلای تۆ گەڕامەوە بۆماڵەوە، لەخەومدا پیاوێکم دی دوو جلی سەوزی لەبەردا بوو، هەستا چووە سەربانی مزگەوت و بانگی دا، پاشان کەمێك دانیشت و جا هەستایەوە وەك وشەکانی بانگی وتەوە بەڵام ئەوەندە هەیە کە (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَة)ی بۆ زیاد کرد، ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبوایە کە خەڵك پێم بڵێن: درۆدەکەیت - (ابْنُ الْمُثَنَّی) وتی: کە خەڵك بیان وتایە: درۆدەکات – دەموت: من بە خەبەر بووم و نەخەوتبووم، - لە ریوایەتی (ابْنُ الْمُثَنَّی)دا: خوای گەورە خێری نیشان داویت -. هاتووە – بەڵام لە ریوایەتی (عَمْرٌو)دا: - خوای گەورە خێری نیشان داویت -. نەهاتووە، بڕۆ فەرمان بدە بە بیلال با بەو شێوەیەی بینیوتە بانگ بدات). عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: بەڵکو منیش ئەمەم لە خەودا بینی وەك چۆن - (عَبْدُ اللَّه کوڕی زَیْدِ) - دیویەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو پێشم کەوت

من پێم شەرمم بوو باسی بکەم. واتە: (ابْنَ أَبِي لَيْلَى) وتی: وە هاوەڵانمان گێڕاویانەتەوە، کە وتویانە: ئەگەر پیاوێ لە هاوەڵان بهاتایە بۆ مزگەوت لەوکاتەدا خەڵکەکە بە کۆمەڵ نوێژیان بکردایە لە نوێژخوێنانی دەپرسی چەند رکاتیان کردووە؟ ئەوانیش هەواڵیان دەدایە کە چەند رکاتیان کردووە - بۆ نمونە رکاتێ یان دووان، جا ئەویش بەپەلە رکاتەکە یان دوو ڕکاتەکەی دەکرد، پاشان لەگەڵ پێشنوێژ دەچووە ناو نوێژەوە – کەواتە نوێژخوێنان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژیان دەکرد، بەڵام ئەوەیان نەدەکرد کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیکرد، بەڵکو هەیان بوو بە پێوە بوو، هەیان بوو لە رکوعدا بوو، هەیان بوو دانیشت بوو، هەشیان بوو پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم چی دەکرد، ئەویش ئەوەی دەکرد – واتە پێچەوانەی ئەوی نەدەکرد - . (ابْنُ الْمُثَنَّى) دەڵێت: عەمر وتی: ئەم ریوایەتە (حُصَيْن) لە (ابْنِ أَبِي لَيْلَى)ەوە گێڕاویەتیەوە بۆم، وتی: هەتا (مُعَاذ) هات... شوعبە وتی: منیش ئەم ریوایەتەم لە (حُصَيْن)ەوە بیستووە، (مُعَاذ) وتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم لەهەر حاڵەتێکدا دیبێت هەتا وتەکەی کە دەڵێ: منیش چوومەتە ئەو حاڵەتەوەو بەو شێوەیەم کردووە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ مَرْزُوقٍ، قَالَ: فَجَاءَ مُعَاذٌ فَأَشَارُوا إِلَيْهِ، قَالَ شُعْبَةُ: وَهَذِهِ سَمِعْتُهَا مِنْ حُصَيْنٍ، قَالَ: فَقَالَ مُعَاذٌ: لاَ أَرَاهُ عَلَى حَالٍ إِلاَّ كُنْتُ عَلَيْهَا، قَالَ: فَقَالَ: إِنَّ مُعَاذًا قَدْ سَنَّ لَكُمْ سُنَّةً كَذَلِكَ فَافْعَلُوا. قَالَ: وَحَدَّثَنَا أَصْحَابُنَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ أَمَرَهُمْ بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، ثُمَّ أُنْزِلَ رَمَضَانُ وَكَانُوا قَوْمًا لَمْ يَتَعَوَّدُوا

الصِّيَامَ، وَكَانَ الصِّيَامُ عَلَيْهِمْ شَدِيدًا، فَكَانَ مَنْ لَمْ يَصُمْ أَطْعَمَ مِسْكِينًا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ) فَكَانَتِ الرُّخْصَةُ لِلْمَرِيضِ وَالْمُسَافِرِ فَأُمِرُوا بِالصِّيَامِ.

ئەبو داود دەڵێت: پاشان گەڕامەوە سەر فەرموودەکەی عەمری کوڕی مەرزوق، وتی: (مُعَاذ) هات ئامازەیان بۆ کرد، - شوعبە وتی: بەم شێوەیە لە (حُصَيْن)ەوە ئەم وتەیەم بیستووە - (ابْنِ أَبِي لَيْلَى) وتی: (مُعَاذ) وتی: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم لەهەر حاڵەتێکدا دیبێت ئیللا منیش چوومەتە ئەو حاڵەتەوە، لەدوای سەلام دانەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تەواوم دەکرد. (مُعَاذ) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بێگومان (مُعَاذ) سوننەتێکی چاکی داهێناوە دەی ئێوەش بەو شێوەیە بکەن). (ابْنَ أَبِي لَيْلَى) وتی: وە هاوەڵانمان گێڕاویانەتەوە، کە وتویانە: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینەو گەیشتە ئەوێ فەرمانی کرد بە موسوڵمانان کە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بن لە مانگێکدا، کە ئایەتی ڕۆژووی ڕەمەزان دابەزی ئەوان گەلێك بوون لەسەر ڕۆژووگرتن ڕانەهاتبوون، ڕۆژووگرتن لەلایان زۆر قورس و گران بوو، هەرکەس لەوان ئەگەر ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبوایە خواردنی دەدا بە هەژارێك، ئەم ئایەتە دابەزی: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ). ﴿البقرة: ١٨٥﴾. واتە: هەر کەسێك لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی با بە ڕۆژوو بێت. ئەمەش ڕوخسەتێك بوو بۆ نەخۆش و ئەو کەسەی کە سەفەری بوایە، فەرمانی کرد بەوانەی کە بەهانەی شەرعیان نەبوو بەڕۆژوو بن.

قَالَ: وَحَدَّثَنَا أَصْحَابُنَا، قَالَ: وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَفْطَرَ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يَأْكُلَ، لَمْ يَأْكُلْ حَتَّى يُصْبِحَ، قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَأَرَادَ امْرَأَتَهُ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ نِمْتُ، فَظَنَّ أَنَّهَا تَعْتَلُّ، فَأَتَاهَا. فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَرَادَ الطَّعَامَ، فَقَالُوا: حَتَّى نُسَخِّنَ لَكَ شَيْئًا، فَنَامَ فَلَمَّا أَصْبَحُوا" أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ).

(ابْنَ أَبِى لَيْلَى) وتى: وە هاوەڵانمان گێڕاویانەتەوە، كە سەرەتا ئەگەر كەسێك بەگەیشتایەتە كاتی رۆژوو شكاندن پێش ئەوەی رۆژووەكەی بشكێنێت دەخەوت و هیچی نەدەخوارد هەتا بەیانی. وتی: هەتا عومەری كوڕی (خَطَّاب) هاتەوە بۆ ماڵەوەو ویستی لەگەڵ خێزانەكەی جوت ببێت، خێزانەكەی وتی: من پێش ئەوەی خواردن بخۆم خەوتم بۆیە جوت بوونم لەسەر حەرامە، عومەر وای دەزانی بە گاڵتەوە بەهانەی بۆ هێناوەتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵی جوت نەبێت، بۆیە لەگەڵی جوت بوو. پیاوێ لە یاریدەدەران بەڕۆژوو بوو هاتەوە بۆلای خێزانەكەی و داوای خواردنی كرد، ئەویش وتی: ئارام بگرە هەتا شتێكت بۆ گەرم كەمەوە، پیاوەكە خەوی لێكەوت پێش ئەوەی خواردنەكە بخوات، كاتێ كە موسوڵمانان رۆژیان لێ بوویەوە، ئەم ئایەتە بۆ پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم دابەزی: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ). ﴿البقرة: ١٨٧﴾. واتە: رێتان پێ دراوە لەشەوانی رۆژوو(ی رەمەزان)دا درووست بوون لەگەڵ ژنەكانتان.

٥٠٧ - (صحيح) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: أُحِيلَتِ الصَّلاَةُ ثَلاَثَةَ أَحْوَالٍ، وَأُحِيلَ الصِّيَامُ ثَلاَثَةَ أَحْوَالٍ، وَسَاقَ نَصْرٌ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَاقْتَصَّ ابْنُ الْمُثَنَّى مِنْهُ قِصَّةَ صَلاَتِهِمْ، نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَطُّ، قَالَ: الْحَالُ الثَّالِثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَصَلَّى - يَعْنِى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ - ثَلاَثَةَ عَشَرَ شَهْرًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾. فَوَجَّهَهُ اللَّهُ تَعَالَى إِلَى الْكَعْبَةِ، وَتَمَّ حَدِيثُهُ، وَسَمَّى نَصْرٌ صَاحِبَ الرُّؤْيَا، قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ - رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ - وَقَالَ فِيهِ: فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، مَرَّتَيْنِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، مَرَّتَيْنِ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، ثُمَّ أَمْهَلَ هُنَيَّةً، ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: مِثْلَهَا إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: زَادَ بَعْدَ مَا قَالَ: « حَيَّ عَلَى

الْفَلَاحِ ». قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَقِّنْهَا بِلَالًا ». فَأَذَّنَ بِهَا بِلَالٌ، وَقَالَ فِي الصَّوْمِ، قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَيَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾﴾. ﴿البقرة: ١٨٣ - ١٨٤﴾. فَكَانَ مَنْ شَاءَ أَنْ يَصُومَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُفْطِرَ وَيُطْعِمَ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا أَجْزَأَهُ ذَلِكَ، وَهَذَا حَوْلٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا

هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ).﴿البقرة: ١٨٥﴾. فَثَبَتَ الصِّيَامُ عَلَى مَنْ شَهِدَ الشَّهْرَ، وَعَلَى الْمُسَافِرِ أَنْ يَقْضِيَ، وَثَبَتَ الطَّعَامُ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ، وَالْعَجُوزِ، اللَّذَيْنِ لاَ يَسْتَطِيعَانِ الصَّوْمَ، وَجَاءَ صِرْمَةُ وَقَدْ عَمِلَ يَوْمَهُ ... وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

[الإرواء الغليل: ٤/ ٢٠ - ٢١].

واته: لە (مُعَاذِ کوڕی جَبَل)ەوە هاتووە، کە وتویەتی، سێ جار نوێژ لە حاڵەتێکەوە گۆڕاوە بۆ حاڵەتێکی تر، وە سێ جار ڕۆژوویش لە حاڵەتێکەوە گۆڕاوە بۆ حاڵەتێکی تر، (نَصْر) - ی کوڕی موهاجیر - فەرموودەکەی بەدرێژی گێڕایەوە واتە باسی هەر سێ حاڵەتەکەی کرد، بەڵام (ابْنُ الْمُثَنَّى) فەرموودەکەی بە تەواوی نەگێڕایەوە، بەڵکو تەنها باسی حاڵەتی نوێژکردنی بەرەو قودس کردو بەس، (ابْنُ الْمُثَنَّى) وتی: حاڵەتی سێهەم ئەوەیە: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینە سیانزە مانگ بەرەو قودس نوێژی دەکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ). واتە: بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، دەی سوێند بەخوا ڕووت دەکەینە ڕووگەیەك کە پەسەندت بێ، ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە، ئێوەش ئەی موسوڵمانان لەهەر لایەك بوون (لەنوێژدا) ڕووتان بکەنە ئەویەوە.

خـوای گـەورە لـە نوێـژدا رووی پـێ وەرچـەرخاند بـەرەو لای کەعبـە. (ابْـنُ الْمُثَنَّى) فەرموودەکـەی تـەواوکرد. جـا (نَصْـر) باسـی خـاوەنی خەوەکـەی کـردو وتـی: (عبداللـه)ی کـوڕی زەیـد هـات - کـە یـەکێ بـوو لـە یاریـدەدەران - ، لـە فەرموودەکەیدا وتی: - ئەو پیاوەی کە لە خەوەکەیدا دی - رووی کـردە قیبلـەو وتـی: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَـيَّ عَلَـى الصَّـلاَةِ، دووجـار، حَـيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، دووجار، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ). پاشـان کـەمێك دانیشـت، هەستایەوە وەك ئەوەی پێشەوەی وتەوە، ئەوەنـدە هەیـە ئەمـەی بـۆ زیـاد کـرد لەدوای: (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ). وتی: (قَدْ قَامَتِ الصَّـلاَةُ، قَـدْ قَامَـتِ الصَّـلاَةُ). (مُعَـاذِ کوڕی جَبَل) وتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسلم بـە(عبداللـە)ی کـوڕی زەیدی فەرموو: (بڕۆ وشەکانی بانگ فێری بیلال بکە). بیلالیش بانگی پێدا.

سەبارەت بە رۆژوو - (نَصْـر) ی کوڕی موهاجیر - وتـی: (مُعَـاذِ کـوڕی جَبَـل) وتـی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسلم لـە مانگێکـدا سـێ رۆژ بـەرۆژوو دەبـوو، وە رۆژی (عاشـورا)ش بـەرۆژوو دەبـوو، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾). ﴿البقـرة: ١٨٣ - ١٨٤﴾. واتـە: ئـەی ئەوانـەی رۆژووتـان لەسـەر نووسـراوە، هـەروەك نووسـراوە لەسـەر ئەوانـەی لـە پـێش ئێوەدا بوون، بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن. (رۆژووتان لەسـەر دانـرا بـۆ) چـەند رۆژێکی دیاریکراوی ژمێراو، جا هەر کەسێك لە ئێـوە نـەخۆش بـوو، یـان لـە سەفەردا بوو (وە بەرۆژوو نەبوو) ئـەوە پێویسـتە بـە ئەنـدازەی ئـەو رۆژانـە (بـەرۆژوو نـەبووە) قـەزای بکاتـەوە لـە رۆژانـی تـردا، وە پێویسـتە لەسـەر

ئەوانە کە زۆر بە ناڕەحەتی دەتوانن بەڕۆژووبن (و بەڕۆژوو نابن) بریتی (یان لەسەرە) کە خۆراکی هەژارێکە، ئینجا هەر کەسێك زۆرتر بریتی بدات ئەوە باشترە بۆی و ئەگەر بەرۆژووبن بۆ خۆتان باشترە ئەگەر بزانن.

ئیتر ئەوەی بیویستایە بەرۆژوو دەبوو، ئەوەشی بیویستایە بەرۆژوو نەدەبوو، لەسەری بوو هەموو رۆژێ خۆراك بدات بە هەژارێك ئەوەندەی بەس بوو، ئەمەش حاڵەتێك بوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ). ﴿البقرة: ١٨٥﴾. واتە: مانگی رەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە، بەرێنما بۆ خەڵکی وە بەڵگەیانی رۆشن بۆ رێنموویی و جیاکردنەوە(ی دروست و نادروست)، جا هەرکەسێك لە ئێوە مانگی رەمەزانی بینی بابە ڕۆژوو بێت، وە هەرکەسێك نەخۆش بوو یان لەسەفەردا بوو، با بە ئەندازەی ئەو رۆژانە (بەرۆژوو نەبووە) قەزای بکاتەوە لە چەند رۆژانێکی تردا، خوا ئاسانی ئەوێ بۆ ئێوە، وە گرانی ناوێ بۆتان، (قەزای ڕەمەزانتان لەسەر دانرا) تا مانگەکە (بگرن) بەتەواوی، وەبەگەورە ناوی خوا بەرن لەسەر ئەو رێنموونییەی کە کردوونی، وەتا سوپاسی (خوا) بکەن.

ئیتر رۆژووی رەمەزان سابت و جێگیر بوو لەسەر ئەو کەسەی کە مانگی بینیبایە، قەزا کردنەوەش لەسەر ئەو کەسە بوو کە لەسەفەردا بوایە، یان نەخۆش بوایە دوای ئەوەی کە چاك بوویەوە، خۆراك دان بە هەژاریش سابت و جێگیر بوو لەسەر پیرەژن و، پیاوی بە ساڵاچوو، ئەو کەسانەی کە توانای رۆژووگرتنیان نەبوایە. (صِرْمَة) - ی کوڕی قەیس — بەڕۆژو بوو کاری دەکرد هاتەوە بۆ ماڵەوە داوای خواردنی کرد.. - لە فەرموودەکەی

پێشوودا بەسەرهاتەکەی هاتووە - (نَصْـر) ی کوڕی موهاجیریش بـە تـەواوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

## باسی چۆنیەتی قامەت کردن.

## ٢٩ – بَابُ فِی الإِقَامَةِ.

**٥٠٨ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ ، قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُـوتِرَ الإِقَامَةَ. زَادَ حَمَّادٌ فِی حَدِيثِهِ: إِلاَّ الإِقَامَةَ.**

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە وتویـەتی: فـەرمانکرا بـە بـیلال کـە بانگـدان بـەجووت بڵـێ و، وشـەکانی قامـەتیش بـەتاك بڵـێ – بێگومـان لەلایـەن پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێکرا - . (حَمَّاد) لـە فەرمودەکەیـدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: بێجگە لە قامەت. - واتە: جگە لـە (قَدْ قَامَـتِ الصَّـلاَةُ، قَـدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) - .

**٥٠٩ - (إسناده صحيح) عَـنْ أَنَـسٍ: مِثْـلَ حَـدِيثِ وُهَيْـبٍ، قَـالَ إِسْمَاعِيلُ: فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ فَقَالَ: إِلاَّ الإِقَامَةَ.**

واتـە: لـە ئەنەسـەوە، بـە هـەمان شـێوەی فەرمودەکـەی وهـەیب هـاتووە، (إِسْمَاعِيل) وتی: بۆ ئەیوبم گێڕایەوە، ئەویش وتی: بێجگە لە قامەت.

٥١٠ - (حسن) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: إِنَّمَا كَانَ الأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَالإِقَامَةُ مَرَّةً مَرَّةً غَيْرَ أَنَّهُ يَقُولُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، فَإِذَا سَمِعْنَا الإِقَامَةَ تَوَضَّأْنَا، ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الصَّلاَةِ.، قَالَ شُعْبَةُ: وَلَمْ أَسْمَعْ مِنْ أَبِى جَعْفَرٍ غَيْرَ هَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم وتەکانی بانگدان دووجار دووجار دەوتران، بەڵام وتەکانی قامەت یەکجار یەکجار، ئەوەندە هەیە کە – بانگبێژ – دووجار دەڵێ: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ). کاتێ کە گوێمان لە قامەت بوو دەستنوێژمان دەگرت، پاشان دەردەچوین بۆ نوێژ. شوعبە وتی: جگە لەم فەرموودە فەرموودەی ترم نەبیستووە لە (أَبِى جَعْفَرٍ).

٥١١ - (حسن) عَنْ أَبِى جَعْفَرٍ - مُؤَذِّنِ مَسْجِدِ الْعُرْيَانِ - قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْمُثَنَّى - مُؤَذِّنَ مَسْجِدِ الأَكْبَرِ - يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ: وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە (أَبِي جَعْفَرٍ)ی بانگبێژی مزگەوتی (عُرْيَان)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە (أَبَا الْمُثَنَّى)ی بانگبێژی مزگەوتی (الأَكْبَر)م بیستووە دەیوت: لە ئیبنو عومەرم بیستووە: جا راوی فەرموودەكەی بە تەواوی گێڕایەوە[1].

## باسی كەسێ بانگدەدات و كەسێكی تر قامەت دەكات.

## ٣٠ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ آخَرُ.

٥١٢ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ، قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الأَذَانِ أَشْيَاءَ لَمْ يَصْنَعْ مِنْهَا شَيْئًا، قَالَ: فَأُرِيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ الأَذَانَ فِي الْمَنَامِ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: « أَلْقِهِ عَلَى بِلالٍ ». فَأَلْقَاهُ عَلَيْهِ، فَأَذَّنَ بِلاَلٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَنَا رَأَيْتُهُ، وَأَنَا كُنْتُ أُرِيدُهُ، قَالَ: « فَأَقِمْ أَنْتَ ».

---

[1]- مزگەوتی (عُرْيَان) مزگەوتێكی بەناوبانگە لە كوفە، مزگەوتی (الأَكْبَر)یش مزگەوتێكی گەورەیە لە كوفە.

واتە: لە (مُحَمَّدِ کوڕی عَبْدُ اللّٰـه)وە، ئـەویش لـە مامیـەوە(عبداللـه)ی کـوڕی زەیـدەوە گێڕاویـەتیـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم ویستی لـە بانگدا شتێك بکات – واتـە زنـگ لـێ بـدرێت یـان فـوو بکرێـت بـە کەڕەنادا - بەڵام هیچ شتێکی نـەکرد – خۆچواندن بـوو بـە گاور و جولەکە - وتی: (عبدالله)ی کوڕی زەیـد لەخـەودا بـانگی بینـی، هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم و خەوەکـەی بـۆ گێڕایـەوە ئـەویش فـەرمووی: (بـڕۆ وشـەکانی بـانگ فێـری بـیلال بکـە). بـیلالی فێرکـردو، بیلالـیش بـانگی دا. (عبدالله) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مـن لەخـەودا بـانگم بینیوە بۆیـە مـن لـە پێشـترم کـە بـانگ بـدەم، پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم فەرمووی: (دە تۆش هەستە قامەت بکە).

٥١٣ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو - شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مِنَ الأَنْصَارِ - ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُحَمَّدٍ ، قَالَ: كَانَ جَدِّي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ يُحَدِّثُ بِهَذَا الْخَبَرِ ، قَالَ: فَأَقَامَ جَدِّي.

واتـە: (مُحَمَّـدِ)ی کـوڕی (عَمْـرٍو) – کـە شـێخێ بـوو لـە خـەڵکی مەدینـە لـە یاریدەدەران بوو - گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: لە (عبدالله)ی کوڕی (مُحَمَّـد)م بیسـتووە دەیـوت: بـاپیرم (عبداللـە)ی کـوڕی زەیـد ئـەو هەواڵـەی پێشـووی گێڕاوەتەوە، (عبدالله)ی کوڕی (مُحَمَّد) وتی: باپیرم قامەتی کرد.

٥١٤ - (ضعيف) عَنْ زِيَادَ بْنَ الْحَارِثِ الصُّدَائِيَّ، قَالَ: لَمَّا كَانَ أَوَّلُ أَذَانِ الصُّبْحِ أَمَرَنِي - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَأَذَّنْتُ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ أُقِيمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى نَاحِيَةِ الْمَشْرِقِ إِلَى الْفَجْرِ، فَيَقُولُ: « لاَ ». حَتَّى إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ نَزَلَ فَبَرَزَ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيَّ وَقَدْ تَلاَحَقَ أَصْحَابُهُ - يَعْنِي فَتَوَضَّأَ - فَأَرَادَ بِلاَلٌ أَنْ يُقِيمَ فَقَالَ: لَهُ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «إِنَّ أَخَا صُدَاءٍ هُوَ أَذَّنَ، وَمَنْ أَذَّنَ فَهُوَ يُقِيمُ». قَالَ: فَأَقَمْتُ.

[الإرواء: ٢٣٧، الضعيفة: ٣٥].

واتە: زیادی کوڕی (حَارِثِ الصُّدَائِيِّ) وتی: یەکەم کاتی بانگی بەیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردم کە من بانگ بدەم، منیش بانگمداو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قامەت بکەم؟ لەو کاتەدا سەیری دەوروبەری خۆرهەڵاتی دەکرد بۆ بینینی بەرەبەیان فەرمووی: (نەخێر) – کاتی نەهاتووە - . هەتا بەرەبەیان دەرکەوت لەسەر وڵاخەکەی دابەزی و دەرچوو دەستی بەئاوگەیاندو هاتەوە بۆناو هاوەڵانی - واتە دەستنوێژی گرت - بیلال ویستی قامەت بکات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووی: (برامان (صُدَاء)ی بانگیدا، کێش بانگ بدا هەر ئەو خۆشی قامەت دەکا). وتی: منیش قامەتم کرد.

## باسی دەنگ بەرزكردنەوە لەكاتی بانگداندا.

## ٣١ - بَابُ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالأَذَانِ.

٥١٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: « الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ مَدَى صَوْتِهِ، وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ، وَشَاهِدُ الصَّلاَةِ يُكْتَبُ لَهُ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ صَلاَةً، وَيُكَفَّرُ عَنْهُ مَا بَيْنَهُمَا ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: بانگبێژ چەندە دەنگی بڕوات پڕئەوە خوا لە تاوانی خۆش دەبێت، وە هەموو شتێ چ تەڕ چ وشك كە دەنگی بانگبێژی بگاتێ ڕۆژی دوایی شایەتی بۆ دەدا. وە ئەوەی ئامادەی نوێژی بە كۆمەڵ بێت پاداشتی بیست و پێنج نوێژی بۆ دەنوسرێت، وە دەبێتە كەفارەتی هەڵەو تاوانەكانی نێوان ئەو بانگەو بانگی داهاتوو.

٥١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا نُودِيَ بِالصَّلاَةِ، أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ، حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قُضِيَ النِّدَاءُ،

أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، وَيَقُولَ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا، لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَضِلَّ الرَّجُلُ، إِنْ يَدْرِي كَمْ صَلَّى ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ، شەیتان هەڵدێ بە ترِ لێدان، بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کە بانگەکە تەواو بوو دێتەوە، هەتا قامەت دەکرێ دیسان هەڵ دێتەوە، کە قامەت تەواو بوو دێتەوە وەسوەسە دەخاتە دڵی نوێژخوێنەوە دالغە بۆ نوێژخوێنەکە دروست دەکات، پێی دەڵێ: یادی ئەوەو ئەوەبکە کە پێشتر لە یادی نەبوو، تاوای لێ دەکات ، نازانێ چەند رکات نوێژی کردووە.

## باسی لەسەر بانگبێژ واجبە پارێزگاری لە کاتەکانی بانگ بکات.

## ٣٢ - بَابُ مَا يَجِبُ عَلَى الْمُؤَذِّنِ مِنْ تَعَاهُدِ الْوَقْتِ.

٥١٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « الإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ أَرْشِدِ الأَئِمَّةَ، وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليە وسلم وسلم فەرموویەتی: (ئیَشنویَذ زامنـة، فەرموویەتی: (پێشنوێژ زامنە چونکە پارێزگاری دەکات لە نوێژ و ژمارەی رکاتەکانی ئەو خەڵکەی کە لە دوایەوە نوێژ دەکەن - بۆیە دەبێت لە مەرج و روکنەکانی نوێژدا کەمتەرخەمی نەکات - ، بانگبێژیش ئەمیندارەو خەڵك متمانەی پێ دەکەن بۆ نوێژ و رۆژوویان - بۆیە دەبێت لەکاتی خۆیدا بانگبدات - ، خودایە هیدایەتی پێشنوێژەکان بدە بۆ رێگەی راست، لە بانگبێژەکانیش خۆشبە).

٥١٨ - (إسناده صحيح) عَنْ الأَعْمَشِ، قَالَ: نُبِّئْتُ عَنْ أَبِى صَـالِحٍ، قَالَ: وَلاَ أُرَانِى إِلاَّ قَدْ سَمِعْتُهُ مِنْهُ، عَنْ أَبِى هُرَيْـرَةَ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِثْلَهُ.

واتە: لە ئەعمەشەوە هاتووە، کە وتویەتی: هەواڵم دا بە (أَبِى صَالِح)، ئەعمەش وتی: پێ نازانم ئیللا ئەم فەرموودەم لە (أَبِى صَالِح) بیستووە، لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليە وسلم وەك فەرمووکەی پێشووی فەرموو.

## باسی بانگدان لەسەر مەنارە.

## ٣٣ - بَابُ  الأَذَانِ فَوْقَ الْمَنَارَةِ.

٥١٩ - (حسن) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ امْرَأَةٍ مِـنْ بَنِـى النَّجَّـارِ، قَالَتْ: كَانَ بَيْتِي مِنْ أَطْوَلِ بَيْتٍ حَوْلَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ الْفَجْرَ، فَيَأْتِي بِسَحَرٍ فَـيَجْلِسُ عَلَـى الْبَيْتِ يَنْظُرُ إِلَى الْفَجْرِ فَإِذَا رَآهُ تَمَطَّى، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَحْمَـدُكَ، وَأَسْـتَعِينُكَ عَلَـى قُـرَيْشٍ، أَنْ يُقِيمُـوا دِينَكَ، قَالَتْ: ثُمَّ يُؤَذِّنُ، قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُـهُ كَـانَ تَرَكَهَا لَيْلَةً وَاحِدَةً - تَعْنِي هَذِهِ الْكَلِمَاتِ - .

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێـرەوە، لـە ئـافرەتێکی هـۆزی نـەجارەوە هـاتووە، کە وتویەتی: ماڵەکەی من بەرزترین ماڵی دەوروبەری مزگەوت بـوو، بـەیانیان بیلال بانگی لەسـەر دەدا، لـە پـێش هـاتنی کـاتی بـانگی بەیانیـدا بـیلال دەهات لەسـەربان دادەنیشـت چـاوەڕێی سـەحەری دەکـرد، کـە دەیبینـی روونـاکی بەرەبەیان بڵاوبۆتـەوە خـۆی دەکێشایەوە و لـە شـوێنی خـۆی هەڵئەسا، ئینجا دەیوت: خودایە سوپاس و ستایشی تـۆ دەکـەم لەسـەر نیعمـەتی ئیسلام، داوای کۆمەکی و پشتیوانیت لێ دەکەم کە قورەیش موسـوڵمان بـبن و پابەنـد بـن بـە دینەکەتەوە، ئافرەتەکە وتی: پاشان بانگی دەدا، هەروەها وتی: سوێند بـە خـوا پێ نازانم یەك شەو تەرکی کردبێت - واتە ئەم وشانەی تەرك کردبێت - .

## باسی خۆ وەرگێڕانی بانگبێژ
## لەكاتی بانگداندا بەلای ڕاست و چەپدا

## ٣٤ – بَابُ فِي الْمُؤَذِّنِ يَسْتَدِيرُ فِي أَذَانِهِ.

٥٢٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، فَخَرَجَ بِلاَلٌ فَأَذَّنَ، فَكُنْتُ أَتَتَبَّعُ فَمَهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا، قَالَ: ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ بُرُودٌ يَمَانِيَةٌ قِطْرِيٌّ.

(منكر) وَقَالَ مُوسَى: قَالَ: رَأَيْتُ بِلاَلاً خَرَجَ إِلَى الأَبْطَحِ فَأَذَّنَ، فَلَمَّا بَلَغَ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، لَوَى عُنُقَهُ يَمِينًا وَشِمَالاً، وَلَمْ يَسْتَدِرْ، ثُمَّ دَخَلَ فَأَخْرَجَ الْعَنَزَةَ، وَسَاقَ حَدِيثَهُ.

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە وتویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە مەككە لەناو چادرێكی چەرمینی سوردا بوو، بیلال دەرچوو بۆ بانگدان و بانگی فەرموو، لەو كاتەدا منیش سەرنجی دەمیم

دا بەلای راست و بەلای چەپدا ئەم لاو لای پێ دەکرد، وتی: پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناو چادرەکە هاتەدەرەوە دەستێ جلی سوری یەمانی قەتەری لەبەردا بوو.

وە موسا وتی: ئەبو جوحەیفە وتی: بیلالم دی لە (أَبْطَح) بانگیدا کاتێ کە گەیشتە (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ). ملی وەردەگێرا بەلای راست و چەپدا، بەلام خۆی وەرنەدەگێرا، پاشان بیلال چووەژوورەوە نێزەکەی دەرهێنا، جا (موسى) باقی فەرموودەکەی گێرایەوە.

## باسی ئەوەی سەبارەت بە پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت هاتووە

## ٣٥ – بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ.

**٥٢١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « لاَ يُرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ ».**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە واتە وەرگیراوە).

## باسی کەسێ کە گوێی لە بانگبێژ بوو چی دەڵێ.

## ٣٦ - بَابُ  مَا يَقُولُ إِذَا سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ.

٥٢٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی فەرموو ئێوەش ئەوە بڵێن).

٥٢٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ: فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لِيَ الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ تَعَالَى، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفَاعَةُ ».

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عومری کوڕی (عَاص)ەوە هاتووە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە فەرموویەتی: (کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی فەرموو ئێوەش ئەوە بڵێن، پاشان سڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە هەر کەسێك سڵاواتێك لەسەر من بدات خوای گەورە دە جار ڕەحمەت دەڕێژێت بە سەریدا، داوای (وسیلە)م بۆ بکەن کە مەنزڵگایەکە لە بەهەشتدا دانراوە بۆ یەکێك لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوا، هیوادارم کە ئەو بەندەیە من بم، هەر کەسێك داوای (وسیلە)م بۆ بکات شەفاعەتی من بۆ ئەو قبوڵ دەبێت.

٥٢٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ الْمُؤَذِّنِينَ يَفْضُلُونَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «قُلْ كَمَا يَقُولُونَ، فَإِذَا انْتَهَيْتَ، فَسَلْ تُعْطَهْ».

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەمرەوە هاتووە، کە پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بانگبێژەکان بەهۆی بانگدانەوە پێشمان کەوتون لە پاداشتدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بانگبێژەکان لەکاتی بانگدا چی دەڵێن، تۆش لەدوای ئەوانەوە بیڵێرەوە، دوای ئەوەی کە وەڵامی بانگەکەت دایەوەو تەواو بوویت، لە خوا داوا بکە داواکەت دێتەجێ واتە پاڕانەوەکەت قبوڵ دەبێ).

٥٢٥ - (صحيح) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ قَالَ: حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ، رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ».

واتە: لە سەعدی کوڕی عومری کوڕی (أَبِي وَقَّاص)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ گوێی لە بانگبێژ بوو بڵێ: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ، رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا). واتە: منیش شایەتی دەدەم کە جگە لە (الله) هیچ فریاد ڕەس و پەرستراوێکی تر نیەو تاك و تەنیاو بێ هاوەڵە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە، ڕازیم بەوەی کە (الله) پەروەردگارمە، موحەممەد پێغەمبەرمە، ئیسلامیش دینمە، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت).

٥٢٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يَتَشَهَّدُ قَالَ: «وَأَنَا وَأَنَا ».

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە گوێی لە بانگبێژ بوو شایەتی دەدا ئەویش دەیفەرموو: (وە منیش شایەتی دەدەم وە منیش شایەتی دەدەم).

٥٢٧ - (صحيح) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا قَالَ الْمُـؤَذِّنُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ فَإِذَا قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، قَالَ: أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَإِذَا قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّـهِ ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَـيَّ عَلَـى الصَّلاَةِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَـالَ: حَـيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَـالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، قَالَ: اللَّهُ أَكْبَـرُ اللَّـهُ أَكْبَـرُ، ثُـمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ مِـنْ قَلْبِـهِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ ».

واتە: لە پێشەوا عومەری كوڕی (خَطّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (كاتێ كە بانگبێژ وتی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكبَرُ) كەسێ لە ئێوە بڵێ: (اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ). كاتێ وتی: (أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّٰ اللّٰهُ). ئەويش بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّٰ اللّٰـهُ). كاتێ وتی: (أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ). ئەويش بڵێ: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ). كاتێ وتی: (حَـيَّ عَلَى الصَّلاَةِ). ئەويش بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إِلاّٰ بِاللّٰـهِ). كاتێ وتی: (حَـيَّ عَلَـى الْفَلاَحِ). ئەويش بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاّٰ بِاللّٰهِ). بە مەرجێك لە دڵەوە بيڵێ، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

## باسی كەسیٚ كە گوێی لە قامەت بوو چی دەڵێ.

## ٣٧ – بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا سَمِعَ الإِقَامَةَ.

٥٢٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِى أُمَامَةَ - أَوْ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنَّ بِلاَلاً أَخَذَ فِى الإِقَامَةِ، فَلَمَّا أَنْ قَالَ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَالَ: النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «أَقَامَهَا اللَّهُ وَأَدَامَهَا». وَقَالَ: فِى سَائِرِ الإِقَامَةِ كَنَحْوِ حَدِيثِ عُمَرَ فِى الأَذَانِ.

[الإرواء: ٢٤١].

واتە: لە (أَبِى أُمَامَةَ)ەوە - یان لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە - كاتێ كە بیلال دەستی دەكرد بە قامەت كردن دەیوت: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ). پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (أَقَامَهَا اللَّهُ وَأَدَامَهَا). واتە: خودا ئەم نوێژە پایەدار بكات و تاسەر رایبگرێت، بەلاّم لە وشەكانی تری قامەتدا هەروەك لە فەرموودەكەی پێشووی پێشەوا عومەردا رەزای خوای لێ بێ كە لەبارەی بانگدانەوە هاتووە بەو شێوەیە دەیوتەوە واتە بە هەمان شێوە وەك وشەكانی بانگ وشەكانی قامەتیشی دەوتەوە.

## باسی ئەوەی سەبارەت بە پاڕانەوەی کاتی بانگدان هاتووە.

## ٣٨ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ الأَذَانِ.

٥٢٩ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، إِلاَّ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ».

واتە: لە جابری کوڕی (عبدالله)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی کە گوێی لە بانگ بوو بڵێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ). واتە: ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوەو، ئەم نوێژە دابەستراوە، ببەخشە بە موحەممەد پایەی هەرە بەرزی (الْوَسِيلَةَ) و پلەی هەرەگەورەی (الْفَضِيلَةَ)، وە بیبەرە ئەو بارەگا پەسەندەی کە خۆت بەڵێنت پێی داوە، ئیللا شەفاعەتی من بۆ ئەو حەڵاڵ دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا.

# باسی کەسێ گوێی لە بانگی شێوان بوو چی دەڵێ.

## ٣٩ - بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ أَذَانِ الْمَغْرِبِ.

٥٣٠ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقُولَ عِنْدَ أَذَانِ الْمَغْرِبِ: «اللَّهُمَّ إِنَّ هَذَا إِقْبَالُ لَيْلِكَ، وَإِدْبَارُ نَهَارِكَ، وَأَصْوَاتُ دُعَاتِكَ، فَاغْفِرْ لِي».

[المشكاة: ٦٦٩].

واتە: لە (أُمِّ سَلَمَةَ)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێری کردم لەدوای بانگی شێوان بڵێم: خودایە! ئێستا کاتی هاتنی شەوەکەتەو ڕۆیشتنی ڕۆژەکەت، ئەوەش دەنگی بانگەوازخوازانی تۆیە، لێم خۆشبە.

## باسی کرێ وەرگرتن لەسەر بانگدان.

## ٤٠ - بَابُ أَخْذِ الأَجْرِ عَلَى التَّأْذِينِ.

**٥٣١ - (صحيح) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِى الْعَاصِ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! اجْعَلْنِى إِمَامَ قَوْمِى، قَالَ: « أَنْتَ إِمَامُهُمْ، وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لاَ يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا ».**

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی (أَبِى الْعَاص)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بمکە بە پێشنوێژی خزمەکانم، فەرمووی: (تۆ پێشنوێژیان بە، وە لەکاتی نوێژکردندا چاوت لە هەرە لاواز و زەبونەکەیانەوە بێت، ئاگات لە حاڵی بێ و نەکەی بەهۆی نوێژی دوورو درێژەوە ئەوەندەی تر ماندوو بێ تاقەتی بکەی، وە بانگدەرێکیش دابنێ کە لەسەر بانگەکەی کرێ وەرنەگرێت).

## باسی بانگدانی پێش هاتنی وەخت.

## ٤١ – بَابُ فِي الأَذَانِ قَبْلَ دُخُولِ الْوَقْتِ.

٥٣٢ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ بِلاَلاً أَذَّنَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَرْجِعَ فَيُنَادِيَ: « أَلاَ إِنَّ الْعَبْدَ قَدْ نَامَ، أَلاَ إِنَّ الْعَبْدَ قَدْ نَامَ ». زَادَ مُوسَى: فَرَجَعَ فَنَادَى أَلاَ إِنَّ الْعَبْدَ نَامَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَمْ يَرْوِهِ عَنْ أَيُّوبَ إِلاَّ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە بیلال پێش هەڵاتنی بەرەبەیان بانگیدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێکرد کە بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی بانگ بکات و بڵێ: ئاگاداربن کە بەندەکە خەو زۆری بۆ هێنا بوو بۆیە هەڵاتنی بەرەبەیانی نەبینی و ئاگای لەکاتی بانگدان نەبوو، ئاگاداربن کە بەندەکە خەو زۆری بۆ هێنا بوو بۆیە هەڵاتنی بەرەبەیانی نەبینی و ئاگای لەکاتی بانگدان نەبوو. (مُوسَى) ئەمەشی بۆ زیاد کرد گەڕایەوەو بانگی کردو وتی: ئاگاداربن کە بەندەکە خەو زۆری بۆ هێنا بوو بۆیە هەڵاتنی بەرەبەیانی نەبینی و ئاگای لەکاتی بانگدان نەبوو.

**٥٣٣ - (صحيح) عَنْ مُؤَذِّنٍ لِعُمَرَ يُقَالُ لَهُ مَسْرُوحٌ، أَذَّنَ قَبْلَ الصُّبْحِ فَأَمَرَهُ عُمَرُ فَذَكَرَ نَحْوَهُ.**

واتە: بانگبێژەکەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ کە پێیان دەوت مەسروح پێش هەڵاتنی بەرەبەیان بانگی دا، عومەر فەرمانی پێکرد .. بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو فەرموودەکەی گێڕایەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَدْ رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ - أَوْ غَيْرِهِ - أَنَّ مُؤَذِّنًا لِعُمَرَ يُقَالُ لَهُ مَسْرُوحٌ أَوْ غَيْرُهُ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ریوایەتێکی تردا حەمادی کوڕی زەید لە (عُبَيْدِ اللّٰـه)ی کوڕی عومەرەوە لە نافعەوە یان یان جگە لە نافعیش گێڕاویەتیەوە، کە بانگبێژەکەی عومەر ڕەزای خوای لێ بێ کە پێیان دەوت مەسروح، یان جگە لە مەسروحیش.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ الدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ لِعُمَرَ مُؤَذِّنٌ يُقَالُ لَهُ مَسْعُودٌ، وَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ ذَلِكَ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ریوایەتێکی تردا (دَّرَاوَرْدِی)، لە (عُبَيْدِ اللّٰـه)ەوە، لە نافعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە، کە عومەر بانگبێژێکی هەبوو پێیان دەوت مەسعود، وە بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە، ئەمەش ڕاسترە لەوەی کە حەمادی کوڕی سەلەمە گێڕاویەتیەوە.

٥٣٤ - (حسن) عَنْ بِلاَلٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: « لاَ تُؤَذِّنْ حَتَّى يَسْتَبِينَ لَكَ الْفَجْرُ هَكَذَا ». وَمَدَّ يَدَيْهِ عَرْضًا.

واتە: لە بیلالەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (بانگ مەدە هەتا بەرەبەیانت بەم شێوەیە بۆ دەردەکەوێت، جا دەستی درێژ کرد بۆ پانتایی ئاسمان، واتە هەتا رووناکیەکەی بڵاودەبێتەوە بە هەموو لایەکدا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: شَدَّادٌ مَوْلَى عِيَاضٍ لَمْ يُدْرِكْ بِلاَلاً.

ئەبو داود دەڵێت: شەدادی (مَوْلَى عِيَاض) بیلالی نەدیوە.

## باسی بانگدان لەلایەن نابیناوە.

## ٤٢ - بَابُ الأَذَانِ لِلأَعْمَى.

٥٣٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ كَانَ مُؤَذِّنًا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ أَعْمَى.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: کوڕی (أُمِّ مَكْتُوم) بانگبێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو، نابیناش بوو.

## باسی چوونەدەرەوە لە مزگەوت لەدوای بانگ.

## ٤٣ – بَابُ الْخُرُوجِ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ الأَذَانِ.

٥٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ، قَالَ: كُنَّا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي الْمَسْجِدِ، فَخَرَجَ رَجُلٌ حِينَ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِلْعَصْرِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ عَلَيْهِ السَّلاَمُ.

واتە: لە (أَبِي الشَّعْثَاء)ەوە هاتووە کە وتویەتی: رۆژێ لە مزگەوت لای ئەبو هورەیرە دانیشتبووین، لەکاتێکدا کە بانگدەر بانگی عەسری دەدا پیاوێك لە مزگەوت رۆشتەدەرەوە، ئەبو هورەیرە وتی: بەڵێ ئەم پیاوە بەم دەرچوونەی لە فەرمانی باوکی قاسم واتە لە فەرمانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەرچوو.

## باسی بانگبێژ چاوەڕوانی پێشنوێژ دەکات.

## ٤٤ – بَابُ فِي الْمُؤَذِّنِ يَنْتَظِرُ الإِمَامَ.

٥٣٧ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ، ثُمَّ يُمْهِلُ، فَإِذَا رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ خَرَجَ أَقَامَ الصَّلاَةَ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: بیلال بانگی دەدا، پاشان خۆی دوادەخست، کاتێ کە بینی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەژوورەکەی خۆی دەهاتەدەرەوە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، قامەتی کرد.

## باسی دووبارە کردنەوەی وشەکان (التَّثْوِيبِ)[١].

## ٤٥ - بَابُ فِي التَّثْوِيبِ.

| |
|---|
| ٥٣٨ - (حسن) عَنْ مُجَاهِدٍ ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ فَثَوَّبَ رَجُلٌ فِي الظُّهْرِ - أَوِ الْعَصْرِ - قَالَ: اخْرُجْ بِنَا، فَإِنَّ هَذِهِ بِدْعَةٌ. |

واتە: لە موجاهیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عومەردا بووم ڕەزای خوایان لێ بێ پیاوێ قامەتی کرد بۆ نوێژی نیوەڕۆ - یان نوێژی عەسر - (تَثْوِيب)ی کرد، ئیبنو عومەر وتی: هەستە دەستم بگرە با بڕۆینەدەرەوە، چونکە ئەمە شتێکی تازە داهێنراوە لە دیندا واتە بیدعەیە. - ئیبنو عومەر لە کۆتایی تەمەنیدا کوێر بوو بۆیە وتی هەستە دەستم بگرە با بڕۆینەدەرەوە.

---

[١]- (التَّثْوِيبِ) لە کتێبی (فتح الودود)دا بەم مانایانە هاتووە: یەکەم: بانگەواز لەسەر بانگەواز، دووەم: قامەت وەك لە فەرمودەی ژمارە: (٥١٦)دا هاتووە: (حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ)، سێیەم: (الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ). لە کتێبی (عون المعبود: (١/ ٣٨٣).

## باسی قامەت دەکریٚ و پیٚشنویٚژ نایەت و بەدانیشتنەوە چاوەڕیٚی دەکەن.

## ٤٦ - بَابُ فِي الصَّلاَةِ تُقَامُ وَلَمْ يَأْتِ الإِمَامُ يَنْتَظِرُونَهُ قُعُودًا.

**٥٣٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي».**

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی (أَبِي قَتَادَةَ)ەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ قامەت دەکرێت بۆ نوێژ هەڵمەسن هەتا کاتێ کە دەمبینن دێم بۆ نوێژ).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَكَذَا رَوَاهُ أَيُّوبُ وَحَجَّاجٌ الصَّوَّافُ، عَنْ يَحْيَى، وَهِشَامٌ الدَّسْتَوَائِيُّ ، قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ يَحْيَى، وَرَوَاهُ مُعَاوِيَةُ بْنُ سَلاَّمٍ وَعَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى وَقَالاَ فِيهِ: « حَتَّى تَرَوْنِي وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ ».

ئەبو داود دەڵێت: بەم شێوەیە ئەیوب و (حَجَّاجٌ الصَّوَّاف) لە (يَحْيَى)ەوە گێڕاویانەتەوە. وە (هِشَامٌ الدَّسْتَوَائِيّ) وتی: (يَحْيَى) بەم شێوەیە بۆی نوسیووم. هەروەها لە ریوایەتێکی تردا مەعاویەی کوڕی سەلام و عەلی کوڕی موبارك لە

(يَحْيَى)ەوە گێڕاویانەتەوە، لە فەرموودەکەیاندا وتویانـە: (هـەتا کـاتێ دەمبیـنن دێم بۆ نوێژ لەسەرخۆو هێمن و ئارام بن).

٥٤٠ - (صحيح) عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ يَحْيَى، بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ، قَالَ: «حَتَّى تَرَوْنِي قَدْ خَرَجْتُ». قَالَ أَبُـو دَاوُدَ: لَـمْ يَـذْكُرْ: « قَـدْ خَرَجْتُ ». إِلاَّ: مَعْمَرٌ، وَرَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مَعْمَرٍ، لَمْ يَقُلْ فِيهِ: « قَدْ خَرَجْتُ ».

واتـە: لـە مەعمـەرەوە، لـە (يَحْيَـى)ەوە، بەهـەمان سـەنەد وەك فەرمودەكـەی پێشوو هاتووە، کە پێغەمبـەر صلی اللە علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (هـەتا کـاتێ دەمبینن لەژوورەکەی خۆم دەردەچم بۆ نوێژ). ئـەبو داود دەڵـێ: کـەس باسـی: (قَـدْ خَرَجْـتُ)ی نـەکرد جگـە لـە مەعمـەر، وە (ابْـنُ عُيَيْنَـة)، لـە مەعمـەرەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام تێدا نەیفەرموو: (قَدْ خَرَجْتُ).

٥٤١ - (صـحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ الصَّلَاةَ كَانَـتْ تُقَـامُ لِرَسُـولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، فَيَأْخُـذُ النَّـاسُ مَقَـامَهُمْ قَبْلَ أَنْ يَأْخُذَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە قامەت دەکرا بۆ پێغەمبەری خوا صلی اللە علیـە وسـلم خەڵکەکـە ریزیـان دەبەسـت، پـێش ئـەوەی پێغەمبـەر صـلی اللە علیە وسلم لەجێی خۆی هەستێ.

٥٤٢ - (صحيح) عَنْ حُمَيْدٍ ، قَالَ: سَأَلْتُ ثَابِتًا الْبُنَانِيَّ عَنْ الرَّجُلِ يَتَكَلَّمُ بَعْدَ مَا تُقَامُ الصَّلاَةُ؟ فَحَدَّثَنِي عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَعَرَضَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ، فَحَبَسَهُ بَعْدَ مَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ.

واته: لە حومەیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بە قسەکردنی کەسێك لەدوای قامەت کە ئایا دروستە یان نا لە (ثَابِت الْبُنَانِيّ)م پرسی؟ ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بۆی گێڕامەوەو، وتی: قامەت کرا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەوکاتەدا پیاوێ قسەی لەگەڵ دەکرد، بە قسەکردن گیری دا دوای ئەوەی کە بانگبێژ قامەتی تەواو کردبوو.

٥٤٣ - (ضعيف) عَنْ كَهْمَسٍ، قَالَ: قُمْنَا إِلَى الصَّلاَةِ بِمِنًى، وَالإِمَامُ لَمْ يَخْرُجْ فَقَعَدَ بَعْضُنَا، فَقَالَ لِي شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ: مَا يُقْعِدُكَ؟ قُلْتُ ابْنُ بُرَيْدَةَ، قَالَ: هَذَا السُّمُودُ! فَقَالَ: لِي الشَّيْخُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْسَجَةَ، عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: كُنَّا نَقُومُ فِي الصُّفُوفِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَوِيلاً قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، قَالَ: وَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَلُونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ، وَمَا مِنْ

خَطْوَةٍ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ مِنْ خَطْوَةٍ يَمْشِيهَا يَصِلُ بِهَا صَفًّا».

[المشكاة: ١٠٩٥].

واتە: لە (كَهْمَس)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە مونا هەستاین بۆ نوێژ بەڵام پێشنوێژ نەهاتەدەرەوە بۆ نوێژ، بۆیە هەندێكمان دانیشتینەوە، شێخێكی خەڵكی كوفە پێی وتم: چی وای لێكردی كە دانیشی؟ وتم: (ابْنُ بُرَيْدَةَ)ە، چونكە وتی: ئەو وەستان بە پێوە بۆ چاوەڕوانی كردنی پێشنوێژ بێ ئاگاییەو رێگری لێ كراوە. شێخەكە پێی وتم: (عَبْدُ الرَّحْمَنِ)ی كوڕی عەوسەجە لە بەرائی كوڕی عازبەوە بۆی گێڕامەوەو، وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەڕیزەكاندا ماوەیەكی دورودرێژ بە پێوە بووین پێش ئەوەی بانگبێژ (الله أكبر) بكات، یان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (الله أكبر) بكات، وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەڕاستی خواو مەلائیكەكانی سەڵاوات دەدەن لەسەر ئەوانەی كە لەڕیزی یەكەمدا نوێژ دەكەن، وە هیچ هەنگاوێك خۆشەویستر نیە لەو هەنگاوەی كە دەنرێت بۆ گەیشتن بە ریزی یەكەمدا).

٥٤٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ ، قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَجِيٌّ فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ، فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ.

واتــە: لـە ئەنەســەوە هـاتووە، کـە وتویــەتی: جـارێ قامــەت کـرا بـۆ نوێـژ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەوکاتەدا لە کۆشەیەکی مزگەوتدا لەگەڵ پیاوێکدا گفتوگۆی دەکرد، هەڵنەسا بۆ نوێژ هەتا خەڵکەکە خەویان لێ کەوت.

**٥٤٥ - (ضعيف) عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُقَامُ الصَّلَاةُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذَا رَآهُمْ قَلِيلاً جَلَسَ لَمْ يُصَلِّ، وَإِذَا رَآهُمْ جَمَاعَةً صَلَّى.**

واتە: لە سالمی کوڕی (أَبِي النَّضْر)ەوە هاتووە، کاتێ کە قامەت دەکرا بـۆ نوێـژ لـە مزگەوتـدا، پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم سـەیری دەکـرد ئەگـەر نوێژخوێنان کەم بوونایە دادەنیشت و نوێژی نەدەکرد هەتا زۆر دەبوون، بـەڵام ئەگەر زۆربوونایە پێشنوێژی بۆ دەکردن.

**٥٤٦ - (إسناده ضعيف) عَنْ عَلِيِّ بنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ مِثْلَ ذَلِكَ.**

واتـە: بـە هـەمان شـێوەی فەرموودەکـەی پێشـوو پێشـەوا عـەلی کـوڕی (أَبِـي طَالِب) ڕەزای خوای لێ بێ گێڕاپەوە.

## باسی هەڕەشەكردن لەوكەسانەی كە تەركی نوێژی بەكۆمەڵ دەكەن.

## ٤٧ – بَابُ فِي التَّشْدِيدِ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ.

**٥٤٧ - (حسن) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مَا مِنْ ثَلاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلاَ بَدْوٍ لاَ تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إِلاَّ قَدِ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ، فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ، فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ». قَالَ زَائِدَةُ: قَالَ السَّائِبُ: يَعْنِي (بِالْجَمَاعَةِ) الصَّلاَةَ فِي الْجَمَاعَةِ.**

واتە: لە (أَبِي الدَّرْدَاء)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: ئەگەر سێ كەس پێكەوە بوون جاگوند نشین بوون یا كۆچەری بەكۆمەڵ نوێژیان نەكرد، ئەوە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا، كەواتە ئەی موسڵمان بەجەماعەت نوێژەكانت بكەو پابەند بە بەنوێژی بە كۆمەڵەوە، چونكە گورك ئەومەڕە دەخوات كە تەنیایە. (زَائِدَة) وتی: سائب وتی: مانای (بِالْجَمَاعَة). واتە نوێژی بە كۆمەڵ.

٥٤٨ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّىَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِى بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ، إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: نیازم کرد فەرمان بدەم قامەت بۆ نوێژ بکرێ، پاشان فەرمان بکەم بە یەکێك پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، خۆشم لەگەڵ چەند کەسێك کە یەکی کۆمەڵێ داریان پێ بێت، بڕۆم ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم بە سەریاندا کە ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نابن.

٥٤٩ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ فِتْيَتِى فَيَجْمَعُوا حُزَمًا مِنْ حَطَبٍ، ثُمَّ آتِىَ قَوْمًا يُصَلُّونَ فِى بُيُوتِهِمْ، لَيْسَتْ بِهِمْ عِلَّةٌ فَأُحَرِّقَهَا عَلَيْهِمْ ». قُلْتُ لِيَزِيدَ بْنِ الأَصَمِّ: يَا أَبَا عَوْفٍ الْجُمُعَةَ عَنَى أَوْ غَيْرَهَا؟ قَالَ: صُمَّتَا أُذُنَاىَ، إِنْ لَمْ أَكُنْ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَأْثُرُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا ذَكَرَ جُمُعَةً وَلاَ غَيْرَهَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله

علیـه وسـلم فەرموویـەتی: (نیـازم کـرد فـەرمان بـدەم چـەند کەسـێك دار کۆبکەنەوە و لەگەڵ خۆیان بیهێنن، خۆشم لەگەڵ ئەوانەی کە دارەکانیان پێیە بڕۆم ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم بە سەریاندا کە نـەخۆش نـین، یـان عوزریـان نیەو لەماڵەوە نوێژ دەکەن - واتە بەهانەی شـەرعیان نیـە -). راوی دەڵێ: وتم: بە یەزیدی کوڕی (أَصَمّ): ئەی (أَبَا عَوْف) ئایـا پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسـلم مەبەستی لە نوێژی جومعە بوو یان مەبەستی جگە لە نوێژی جومعە لەنوێـژە فەرزەکانی تر بوو؟ وتی: یاخوا گوێم کەڕ بێت، ئەگەر بەو شێوەیە نـەم بیست بێت کە ئەبو هـورەیرە، لـە پێغەمبـەرەوە صلی الله علیـه وسـلم گێڕاویەتیـەوە، ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم باسی نوێـژی جومعـەو جگـە لە نوێژی جومعەشی نەکرد، بەڵکو بەگشتی باسی نوێژە فەرزەکانی کرد.

٥٥٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: حَافِظُوا عَلَى هَؤُلاَءِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ، فَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى، وَإِنَّ اللَّهَ شَرَعَ لِنَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُنَنَ الْهُدَى، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلاَّ مُنَافِقٌ بَيِّنُ النِّفَاقِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ، وَمَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَلَهُ مَسْجِدٌ فِي بَيْتِهِ، وَلَوْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ وَتَرَكْتُمْ مَسَاجِدَكُمْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَكَفَرْتُمْ.

واتـە: لـە (عبداللـە)ی كوڕی مەسـعودەوە هاتووە، كـە وتويـەتی: پارێزگاری بكەن لە سنورەكانی ئەو پێنج نوێژە فەرزانە كە بانگيـان بـۆ دەدرێـت، چونكە لـە سـوننەت و رێگـەی راسـتی هيدايـەتن، بێگومـان خـوای گـەورە سـوننەت و رێگەی راستی هيدايەتی بۆ پێغەمبەرەكەی داناوە، ئێمە وامان بينيوە كە تـەنها ئەو مونافيقانەی كەناسراو بوون دوادەكەوتن لـە نوێـژی جەماعـەت، وە پيـاوی وامان ديوە دوو پياو چوونەتە ئـەم لاو لايـەوەو دەسـتيان گرتـووەو بەيارمـەتی ئەوان دەهات هەتا دەينهێنايە ناو ريزی نوێـژی جەماعەتـەوە، وە هەريـەكێ لـە ئێوە مزگەوت يان شوێنی نوێژكردنی هەيە لەماڵەوە، ئەگەر ئێوەش لـە ماڵـەوە نوێژ بكەن و تەركی نوێژی بەكۆمەڵ بكـەن لـە مزگەوتەكانتانـدا ئـەوە تـەركی سـوننەتی پێغەمبەرەكـەتان صـلی الله عليــە وسـلم كـردووە، ئەگــەر تــەركی سوننەتی پێغەمبەرەكەشتان صلی الله عليـە وسـلم كـرد ئـەوا بـەرەو كافربوون دەڕۆن.

**٥٥١ - (صحيح دون جملة العُذرُ، بلفظ: (ولا صلاة لـه) ) عَنْ ابْـنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: « مَنْ سَمِعَ الْمُنَادِيَ فَلَمْ يَمْنَعْهُ مِنَ اتِّبَاعِهِ عُـذْرٌ ».- قَالُوا: وَمَا الْعُذْرُ؟ قَالَ: خَوْفٌ أَوْ مَرَضٌ - « لَمْ تُقْبَـلْ مِنْهُ الصَّلَاةُ الَّتِي صَلَّى ».**

واتە: ئيبنو عەباس رەزای خوايان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله عليه وسلم فەرموويەتی: (هەركەسێ گوێی لـە بـانگ بـێ و بـەبێ بەهانەيـەكی رەوا نەچـێ بـۆ نوێـژی جەماعـەت). هـاوەڵان وتيـان: بەهانـەی رەوا وەك چـی؟ فەرمووی: وەك ترس يان وەك نەخۆشی (ئەو نوێژەی كە بە تەنيا دەيكات خوا لێی وەرناگرێت).

٥٥٢ - (حسن صحيح) عَنْ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ، شَاسِعُ الدَّارِ، وَلِي قَائِدٌ لاَ يُلاَئِمُنِي، فَهَلْ لِي رُخْصَةٌ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِي؟ قَالَ: «هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « لاَ أَجِدُ لَكَ رُخْصَةً ».

واتە: کوڕی (أُمِّ مَكْتُوم) - کە بانگدەری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو - لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم من پیاوێکی نابینام و ماڵەکەمان دوورە لە مزگەوتەوە، چاوساغم نیە دەستم بگرێت بێم بۆ مزگەوت، ئایا ڕێگەم دەدەیت لەماڵەوە نوێژەکانم بکەم؟ فەرمووی: (گوێت لە بانگە). وتی: بەڵێ گوێم لە بانگە، فەرمووی: (دەی ڕێگەت پێ نادەم).

٥٥٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ الْمَدِينَةَ كَثِيرَةُ الْهَوَامِّ وَالسِّبَاعِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَتَسْمَعُ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ؟ فَحَيَّ هَلاً ».

واتە: کوڕی (أُمِّ مَكْتُوم)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مەدینە جانەوەر و دڕندەی زۆرە منیش نابینام ڕێگەم دەدەیت لەماڵەوە نوێژەکانم بکەم؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئایا گوێت لە (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)ە؟ دەی دەبێ بێیت بەدەم

بانگەوە واتە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا رَوَاهُ الْقَاسِمُ الْجَرْمِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، لَيْسَ فِي حَدِيثِهِ « حَيَّ هَلاَ ».

ئەبو داود دەڵێت: بەم شێوەیە قاسمی جەرمی، لە سوفیانەوە هێناویەتی، بەڵام لە فەرموودەکەیدا: (حَيَّ هَلاَ). نەهاتووە.

## باسی فەزڵی نوێژی بەکۆمەڵ.

## ٤٨ – بَابُ فِي فَضْلِ صَلاَةِ الْجَمَاعَةِ.

٥٥٤ - (حسن) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا الصُّبْحَ فَقَالَ: « أَشَاهِدٌ فُلاَنٌ ». قَالُوا: لاَ، قَالَ: « أَشَاهِدٌ فُلاَنٌ ». قَالُوا: لاَ، قَالَ: « إِنَّ هَاتَيْنِ الصَّلاَتَيْنِ أَثْقَلُ الصَّلَوَاتِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ، وَلَوْ تَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَيْتُمُوهُمَا وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الرُّكَبِ، وَإِنَّ الصَّفَّ الأَوَّلَ عَلَى مِثْلِ صَفِّ الْمَلاَئِكَةِ، وَلَوْ عَلِمْتُمْ مَا فَضِيلَتُهُ لاَبْتَدَرْتُمُوهُ، وَإِنَّ صَلاَةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلاَتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَثُرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ».

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردین و فەرمووی: (ئایا فڵانەکەس ئامادەی ئەم نوێژی جەماعەتە بووە لەگەڵمان؟) وتیان: نەخێر ئامادە نەبووە، فەرمووی: ئایا فڵانەکەس ئامادەی ئەم نوێژی جەماعەتە بووە لەگەڵمان؟) وتیان: نەخێر ئامادە نەبووە، فەرمووی: (ئەم دوو نوێژە واتە نوێژی بەیانی و عیشا قورسترین نوێژن لەسەر مونافیقەکان، ئەگەر دەتانزانی چەندە فەزڵ و چاکەیان تێدایە بە گاکۆڵکەش بوایە خۆتان دەگەیاندێ، وە ریزی یەکەم وەك ریزی مەلائیکە وایە ئەگەر دەتانزانی چەندە فەزڵیان هەیە دەسپێشکەریتان بۆ دەکردو بە پەلە خۆتان دەگەیاندێ، بێگومان نوێژی دوو پیاو خێری زۆرترە لە نوێژی یەك پیاو کە بە تەنیا خۆی بێت، وە نوێژی سێ پیاو بە کۆمەڵ خێری زۆرترە لە نوێژی دوو پیاو بە جەماعەت، هەتا ژمارەیان زۆرتر بێت خۆشەویسترە لەلای خوای گەورە).

٥٥٥ - (صحيح) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ ».

واتە: لە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففانەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەرکەس نوێژی عیشا بە کۆمەڵ بکات، وەکو ئەوە وایە هەتا نیوەشەو شەونوێژی کردبێ، وە ئەوەی نوێژی عیشاو بەیانی بە کۆمەڵ بکات، وەکو ئەوە وایە ئەو شەوە هەتا بەیانی شەونوێژ بکات.

## باسی ئەوەی سەبارەت بە فەزڵی ڕۆیشتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ هاتووە.

## ٤٩ – بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الصَّلاَةِ.

٥٥٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « الأَبْعَدُ فَالأَبْعَدُ مِنَ الْمَسْجِدِ، أَعْظَمُ أَجْرًا ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: کێتان ڕێگاکەی زیاتر دوورتر بێت لە مزگەوتەوە پاداشتەکەی گەورەترە).

٥٥٧ - (صحيح) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ لاَ أَعْلَمُ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ مِمَّنْ يُصَلِّي الْقِبْلَةَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ أَبْعَدَ مَنْزِلاً مِنَ الْمَسْجِدِ مِنْ ذَلِكَ الرَّجُلِ، وَكَانَ لاَ تُخْطِئُهُ صَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ، فَقُلْتُ: لَوِ اشْتَرَيْتَ حِمَارًا تَرْكَبُهُ فِي الرَّمْضَاءِ وَالظُّلْمَةِ؟ فَقَالَ: مَا أُحِبُّ أَنَّ مَنْزِلِي إِلَى جَنْبِ الْمَسْجِدِ، فَنُمِيَ الْحَدِيثُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ عَنْ قَوْلِهِ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: أَرَدْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَنْ يُكْتَبَ لِي إِقْبَالِي إِلَى الْمَسْجِدِ،

وَرُجُوعِي إِلَى أَهْلِي إِذَا رَجَعْتُ، فَقَالَ: «أَعْطَاكَ اللَّهُ ذَلِكَ كُلَّهُ أَنْطَاكَ اللَّهُ ﴿جَلَّ وَعَزَّ﴾ مَا احْتَسَبْتَ كُلَّهُ أَجْمَعَ».

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هەبوو نوێژە فەرزەکانی بە جەماعەت نەدەفەوتاند لە مزگەوتدا، ماڵی هیچ موسوڵمانێکی خەڵکی مەدینەش ئەوەندەی ماڵەکەی ئەو دوور نەبوو لە مزگەوتەوە، ئوبەی دەڵێ: پێم وت ئەگەر گوێدرێژێکت بکڕیایە لەکاتی گەرمای بەتین و تاریکیدا کە دەهاتی بۆ مزگەوت سواری بویتایە؟ پیاوەکە وتی: پێم خۆش نیە و حەز ناکەم ماڵەکەم بە تەنیشت مزگەوتەوە بێ، ئەم بەسەرهاتە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆیە ئەویش سەبارەت بەو قسەیەی کە مەبەستی چی بووە لە پیاوەکەی پرسی؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەمەوێت لە ڕۆشتنم بۆ مزگەوت و گەڕانەوەم بۆ ناو خێزانەکەم ئەگەر گەڕامەوە خێری ئەو هەنگاوە زۆرانەم بۆ بنوسرێت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: خوای گەورە خێری ئەو هەموو هەنگاوانەی بۆ نوسیویت، هەموو ئەو خێرەت بۆ دەستەبەر بووە کە ویستوتە.

٥٥٨ - (حسن) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ مُتَطَهِّرًا إِلَى صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ، فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْحَاجِّ الْمُحْرِمِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى تَسْبِيحِ الضُّحَى لاَ يُنْصِبُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ، فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ

الْمُعْتَمِرِ، وَصَلاَةٌ عَلَى أَثَرِ صَلاَةٍ لاَ لَغْوَ بَيْنَهُمَا، كِتَابٌ فِى عِلِّيِّينَ ».

واته: لە ئەبو ئومامەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك بەچاکی دەستنوێژ بگرێ لەماڵی خۆی دەرچێ بەرەو مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان بەکۆمەڵ، ئەوە پاداشتی حاجیەکی هەیە کە لە ئیحرامدا بێت، ئەوەشی دەرچێ بۆ نوێژی چێشتەنگاو خۆی ماندوو نەکات تەنها بۆ ئەوە نەبێ، ئەوە پاداشتی عەمرەیەکی بۆ هەیە، نوێژ لەودای نوێژ ئەگەر لە نێوانیاندا قسەی پڕوپوچ و دنیایی و کردەوەی خراپە نەکرێت، کردەوەیەکە لەناو دەفتەرێکی بەرزدا دەنوسرێت کە کردەوەی پیاوچاکانی تێدا دەنوسرێت).

٥٥٩ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « صَلاَةُ الرَّجُلِ فِى جَمَاعَةٍ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِى بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِى سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، وَذَلِكَ بِأَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، وَأَتَى الْمَسْجِدَ لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، وَلاَ يَنْهَزُهُ - يَعْنِي - إِلاَّ الصَّلاَةُ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رُفِعَ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ كَانَ فِى صَلاَةٍ مَا كَانَتِ الصَّلاَةُ هِىَ تَحْبِسُهُ، وَالْمَلاَئِكَةُ يُصَلُّونَ عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِى

مَجْلِسِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، يَقُولُونَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ، مَا لَمْ يُؤْذِ فِيهِ، أَوْ يُحْدِثْ فِيهِ».

واتە: نوێژی کەسێك کە بەکۆمەڵ دەیکات بیست و پێنج پلە خێرو پاداشتی زیاترە لە نوێژی ماڵەوە و بازاڕی کە بە تەنیا دەیکات، ئەویش لەبەر ئەمەیە چونکە هەرکاتێ کەسێکتان دەستنوێژ جوان بگرێ و دەرچێ بەرەو مزگەوت، لەو چوونەی بۆ مزگەوت تەنها مەبەستی نوێژ بێ، وە تەنها نوێژ پاڵی پێوە نابێت، هەر هەنگاوێ دەنێ پلەیە پێی بەرزدەبێتەوەو گوناهێکی پێی هەڵدەوەرێ هەتا دەچێتە مزگەوتەوە، کاتێ کە چووە مزگەوتەوە ئەوە ئیتر لەنوێژدایە مادەم نوێژ ڕێگری لێ کردبێت لە مزگەوت بێتەدەرەوە، وە مەلائیکەکان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن هەتا لەجێگە نوێژەکەیدا بمێنێتەوەو چاوەڕێی نوێژ بکات دەڵێن: خودایە لێی خۆشبە، خودایە ڕەحمی پێبکە، خودایە تەوبەو پەشیمانی لێ وەربگرە، تاکو دەستنوێژی هەبێ و ئازاری کەس نەدات بەدەست و بە زمانی.

٥٦٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الصَّلَاةُ فِي جَمَاعَةٍ تَعْدِلُ خَمْسًا وَعِشْرِينَ صَلَاةً، فَإِذَا صَلَّاهَا فِي فَلَاةٍ فَأَتَمَّ رُكُوعَهَا وَسُجُودَهَا بَلَغَتْ خَمْسِينَ صَلَاةً».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژێکی جەماعەت خێرو پاداشتی

بەرامبەر بە بیست و پێنج نوێژە کە بە تەنیا بیکات، ئەگەر لە سەحرایەکی بێ ئاودا بە ڕێك و پێکی و بە خشوعەوە نوێژێ بکات و سەجدەو رکوعەکەشی تەواو بێت ئەوا خێرو پاداشتی پەنجا نوێژی هەیە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ فِي الْحَدِيثِ: « صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْفَلاَةِ تُضَاعَفُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي الْجَمَاعَةِ ». وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

ئەبو داود دەڵێت: (عَبْدُ الْوَاحِدِ)ی کوڕی زیاد لە فەرمودەکەیدا وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی پیاوێك لە سەحرایەکی بێ ئاودا خێرو پاداشتی زیاترە لەو نوێژەی کە بە جەماعەت دەیکات). پاشان (عَبْدُ الْوَاحِدِ) فەرموودەکەی بە تەواوەتی گێڕایەوە.

## باسی ئەوەی کە سەبارەت بە تاریکی ڕۆیشتن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ هاتووە.

## ٥٠ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَشْيِ إِلَى الصَّلاَةِ فِي الظُّلَمِ.

٥٦١ - (صحيح) عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ».

واتــە: لـە (بُرَيْــدَةَ)ەوە هـاتووە، كـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم فەرموویەتی: (مژدە بدەن بەو كەسانەی لە تاریكی شەودا هەنگاو دەنێن بەرەو مزگەوتەكان، بە رووناكی تەواو بۆیان لە قیامەتدا - مەبەست لە نوێژی بەیانی و عیشایە-).

## باسی ئەوەی سەبارەت بە لەسەرخۆ ڕۆشتن بۆ نوێژی بەكۆمەڵ هاتووە.

## ٥١ - بَابُ مَا جَاءَ فِي الْهَدْيِ فِي الْمَشْيِ إِلَى الصَّلاَةِ.

٥٦٢ - (صحيح) عَنْ أَبُو ثُمَامَةَ الْحَنَّاطُ: أَنَّ كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ أَدْرَكَهُ وَهُوَ يُرِيدُ الْمَسْجِدَ -أَدْرَكَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ - قَالَ: فَوَجَدَنِي وَأَنَا مُشَبِّكٌ بِيَدَيَّ، فَنَهَانِي عَنْ ذَلِكَ وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَلاَ يُشَبِّكَنَّ يَدَيْهِ، فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ ».

واته: (أَبُو ثُمَامَـةَ الْحَنَّـاط) دەڵێت: لەڕێگەی مزگەوت لەگەڵ كەعبی كوڕی عـوجرە چـاومان بەیـەكتر كـەوت، بینـی مـن پەنجـەكانم خسـتبووە نـاو پەنجەكانمەوە، كەعب ئەو كارەی لێ قەدەغەكردم وتی: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم فەرموویـەتی: (كـاتێ كەسـێكتان بەچـاكی دەسـتنوێژ دەگـرێ،

پاشان دەچێ بەرەو مزگەوت، با پەنجەكانی نەخاتە ناو پەنجەكانیەوە، چونكە ئەو كەسە لە نوێژدایە).

٥٦٣ - (صحيح) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: حَضَرَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ الْمَوْتُ فَقَالَ: إِنِّي مُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا مَا أُحَدِّثُكُمُوهُ إِلاَّ احْتِسَابًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ، لَمْ يَرْفَعْ قَدَمَهُ الْيُمْنَى إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ حَسَنَةً، وَلَمْ يَضَعْ قَدَمَهُ الْيُسْرَى إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهُ سَيِّئَةً، فَلْيُقَرِّبْ أَحَدُكُمْ أَوْ لِيُبَعِّدْ، فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى فِي جَمَاعَةٍ غُفِرَ لَهُ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا بَعْضًا وَبَقِيَ بَعْضٌ صَلَّى مَا أَدْرَكَ، وَأَتَمَّ مَا بَقِيَ كَانَ كَذَلِكَ، فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا فَأَتَمَّ الصَّلاَةَ كَانَ كَذَلِكَ».

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەییەبەوە هاتووە، كە وتویەتی: پیاوێك لە یاریدەدەران كەوتە گیانەلاوە بە ئامادەبووانی وت: فەرموودەیەكتان بۆ دەگێڕمەوە ئەگەر لەبەر دەستكەوتنی خێرو پاداشت نەبوایە بۆم نەدەگێڕانەوە، ئەویش ئەوەیە بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (ئەگەر كەسێ لەئێوە دەستنوێژێ بگرێ بەجوانی و بەتەواوی، پاشان دەرچێ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژ، پێی راستی بەرزناكاتەوە ئیللا خوای

گەورە چاکەیەکی بۆ دەنوسێت، پێی چەپیشی دانانێت ئیللا خوای گەورە خراپەیەکی هەڵدەوڕێنێت، کەسێ لە ئێوە ماڵی دوور بێت لە مزگەوتەوە یان نزیك ئەگەر هات بۆ مزگەوت و بەکۆمەڵ نوێژی کرد ئەوا خوای گەورە لە هەڵەو گوناهە بچوکەکانی خۆش دەبێت، بێگومان ئەگەر هات بۆ مزگەوت ئامادەبووان هەندێ نوێژیان کردبوو بەکۆمەڵ هەندێکیشیان مابوو جا ئەوەی فریاکەوت لەگەڵ پێشنوێژ بیکات ئەوەشی لەدەستی دەرچوو بوو دوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ هەستێتەوە تەواوی بکات ئەوا خوای گەورە لە هەڵەو گوناهە بچوکەکانی خۆش دەبێت، هەروەها ئەگەر هات بۆ مزگەوت نوێژی بەکۆمەڵ تەواو بوو بوو نەگەیشت بە نوێژدا بە تەنیا نوێژی خۆی بکات بە تەواوی ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.

## باسی ئەو کەسەی کە لەماڵ دەردەچێت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ دەبینێ خەڵکەکە نوێژیان کردووەو ناگات بەنوێژی بەکۆمەڵدا.

## ٥٢ – بَابُ فِيمَنْ خَرَجَ يُرِيدُ الصَّلاَةَ فَسُبِقَ بِهَا.

٥٦٤ – (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ رَاحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا، أَعْطَاهُ اللَّهُ جَلَّ وَعَزَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلاَّهَا وَحَضَرَهَا، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ شَيْئًا».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەچاکی دەستنوێژ بگرێ و پاشان دەرچێ بەرەو مزگەوت دەبینێ خەڵکەکە بەکۆمەڵ نوێژیان کردووە بەتەنیا نوێژی خۆی بکات، ئەوا خوای گەورە وەك پاداشتی ئەوانەی بۆ دەنوسێت کە ئامادەی نوێژ بوون و نوێژیان بەکۆمەڵ کردووە بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکرێتەوە، چونکە هەوڵیداوە بکات بە نوێژی بەکۆمەڵدا).

## باسی ئەوەی سەبارەت بە دەرچوونی ئافرەتان بۆ مزگەوت هاتووە.

## ٥٣ – بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى الْمَسْجِدِ.

٥٦٥ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ، وَلَكِنْ لِيَخْرُجْنَ وَهُنَّ تَفِلاَتٌ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەرگری مەکەن لەوەی کە ئافرەتانتان بچن بۆ مزگەوتەکان، بەڵام دەبێ بەبێ ئەوەی بۆنی خۆش لەخۆیان بدەن دەربچن).

٥٦٦ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ ».

واتـه: لـه ئیبنـو عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (بـەرگری مەکـەن لـەوەی کە ئافرەتانتـان بچن بۆ مزگەوتەکان).

٥٦٧ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ ».

واتـه: لـه ئیبنـو عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (بـەرگری مەکـەن لـەوەی کـە ئافرەتانتـان بچـن بـۆ مزگەوتـەکان، بـەڵام ماڵـەکانیان چـاکترە بۆیـان، واتـە لەماڵەوە نوێژ بکەن چاکترە بۆیان هەتا لە مزگەوت).

٥٦٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « ائْذَنُوا لِلنِّسَاءِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِاللَّيْلِ ». فَقَالَ ابْنٌ لَهُ: وَاللَّهِ لاَ نَأْذَنُ لَهُنَّ فَيَتَّخِذْنَهُ دَغَلاً وَاللَّهِ لاَ نَأْذَنُ لَهُنَّ، قَالَ: فَسَبَّهُ وَغَضِبَ وَقَالَ: أَقُولُ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ « ائْذَنُوا لَهُنَّ ». وَتَقُولُ: لاَ نَأْذَنُ لَهُنَّ؟.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رێگە بـدەن بـە

ئافرەتانتان بەشەوا بچن بۆ مزگەوتەکان)، کوڕێکی وتی: سوێند بە خوا ڕێگەیان پێ نادەم، چونکە ئامادەبوونیان لە مزگەوت دەبێتە هۆی خراپەکاری و فڕوفێڵ، سوێند بە خوا ڕێگەیان پێ نادەم، موجاهد راوی فەرموودەکە وتی: ئیبنو عومەر لێی تورەبوو قسەی پێ وت و وتی: من دەڵێم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ڕێگەیان پێ بدەن). تۆ دەڵێی: (ڕێگەیان پێ نادەم).

## باسی توندی لەمەدا، واتە لە چوونی ئافرەتان بۆ مزگەوتەکان.

## ٥٤ - بَابُ التَّشْدِيدِ فِي ذَلِكَ.

٥٦٩ - عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: لَوْ أَدْرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ ﴿بَعْدَهُ﴾ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ، كَمَا مُنِعَهُ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ. قَالَ يَحْيَى: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَمُنِعَهُ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ.

واتە: لە (عَمْرَة)ی کچی (عَبْدِ الرَّحْمَن)ەوە هاتووە، کە خاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی راگەیاندووەو وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیبینی بەم شێوەیە ئافرەتان (لەدوای

ئـەو) خۆيـان دەڕازێننــەوەو بـۆنی خـۆش لـەخۆيان دەدەن ئـەوا بـەرگری لـێ دەكـردن كـە بچـن بـۆ مزگەوتـەكان، وەك چـۆن ئافرەتـانی نـەوەی ئيسـرائيل بەرگريان لێ دەكرا ئامادەی مزگەوتەكان بن. (يَحْيَى) وتی: وتم بـە (عَمْرَةَ) ئايـا ئافرەتانی نەوەی ئيسرائيل بەرگريان لێ دەكرا؟ وتی: بەڵێ.

**٥٧٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: «صَلاَةُ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِـي حُجْرَتِهَا، وَصَلاَتُهَا فِي مَخْدَعِهَا، أَفْضَلُ مِنْ صَـلاَتِهَا فِي بَيْتِهَا».**

واتــە: لــە (عبداللــە)ەوە هــاتووە، كــە پێغەمبــەر صــلى الله عليــە وســلم فەرموويەتی: نوێژی ئافرەت لە هۆدەكەی خۆيـدا خێرتـرو چاكترە لـە نوێـژی ناو حوجرەكەی يان حەوشەكەی، وە نوێژی ئـافرەت لـە هـۆدەی گەنجينەكەيـدا خێرترو چاكترە لە نوێژی ناو هۆدەكەی خـۆی. - چـونكە شـاراوەترە. (مَخْـدَع)ماڵێكی بچوكە لەناو ماڵێكی گەورەدا-[1].

**٥٧١ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَوْ تَرَكْنَا هَذَا الْبَابُ لِلنِّسَاءِ». قَالَ نَافِعٌ: فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ ابْنُ عُمَرَ حَتَّى مَاتَ[2].**

---

[1] - وەرم گرتووە لەكتێبی (عون المعبود شرح سنن أبي داود.

[2] - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (ضعيف الإسناد) رَوَاهُ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ نَافِعٍ قَالَ قَـالَ عُمَـرُ وَهَذَا أَصَحُّ.

واتـە: لـە نافعـەوە، لـە ئیبنـو عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ هـاتووە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فەرموویـەتی: (ئەگـەر ئـەو دەرگایـەمان تایبـەت بكردایـە بـۆ ئافرەتـان چـاكتر بـوو، بـۆ ئـەوەی پیـاوان و ئافرەتـان لـەكاتی چـوونەژوورەوە بـۆ مزگـەوت و هاتنـەدەرەوەدا تێكـەڵاو نەبوونایە). نافع وتی: ئیتر ئیبنو عومـەر لـەو دەرگاوە نەچووە ژوورەوە هـەتا وەفاتی كرد[1].

## باسی بە پەلە رۆیشتن بۆ نوێژی بەكۆمەڵ.

## ٥٥ – بَابُ السَّعْيِ إِلَى الصَّلاَةِ.

٥٧٢ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: بیستم لـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیە وسلم دەیفەرموو: (هەركاتێك قامەت كرا بۆ نوێژ بە هەڵـەداوان مەیەن بۆ نوێژ، بەڵكو هـێمن و لەسـەرخۆ بـن و پەلـە نەكـەن، فریـای هەرچـی كەوتن لەگەڵ پێشنوێژدا بەكۆمەڵ ئەنجامی بدەن، ئەوەشی كە لە دەستان چوو لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ هەستنەوە تەواوی بكەن).

[1] - ئەم فەرموودە دووبارەیەو لە ژمارە: ٤٦٢.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا قَالَ: الزُّبَيْدِيُّ، وَابْنُ أَبِى ذِئْبٍ، وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، وَمَعْمَرٌ، وَشُعَيْبُ بْنُ أَبِى حَمْزَةَ عَنْ الزُّهْرِيِّ: « وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا ».

ئەبو داود دەڵێت: زوبەیدی و ، (ابْنُ أَبِى ذِئْبٍ) و، ئیبراهیمی كوڕی سەعد و، مەعمەر و، شوعەیبی كوڕی ئەبو حەمزە، هەر هەموویان لە زوهریەوە، بەهەمان شێوە گێڕاویانەتەوە بە گۆ(لفظ)ی: (وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا): (ئەوەی لە دەستان چوو لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ هەستنەوە تەواوی بكەن).

(شاذ) وَقَالَ: ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ وَحْدَهُ: « فَاقْضُوا ».

واتە: وە لەناو هاوەڵانی زوهریدا بە تەنیا لە (ابْنُ عُيَيْنَة)ەوە هاتووە، بە گۆی: (فَاقْضُوا). واتە: (لەپاشدا تەواوی بكەن).

(حسن صحيح) وَقَالَ: مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِى سَلَمَةَ، عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، وَجَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: « فَأَتِمُّوا ».

واتە: وە موحەممەدی كوڕی عەمر وتی: لە ئەبو سەلەمەوە، لە ئەبو هورەیرە و، لە جەعفەری كوڕی رەبیعەوە، لە ئەعرەجەوە، لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، بە گۆی: (فَأَتِمُّوا). واتە: (تەواوی بكەن).

وَابْنُ مَسْعُودٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو قَتَادَةَ، وَأَنَسٌ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلُّهُمْ قَالُوا: «فَأَتِمُّوا ».

واتە: وە ئیبنو مەسعود، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، وە ئەبو قەتادە و ئەنەس، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هەر هەموویان هێناویانە بە گوێ: (فَأَتِمُّوا). واتە: (تەواوی بكەن).

**٥٧٣ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « ائْتُوا الصَّلاَةَ وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَصَلُّوا مَا أَدْرَكْتُمْ، وَاقْضُوا مَا سَبَقَكُمْ ».**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ هاتن بۆ نوێژ هێمن و لەسەرخۆ بن، فریای هەرچی كەوتن لەگەڵ پێشنوێژدا بەكۆمەڵ ئەنجامی بدەن، ئەوەشی كە لە دەستان چوو لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ هەستن بەجێیبێنن).

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا قَالَ ابْنُ سِيرِينَ، عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: «وَلْيَقْضِ ».

ئەبو داود دەڵێت: بەهەمان شێوە (ابْنُ سِيرِين) لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی: (بەجێیبێنن).

وَكَذَا أَبُو رَافِعٍ، عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، وَأَبُو ذَرّ رُوِىَ عَنْهُ « فَأَتِمُّوا ». وَ«اقْضُوا ». وَاخْتُلِفَ فِيهِ.

وە بەهەمان شێوە ئەبو رافع، لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتیەوە، وە لە (أَبُو ذَرّ)یشەوە بە گوێ: (فَأَتِمُّوا) ، وە بە گوێ (وَاقْضُوا) گێڕاویانەتەوە، بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەری.

## باسی ئەگەر لە مزگەوتێکدا نوێژی بەکۆمەڵ کرابێت بۆ یەکێ لە نوێژە فەرزەکان ئایا دروستە جارێکی تر نوێژی بەکۆمەڵی تێدا بکرێتەوە؟

## ٥٦ – بَابُ فِي الْجَمْعِ فِي الْمَسْجِدِ مَرَّتَيْنِ.

٥٧٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبْصَرَ رَجُلاً يُصَلِّي وَحْدَهُ فَقَالَ: « أَلاَ رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّيَ مَعَهُ ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، لەدوای تەواوبوونی نوێژی بەکۆمەڵ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێکی بینی بە تەنیا نوێژی دەکرد فەرمووی: (ئەوە کەسێك نیە خێر بەمە بکات و نوێژی لەگەڵدا بکات).

## باسی کەسیٚ لەمەنزڵگای خۆی نوێژ بکات پاشان بچێت بۆ مزگەوت و بگات بە نوێژی بەکۆمەڵداو نوێژیان لەگەڵ بکات.

## ٥٧ – بَابُ فِيمَنْ صَلَّى فِي مَنْزِلِهِ ثُمَّ أَدْرَكَ الْجَمَاعَةَ يُصَلِّي مَعَهُمْ.

٥٧٥ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَلَمَّا صَلَّى إِذَا رَجُلاَنِ لَمْ يُصَلِّيَا فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَدَعَا بِهِمَا، فَجِيءَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا، فَقَالَ: « مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟ ». قَالاَ قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا. فَقَالَ: « لاَ تَفْعَلُوا إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ أَدْرَكَ الإِمَامَ وَلَمْ يُصَلِّ فَلْيُصَلِّ مَعَهُ، فَإِنَّهَا لَهُ نَافِلَةٌ».

واتە: لە جابری کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسودەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە جارێ لەکاتی لاوێتیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژەکەی بویەوە، دوو پیاوی بینی لە سوچی مزگەوتدا دانیشتبوون و نوێژیان نەدەکرد، جا

بانگی كردن، كە هێنانیان بۆ لای دەلەرزین، پێی فەرموون: چ شتێك بەرگری كردن لەوەی كە نوێژمان لەگەڵدا نەكەن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڕاستی ئێمە لەناو بنەوبارگەی خۆماندا نوێژمان كردووە، فەرمووی: كاری وا مەكەن، ئەگەر كەسێ لە ئێوە لەناو بنەوبارگەی خۆیدا نوێژی كرد، پاشان گەیشت بە نوێژی پێشنوێژدا ئەوا با نوێژی لەگەڵدا بكات، چونكە ئەوەی بە نوێژی سوننەت بۆ دەنوسرێت.

**٥٧٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ بِمِنًى، بِمَعْنَاهُ.**

واتە: لە جابری كوڕی یەزیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە مونا نوێژم كرد.. بە هەمان مانا فەرموودەكەی گێڕایەوە.

**٥٧٧ - (ضعيف) عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَامِرٍ ، قَالَ: جِئْتُ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ فَجَلَسْتُ وَلَمْ أَدْخُلْ مَعَهُمْ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ: فَانْصَرَفَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَأَى يَزِيدَ جَالِسًا فَقَالَ: « أَلَمْ تُسْلِمْ يَا يَزِيدُ ». قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَدْ أَسْلَمْتُ، قَالَ: «فَمَا مَنَعَكَ أَنْ تَدْخُلَ مَعَ النَّاسِ فِي صَلَاتِهِمْ؟». قَالَ:**

إِنِّي كُنْتُ قَدْ صَلَّيْتُ فِي مَنْزِلِي وَأَنَـا أَحْسِـبُ أَنْ قَـدْ صَلَّيْتُمْ، فَقَالَ: « إِذَا جِئْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَوَجَدْتَ النَّاسَ فَصَلِّ مَعَهُمْ، وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَـلَّيْتَ تَكُـنْ لَـكَ نَافِلَـةً، وَهَذِهِ مَكْتُوبَةً ».

[المشكاة: ١١٥٥].

واتـە: لـە یەزیـدی کـوڕی عـامرەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: دوای ئـەوەی کـە موسـوڵمان بـووم چـووم بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لەوکاتـەدا بەرنوێـژی بـۆ هـاوەڵانی دەکـرد، نوێـژم لەگـەڵ نـەکردن، راوی وتـی: کاتێ کە پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم ئـاوڕی دایـەوە بـۆ لامـان بینـی یەزیـد لـە گۆشـەیەکی مزگەوتـدا دانیشـتووە فـەرمووی: (ئـەی یەزیـد ئایـا موسوڵمان بوویت؟). وتی: بەڵێ موسوڵمان بووم ئەی پێغەمبەری خوا صـلی الله علیه وسلم! فـەرمووی: (ئـەی چـی بـەرگری کـردی لـەوەی لەگـەڵ ئـەو خەڵکـە نوێژ نـەکەیت؟). وتـی: من لە مەنزڵگای خۆم نوێژم کردبوو، وە من وام دەزانـی ئێـوە لەنوێـژ بوونەتـەوە، پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (ئەگـەر هاتی بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بینیت خەڵك نوێژ دەکەن تۆش نوێـژیان لەگـەڵ بکـە ئەگـەر نوێژیشـت کردبـوو، چـونکە ئـەو نوێـژەی لەگـەڵ خـەڵك دەیکەیت بە سوننەت بۆت دەنوسرێت، وە ئەو نوێژەش کە لە مـەنزڵگای خـۆت کردوتە بە فەرز بۆت دەنوسرێت). - لەوانەشە بـە پێچەوانەشـەوە بێـت نوێـژی یەکەم بە سوننەت و نوێژی دووهەم بە فەرز - .

٥٧٨ - (ضعيف) عَنْ بُكَيْرٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عَفِيفَ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْمُسَيَّبِ يَقُولُ: حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أَسَدِ بْنِ خُزَيْمَةَ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ فَقَالَ: يُصَلِّي أَحَدُنَا فِي مَنْزِلِهِ الصَّلاَةَ، ثُمَّ يَأْتِي الْمَسْجِدَ، وَتُقَامُ الصَّلاَةُ فَأُصَلِّي مَعَهُمْ، فَأَجِدُ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَقَالَ أَبُو أَيُّوبَ: سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: « ذَلِكَ لَهُ سَهْمُ جَمْعٍ ».

[المشكاه: ١١٥٤].

واتە: لە بوکەیرەوە هاتووە، کە بیستوویەتی لە عەفیفی کوڕی عەمری کوڕی موسەییەب دەیوت: پیاوێ لە (بَنِي أَسَدِ بْنِ خُزَيْمَةَ) بۆی گێڕامەوە، کە لە ئەبو ئەیوبی (أَنْصَارِيّ) پرسیوە؟ وتویەتی: ئەگەر یەکێ لە ئێمە لە مەنزلگای خۆی نوێژێکی فەرزی کرد، پاشان هات بۆ مزگەوت بینی خەڵك ئەو نوێژە بەکۆمەڵ دەکەن ئایا نوێژیان لەگەڵدا بکات؟ لەوبارەوە گومانێکم بۆ دروست بوو، ئەبو ئەیوب وتی: ئێمەش لەوبارەوە لە پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (بەشێ لە خێری ئەو نوێژە بەکۆمەڵەشی بەردەکەوێت).

## باسی ئەگەر کەسێ بەکۆمەڵ نوێژی کرد پاشان فریای هەمان نوێژ کەوت بەکۆمەڵ دووبارەی بکاتەوە یان نا؟

## ٥٨ - بَابُ إِذَا صَلَّى ثُمَّ أَدْرَكَ جَمَاعَةً أَيُعِيدُ.

٥٧٩ - (حسن صحيح) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: أَتَيْتُ ابْنَ عُمَرَ عَلَى الْبَلاَطِ وَهُمْ يُصَلُّونَ، فَقُلْتُ أَلاَ تُصَلِّي مَعَهُمْ، قَالَ: قَدْ صَلَّيْتُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ « لاَ تُصَلُّوا صَلاَةً فِي يَوْمٍ مَرَّتَيْنِ ».

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە هاتووە، کە وتویەتی: چووم بۆلای ئیبنو عەمەر ڕەزای خوایان لێ بێ لە (بَلاَط) بینیم خەڵکەکە بەکۆمەڵ نوێژیان دەکرد بەڵام ئەو نوێژی لەگەڵ نەدەکردن، وتم: ئەوە بۆ نوێژیان لەگەڵ ناکەیت؟ ئیبنو عەمەر وتی: نوێژم کردووە، لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (لەڕۆژێکدا دووجار نوێژێکی فەرز مەکەن).

# باسەکانی پێشنوێژیکردن

## ﴿الأبواب الإِمَامَة﴾.

## باسی پوختەی فەزڵی پێشنوێژیکردن.

## ٥٩ - بَابُ فِي جِمَاعِ الإِمَامَةِ وَفَضْلِهَا.

٥٨٠ - (حسن صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مَنْ أَمَّ النَّاسَ فَأَصَابَ الْوَقْتَ فَلَهُ وَلَهُمْ، وَمَنِ انْتَقَصَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَعَلَيْهِ وَلاَ عَلَيْهِمْ».

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (هەرکەسێ پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات ئەگەر کاتەکەی پێکا ئەوە پاداشتەکەی بۆ خەڵکەکەو بۆ خۆشیەتی، بەڵام ئەگەر کەموکورتیەکی تێدا بوو ئەوە پاداشتەکەی بۆ خەڵکەکەیەو تاوانەکەشی لەسەر خۆیەتی).

## باسی كەراهەتی خۆدزینەوە لە پێشنوێژیكردن.

## ٦٠ - بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ التَّدَافُعِ عَلَى الإِمَامَةِ.

٥٨١ - (ضعيف) عَنْ سَلاَمَةَ بِنْتِ الْحُرِّ أُخْتِ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ الْفَزَارِيِّ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ « إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَتَدَافَعَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، لاَ يَجِدُونَ إِمَامًا يُصَلِّي بِهِمْ ».

[المشكاة: ١١٢٤].

واتە: (سَلامَة)ی كچی (الْحَرّ)ی خوشكی (خَرَشَـة)ی كوڕی (الْحُرّ الْفَزَارِيّ) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (لە نیشانەكانی قیامەت ئەوەیە هەركەسە لە ئەهلی مزگەوت پێشنوێژیكردن لەخۆی دووردەخاتەوە، هەتا دەگاتە رادەیە كەسێكیان دەست ناكەوێت كە شایستە بێت بەرنوێژیان بۆ بكات).

## باسی کێ شایستەترە بۆ پێشنوێژیکردن.

## ٦١ – بَابُ مَنْ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ.

٥٨٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ الْبَدْرِىِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، وَأَقْدَمُهُمْ قِرَاءَةً، فَإِنْ كَانُوا فِى الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَلْيَؤُمَّهُمْ أَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِى الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَلْيَؤُمَّهُمْ أَكْبَرُهُمْ سِنًّا، وَلاَ يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِى بَيْتِهِ وَلاَ فِى سُلْطَانِهِ، وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ ».

واتە: لە ئەبو مەسعودی بەدریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێشنوێژی بکات بۆ هۆزەکەی، ئەوەیان کە قورئانی زۆرتر لەبەرەو چاکتری دەزانێت، وە پێشترینیان لە قورئان خوێندندا، جا ئەگەر لە خوێندنەوەدا وەك یەك بوون، ئەوە کێ زوتر کۆچی کردبێت با پێش نوێژی بکات، جا ئەگەر لە کۆچ کردندا وەك یەك بوون، ئەوە کێ لە هەموویان بەتەمەنترە با پێش نوێژی بکات، وە هیچ پیاوێ پێشنوێژی لە ماڵ و لە دەسەڵاتی کەسێکی تردا نەکات، وە دانەنیشێت لەسەر فەرشەکەی بە بێ پرس و مۆڵەتی خۆی). - لەریوایەتی تردا هاتووە کە خاوەن ماڵ لەپێشترە بۆ پێشنوێژیکردن - .

قَالَ شُعْبَةُ: فقلت لإسْمَاعِيلَ: ما تَكْرِمَتُهُ؟ قَالَ: فِرَاشُهُ.

شوعبە دەڵێت: وتم بە ئیسماعل (تَكْرِمَتُهُ) چیە؟ وتی: ئەو فەرشەیە كەلەسەری دادەنیشێت و تایبەتە بەخۆیەوە.

**٥٨٣ - (صحيح) عَنْ شُعْبَةَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ فِيهِ: « وَلاَ يَؤُمُّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِى سُلْطَانِهِ». قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا قَالَ يَحْيَى الْقَطَّانُ، عَنْ شُعْبَةَ: « أَقْدَمُهُمْ قِرَاءَةً ».**

واتە: فەرموودەی پێشوو لە شوعبەوە هاتووە، (مُعَاذٍ) راوی فەرمودەكە تێیدا وتی: (هیچ پیاوێ پێشنوێژی لە دەسەڵاتی كەسێكی تردا نەكات). ئەبو داود دەڵێت: (يَحْيَى الْقَطَّان) بە هەمان شێوەیە لە شوعبەوە گێڕاویەتیەوە، بە گۆی: (پێشترینیان لە قورئان خوێندندا).

**٥٨٤ - (صحيح) عَنْ أَبَا مَسْعُودٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: «فَإِنْ كَانُوا فِى الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِى السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً ». وَلَمْ يَقُلْ: « فَأَقْدَمُهُمْ قِرَاءَةً ».**

واتە: فەرموودەی پێشوو لە ئەبو مەسعودەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، كە فەرموویەتی: (ئەگەر لە قورئان خوێندندا وەك یەك بوون، ئەوە زاناترینیان بەسوننەت، جا ئەگەر لە سوننەتیشدا یەكسان بوون كێ زوتر كۆچی كردبێت ئەوە دەبێت بە پێشنوێژ، بەڵام نەیفەرموو: (كێ زوتر كۆچی كردبێت).

(صحيح) قَالَ أَبو دَاوُدَ: رَوَاهُ حَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: « وَلاَ تَقْعُدْ عَلَى تَكْرِمَةِ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ ».

ئەبو داود دەڵێت: حەجاجی کوڕی (أَرْطَاة)، لە ئیسماعیلەوە گێڕاویەتیەوە، بە گوێی: (لەسەر فەرشی هیچ کەسێ دانەنیشێت مەگەر بە پرس و مۆڵەتی خۆی).

٥٨٥ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلِمَةَ، قَالَ: كُنَّا بِحَاضِرٍ يَمُرُّ بِنَا النَّاسُ إِذَا أَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانُوا إِذَا رَجَعُوا مَرُّوا بِنَا فَأَخْبَرُونَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، وَكُنْتُ غُلاَمًا حَافِظًا، فَحَفِظْتُ مِنْ ذَلِكَ قُرْآنًا كَثِيرًا، فَانْطَلَقَ أَبِي وَافِدًا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَعَلَّمَهُمُ الصَّلاَةَ فَقَالَ: « يَؤُمُّكُمْ أَقْرَؤُكُمْ ». وَكُنْتُ أَقْرَأَهُمْ لِمَا كُنْتُ أَحْفَظُ، فَقَدَّمُونِي فَكُنْتُ أَؤُمُّهُمْ وَعَلَيَّ بُرْدَةٌ لِي صَغِيرَةٌ صَفْرَاءُ، فَكُنْتُ إِذَا سَجَدْتُ تَكَشَّفَتْ عَنِّي، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسَاءِ: وَارُوا عَنَّا عَوْرَةَ قَارِئِكُمْ. فَاشْتَرَوْا لِي قَمِيصًا عُمَانِيًّا فَمَا فَرِحْتُ بِشَيْءٍ بَعْدَ الإِسْلاَمِ فَرَحِي بِهِ، فَكُنْتُ أَؤُمُّهُمْ وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ، أَوْ ثَمَانِ سِنِينَ.

واتە: لە عەمری کوڕی سەلەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە لە (حَاضِـر) لەسەر ڕێگای خەڵك بووین - (حَاضِر) بە شوێنێ دەوترێت کە ئاوی لێ بێ و هۆزێ لێی دادەبەزن و بەجێی ناهێڵن - ، بۆیە کاتێ کە خەڵك دەچوون بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بەلاماندا تێدەپەڕین، وە کاتێکیش کە دەگەڕانەوە بە هەمان شێوە، جا کە دەهاتنەوە پێیان ڕادەگەیاندین و دەیانوت: کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئاواو ئاوای فەرمووە، منیش لەو کاتەدا غولامێ بووم توانای لەبەرکردنم بەهێز بوو زوو شتم لەبەردەکرد بۆیە هەرچیان دەوت لەبەرم دەکرد، لەبەرئەوە قورئانێکی زۆرم لەبەرکرد، جا باوکم لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەمان بە نوێنەری چوون بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەویش فێری نوێژی کردن و فەرمووی: (کێ قورئانی زۆرتر لەبەر بوو با ئەوە پێشنوێژیتان بۆ بکات). منیش لە هەموویان زیاتر قورئانم لەبەر بوو بۆیە کردمیان بە پێشنوێژی خۆیان و بەرنوێژیم بۆ دەکردن، کراسێکی زەردی کورتم لەبەردا بوو کاتێ کە دەچوومە سەجدەوە بەدەنم دەردەکەوت، بۆیە ئافرەتێك لەو تیرەیە وتی: ئەوە بۆ پاشی شەرمگەری ـ دوای قورئان خوێنەکەتان ناشارنەوە لە ئێمە! ئەوانیش کراسێکی عومانیان بۆ کڕیم و پۆشیم ئەوەندە پێی کەیف خۆش بووم لەدوای ئیسلام بە هیچ شتێ ئەوەندە کەیف خۆش نەبووم، من حەوت هەشت ساڵان بووم بەرنوێژیم بۆ دەکردن.

**٥٨٦ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلِمَةَ، بِهَـذَا الْخَبَـرِ. قَـالَ: فَكُنْـتُ أَؤُمُّهُمْ فِى بُرْدَةٍ مُوصَلَةٍ فِيهَا فَتْقٌ، فَكُنْتُ إِذَا سَجَدْتُ خَرَجَتِ اسْتِي.**

واتە: لە عەمری کوڕی سەلەمەوە، بەسەرهاتی پێشوو هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە بەرنوێژیم بۆ دەکردن عەبایەکم لەبەردا بوو دڕاو بوو دووڕابووەوە بەڵام کونی تێدا بوو بۆیە کاتێ کە دەچوومە سەجدەوە دواوەم دەردەکەوت.

**٥٨٧ - (صحيح غير أن قوله (عَنْ أبيهِ) شاذ) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلِمَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُمْ وَفَدُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أَرَادُوا أَنْ يَنْصَرِفُوا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَنْ يَؤُمُّنَا؟ قَالَ: «أَكْثَرُكُمْ جَمْعًا لِلْقُرْآنِ». أَوْ «أَخْذًا لِلْقُرْآنِ». ﴿قَالَ﴾: فَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ مِنَ الْقَوْمِ جَمَعَ مَا جَمَعْتُهُ، قَالَ: فَقَدَّمُونِي وَأَنَا غُلاَمٌ وَعَلَيَّ شَمْلَةٌ لِي فَمَا شَهِدْتُ مَجْمَعًا مِنْ جَرْمٍ إِلاَّ كُنْتُ إِمَامَهُمْ، وَكُنْتُ أُصَلِّي عَلَى جَنَائِزِهِمْ إِلَى يَوْمِي هَذَا.**

واتە: لە عەمری کوڕی سەلەمەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کە وتویەتی: بە نوێنەری چووین بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە ویستیان بگەڕێنەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کێ پێشنوێژیمان بۆ بکات؟ فەرمووی: (کێ قورئانی زۆرتری لەبەر بوو). — عەمر وتی - هیچ کەس لەو هۆزە بە ئەندازەی من قورئانی لەبەر نەبوو، وتی: جا خستمیانە پێشەوە بۆ ئەوەی بەرنوێژیان بۆ بکەم، منیش غوڵامێ بووم کراسێکی بچوکم پێچابوو بە خۆمەوە، ئیتر لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ بە بەردەوامی پێشنوێژی بۆ هۆزەکەم دەکەم و، نوێژ لەسەر جەنازەیان دەکەم.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلِمَةَ، قَالَ: لَمَّا وَفَدَ قَوْمِي إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَقُلْ عَنْ أَبِيهِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە عەمری کوڕی سەلەمەوە، هاتووە، کە وتویەتی: بە نوێنەری چووین بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، نەیوت: لە باوکیەوە.

٥٨٨ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ نَزَلُوا الْعَصْبَةَ قَبْلَ مَقْدَمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا. زَادَ الْهَيْثَمُ: وَفِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الأَسَدِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە کۆچەرە یەکەمینەکان لە مەکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، پێش ئەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تەشریف ببات بۆ مەدینە، لە (عَصْبَة) دابەزین کە شوێنێکە لە مەدینە، لەوکاتەدا سالمی (مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَة) پێشنوێژی بۆ دەکردن چونکە لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بوو. (هَيْثَم) ئەمەشی بۆ زیاد کرد: ئەوانەی کە سالم پێشنوێژی بۆ دەکردن عومەری کوڕی (خَطَّاب) و، ئەبو سەلەمەی کوڕی (عَبْدِ الأَسَد)یان لەناودا بوو.

٥٨٩ - (صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ أَوْ لِصَاحِبٍ لَهُ: « إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَأَذِّنَا، ثُمَّ أَقِيمَا، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا ».

واتە: لە مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە خۆی یان بە هاوڕێکەی فەرمووە: (هەرکاتێ کاتی نوێژ بوو بانگدرا، پاشان قامەت کرا، با ئەو کەسەی کە لەهەمووتان بەتەمەنترە بەرنوێژیەکەتان بۆ بکات).

(مدرج) وَفِي حَدِيثِ مَسْلَمَةَ، قَالَ: وَكُنَّا يَوْمَئِذٍ مُتَقَارِبَيْنِ فِي الْعِلْمِ.

وە لە فەرموودەکەی مەسلەمەدا هاتووە، کە وتویەتی: ئێمەش لەوکاتەدا هەمووومان لە زانست و زانیاریدا وەك یەك بووین.

(مرسل) وَقَالَ فِي حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ: قَالَ خَالِدٌ: قُلْتُ لأَبِي قِلاَبَةَ: فَأَيْنَ الْقُرْآنُ ، قَالَ: إِنَّهُمَا كَانَا مُتَقَارِبَيْنِ.

وە موسەدەد راوی فەرمودەکە لە فەرموودەکەی (إِسْمَاعِيل)دا وتی، خالید وتی: وتم بە ئەبی قەلابە: ئەی کوا (ترجیح)دان بەوەی کە کێ قورئانی زۆرتری لەبەر بوو، وتی: چونکە لەوەدا وەك یەك بوون بۆیە ئەوەیان کرد بەپێشنوێژ کە بەتەمەنتر بوو.

٥٩٠ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لِيُؤَذِّنْ لَكُمْ خِيَارُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ قُرَّاؤُكُمْ».

[المشكاة: [١١١٩].

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (با کەسێکی چاکتان بانگتان بۆ بدات، کامتان لەهەمووتان زیاتر قورئانی لەبەربوو ئەوەش بەرنوێژیەکەتان بۆ بکات).

## باسی پێشنوێژی ئافرەتان.

## ٦٢ - بَابُ إِمَامَةِ النِّسَاءِ.

٥٩١ - (حسن) عَنْ أُمِّ وَرَقَةَ بِنْتِ نَوْفَلٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا غَزَا بَدْرًا قَالَتْ: قُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! ائْذَنْ لِي فِي الْغَزْوِ مَعَكَ أُمَرِّضُ مَرْضَاكُمْ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَرْزُقَنِي شَهَادَةً، قَالَ: « قِرِّي فِي بَيْتِكِ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَرْزُقُكِ الشَّهَادَةَ ». قَالَ: فَكَانَتْ تُسَمَّى الشَّهِيدَةَ، قَالَ: وَكَانَتْ قَدْ قَرَأَتِ الْقُرْآنَ فَاسْتَأْذَنَتِ

النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنْ تَتَّخِـذَ فِـي دَارِهَـا مُؤَذِّنًا، فَأَذِنَ لَهَا، قَـالَ: وَكَانَـتْ دَبَّـرَتْ غُلَامًـا لَهَـا وَجَارِيَةً، فَقَامَا إِلَيْهَا بِاللَّيْلِ، فَغَمَّاهَا بِقَطِيفَةٍ لَهَا حَتَّى مَاتَتْ، وَذَهَبَا، فَأَصْبَحَ عُمَرُ فَقَامَ فِـي النَّـاسِ فَقَـالَ: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِـنْ هَـذَيْنِ عِلْـمٌ - أَوْ مَـنْ رَآهُمَـا - فَلْيَجِئْ بِهِمَا، فَأَمَرَ بِهِمَا، فَصُلِبَا فَكَانَا أَوَّلَ مَصْـلُوبٍ بِالْمَدِينَةِ.

واتە: لە ئوم وەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ویستی بچێت بۆ جەنگی بەدر پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتم بدەرێ با لەگەڵت بێم بۆ جەنگ چارەسەری و خزمەتی نەخۆش و بریندارەکان بکەم، بەڵکو خوای گەورە پلەی بەرزی شەهیدیم پێ ببەخشێت؟ فەرمووی: (لەماڵی خۆت بمێنەرەوە خوای گەورە پلەی بەرزی شەهیدیت پێ دەبەخشێت). وەکیع راوی فەرموودەکە وتی: ئیتر لەدوای ئەوە بە شەهیدە ناوی دەبرا، وەکیع وتی: ئوم وەرەقە قورئانی لەبەر بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مۆڵەتی پێدا لەماڵەکەیدا بانگبێژێ دابنێ بانگی بۆ بدات و بەرنوێژی بکات بۆ ئافرەتان، راوی وتی: غولامێك و کەنیزکێکی هەبوو پێی وتن لەدوای مردنم ئێوەش ئازاد بن، ئەوانیش شەو چوونە سەری و پۆشاکێکیان دا بەسەر لوت و دەم و چاویداو بەستیان هەتا مرد، جا هەستان و رۆیشتن، کاتێ کە رۆژ بوویەوە هەواڵەکە گەیشتە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ هەستا وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوەو وتی: کێ

هەواڵی ئەو دووانە دەزانێت یان کێ بینوینی بیانهێنن بۆ لامان کاتێ هێنانیان فەرمانی کرد هەڵیان بواسن، ئەوەش یەکەم هەڵواسین بوو لە شاری مەدینەدا.

٥٩٢ - (حسن) عَنْ أُمِّ وَرَقَةَ بِنْتِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، بِهَذَا الْحَدِيثِ وَالأَوَّلُ أَتَمُّ، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَزُورُهَا فِي بَيْتِهَا، وَجَعَلَ لَهَا مُؤَذِّنًا يُؤَذِّنُ لَهَا، وَأَمَرَهَا أَنْ تَؤُمَّ أَهْلَ دَارِهَا، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَأَنَا رَأَيْتُ مُؤَذِّنَهَا شَيْخًا كَبِيرًا.

واتە: ئوم وەرەقەی کچی (عبداللە)ی کوڕی (الْحَارِث)، فەرموودەکەی پێشووی گێڕاوەتەوە، بەڵام فەرموودەی یەکەم تەواوترە، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی کرد لەماڵەکەی خۆیدا و بانگدەرێکی بۆ دانا کە بانگی بۆ بدات و فەرمانی پێ کرد پێشنوێژی بۆ کەس و کارەکەی و ماڵی خۆی بکات. (عَبْدُ الرَّحْمَن) وتی: من بانگدەرەکەم بینی پیاوێکی پیر بوو.

# باسی پیاوێ پێشنوێژی بكات بۆ كۆمەڵێ ئەوان رقیان لێی بێت.

## ٦٣ - بَابُ الرَّجُلِ يَؤُمُّ الْقَوْمَ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ.

٥٩٣ - (ضعيف إلا الشطر الأول فصحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُمْ صَلاَةً مَنْ تَقَدَّمَ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، وَرَجُلٌ أَتَى الصَّلاَةَ دِبَارًا - وَالدِّبَارُ أَنْ يَأْتِيَهَا بَعْدَ أَنْ تَفُوتَهُ - وَرَجُلٌ اعْتَبَدَ مُحَرَّرَهُ».

[المشكاة: [١١٢٢].

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە نوێژی سێ جۆر كەس وەرناگرێت: پیاوێ بەرنوێژی بۆ كۆمەڵێ بكات ئەوان رقیان لێی بێت، وە پیاوێ عادەتی وابێت هەتا نوێژەكەی نەچێت نەڕوات بەدەمیەوە - واتە ئەوەی كە نوێژی جەماعەت تەواو بوو ئەو كاتە دەڕوات بۆ نوێژ- وە پیاوێ ئەو بەندەیەی كە ئازدی كردووە بیگێڕێتەوە بۆ بەندەیی).

## باسی پێشنوێژی چاکەکار و خراپەکار.

## ٦٤ – بَابُ  إِمَامَةِ الْبَرِّ وَالْفَاجِرِ.

٥٩٤ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « الصَّلاَةُ الْمَكْتُوبَةُ وَاجِبَةٌ خَلْفَ كُلِّ مُسْلِمٍ، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا، وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژە فەرزەکان واجبە لەدوای هەموو موسڵمانێکەوە بکرێن ئیتر چاکەکار بێ یان خراپەکار، ئەگەر تاوانە گەورەکانیش بکات).

## باسی پێشنوێژی نابینا

## ٦٥ – بَابُ إِمَامَةِ الأَعْمَى.

٥٩٥ - (حسن صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَخْلَفَ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ يَؤُمُّ النَّاسَ، وَهُوَ أَعْمَى.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچوو بۆ غەزا کوڕی (أُمِّ مَكْتُوم)ی لەجێی خۆی دادەنا بۆ ئەوەی پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی مەدینە، لەکاتێکدا کە نابیناش بوو.

# باسی پێشنوێژی کەسیٚ کە سەردانی قەومێك بکات.

## ٦٦ – بَابُ إِمَامَةِ الزَّائِرِ.

٥٩٦ - (صحيح) عَنْ أَبُو عَطِيَّةَ - مَوْلًى مِنَّا- قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ حُوَيْرِثٍ يَأْتِينَا إِلَى مُصَلاَّنَا هَذَا، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَقُلْنَا لَهُ: تَقَدَّمْ فَصَلِّهْ. فَقَالَ: لَنَا قَدِّمُوا رَجُلاً مِنْكُمْ يُصَلِّي بِكُمْ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ لِمَ لاَ أُصَلِّي بِكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « مَنْ زَارَ قَوْمًا فَلاَ يَؤُمَّهُمْ وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ ».

واتە: لە (أَبُو عَطِيَّةَ)ی نۆکەری هۆزی (حُوَيْرِث)ەوە هاتووە، کە وتویەتی مالیکی کوڕی (حُوَيْرِث) سەردانی کردین و هات بۆ مزگەوتەکەمان لە بەسرا کاتیٚ کە قامەت کرا بۆ نویٚژ پێمان وت: پێشکەوە بەرنوێژیمان بۆ بکە. ئەویش پێی وتین: با پیاویٚ لەخۆتان بەرنوێژیتان بۆ بکات – لەکاتێکدا کە ئەو لەوان شایەنتر بوو، چونکە یەکیٚ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پیاوێکی زاناش بوو - ، پێتان دەڵێم کە بۆچی بەرنوێژیتان بۆ ناکەم؟ چونکە لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە فەرموویەتی: (ئەوەی سەردانی قەومێك بکات نابێت بەرنوێژییان بۆ بکات، بەڵکو دەبیٚ پیاوێ لەخۆیان بەرنوێژییان بۆ بکات).

## باسی راوەستانی پێشنوێژ لەشوێنێكدا كە بەرزتر بێ لە شوێنی خەڵكەكە.

## ٦٧ – بَابُ الإِمَامِ يَقُومُ مَكَانًا أَرْفَعَ مِنْ مَكَانِ الْقَوْمِ.

| |
|---|
| ٥٩٧ - (صحيح) عَنْ هَمَّامٍ: أَنَّ حُذَيْفَةَ أَمَّ النَّاسَ بِالْمَدَائِنِ عَلَى دُكَّانٍ، فَأَخَذَ أَبُو مَسْعُودٍ بِقَمِيصِهِ فَجَبَذَهُ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ قَالَ: أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُنْهَوْنَ عَنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: بَلَى، قَدْ ذَكَرْتُ حِينَ مَدَدْتَنِي. |

واتە: لە (هَمَّام) ەوە هاتووە، كە (حُذَيْفَة) لەسەر شوێنێكی بەرز كە بەرزتر بوو لە شوێنی خەڵكەكە راوەستابوو بەرنوێژی بۆ خەڵكی مەدائین دەكرد، ئەبو مەسعود كراسەكەی گرت و رایكێشا كاتێ كە لەنوێژ بووەوە وتی: نازانیت كە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەو شێوە وەستانەیان قەدەغەكردووە؟ وتی: بەڵێ، كاتێ یادم كەوتەوە كە راتكێشام.

| |
|---|
| ٥٩٨ - (حسن بما قبله إلا قوله أن الإمام كان عمار وأن الذي جذبه حذيفة، فإنه منكر، والصواب ما في الحديث السابق) عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ، حَدَّثَنِي رَجُلٌ |

أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ بِالْمَدَائِنِ، فَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَتَقَدَّمَ عَمَّارٌ، وَقَامَ عَلَى دُكَّانٍ يُصَلِّي وَالنَّاسُ أَسْفَلَ مِنْهُ، فَتَقَدَّمَ حُذَيْفَةُ فَأَخَذَ عَلَى يَدَيْهِ، فَاتَّبَعَهُ عَمَّارٌ حَتَّى أَنْزَلَهُ حُذَيْفَةُ، فَلَمَّا فَرَغَ عَمَّارٌ مِنْ صَلاَتِهِ، قَالَ لَهُ حُذَيْفَةُ: أَلَمْ تَسْمَعْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِذَا أَمَّ الرَّجُلُ الْقَوْمَ فَلاَ يَقُمْ فِي مَكَانٍ أَرْفَعَ مِنْ مَقَامِهِمْ ». - أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ - قَالَ عَمَّارٌ: لِذَلِكَ اتَّبَعْتُكَ حِينَ أَخَذْتَ عَلَى يَدَيَّ.

واتە: عودەی كوڕی (ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ) وتی: پیاوێ بۆی گێڕامەوە، وتی: لە مەدائین لەگەڵ عەماری كوڕی یاسردا بووم، كاتێ كە قامەت كرا بۆ نوێژ عەمار چووەپێشەوەو لەشوێنێكدا بەرنوێژی بۆ خەڵكەكە كرد كە بەرزتر بوو لە شوێنی خەڵكەكە، (حُذَيْفَة) لەڕیزەكە چووەپێشەوەو لەدواوە عەماری گرت و رایكێشا بۆئەوەی دابەزێت، عەماریش شوێنی كەوت هەتا (حُذَيْفَة) هێنایە خوارەوە، كاتێ كە عەمار لەنوێژ بوویەوە، (حُذَيْفَة) پێی وت: ئایا نەتبیستووە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ كە پیاوێ بەرنوێژی كرد بۆ قەومێ با لە شوێنێكدا بەرنوێژی نەكات كە بەرزتر بێت لە شوێنی قەومەكە). - یان بەهەمان شێوە - عەمار وتی: لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شوێنت كەوتم كاتێ كە دەستەكانمت گرت و راتكێشام.

## باسی كەسێ بەرنوێژی بكات بۆ قەومێك لەكاتێكدا ئەو نوێژەی كردبێت.

## ٦٨ - بَابُ إِمَامَةِ مَنْ يُصَلِّي بِقَوْمٍ وَقَدْ صَلَّى تِلْكَ الصَّلاَةَ.

٥٩٩ - (حسن صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ كَانَ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلاَةَ.

واتە: لە جابری كوڕی (عبداللە)ەوە هاتووە، كە (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم نوێژی عیشای كردو، پاشان هاتەوە بۆناو قەومەكەی و بەرنوێژی هەمان نوێژی بۆ كردن.

٦٠٠ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: إِنَّ مُعَاذًا كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ.

واتە: لە جابری كوڕی (عبداللە)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەل لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم نوێژی دەكرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆناو قەومەكەی و بەرنوێژی هەمان نوێژی بۆ كردن.

## باسی نوێژكردنی پێشنوێژ بەدانیشتنەوە.

## ٦٩ – بَابُ الإِمَامِ يُصَلِّي مِنْ قُعُودٍ.

٦٠١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم رَكِبَ فَرَسًا، فَصُرِعَ عَنْهُ، فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ ، فَصَلَّى صَلاةً مِنَ الصَّلَوَاتِ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: « إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، أَوْ إِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا ﴿وَ﴾لَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا، فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ ».

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سواری ئەسپێ بوو لەسەری كەوتەخوارەوەو، لای راستی روشا، لەبەر ئازار توانای نەبوو نوێژەكانی بەپێوە بكات، جا بەدانیشتنەوە یەكێ لە نوێژە فەرزەكانی دەكرد، ئێمەش بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژمان كرد، كاتێ كە لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بكەون، جا ئەگەر بەپێوە نوێژی كرد ئێوەش بەپێوە لەدوایەوە نوێژ بكەن، وە ئەگەر چووە ركوعەوە ئێوەش ركوع بەرن، كاتێ كە سەری بەرزكردەوە ئێوەش بەدوایدا سەرتان بەرزكەنەوە، ئەگەر وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە

بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەکەن. ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). واتە: پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ. هەروەها ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن.

٦٠٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَرَسًا بِالْمَدِينَةِ فَصَرَعَهُ عَلَى جِذْمِ نَخْلَةٍ، فَانْفَكَّتْ قَدَمُهُ ، فَأَتَيْنَاهُ نَعُودُهُ ، فَوَجَدْنَاهُ فِي مَشْرُبَةٍ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها يُسَبِّحُ جَالِسًا ، قَالَ: فَقُمْنَا خَلْفَهُ ، فَسَكَتَ عَنْا ، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ مَرَّةً أُخْرَى نَعُودُهُ ، فَوَجَدْنَاهُ فَصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ جَالِسًا ، فَقُمْنَا خَلْفَهُ فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا ، قَالَ: فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ ، قَالَ: إِذَا صَلَّى الإِمَامُ جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا ، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا ، وَلا تَفْعَلُوا كَمَا يَفْعَلُ أَهْلُ فَارِسَ بِعُظَمَائِهَا ».

واتە: لە جابرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە سواری ئەسپێ بوو کەوتەخوارەوەو کەوت بەسەر ئەسڵی دارخورمایەکدا، قاچی دەرچوو، ئێمەش سەردانمان کرد، بینیمان لە ژووری گەنجینەکەی عائیشەدا رەزای خوای لێ بێ بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات، جابر وتی: ئێمەش لەدوایەوە بەپێوە نوێژمان کرد بێ دەنگ بوو بەرگری نەکردین، پاشان جارێکی تر سەردانمان کردەوە، بە دانیشتنەوە یەکێ لە نوێژە

فەرزەکانی دەکرد، ئێمەش بە پێوە لەدوایەوە نوێژمان کرد، ئاماژەی بۆکردین کە دانیشین ئێمەش دانیشتین، جابر وتی: کاتێ کە لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (ئەگەر پێشنوێژ بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەش بەپێوە لەدوایەوە نوێژ بکەن، بەوشێوەیە مەکەن کە فارسەکان بەرامبەر بە پاشاو خاوەن دەسەڵاتەکانیان دەیانکرد).

٦٠٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنَّمَا جُعِلَ اَلْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَلَا تُكَبِّرُوا حَتَّى يُكَبِّرَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَلَا تَرْكَعُوا حَتَّى يَرْكَعَ، وَإِذَا ، قَالَ: سَمِعَ اَللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اَللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ اَلْحَمْدُ». قَالَ مُسْلِمٌ: «وَلَكَ الْحَمْدُ». « وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَلَا تَسْجُدُوا حَتَّى يَسْجُدَ، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعِينَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون، جا پێشی مەکەون، کاتێ کە وتی: (الله اكبر)، ئێوەش بڵێن: (الله اكبر). ئێوە (الله اكبر). مەکەن هەتا ئەو دەڵێ: (الله اكبر) واتە پێشی مەکەون. ئەگەر چووە رکوعەوە ئێوەش رکوع بەرن، مەچنە رکوعەوە هەتا ئەو رکوع دەبات، کاتێ وتی: (سَمِعَ

اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). ئێوەش بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). موسلیم وتی: (وَلَكَ الْحَمْدُ). ئەگەر چووە سەجدەوە ئێوەش سەجدە بەرن، مەچنە سەجدەوە هەتا ئەو سەجدە دەبات، جا ئەگەر بەپێوە نوێژی کرد ئێوەش بەپێوە لەدوایەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بکەن).

قَالَ أَبو دَاوُدَ: « اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ ». أَفْهَمَنِي بَعْضُ أَصْحَابِنَا، عَنْ سُلَيْمَانَ.

ئەبو داود دەڵێت: کاتێ کە سولەیمان فەرموودەکەی بۆ گێڕامەوە، لە وشەی: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). تێنەگەیشتم، پاشان هەندێ لە هاوەڵانمان تێیان گەیاندم.

**٦٠٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ ». بِهَذَا الْخَبَرِ زَادَ: « وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا ».**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون). ئەبو خالد راوی فەرموودەکە بەسەرهاتی ناوبراوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (کاتێ کە قورئانی خوێند بە بێدەنگی گوێی لێ بگرن).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ﴿وَ﴾ هَذِهِ الزِّيَادَةُ: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). لَيْسَتْ بِمَحْفُوظَةٍ، الْوَهَمُ عِنْدَنَا مِنْ أَبِي خَالِدٍ[١].

ئەبو داود دەڵێت: ئەم زیادەیە: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). لەلای ئێمە(مَحْفُوظ) نیە، (وَهم)ەكەش لە ئەبی خالیدەوەیە.

٦٠٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا ، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ ، قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا ، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا ، فَصَلُّوا جُلُوسًا».

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵی خۆیدا بە دانیشتنەوە نوێژی دەكرد، كۆمەڵێكیش لەدوایەوە بە پێوە نوێژیان كرد، ئاماژەی بۆكردن كە دانیشن، كاتێ كە لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بكەون، جا ئەگەر چووە ركوعەوە ئێوەش ركوع بەرن، كاتێ كە سەری بەرزكردەوە ئێوەش بەدوایدا سەرتان بەرزكەنەوە، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بكەن).

---

[١] - (وَهم)ەكە لە ئەبی خالیدەوە نیە، بەڵكو لە (ابن عجلان)ەوەیە، سەیری (صحيح سنن أبي داود: (٣/ ١٦٠ - ١٦٢) بكە.

٦٠٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ ، قَالَ: اشْتَكَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يُكَبِّرُ لِيُسْمِعَ النَّاسَ تَكْبِيرَهُ، ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە جابرەوە هاتووە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەكاتێكدا كە نەخۆش بوو بە دانیشتنەوە نوێژی دەكرد، ئێمەش لەدوایەوە نوێژمان كرد، وە ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ بەدەنگی بەرز (الله اكبر)ی دەكرد بۆ ئەوەی خەڵكەكە گوێیان لە (الله اكبر)ەكانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێت، پاشان فەرموودەكەی گێڕایەوە.

٦٠٧ - (صحيح) عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ، أَنَّهُ كَانَ يَؤُمُّهُمْ قَالَ: فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ إِمَامَنَا مَرِيضٌ؟ فَقَالَ: « إِذَا صَلَّى قَاعِدًا، فَصَلُّوا قُعُودًا ».

واتە: ئوسەیدی كوڕی (حُضَیْر) نەخۆش بوو بەرنوێژی بۆ قەومەكەی دەكرد، وتی: لەوكاتەدا كە ئەو پێشنوێژیان بوو نەخۆش بوو وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ سەردانی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشنوێژەكەمان نەخۆشە، فەرمووی: (ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بكەن).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ هذا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِمُتَّصِلٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە: (مُتَّصِل) نیە، چونكە راوى فەرمودەكە (حصين) ئوسەيدى نەديوە.

## باسى دووكەس ئەگەر يەكێكيان بەرنوێژى بكات بۆ ئەوى تريان چۆن دەوەستى؟

## ٧٠ - بَابُ الرَّجُلَيْنِ يَؤُمُّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، كَيْفَ يَقُومَانِ؟

٦٠٨ - (صحيح) عَنْ ثَابِتٍ ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى أُمَّ حَرَامٍ ، فَأَتَيْنَاهُ بِسَمْنٍ وَتَمْرٍ ، فَقَالَ: «رُدُّوا هَذَا فِي وِعَائِهِ ، وَهَذَا فِي سِقَائِهِ ، فَإِنِّي صَائِمٌ». قَالَ: ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى بِنَا ﴿رَكْعَتَيْنِ﴾ تَطَوُّعًا ، فَأَقَامَ أُمَّ حَرَامٍ وَأُمَّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا ، قَالَ ثَابِتٌ: وَلاَ أَعلَمُهُ إلاَ قَالَ: أَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ عَلَى بِسَاطٍ.

واتە: لە (ثابت)ەوە، لە ئەنەسى كوڕى مالیكەوە هاتووە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم چوو بۆلاى (أُمّ حَرَام) - كە خوشكى (أُمُّ سُلَيْم)ى دايكى ئەنەس بوو - ئەويش رۆن و خورماى بۆ هێنا، فەرمووى: (خورماكە بكەرەوە ناو دەفرەكەى خۆيەوە، رۆنەكەش بكەرەوە ناو جەوەنە يان مەشكەكەى خۆيەوە، چونكە من بەرۆژووم). پاشان هەستا بەرنوێژى دوو ركات نوێژى سوننەتى بۆ كردين، (أُمُّ سُلَيْمٍ) و (أُمُّ حَرَام)يش لەدوامانەوە وەستان، (ثابت)

وتی: نازانم ئیللا ئەوە نەبێت کە ئەنەس وتی: منیشی خستە لای راستی خۆیەوە لەسەر راخەرێك.

٦٠٩ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّهُ وَامْرَأَةً مِنْهُمْ فَجَعَلَهُ عَنْ يَمِينِهِ، وَالْمَرْأَةَ خَلْفَ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی بۆ ئەنەس و ئافرەتێکی خانەوادەکەی کردووە، ئەنەسی خستۆتە لای راستی و ئافرەتەکەش لەدوای ئەنەسەوە.

٦١٠ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَطْلَقَ الْقِرْبَةَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ أَوْكَأَ الْقِرْبَةَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ كَمَا تَوَضَّأَ، ثُمَّ جِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَنِي بِيَمِينِهِ، فَأَدَارَنِي مِنْ وَرَائِهِ، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: شەوێك لەماڵ (مَيْمُونَة)ی پورم مامەوە - کە خێزانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو - جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا دەمی کونەیەکی کردەوەو دەستنوێژی گرت، پاشان دەمەکەی بەستەوە، ئینجا هەستا بۆ

نوێژكردن، منیش هەستام دەستنوێژم گرت وەك چۆن ئەو دەستنوێژی گرت، پاشان هاتمەوە لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش بەدەستی راستی لەپشتی خۆیەوە هێنامیە لای راستی خۆیەوە، ئینجا نوێژم لەگەڵ كرد.

٦١١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ - فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ - قَالَ: فَأَخَذَ بِرَأْسِي - أَوْ بِذُؤَابَتِي- فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هەمان بەسەرهاتی ناوبراو هاتووە، كە وتویەتی: مووی پێشی سەری گرتم و خستمیە لای راستیەوە.

## باسی ئەگەر سێ كەس بوون لەكاتی جەماعەتدا چۆن رادەوەستن.

## ٧١ - بَابُ إِذَا كَانُوا ثَلاَثَةً كَيْفَ يَقُومُونَ.

٦١٢ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: « قُومُوا فَلأُصَلِّيَ لَكُمْ ». قَالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ فَنَضَحْتُهُ بِالْمَاءِ، فَقَامَ عَلَيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ مِنْ وَرَاءِهِ، وَالْعَجُوزُ

مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە هـاتووە، کـە پـوری (مُلَيْكَـة) بانگێشـتی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم کرد بۆ خـواردنێ کـە دروسـتی کردبـوو، ئـەویش لێـی خـوارد، پاشـان فـەرمووی: (هەسـتن بـا بەرنوێـژیتان بـۆ بکـەم). ئەنــەس وتــی: هەســتام چــووم حەســیرێکمان هــەبوو کــە لەبــەر کــۆنی ڕەش داگەڕابوو، ئاوڕشێنم کردوو هێنام، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا چووە سـەری، مـن و منـداڵێکی هـەتیو لەدوایـەوە ڕیزبـووین، پیرەژنەکـەش لـە دوامانەوە بوو، جا دوورکات نوێژی بۆ کردین پاشان سەلامی دایەوەو ڕۆشت.

٦١٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْـنِ الأَسْـوَدِ، عَـنْ أَبِيـهِ، قَـالَ: اسْتَأْذَنَ عَلْقَمَةُ وَالأَسْوَدُ عَلَـى عَبْـدِ اللَّـهِ، وَقَـدْ كُنَّـا أَطَلْنَا الْقُعُودَ عَلَى بَابِهِ، فَخَرَجَتِ الْجَارِيَةُ فَاسْـتَأْذَنَتْ لَهُمَا، فَأَذِنَ لَهُمَا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى بَيْنِي وَبَيْنَهُ، ثُمَّ قَـالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ.

واتـە: لـە (عَبْـد الـرَّحْمَن)ی کـوڕی ئەسـوەدەوە، لـە باوکیـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: عەلقەمــە و ئەسـوەد داوای مۆڵـەتی چـوونەژوورەوەیان کـرد لـە (عبداللّـە)ی کـوڕی مەسـعود، ماوەیــەکی زۆر لەبــەردەم دەرگــای ماڵەکەیــدا دانیشـتین چـاوەڕێی مۆڵـەتمان کـرد، جـا کەنیزەیـەك هاتـەدەرەوەو بینینـی لەبــەردەم دەرگــا دانیشــتووین، چــووەژوورەوە مۆڵــەتی بــۆ وەرگــرتین و چووینەژوورەوە، (عبداللّە) هەستا لـەنێوان مـن و ئـەودا نوێـژی کـرد – واتـە

یـەکێکیان لای راسـتیەوە وەسـتا، ئەویشـیان لـەلای چـەپیەوە - پاشـان وتـی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم دی بەو شێوەیەی کرد.

## باسی وەرچەرخانی پێشنوێژ لەدوای سەلام دانەوە.

## ٧٢ – بَابُ الإِمَامِ يَنْحَرِفُ بَعْدَ التَّسْلِيمِ.

٦١٤ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَ إِذَا انْصَرَفَ انْحَرَفَ.

واتە: لە جابری کوڕی یەزیدی کوڕی زەیدەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کە وتویەتی: لەدوای پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نوێژم کردووە، کاتێ کە سەلامی دایەوە خۆی وەردەچەرخاند.

٦١٥ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، فَيُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتـە: لـە بـەرائی کوڕی عازبـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: جاران کـە لـەدوای پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نوێـژمان دەکـرد: پێمـان خـۆش بـوو لـەلای

راستیەوە بین، چونکە کە سەلامی دەدایەوە لەلای راستیەوە رووی تێ دەکردین.

## باسی ئایا دروستە پێشنوێژ لە جێگای خۆیدا نوێژی سوننەت بکات یان نا؟

## ٧٣ - بَابُ الإِمَامِ يَتَطَوَّعُ فِي مَكَانِهِ.

٦١٦ - (صحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ يُصَلِّي الإِمَامُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ حَتَّى يَتَحَوَّلَ ».

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با پێشنوێژ لەو جێگایەدا نوێژی سوننەت نەکات کە نوێژە فەرزەکەی تێدا کردووە هەتا دەگوێزێتەوە بۆ جێگایەکی تر).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَطَاءٌ الْخُرَاسَانِيُّ لَمْ يُدْرِكِ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ.

واتە: ئەبو داود دەڵێت: (عَطَاء الْخُرَاسَانِيُّ) راوی فەرموودەکە موغیرەی کوڕی شوعبەی نەدیوە.

## باسی ئەگەر پێشنوێژ دەستنوێژەکەی پوچەڵ بوویەوە دوای ئەوەی کە سەری بەرزکردەوە لە سەجدەی دوا رکاتدا.

## ٧٤ - بَابُ الإِمَامِ يُحْدِثُ بَعْدَ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنْ آخِرِ الرَّكْعَةِ.

٦١٧ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا قَضَى الإِمَامُ الصَّلاَةَ وَقَعَدَ، فَأَحْدَثَ قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ: فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ وَمَنْ كَانَ خَلْفَهُ مِمَّنْ أَتَمَّ الصَّلاَةَ ».

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر پێشنوێژ روکنەکانی نوێژی تەواو کردو لە نوێژ بوویەوە واتە دوای ئەوەی سەری بەرزکردەوە لە سەجدەی دوا رکاتداو دانیشت بۆ تەحیات دەستنوێژەکەی پوچەڵ بوویەوە پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، ئەوە نوێژەکەی خۆی و ئەوانەش کە لەدوایەوە نوێژیان کردووە دروستە)[1].

---

[1] - بەڵام ئەو فەرموودەی کە دوای ئەم دێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژ تەواو نیە ئیللا بە سەلام دانەوە نەبێت، وە ئەگەر پێش سەلام دانەوە دەستنوێژەکەی پوچەڵ بوویەوە ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، وە لەسەریەتی دەستنوێژ بگرێتەوەو نوێژەکەی

٦١٨ - (حسن صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَـال رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُـورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ ».

واتــه: لـه پێشـەوا عەلیـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـه وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: کـه (کلیلـی کردنـەوەی دەستنوێژە، دابەستنیشی بە (الله اکبر)ە، بە سەلامدانەوەش تەواو دەکرێت).

## باسی ئەو کەسەی کە لەدوای پێشنوێژەوە نوێژ دەکات پێویستە شوێن پێشنوێژ بکەوێت، وە نابێت پێشی بکەوێت.

## ٧٥ - بَابُ مَا يُؤْمَرُ بِهِ الْمَأْمُومُ مِنَ اتِّبَاعِ الإِمَامِ.

٦١٩ - (حسن صحيح) عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِى سُفْيَانَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ تُبَادِرُونِى بِرُكُـوعٍ وَلاَ بِسُجُودٍ، فَإِنَّهُ مَهْمَا أَسْبِقْكُمْ بِهِ إِذَا رَكَعْـتُ تُـدْرِكُونِى بِهِ إِذَا رَفَعْتُ، إِنِّى قَدْ بَدَّنْتُ ».

---

بکاتەوە، چونکە نوێژ تەواو نیە ئیللا بـە سـەلام دانـەوە نـەبێت. شـرح سـنن أبـی داود: عبدالمحسن العباد.

واتە: لە مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە چوونە رکوع و لە چوونە سەجدەدا پێشم مەکەون، چونکە هەرچەندە کەمێ پێشتان بکەوم لە چوونە رکوعدا فریام دەکەون کاتێ کە ویستم سەرم بەرزکەمەوە، چونکە بەڕاستی من بەساڵاچووم).

٦٢٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ الْخَطْمِيَّ يَخْطُبُ النَّاسَ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْبَرَاءُ - وَهُوَ غَيْرُ كَذُوبٍ - أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا رَفَعُوا رُءُوسَهُمْ مِنَ الرُّكُوعِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامُوا قِيَامًا، فَإِذَا رَأَوْهُ قَدْ سَجَدَ سَجَدُوا.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عبداللە)ی کوڕی یەزیدی (خَطْمِیّ) وتاری دەدا بۆ خەڵك گوێم لێی بوو وتی: (بَراء) - کە پیاوێکی باوەڕ پێکراوەو درۆزن نیە – بۆی گێڕامەوە، وتی: هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سەریان بەرزدەکردەوە لە رکوع ماوەیەك بە راوەستاوی دەمانەوە، کاتێ کە پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم دەدی دەچووە سەجدەوە، ئەوانیش دەچوونە سەجدەوە.

٦٢١ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ، قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلاَ يَحْنُو أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَرَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ.

واتە: لە (بَـرَاء)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژمان دەکرد هیچ کەسێ لە ئێمە پشتی لارنەدەکردەوە هەتا پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دەدی سەری دەخستە سەر جێگا سەجدەکەیەوە.

٦٢٢ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ، قَالَ: أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا رَكَعَ رَكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ». لَمْ نَزَلْ قِيَامًا حَتَّى يَرَوْهُ قَدْ وَضَعَ جَبْهَتَهُ بِالأَرْضِ، ثُمَّ يَتَّبِعُونَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (بَرَاء)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژمان دەکرد کاتێ کە دەچووە رکوعەوە ئەوانیش دەچوونە رکوعەوە،، کاتێ کە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). بەردەوام بە راوەستاوی دەمانەوە، هەتا کاتێ کە پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم دەدی روخساری دەخستە سەر زەوییەوە، پاشان شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەکەوتن.

## باسی هەڕشەكردن لەو كەسەی كە لەركوع و لەسەجدەدا لەپێش پێشنوێژەوە سەری بەرزدەكاتەوە یان لە پێشییەوە دەچێتە ركوع و سەجدەوە.

## ٧٦ – بَابُ التَّشْدِيدِ فِيمَنْ يَرْفَعُ قَبْلَ الإِمَامِ أَوْ يَضَعُ قَبْلَهُ.

٦٢٣ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَمَا يَخْشَى - أَوْ أَلاَ يَخْشَى - أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ وَالإِمَامُ سَاجِدٌ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ؟! أَوْ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ ».

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئایا ناترسێت كەسێك لە ئێوە سەری بەرزدەكاتەوە لە سەجدە لەكاتێكدا كە پێشنوێژ لەسەجدەدایە خوا ئەو سەرەی بكات بەسەری گوێدرێژ؟ یان وێنەی ئەو بگۆڕێت بە وێنەی گوێدرێژێك).

## باسی ئەو كەسەی كە لە پێش پێشنوێژەوە سەلام دەداتەوە.

## ٧٧ - بَابُ فِيمَنْ يَنْصَرِفُ قَبْلَ الإِمَامِ.

٦٢٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَضَّهُمْ عَلَى الصَّلاَةِ، وَنَهَاهُمْ أَنْ يَنْصَرِفُوا قَبْلَ انْصِرَافِهِ مِنَ الصَّلاَةِ.

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هانی هاوەڵانی دەدا لەسەر نوێژكردنی بەكۆمەڵ، وە بەرگری ئەوەشی لێ دەكردن كە لەپێشیەوە سەلام بدەنەوە.

## باسی پوختەی ئەو پۆشاكانەی كە دروستە نوێژیان پێوە بكرێت.

## ٧٨ - بَابُ جِمَاعِ أَثْوَابِ مَا يُصَلَّى فِيهِ.

٦٢٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنْ الصَّلاَةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ؟ فَقَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ « أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟! ».

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە، کە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیار کرا ئایا نوێژکردن بەکراسێکەوە دەکرێت یان نا؟ ئەویش فەرمووی: (بۆچی هەمووتان دوو کراستان هەیە؟!).

٦٢٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ يُصَلِّ أَحَدُكُمْ فِى الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ مِنْهُ شَىْءٌ ».

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با هیچ کەسێك لە ئێوە بە کراسێکەوە نوێژ نەکات، کە نەگاتەوە بەسەر هەردوو شانیدا).

٦٢٧ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فِى ثَوْبٍ فَلْيُخَالِفْ بِطَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ ».

واتە: لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێك لەئێوە بە کراسێکەوە نوێژی کرد، با بیئاڵێنێ لەخۆیەوەو هەردوو چمکەکەی لەسەر شانی راست و چەپ بکا).

٦٢٨ - (صحيح) عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِى سَلَمَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ، مُلْتَحِفًا، مُخَالِفًا بَيْنَ طَرَفَيْهِ عَلَى مَنْكِبَيْهِ.

واتە: لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە کراسێکەوە نوێژی دەکرد، ئالاندبووی لەخۆیەوە، هەردوو چمکەکەی لەسەر شانی ڕاست و چەپ کردبوو.

٦٢٩ - (صحيح) عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا تَرَى فِي الصَّلاَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ قَالَ: فَأَطْلَقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِزَارَهُ طَارَقَ بِهِ رِدَاءَهُ، فَاشْتَمَلَ بِهِمَا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى بِنَا نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أَنْ قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: « أَوَكُلُّكُمْ يَجِدُ ثَوْبَيْنِ ».

واتە: لە قەیسی کوڕی (طَلْق)ەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کە وتویەتی: چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پیاوێ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێت چۆنە نوێژکردن بە کراسێکەوە ئایا دروستە یان نا؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئیزارەکەی بڵاوکردەوەو هەڵیدایەوەو خستیە سەر ڕیدائەکەی دابەسەریداو ئالاندی لەخۆیەوە، پاشان هەستا بەرنوێژی بۆکردین کاتێ کە لەنوێژ بوویەوە، فەرمووی: (بۆچی هەمووتان دوو کراستان هەیە؟).

## باسی پیاو کراسەکەی لە ملی گریّ دەدات پاشان نوێژی پێوە دەکات.

## ٧٩ - بَابُ الرَّجُلِ يَعْقِدُ الثَّوْبَ فِي قَفَاهُ ثُمَّ يُصَلِّي.

٦٣٠ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ الرِّجَالَ عَاقِدِي أُزُرِهِمْ فِي أَعْنَاقِهِمْ مِنْ ضِيقِ الأُزُرِ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ كَأَمْثَالِ الصِّبْيَانِ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ لاَ تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَرْفَعَ الرِّجَالُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە، کە وتویەتی: بینیم پیاوان (ئیزار)ەکانیان لەبەر تەسکی و نەبوونی جل و بەرگ وەك بەروانکەی منداڵ گریّ دەدا بە بەرۆکیانەوە، لەکاتی نوێژی جەماعەتدا، کە لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەیانکرد، پیاوێکیش بانگەوازی دەکرد: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ئێوە سەر بەرزمەکەنەوە هەتا پیاوەکان هەڵدەسنەوە، بۆ ئەوەی عەورەتیان نەبینن.

## باسی پیاو بە کراسێکەوە نوێژ بکات کە هەندێکی بە غەیری خۆیەوە بێت.

## ٨٠ - بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّى فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ بَعْضُهُ عَلَى غَيْرِهِ.

٦٣١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِى ثَوْبٍ وَاحِدٍ بَعْضُهُ عَلَيَّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە تەنها کراسێکەوە نوێژی دەکرد لەکاتێکدا کە هەندێکیشی بە منەوە بوو.

## باسی ئەگەر پیاوێك بە تەنها کراسێکەوە نوێژ بکات دروستە یان نا؟.

## ٨١ - بَابُ فِى الرَّجُلِ يُصَلِّى فِى قَمِيصٍ وَاحِدٍ.

٦٣٢ - عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّى رَجُلٌ أَصِيدُ، أَفَأُصَلِّى فِى الْقَمِيصِ الْوَاحِدِ ، قَالَ: « نَعَمْ، وَازْرُرْهُ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ ».

واتـە: لـە سـەلەمەی کـوڕی ئەکوەعـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم! مـن پیـاوێکی راوچـیم ئایـا لـەڕاو بـە کراسێکەوە نوێژ بکەم؟ - یان وتی: من پیاوێکم نەخۆشیە بە ملمەوە هەیـە.... فەرمووی: (بەڵێ، گرێی بدە ئەگەر بەدرکێکیش بێت).

٦٣٣ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْـنِ أَبِـى بَكْـرٍ، عَـنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَمَّنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فِى قَمِـيصٍ لَـيْسَ عَلَيْهِ رِدَاءٌ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنِّى رَأَيْـتُ رَسُـولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى فِى قَمِيصٍ.

واتـە: لـە موحەمـەدی کـوڕی (عَبْـدُ الـرَّحْمَن)ی کـوڕی ئـەبو بـەکرەوە، لـە باوکیـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: جـابری کـوڕی (عبداللـه) بـە کراسـێکەوە بەرنوێژی بـۆ دەکـردین ریـدائی نـەدابوو بەسـەردا، کـاتێ کـە لەنوێـژ بوویـەوە، وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە کراسێکەوە نوێژی دەکرد.

## باسی ئەگەر پۆشاك تەسك و كورت بوو
## ئەوا با نوێژ خوێن بیكات بە ئیزار.

## ٨٢ - بَابُ إِذَا كَانَ الثَّوْبُ ضَيِّقًا يَتَّزِرُ بِهِ.

٦٣٤ - (صحيح) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرًا - يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ اللَّهِ - قَالَ: سِرْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةٍ، فَقَامَ يُصَلِّي، وَكَانَتْ عَلَيَّ بُرْدَةٌ ذَهَبْتُ أُخَالِفُ بَيْنَ طَرَفَيْهَا، فَلَمْ تَبْلُغْ لِي، وَكَانَتْ لَهَا ذَبَاذِبُ فَنَكَسْتُهَا، ثُمَّ خَالَفْتُ بَيْنَ طَرَفَيْهَا، ثُمَّ تَوَاقَصْتُ عَلَيْهَا لاَ تَسْقُطُ، ثُمَّ جِئْتُ حَتَّى قُمْتُ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي حَتَّى أَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَجَاءَ ابْنُ صَخْرٍ حَتَّى قَامَ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَنَا بِيَدَيْهِ جَمِيعًا حَتَّى أَقَامَنَا خَلْفَهُ، قَالَ: وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمُقُنِي وَأَنَا لاَ أَشْعُرُ، ثُمَّ فَطِنْتُ بِهِ، فَأَشَارَ إِلَيَّ أَنْ أَتَّزِرَ بِهَا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:

« يَا جَابِرُ» قَالَ: قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: « إِذَا كَانَ وَاسِعًا فَخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ، وَإِذَا كَانَ ضَيِّقًا فَاشْدُدْهُ عَلَى حِقْوِكَ ».

واته: لە عوبادەی کوڕی (صَّامِت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: چوین بۆلای جابر - واتە کوڕی (عبدالله) — وتی: لە غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، هەستا بۆ نوێژکردن، منیش لەوکاتەدا بوردمیەکی شاڵی خەت خەتم لەبەردا بوو ویستم چمکی راستی بدەم بەسەر شانی چەپمداو چمکی چەپیشی بدەم بەسەر شانی راستمدا، بەڵام لەبەر کەمی بەشی نەدەکردم، ریشوی هەبوو هەردوو لاکەیم خستە سەریەك و پێکەوە گرێمدان بە ملم گرتم بۆ ئەوەی نەکەوێت، پاشان هاتم و لەلای چەپی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم وەستام، دەستی گرتم هێنامیە لای راستی خۆیەوە، ئینجا (ابْنُ صَخْر) هات و لەلای چەپی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم وەستا، جا دەستی هەردووکمانی گرت و بەرەو دواوە پاڵی پێوەناین، هەتا هەردووکمانی لە پشتی خۆیەوە دانا، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر سەیری دەکردم، بەڵام من ئاگام لێ نەبوو، پاشان کە تێگەیشتم، ئاماژەی بۆ کردم کە بیکەم بە ئیزار - واتە بیبەستم لە کەمەرم - ، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژ بوویەوە، فەرمووی: (ئەی جابر). جابر وتی: وتم: (لَبَّيْكَ) ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ! فەرمووی: (ئەگەر بوردەکە فراوان بوو هەردوو چمکەکەی بەسەر شانتا راست و چەپ بکە، ئەگەر تەسکیش بوو بیبەستە بە ملتەوە).

٦٣٥ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : - أَوْ قَالَ: قَالَ: عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - : إِذَا كَانَ لأَحَدِكُمْ ثَوْبَانِ فَلْيُصَلِّ فِيهِمَا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، فَلْيَتَّزِرْ بِهِ، وَلاَ يَشْتَمِلِ اشْتِمَالَ الْيَهُودِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی — یان وتی: عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی - : (ئەگەر یەکێ لەئێوە دوو پۆشاکی هەبوو ئەوە با نوێژیان پێوە بکات، بەڵام ئەگەر تەنها یەك پۆشاکی هەبوو ئەوا با بیبەستێ وەك ئیزار و کاتێ کە ویستی نوێژ بکات، وە با هیچ کەس لەئێوە لەکاتی نوێژکردندا خۆی بە پۆشاکەکەی نەپێچێتەوە وەك خۆپێچانەوەی جولەکەکان).

٦٣٦ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُصَلِّي فِي لِحَافٍ لاَ يَتَوَشَّحُ بِهِ، وَالآخَرُ أَنْ يُصَلِّي فِي سَرَاوِيلَ وَلَيْسَ عَلَيْكَ رِدَاءٌ.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە لەوەی کە پیاوێك بە تەنها پۆشاکێکەوە خۆی بپێچێتەوەو نوێژ بکات، وە لە کەسێکی تریش کە بە تەنها شەرواڵێکەوە نوێژ بکات و هیچی تری لەسەرەوە نەبێت.

## باسی نوێژکردن بە جلی شۆڕەوە.

## ٨٣ - بَابُ الإِسْبَالِ فِي الصَّلاَةِ.

٦٣٧ - (صحيح) عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « مَنْ أَسْبَلَ إِزَارَهُ فِي صَلاَتِهِ خُيَلاَءَ، فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي حِلٍّ وَلاَ حَرَامٍ ».

واتە: ئیبنو مەسعود دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علییە وسلم بیستووە دەیفەرموو: (هەرکەسێك بە جلی شۆڕەوە نوێژ بکات بۆ فیزو دەعیەو رۆح زلی، ئەوە باوەڕی بەحەڵاڵ و حەرامی خوا نیە).

٦٣٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يُصَلِّي مُسْبِلاً إِزَارَهُ إِذْ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اذْهَبْ فَتَوَضَّأْ ». فَذَهَبَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ جَاءَ، ثُمَّ قَالَ: « اذْهَبْ فَتَوَضَّأْ ». فَذَهَبَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا لَكَ أَمَرْتَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ؟! فَقَالَ: «إِنَّهُ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ مُسْبِلٌ إِزَارَهُ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لاَ يَقْبَلُ صَلاَةَ رَجُلٍ مُسْبِلٍ إِزَارَهُ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: جارێ پیاوێ بە جلی شۆڕەوە نوێژی دەكرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێی فەرموو: (برۆ دەستنوێژ بگرەوە). چوو دەستنوێژی گرت و هاتەوە، پاشان فەرمووی: (برۆ دەستنوێژ بگرەوە). چوو دەستنوێژی گرت پاشان هاتەوە، پیاوێ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بۆچی فەرمانت پێ كرد كە دەستنوێژ بگرێتەوە؟ فەرمووی: (چونكە بە جلی شۆڕەوە نوێژی دەكرد، خوای گەورەش نوێژی پیاوێ وەرناگرێت بە جلی شۆڕەوە بیكات).

## باسی ئافرەت بە چەند پۆشاكەوە نوێژ بكات.

## ٨٤ - بَابُ فِي كَمْ تُصَلِّي الْمَرْأَةُ.

٦٣٩ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ قُنْفُذٍ، عَنْ أُمِّهِ، أَنَّهَا سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ: مَاذَا تُصَلِّي فِيهِ الْمَرْأَةُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَتْ: تُصَلِّي فِي الْخِمَارِ وَالدِّرْعِ السَّابِغِ الَّذِي يُغَيِّبُ ظُهُورَ قَدَمَيْهَا.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی زەیدی كوڕی (قُنْفُذ)ەوە، لە دایكیەوە هاتووە، كە سەبارەت بە ئافرەت بە چەند پۆشاكەوە نوێژ بكات پرسیاری لە ئوم سەلەمە كردووە؟ ئەویش وتویەتی: بە سەرپۆشێك و كراسێكەوە نوێژ بكات كە فراوان بێت و سەرتاپای هەتا پشتی پێكانی داپۆشێت.

٦٤٠ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهَا سَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتُصَلِّى الْمَرْأَةُ فِى دِرْعٍ وَخِمَارٍ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ؟ قَالَ: « إِذَا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّى ظُهُورَ قَدَمَيْهَا »[1].

[المشكاة: ٧٦٣].

واته: موحەممەدی کوڕی زەید ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: لە ئوم سەلەمەوە هاتووە، کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم ئایا دروستە ئافرەت بە کراسێکەوە نوێژ بکات، ئیزاری لەسەرەوە نەبێت؟ ئەویش فەرموویەتی: (بەڵێ، ئەگەر کراسەکە ئەوەندە تەواو و فراوان بێت کە سەرتاپای هەتا پشتی پێکانی داپۆشێت).

[1] - قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ وَبَكْرُ بْنُ مُضَرَ وَحَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ وَابْنُ أَبِى ذِئْبٍ وَابْنُ إِسْحَاقَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ عَنْ أُمِّهِ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ لَمْ يَذْكُرْ أَحَدٌ مِنْهُمُ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَصَرُوا بِهِ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ رضى الله عنها.

## باسی ئافرەتیٚ بەبیٚ سەرپۆش نویٚژبکات.

## ٨٥ - بَابُ الْمَرْأَةِ تُصَلِّى بِغَيْرِ خِمَارٍ.

٦٤١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَـلاَةَ حَـائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ»[1].

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە، کە پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوا نویٚژی ئافرەتی بالغ وەرناگریٚت ئیللا بە سەرپۆشەوە نەبیٚت).

٦٤٢ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدٍ، أَنَّ عَائِشَةَ نَزَلَتْ عَلَى صَفِيَّةَ أُمِّ طَلْحَةَ الطَّلَحَاتِ، فَرَأَتْ بَنَاتٍ لَهَا، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ وَفِي حُجْرَتِي جَارِيَةٌ، فَأَلْقَى لِي حِقْوَهُ وَقَالَ: « شُقِّيهِ بِشَقَّتَيْنِ فَأَعْطِي هَذِهِ

---

[1] - (مرسل قوي) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ سَعِيدٌ - يَعْنِي ابْنَ أَبِي عَرُوبَةَ - ، عَنْ قَتَادَةَ عَنِ الْحَسَنِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

نِصْفًا، وَالْفَتَاةَ الَّتِي عِنْدَ أُمِّ سَلَمَةَ نِصْفًا، فَإِنِّي لاَ أُرَاهَا إلاَّ قَدْ حَاضَتْ » أَوْ « لاَ أُرَاهُمَا إلاَّ قَدْ حَاضَتَا»[١].

واتە: لە موحەممەدەوە – واتە لە (ابْنِ سِيرِين)ەوە - هاتووە، کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ لەماڵی (صَفِيَّة)ی دایکی (طَلْحَةَ الطَّلَحَات) دابەزی - واتە (طَلْحَة)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه الخِزاعي) کە ناسراو بووە بە (طَلْحَةَ الطَّلَحَات) چونکە لەناو باپیرانیدا چەند (طَلْحَة) ناوێك هەبووە- کچەکانی بینی، عائیشە وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاتەژوورەوە بۆلام لەوکاتەدا کەنیزەکێ لە ژوورەکەمدا بوو، ئیزارێکی بۆ فڕێدام فەرمووی: (بیکە بەدوو بەشەوە نیوەی بدە بەومیان کە لەلای خۆتە، نیوەکەی تریشی بدە بەو کچەی کە لەلای ئوم سەلەمەیە با لەکاتی نوێژ کردندا بەکاری بهێنن، چونکە من وای دەبینم گەیشتۆتە تەمەنی باڵغی و کەوتۆتە حەیزەوە) یان (من وایان دەبینم کە گەیشتونەتە تەمەنی باڵغی و کەوتونەتە حەیزەوە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ هِشَامٌ عَنْ ابْنِ سِيرِينَ.

ئەبو داود دەڵێت: هیشام بە هەمان شێوە لە (ابْنِ سِيرِين)ەوە گێڕاویەتیەوە.

---

[١]– قَالَ: أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ هِشَامٌ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ.

# باسی ئەوەی دەربارەی (سدل)[1] هاتووە لە نوێژدا.

## ٨٦ - بَابُ ﴿مَا جَاءَ فِي﴾ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ.

٦٤٣ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (سدل)ی قەدەغەكردووە لە نوێژدا جل و بەرگ بەسەر زەویدا شۆڕبكرێتەوەو بخشێندرێ، هەروەها یەكێك كە دەمی خۆی هەڵبەستێت.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُد: رَوَاهُ عِسْلٌ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: عیسل لە (عَطَاء)ەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتیەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (سدل)ی قەدەغەكردووە لە نوێژدا.

---

[1] - (سدل) واتە: شۆڕكردنەوەو خشاندنی جل و بەرگ بەسەر زەویدا، یان ئەومیە چاكەت یان پاڵتۆ بكرێتە سەرشان، بێ ئەوەی دەست لە قۆڵەكانیەوە دەربكرێت.

٦٤٤ - (صحيح مقطوع) عَنْ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَكْثَرُ مَا رَأَيْتُ عَطَاءً يُصَلِّي سَادِلاً. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا يُضَعِّفُ ذَلِكَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە (ابْنِ جُرَيْج)ەوە هاتووە، كە وتويەتى: زۆرجار (عَطَاء)م ديوە لە نوێژدا (سدل)ى كردووە. ئەبو داود دەڵێت: ئەو كردەوەيەى كە لە (عَطَاء)ەوە دەيگێڕنەوە فەرموودەى پێشوو لاواز دەكات كە لە ئەبو هورەيرەوە هاتووە.

## باسى نوێژكردن لە پۆشاكى ئافرەتاندا.

## ٨٧ - بَابُ الصَّلاَةِ فِي شُعُرِ النِّسَاءِ.

٦٤٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُصَلِّي فِي شُعُرِنَا، أَوْ لُحُفِنَا، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: شَكَّ أَبِي.

واتە: لە عائيشەوە ڕەزاى خواى لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لە پۆشاك و پێخەفى ئێمەدا نوێژى نەدەكرد. (عُبَيْدُ اللَّه)ى كوڕى (مُعَاذ) وتى: باوكم شكى هەيە لە (شُعُرِنَا، أَوْ لُحُفِنَا). ئەم فەرموودە پێشتر بە ژمارە: (٣٦٧) هاتووە.

## باسی پیاوێ کاتێ کە نوێژبکات قژی کۆکردبێتەوە لە ناوەڕاستی سەریدا.

## ٨٨ - بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّي عَاقِصًا شَعْرَهُ.

٦٤٦ - (حسن) عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ رَأَى أَبَا رَافِعٍ مَوْلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ وَهُوَ يُصَلِّي قَائِمًا، وَقَدْ غَرَزَ ضُفُرَهُ فِي قَفَاهُ، فَحَلَّهَا أَبُو رَافِعٍ، فَالْتَفَتَ حَسَنٌ إِلَيْهِ مُغْضَبًا، فَقَالَ: أَبُو رَافِعٍ: أَقْبِلْ عَلَى صَلاَتِكَ وَلاَ تَغْضَبْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « ذَلِكَ كِفْلُ الشَّيْطَانِ ». يَعْنِي مَقْعَدَ الشَّيْطَانِ: يَعْنِي: مَغْرِزَ ضُفُرِهِ.

واتە: سەعیدی کوڕی سەعیدی مەقبوریی، لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، کە ئەبو رافع ی دیوە کاتی خۆی کە نۆکەری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو، دیویەتی داویەتی بەلای حەسەنی کوڕی عەلیدا رمزای خوایان لێ بێ راوەستابوو نوێژی دەکرد، پەلکەکانی کۆکردبووەوەو گرێیدابوون بە پشت سەریەوە، ئەبو رافع پەلکەکانی کردەوە، حەسەن بەتوڕەییەوە ئاوڕی لێ

دايەوە، ئـەبو رافع وتـى: خـەريكى نوێـژى خۆتبـەو تورەمەبـە، چونكە مـن لـ پێغەمبـەرى خـوام صـلى الله عليـە وسـلم بيسـتووە دەيفـەرموو: (ئـەوە بەشـ شەيتانە). واتە: ئەوە شوێنى دانيشتنى شەيتانە.

٦٤٧ - (صحيح) عن كُرَيْبٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ يُصَلِّي وَرَأْسُهُ مَعْقُوصٌ مِنْ وَرَائِهِ، فَقَامَ وَرَاءَهُ فَجَعَلَ يَحُلُّهُ، وَأَقَرَّ لَهُ الآخَرُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: مَا لَكَ وَرَأْسِي؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا: مَثَلُ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ ».

واتە: لە كورەيبەوە هاتووە كە (عبداللە)ى كورى عەباس رەزاى خوايان لـ بێ، (عبداللە)ى كورى (حَارِث)ى بينـى پەلكەكانى كۆكردبـووەوەو گرێـدابوو بـە پشـت سـەريەوەو نوێـژى دەكـرد، هەسـتا لەدوايـەوە بلاويكردنـەوە، يـەكێ دەستخۆشى لێ كرد، كاتێ كە لەنوێژ بوويەوە رووى كـردە ئيبنـو عـەباس وتـ تۆ چيت داوە لە سەرى من؟ وتى: من لە پێغەمبەرى خوام صلى الله عليە وسـ بيستووە دەيفەرموو: (بەڕاستى وێنەى ئەم پياوە: وەك كەسێكە بە بەستراوەيى نوێژ بكات).

## نوێژکردن بە نەعلەوە.

## ٨٩ – بَابُ الصَّلاَةِ فِي النَّعْلِ.

٦٤٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي يَوْمَ الْفَتْحِ، وَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی رزگارکردنی مەکەدا پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی نوێژی دەکرد نەعلەکانی لەپێ داکەندبوو لەلای چەپیەوە دایناببوون.

٦٤٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ بِمَكَّةَ، فَاسْتَفْتَحَ سُورَةَ الْمُؤْمِنِينَ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى وَهَارُونَ. أَوْ: ذِكْرُ مُوسَى وَعِيسَى- ابْنُ عَبَّادٍ يَشُكُّ، أَوِ اخْتَلَفُوا - أَخَذَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُعْلَةٌ، فَحَذَفَ فَرَكَعَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ السَّائِبِ حَاضِرٌ لِذَلِكَ.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی سائبەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەکە بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ دەکردین،

سورەتی (مُؤْمِنِينَ)ی خوێند هەتا گەیشتە باسی موساو هارون. یان: باسی موساو عیسا - (ابْنُ عَبَّاد) گومانی هەیە، یان راویەكان رایان جیاوازە — پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوكە كۆكەیەكی كرد، قورئان خوێندنەكەی بڕی و چووە ركوعەوە، لەوكاتەدا (عبداللە)ی كوڕی سائب ئامادەبوو حاڵەتەكەی بینی.

٦٥٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ الْقَوْمُ أَلْقَوْا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاتَهُ قَالَ: « مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إِلْقَائِكُمْ نِعَالَكُمْ ». قَالُوا: رَأَيْنَاكَ أَلْقَيْتَ نَعْلَيْكَ فَأَلْقَيْنَا نِعَالَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنَّ جِبْرِيلَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَرًا ».أو قَالَ: (أَذًى) وَقَالَ: « إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ، فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا أَوْ أَذًى، فَلْيَمْسَحْهُ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بە هاوەڵانی دەكرد، نەعلەكانی لەپێ داكەندو لەلای چەپیەوە داینان، كاتێ كە هاوەڵانی بینیان هەر هەموویان

نەعلەکانیان لەپێ داکەند، جا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەوە چی وای لێ کردن نەعلەکانتان لەپێ داکەنن؟ ئەوانیش وتیان: بینیمان تۆ لە پێت داکەند بۆیە ئێمەش دامانکەندن، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: جبریل سەلامی خوای لێ بێ هات و ئاگاداری کردمەوە کە نەعلەکانم پیسییان پێوەیە، هەروەها فەرمووی: (هەرکام لە ئێوە کاتێ هات بۆ مزگەوت، با تەماشای ژێری پێڵاوەکانی بکات، ئەگەر پیسیەکی پێوە دی، با بیسڕێت لە پاشدا نوێژیان پێوە بکات).

**٦٥١ - (صحيح) عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا، قَالَ: «فِيهِمَا خَبَثٌ» قَالَ فِي الْمَوْضِعَيْنِ: « خَبَثٌ ».**

واتە: بەکری کوڕی (عبداللە)، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بەهەمان سەنەد ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: (فِيهِمَا خَبَثٌ). واتە: ئەگەر پیسییان پێوە بوو. لە دوو شوێنی تریشدا فەرموویەتی: (خَبَثٌ).

**٦٥٢ - (صحيح) عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «خَالِفُوا الْيَهُودَ، فَإِنَّهُمْ لاَ يُصَلُّونَ فِي نِعَالِهِمْ وَلاَ خِفَافِهِمْ ».**

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بە پێچەوانەی جولەکەوە بجولێنەوە،

چونکە ئەوان بە نەعل و خوفەکانیانەوە نوێژ ناکەن. واتە ئێوە بە نەعل و خوفەوەکانتانەوە نوێژ بکەن.

٦٥٣ - (حسن صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي حَافِيًا وَمُنْتَعِلاً.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم دیوە بە پێی پەتی و بەنەعلەوە نوێژی کردووە.

## باسی ئەگەر نوێژخوێن نەعلەکانی لەپیٚ داکەند، لە کوێدا دایانبنیٚ؟

## ٩٠ - بَابُ الْمُصَلِّي إِذَا خَلَعَ نَعْلَيْهِ، أَيْنَ يَضَعُهُمَا؟

٦٥٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلاَ يَضَعْ نَعْلَيْهِ عَنْ يَمِينِهِ، وَلاَ عَنْ يَسَارِهِ فَتَكُونَ عَنْ يَمِينِ غَيْرِهِ، إِلاَّ أَنْ لاَ يَكُونَ عَنْ يَسَارِهِ أَحَدٌ، وَلْيَضَعْهُمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لە ئێوە ویستی نوێژ بکات، با نەعلەکانی لەلای

راستیەوە دانەنێ، هەروەها لەلای چەپیشیەوە دایاننەنێ چونكە دەكەونە لای راستی ئەوكەسەوە كە لە تەنیشتیەوە نوێژ دەكات، ئیللا مەگەر لەلای چەپیەوە كەس نەبێت، بەڵكو با لە نێوان پێكانیدا دایانبنێ.

٦٥٥ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَلاَ يُؤْذِ بِهِمَا أَحَدًا، لِيَجْعَلْهُمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أَوْ لِيُصَلِّ فِيهِمَا ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێ لە ئێوە ویستی نوێژ بكات، با نەعلەكانی لەپێ دابكەنێت و ئازاری كەسیان پێ نەدات، یا لە نێوان پێكانیدا دایانبنێ، یان نوێژیان پێوە بكات).

## باسی نوێژكردن لەسەر (خُمْرَة)

## ٩١ - بَابُ الصَّلاَةِ عَلَى الْخُمْرَةِ.

٦٥٦ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى وَأَنَا حِذَاءَهُ وَأَنَا حَائِضٌ، وَرُبَّمَا أَصَابَنِى ثَوْبُهُ إِذَا سَجَدَ، وَكَانَ يُصَلِّى عَلَى الْخُمْرَةِ.

واتە: لە (مَيْمُونَة)ی کچی (حَارِث)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکرد منیش لە تەنیشتیەوە بووم و بێ نوێژیش بووم، هەندێ جار کە سەجدەی دەبرد کراسەکەی بەر من دەکەوت، وە لەسەر (خُمْـرَة) نوێژی دەکرد کە بەرماڵێکی بچوکە لە پەلکە خورما دروستدەکرێت.

## باسی نوێژکردن لەسەر حەسیر.

## ٩٢ - بَابُ الصَّلاَةِ عَلَى الْحَصِيرِ.

٦٥٧ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي رَجُلٌ ضَخْمٌ - وَكَانَ ضَخْمًا - لاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ أُصَلِّيَ مَعَكَ - وَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا وَدَعَاهُ إِلَى بَيْتِهِ - فَصَلِّ حَتَّى أَرَاكَ كَيْفَ تُصَلِّي فَأَقْتَدِيَ بِكَ. فَنَضَحُوا لَهُ طَرَفَ حَصِيرٍ ﴿كَانَ﴾ لَهُمْ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، قَالَ فُلاَنُ بْنُ الْجَارُودِ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَكَانَ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَ: لَمْ أَرَهُ صَلَّى إِلاَّ يَوْمَئِذٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پیاوێك لە یاریدەدەران وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من پیاوێکی قەڵەوم – بێگومان زەبەلاح و قەڵەو بوو - ناتوانم لەگەڵت نوێژی جەماعەت بکەم لە مزگەوتدا – ئەنەس وتی: پیاوەکە خواردنێکی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سازکردو بانگێشتی کرد بۆ ماڵەویان – نوێژ بکە تاکو بتبینم کە

چۆن نوێژ دەکەیت هەتا بتکەمە پێشەنگ و قودوەی خۆم. حەسیرێکیان هەبوو هەندێ ئاویان پژان لە بەشێکی بۆ ئەوەی نەرم بێت و پاك بێتەوە، جا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەستا دوو رکات نوێژی لەسەر کرد. فولانی کوڕی جارود بە ئەنەسی کوڕی مالیکی وت: ئایا ئەو نوێژە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کردی نوێژی چێشتەنگاو بوو؟ وتی: هەتا ئەوکاتە نەبێت نەمدیوە نوێژی چێشتەنگاوی کردبێت ئیللا ئەوکاتە نەبێت.

٦٥٨ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَزُورُ أُمَّ سُلَيْمٍ فَتُدْرِكُهُ الصَّلَاةُ أَحْيَانًا، فَيُصَلِّي عَلَى بِسَاطٍ لَنَا، وَهُوَ حَصِيرٌ نَنْضَحُهُ بِالْمَاءِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەندێ جار سەردانی ماڵی ئوم سولەیمی دەکرد – دایکی ئەنەس - جاروبار کاتی نوێژی سوننەت دەهاتە پێشەوە، ژێرڕاخەرێکمان هەبوو حەسیر بوو، کەمێك ئاومان لێ دەپڕان بۆ ئەوەی نەرم بێت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی لەسەر دەکرد.

٦٥٩ - (ضعيف) وأما (الصَّلاةِ عَلَى الْحَصِيرِ) (فصحيح) عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي عَلَى الْحَصِيرِ، وَالْفَرْوَةِ الْمَدْبُوغَةِ.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر حەسیر و فەروەی خۆشەکراو نوێژی دەکرد.

# باسی کەسیٚ لەسەر پۆشاکەکەی سەجدە ببات.

# ٩٣ - بَابُ الرَّجُلِ يَسْجُدُ عَلَى ثَوْبِهِ.

٦٦٠ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ وَجْهَهُ مِنَ الأَرْضِ، بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عَلَيْهِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەکاتی گەرمای زۆردا نوێژمان دەکرد، جا ئەگەر یەکیٚ لە ئێمە لەتاو گەرما نەیتوانیایە نێوچاوانی بە چاکی لەسەر زەوی دانێت، پۆشاکەکەی خۆی رادەخست و سەجدەی لەسەری دەبرد.

# باسی ریزەکانی نوێژ.

# تفريع أبواب الصفوف

## باسی رێکخستنی ریزەکان.

## ٩٤ – بَابُ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ.

٦٦١ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَلاَ تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَلَّ وَعَزَّ ». قُلْنَا: وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهِمْ ؟ قَالَ: « يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْمُقَدَّمَةَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوە بۆ ریز نابەستن، لەناو نوێژدا، وەك چۆن مەلائیکەکان ریز دەبەستن لەلای پەروەردگاریان بۆ خواپەرستی؟). وتمان: مەلائیکەکان لەلای پەروەردگاریان چۆن ریز دەبەستن؟ فەرمووی: (ریزی یەکەم تەواو دەکەن و رێك رادەوەستن و بۆشاییەکان پڕدەکەنەوەو نایەڵن ریزەکان لارو وێر بن، وە ناچنە ریزی دووهەم هەتا ریزی یەکەم تەواو دەکەن، پاشان ریزی دووهەم، پاشان ریزی سێهەم، بەهەمان شێوە ریز لەدوای ریز).

٦٦٢ - (صحيح) عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: « أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ - ثَلاَثًا - وَاللَّهِ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ » قَالَ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ، وَرُكْبَتَهُ بِرُكْبَةِ صَاحِبِهِ، وَكَعْبَهُ بِكَعْبِهِ.

واته: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەیرێکی خەڵکەکەی کردوو فەرمووی: (ریزەکانتان رێك راگرن و پاڵ بدەن بەیەکەوە - سێ جار - سوێند بە خوا یا ئەوەتا پاڵ دەدەن بەیەکەوە و رێك دەوەستن یان خوا دووبەرەکی و ناکۆکی دەخاتە نێو دڵەکانتانەوە). نوعمان وتی: ئیتر دەمبینی پیاو شانی دەلکاند بەشانی هاورێکەیەوە، وە ئەژنۆی دەنا بە ئەژنۆی هاورێکەیەوەو، هەروەها پاژنە پێی بە پاژنە پێیەوە.

٦٦٣ - (صحيح) عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَوِّينَا فِي الصُّفُوفِ كَمَا يُقَوَّمُ الْقِدْحُ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنْ قَدْ أَخَذْنَا ذَلِكَ عَنْهُ وَفَقِهْنَا، أَقْبَلَ ذَاتَ يَوْمٍ بِوَجْهِهِ إِذَا رَجُلٌ مُنْتَبِذٌ بِصَدْرِهِ، فَقَالَ: « لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ ».

واتە: لە سەماكی كوڕی حەربەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە نوعمانی كوڕی بەشیرم بیستووە دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەكاتی نوێژدا ریزەكانی بۆ رێك دەكردین، وەك چۆن داری تیر ریز بكرێت پێش ئەوەی پەڕو نوكە تیژەكەی پێوە بكرێت، هەتا زانی، كە ئیتر ئێمە لەوەوە فێربووین و شارەزابووین ئیتر وازی لێهێناین و خۆمان ریز دەبوین، بەڵام رۆژێكیان لای كردەوە پیاوێكی دی سنگی خۆی زۆر دەرپەڕاندبوو لە ریزەكەی، فەرمووی: (یان ئەوەتا ریزەكانتان رێك دەخەن، یا خوا رووتان لەئاستی یەك وەردەگێڕێت).

| |
|---|
| ٦٦٤ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ، يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا وَيَقُولُ: « لاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ ». وَكَانَ يَقُولُ: « إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الأُوَلِ ». |

واتە: لە بەرائی كوڕی عازبەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەم پەڕی ریزەوە تا ئەوپەڕی ریز دەكەوتە ناو ریزەكەوەو دەستی دەهێنا بە سنگ و بە شانمانداو رێكی دەخستین و دەیفەرموو: (نارێك مەوەستن با دووبەرەكی و ناكۆكی نەكەوێتە نێو دڵەكانتانەوە). هەروەها دەیفەرموو: (خوای گەورەو مەلائیكەكانی سەڵاوات دەدەن لەسەر – خەڵكانی - ریزەكانی یەكەم).

٦٦٥ - (صحيح) عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَوِّي صُفُوفَنَا إِذَا قُمْنَا لِلصَّلَاةِ، فَإِذَا اسْتَوَيْنَا كَبَّرَ.

واتە: لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ریزەكانی ریك دەكردین كاتێ كە هەڵئەساین بۆ نوێژ، جا كە رێك ریزمان دەبەست (الله أكبر)ی دەكرد، واتە نوێژی دادەبەست.

٦٦٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي شَجَرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « أَقِيمُوا الصُّفُوفَ، وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ - لَمْ يَقُلْ عِيسَى «بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ » - وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ، وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ ».

واتە: لە (أَبِي شَجَرَة)وە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ریزەكانتان راست بكەنەوەو، شان لەئاستی شانی یەكتری بگرن، كەلەبەرو بۆشایی پڕبكەنەوەو مەهێڵن ریزەكان لارو وێر بن، بەنەرمی و بەهێواشی دەستی براكەتان راكێشن و پاڵی بدەن بەخۆتانەوە ئەگەر تەنیا بوو لە دواوە)- عیسا نەیوت: (دەستی براكەتان راكێشن و پاڵی بدەن بەخۆتانەوە) - وە هیچ بۆشاییەك مەهێڵنەوە بۆ شەیتان هاتوچۆی پێدا بكات، ئەو كەسەی

بۆشایی پڕ بکاتەوە، خودایش بە رەحمەتی خۆی ئەو بەسەر دەکاتەوە، ئەو کەسەی ریز بپچڕێنێ خودایش پەیوندی لەگەڵ ئەودا دەپچڕێنێ).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو شَجَرَةَ: كَثِيرُ بْنُ مُرَّةَ.

ئەبو داود دەڵێت: (أَبُو شَجَرَةَ)ە: (كَثِير)ی کوڕی موررەیە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَمَعْنَى « وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ ». إِذَا جَاءَ رَجُلٌ إِلَى الصَّفِّ فَذَهَبَ يَدْخُلُ فِيهِ، فَيَنْبَغِي أَنْ يُلَيِّنَ لَهُ كُلُّ رَجُلٍ مَنْكِبَيْهِ، حَتَّى يَدْخُلَ فِي الصَّفِّ.

ئەبو داود دەڵێت: « وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ ». مانای ئەوەیە ئەگەر کەسێ هات و ویستی بچێتەناو ریزی نوێژەوە هەرکەس لەئاستی خۆیەوە شانی شل بکات، بۆئەوەی بچێتە ناو ریزەکەوە.

٦٦٧ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « رُصُّوا صُفُوفَكُمْ، وَقَارِبُوا بَيْنَهَا، وَحَاذُوا بِالأَعْنَاقِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لأَرَى الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مِنْ خَلَلِ الصَّفِّ، كَأَنَّهَا الْحَذَفُ ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ریزەکانتان رێك بخەن و پاڵ بدەن بەیەکەوەو، نێوانی ریزەکان لەیەك نزیك بکەنەوەو، شان و ملتان لەئاستی یەك بگرن، بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، شەیتان دەبینم وەك بەرخۆلەی رەش خۆی دەکات بەناو بۆشایی ناو ریزەکانتاندا).

٦٦٨ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ ».

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ریزەكانتان رێك بخەن، چونكە رێكخستنی ریزەكان لەتەواوی و رێكوپێكی نوێژە).

٦٦٩ - (ضعيف ويصح منه الأمر بتسوية الصفوف) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمِ بْنِ السَّائِبِ صَاحِبِ الْمَقْصُورَةِ، قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ يَوْمًا فَقَالَ: هَلْ تَدْرِي لِمَ صُنِعَ هَذَا الْعُودُ؟ فَقُلْتُ: لاَ وَاللَّهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ يَدَهُ عَلَيْهِ فَيَقُولُ: «اسْتَوُوا وَعَدِّلُوا صُفُوفَكُمْ ».

واتە: لە موحەممەدی كوڕی موسلیمی كوڕی سائیبی (صَاحِبِ الْمَقْصُورَة)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: رۆژێ لە تەنیشت ئەنەسی كوڕی مالیكەوە نوێژم دەكرد وتی: ئایا دەزانی ئەو عودە بۆچی دروستكراوە؟ وتم نەخێر سوێند بە خوا نازانم، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیگرت بەدەستیەوەو دەیفەرموو: (رێك راوەستن و خۆتان رێك بكەن و ریزەكانتان رێك بكەن).

٦٧٠ - (ضعيف ويصح منه الأمر بتسوية الصفوف) عَنْ أَنَسٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ أَخَذَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ الْتَفَتَ فَقَالَ: «اعْتَدِلُوا، سَوُّوا صُفُوفَكُمْ». ثُمَّ أَخَذَهُ بِيَسَارِهِ فَقَالَ: «اعْتَدِلُوا، سَوُّوا صُفُوفَكُمْ».

[المشكاة: ١٠٩٨].

واتە: ئەنەس بە هەمان شێوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە هەڵئەسا بۆ نوێژ ئەم عودەی دەگرت بەدەستی راستیەوەو بەلای راستا تا ئەوسەر ریزەکە دەڕۆیشت و ریزەکەی راست دەکردەوەو دەیفەرموو: (رێك راوەستن و ریزەکانتان رێکخەن). پاشان عودەکەی دەگرت بەدەستی چەپیەوەو بەلای چەپا تا ئەوسەر ریزەکە دەڕۆیشت و ریزەکەی راست دەکردەوەو دەیفەرموو: (رێك راوەستن و ریزەکانتان رێکخەن).

٦٧١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ، فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ریزەکان یەك لەدوای یەك تەواو بکەن، بەو شێوەیە ریزی پێشەوە تەواو بکەن، پاشان بەهەمان شێوە ریزەکانی دواوە، جا ئەگەر ناتەویەك هەبوو، ئەوا با بکەوێتە ریزی هەرە دواوە).

٦٧٢ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « خِيَارُكُمْ أَلْيَنُكُمْ مَنَاكِبَ فِي الصَّلاَةِ ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چاکترینتان ئەوەیە کە شانی شل دەکات لەنوێژدا بۆئەوەی کەسێ بێتە ڕیزەکەوە).

## باسی ڕیزەکانی نێوان کۆڵەکەو پایەکان.

## ٩٥ - بَابُ الصُّفُوفِ بَيْنَ السَّوَارِي.

٦٧٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ مَحْمُودٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَدُفِعْنَا إِلَى السَّوَارِي فَتَقَدَّمْنَا وَتَأَخَّرْنَا، فَقَالَ أَنَسٌ: كُنَّا نَتَّقِي هَذَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدِ الْحَمِيدِ)ی کوڕی مەحمودەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیکدا نوێژی هەینیمان دەکرد، لەبەر قەرەباڵغی پاڵیان پێوەناین بۆلای کۆڵەکەو پایەکان جا هەندێکمان لە پێشەوەی کۆڵەکەو پایەکان نوێژمان کرد، هەندێکی ترمان لە دواوەی کۆڵەکەو پایەکان نوێژمان کرد - بۆ ئەوەی لە نێوان کۆڵەکەو پایەکان نوێژ نەکەن چونکە کەراهەتی هەیە - ئەنەس وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم خۆمان لەم جۆرە نوێژە دەپاراست - واتە نوێژکردن لە نێوان کۆڵەکەو پایەکان چونکە دەبنە هۆی بڕینی ڕیزەکان -.

## باسی كێ شایەنترە لەنزیك پێشنوێژەوە بێت لەریزدا، وە خراپی دواكەوتن.

## ٩٦ - بَابُ مَنْ يُسْتَحَبُّ أَنْ يَلِيَ الإِمَامَ فِي الصَّفِّ، وَكَرَاهِيَةِ التَّأَخُّرِ.

٦٧٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ».

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (با خاوەن ئاوەزەكان و ئەوانەی كە لە دین تێگەیشتوون لێم نزیك بن، پاشان ئەوانی دواتر لەوان، پاشان ئەوانی دواتر لەوان).

٦٧٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ وَزَادَ: « وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَهَيْشَاتِ الأَسْوَاقِ ».

واتە: (عبداللە) بە هەمان شێوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێڕاویەتیەوە، بەلأم ئەمەی بۆ زیاد كرد: (نارێك مەوەستن با دووبەرەكی و ناكۆكی نەكەوێتە نێو دڵەكانتانەوە، هۆشیاربن و خۆتان بپارێزن لە ناكۆكی و

دووبەرەکی و قسەی پڕوپوچ و دەنگ بەرزکردنەوەی ناو بازاڕ).

٦٧٦ - (حسن بلفظ: على الذين يصلون الصفوف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى مَيَامِنِ الصُّفُوفِ ».

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورەو مەلائیکەکانی سەلاوات دەدەن لەسەر لای راستی رەیزەکانی نوێژ).

## باسی شوێنی راوەستانی مندالان لەڕیزدا.

## ٩٧ - بَابُ مُقَامِ الصِّبْيَانِ مِنَ الصَّفِّ.

٦٧٧ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو مَالِكٍ الأَشْعَرِيُّ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ بِصَلاَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، وَصَفَّ الرِّجَالَ، وَصَفَّ خَلْفَهُمُ الْغِلْمَانَ، ثُمَّ صَلَّى بِهِمْ - فَذَكَرَ صَلاَتَهُ - ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا صَلاَةُ. - قَالَ عَبْدُ الأَعْلَى: لاَ أَحْسَبُهُ إِلاَّ قَالَ: - «صَلاَةُ أُمَّتِي».

[المشكاة: ١١١٥].

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی غەنمەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئـەبو مـالیکی ئەشعەری وتی: ئایا چۆنیەتی نوێـژکردنی پێغەمبـەری خواتـان صلی الله علیـە وسـلم بـۆ بـاس نەکـەم، وتـی: قامـەت دەکـرا بـۆ نوێـژ، پیـاوان لەپێشـەوە ریـز دەبوون، لەدوای ئەوانەوە منداڵان، پاشان بەرنوێژی بۆ دەکرن - جا ئەبو مالیك وەسـفی نوێـژکردنی پێغەمبـەر صلی الله علیـە وسـلم بـۆ کـردن - پاشـان وتـی: نوێژکردنی بەو شێوەیە بـوو. (عَبْـدُ الأَعْلَـی) وتـی: وادەزانم ئـەبو مالیـك وتـی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (نوێژی ئوممەتەکەم).

## باسی ریزی ئافرەتان و، خراپی دواکەوتن لەڕیزی یەکەم.

## ٩٨ – بَابُ صَفِّ النِّسَاءِ، وَكَرَاهِيَةِ التَّأَخُّرِ عَنْ الصَّفِّ الأَوَّلِ.

٦٧٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « خَيْـرُ صُـفُوفِ الرِّجَـالِ أَوَّلُهَـا وَشَـرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا ».

واتـە: (باشـترین ریـز لـە ریزەکـانی پیـاوان ریـزی یەکەمیانـە، وە خراپترینیشـیان دوا ریزیانـە، وە باشـترین ریـز لـە ریزەکـانی ئافرەتـان دوا ریزیانە، وە خراپترین ریزیشیان یەکەم ریزیانە.

٦٧٩ - (صحيح)[1] عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ عَنْ الصَّفِّ الأَوَّلِ، حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ ».

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کۆمەڵێك بەردەوام لەڕیزی یەکەم دوادەکەون، هەتا خوای گەورەش لەئاگردا دوایان دەخات - واتە درەنگ تر لەئاگردا دەیانهێنێتە دەرەوە-)[2].

٦٨٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا، فَقَالَ لَهُمْ: « تَقَدَّمُوا فَائْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ، مَنْ بَعْدَكُمْ وَلاَ يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ، حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەماشای کرد هەندێ لە هاوەڵانی کە خاوەن پلەوپایە بوون لەریزدا چوونەتەدواوە، فەرمووی: (وەرنە پێشەوە ئێوە پەیڕەوی من بکەن، وە با ئەوانەش کە لەدوای ئێوەوەن پەیڕەوی ئێوە بکەن، کۆمەڵێك بەردەوام هەر دوادەکەون، هەتا خوای گەورەش لەپاداشتدا دەیانخاتە دواوە).

---

[1] - دون قوله (في النار) انظر: (الضعيفة: ٦٤٤٢) التخريج المطول (سنن أبي داود: (٣/ ٢٥٨).

[2] - ئەو کەسانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەداوە بەڵام تاوانبارن بە پێی تاوانەکەیان لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، بەڵام دواتر دهێنرێنەدەرەوە. وەرگێڕ.

## باسی شوێنی راوەستانی پێشنوێژ لەڕیزەکانی نوێژدا.

## ٩٩ – بَابُ مُقَامِ الإِمَامِ مِنَ الصَّفِّ.

٦٨١ - (ضعيف لكن الشطر الثاني منه صحيح) عَنْ أَبُـو هُرَيْـرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « وَسِّـطُوا الإِمَامَ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علی وسلم فەرموویەتی: (پێشنوێژ بخەنە ناوەڕاستانەوەو، بۆشایی ڕیزەکان پڕبکەنەوە). (سەیری فەرموودەی ژمارە: ٦٦٦ بکە).

## باسی پیاوێ لەدوای ریزەکانەوە بە تەنیا نوێژ دەکات.

## ١٠٠ – بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّي وَحْدَهُ خَلْفَ الصَّفِّ.

٦٨٢ - (صحيح) عَنْ وَابِصَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ - قَالَ: سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ - الصَّلاَةَ.

واتـە: لـە (وَابِصَــة)ەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم پیاوێکی بینی بە تەنیا لەدوای ریزەکانەوە نوێژی دەکرد، فەرمانی پێ کرد کە بیگێڕێتەوە – سولەیمانی کوڕی حەرب وتی – نوێژەکەی بگێڕێتەوە.

## باسی کەسێ کە لەدەرەوەی ریزەوە رکوع بەرێت.

## ١٠١ – بَابُ الرَّجُلِ يَرْكَعُ دُونَ الصَّفِّ.

٦٨٣ - (صحيح) عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ أَبَا بَكْرَةَ حَدَّثَ أَنَّهُ دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَنَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَاكِعٌ، قَالَ: فَرَكَعْتُ دُونَ الصَّفِّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا، وَلاَ تَعُدْ ».

واتە: حەسەنی - (بصري) - وتی: ئەبا بەکرە گێڕایەوە، کە جارێ چووەتە مزگەوتەوە لەوکاتـەدا پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسلم لـە رکوعـدا بـووە، ئـەبا بەکرە وتی: منیش پێش ئەوەی بگەمە ریزەکە رکوعم بـرد، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (خـوا سـوربوون و پەرۆشـیت زیـاد بکـات بـۆ دینەکەت، بەڵام دووبارەی نەکەیتەوە).

٦٨٤ - (صحيح) عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ أَبَا بَكْرَةَ جَاءَ وَرَسُولُ اللَّهِ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ دُونَ الصَّفِّ، ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّفِّ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَتَهُ، قَالَ: « أَيُّكُمُ الَّذِي رَكَعَ دُونَ الصَّفِّ، ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّفِّ ؟». فَقَالَ: أَبُو بَكْرَةَ أَنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا، وَلاَ تَعُدْ ».

واتە: لە حەسەنی (بصري)ەوە هاتووە، کە جارێ ئەبا بەکرە هات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، لەوکاتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە رکوعدا بوو، ئەویش پێش ئەوەی بچێتە ریزەوە رکوعی برد، پاشان بە رکوع بردنەوە چووە ناو ریزەکەوە، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: (ئەوە کێتان بوو پێش ئەوەی بچێتە ریزەوە رکوعی برد، پاشان بە رکوع بردنەوە چووە ناو ریزەکەوە؟). ئەبو بەکرە وتی: من بووم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوا سوربوون و پەرۆشیت زیاد بکات بۆ دینەکەت، بەڵام دووبارەی نەکەیتەوە).

# باسەكانی بەربەست لەنوێژدا.

# تفريع أبواب السترة

## باسی چۆنیەتی بەربەستی بەردەم نوێژخوێن.

## ١٠٢ - بَابُ مَا يَسْتُرُ الْمُصَلِّي.

٦٨٥ - (صحيح) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا جَعَلْتَ بَيْنَ يَدَيْكَ مِثْلَ مُؤَخَّرَةِ الرَّحْلِ، فَلاَ يَضُرُّكَ مَنْ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْكَ ».

واتە: لە (طَلْحَةَ)ی كوڕی (عُبَيْدِ اللّـه)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەكاتی نوێژكردندا لەبەردەم جێگە سەجدەكەتدا شتێكت دانا بە ئەندازەی قوتكەی دواوەی كۆپانە وشترێ بەرز بوو، ئیتر هەرچی بە بەردەم نوێژەكەتدا تێپەڕێ زیانی نیە).

٦٨٦ - (صحيح مقطوع) عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: آخِرَةُ الرَّحْلِ، ذِرَاعٌ فَمَا فَوْقَهُ.

واتە: لە (عَطَاء)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: مەبەست لەوە كە بەربەست بە ئەندازەی قوتكەی دواوەی كۆپانە وشترێ بەرزبێ، ئەوەیە كە بەقەد گەزێ یان

زیاتر بەرزبێ.

**٦٨٧ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا، وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ.**

واتە: ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەرۆژی جەژندا دەردەچوو بۆ جێگا نوێژەکەی فەرمانی دەدا حەربەیەکیان بۆ دەهێنا، لەبەردەمیا دایان دەچەقاند، ئینجا بەرەو ئەو حەربەیە نوێژی جەژنی دەکردو، خەڵکەکەش لەدوایەوە نوێژیان دەکرد، جا ئەمەی لەسەفەردا دەکرد، ئینجا فەرمانڕەواکانیش ئەو کارەیان دەکرد.

**٦٨٨ - (صحيح) عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ بِالْبَطْحَاءِ - وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ - الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، يَمُرُّ خَلْفَ الْعَنَزَةِ الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ.**

واتە: لە عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە (بَطْحَاء)[1] بەرنوێژی بۆ هاوەڵانی

---

[1] - شوێنێکە لەدەرەوەی مەکە.

دەكرد نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسری كورت كردەوە - نێزەیەك لەبەردەمیا بوو كردبووی بە بەربەست - لە پێشدا دوو ركات نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردن، دوا بەدوای ئەو دوو ركات نوێژی عەسری بۆ كردن، لەودیو نێزەكەوە ئافرەت و گوێدرێژ تێدەپەڕین.

## باسی هێڵ كێشان ئەگەر داردەست دەست نەكەوت.

## ١٠٣ - بَابُ الْخَطِّ إِذَا لَمْ يَجِدْ عَصًا.

٦٨٩ - (ضعيف) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ شَيْئًا، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَنْصِبْ عَصًا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ عَصًا، فَلْيَخْطُطْ خَطًّا، ثُمَّ لاَ يَضُرُّهُ مَا مَرَّ أَمَامَهُ ».

[المشكاة: ٧٨١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (كاتێ یەكێ لە ئێوە ویستی نوێژ بكات با شتێ لەبەر دەمیدا دابنێت، ئەگەر هیچی دەست نەكەوت با داردەستەكەی بچەقێنێت، ئەگەر داردەستی پێ نەبوو، با هێڵێ لەبەر دەمیدا بكێشێت، پاشان هەرچی بە بەردەم نوێژەكەیدا تێپەڕێ زیانی لێ نادات.

**٦٩٠ - (ضعيف) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنْ أَبِى الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ، فَذَكَرَ حَدِيثَ الْخَطِّ.**

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەبو قاسم صلی الله علیيه وسلم فەرموویەتی، جا راوی وەك فەرموودەی پێشوو فەرمودەی هێڵەکەی گێڕایەوە.

قَالَ سُفْيَانُ: لَمْ نَجِدْ شَيْئًا نَشُدُّ بِهِ هَذَا الْحَدِيثَ، وَلَمْ يَجِئْ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، قَالَ: قُلْتُ لِسُفْيَانَ إِنَّهُمْ يَخْتَلِفُونَ فِيهِ، فَتَفَكَّرَ سَاعَةً ثُمَّ، قَالَ: مَا أَحْفَظُ إِلاَّ أَبَا مُحَمَّدِ بْنَ عَمْرٍو،، قَالَ: سُفْيَانُ: قَدِمَ هَا هُنَا رَجُلٌ بَعْدَ مَا مَاتَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ أُمَيَّةَ، فَطَلَبَ هَذَا الشَّيْخَ أَبَا مُحَمَّدٍ حَتَّى وَجَدَهُ، فَسَأَلَهُ عَنْهُ فَخَلَطَ عَلَيْهِ.

سوفیان دەڵێت: هیچ ڕێگایە نیە ئەم فەرموودەی پێ بەهێز بێت، جگە لە ڕێگەی ناوبراو یان شاهیدی ناوبراو، لەهیچ ڕێگایەکەوە نەهاتووە ئیللا لەم ڕێگەیەوە نەبێت، واتە لە ڕێگەی موحەممەدی کوڕی عەمرەوە. راوی وتی: وتم بە سوفیان ئەوان لەسەر ناوی موحەممەدی کوڕی عەمر رایان جیاوازە، دوای سەعاتێ بیرکردنەوە پاشان وتی: ئیللا موحەممەدی کوڕی عەمرە، سوفیان وتی: لەدوای مردنی (إِسْمَاعِيل) ی کوڕی (أُمَيَّة)ەوە پیاوێکی بەتەمەن لێرەوە هات، بەدوای ئەبو موحەممەددا دەگەڕا هەتا دۆزیەوە، جا دەربارەی فەرموودەکە پرسیاری لێکرد ئەویش تێکەڵ و پێکەڵی کرد.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ سُئِلَ عَنْ وَصْفِ الْخَطِّ غَيْرَ مَرَّةٍ، فَقَالَ: هَكَذَا عَرْضًا مِثْلَ الْهِلاَلِ.

ئەبو داود دەڵێت: زیاتر لە جارێ لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم بیستووە سەبارەت بە چۆنیەتی هێڵەکە پرسیاری لێکراوە، ئەویش وتویەتی: بەم شێوەیە بە پانی وەك هیلال. وات: کەوانەیی.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ مُسَدَّدًا، قَالَ: قَالَ ابْنُ دَاوُدَ: الْخَطُّ بِالطُّولِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە موسەدەدم بیستووە دەیوت: (ابْنُ دَاوُد) وتویەتی: هێڵەکە بەدرێژی دەکێشرێت.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ وَصَفَ الْخَطَّ غَيْرَ مَرَّةٍ، فَقَالَ: هَكَذَا - يَعْنِي بِالْعَرْضِ - حَوْرًا دَوْرًا، مِثْلَ الْهِلاَلِ - يَعْنِي مُنْعَطِفًا - .

ئەبو داود دەڵێت: زیاتر لە جارێ چۆنیەتی هێڵەکەم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بیستووە، وتویەتی: بەم شێوەیە - واتە بە پانی - وەك هیلال — واتە — بە کەوانەیی.

٦٩١ - (صحيح مقطوع) عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ شَرِيكًا صَلَّى بِنَا فِي جَنَازَةِ الْعَصْرِ، فَوَضَعَ قَلَنْسُوَتَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ، يَعْنِي: فِي فَرِيضَةٍ حَضَرَتْ.

واتە: لە سوفیانی کوڕی عویەیینەوە هاتووە، کە وتویەتی: شەریکم بینی هات بۆ ئەوەی نوێژ لەسەر مردوو بکات کاتی نوێژی عەسر هاتە پێشەوە، نوێژی عەسری دەکرد قەلەنسوەکەی کردە بەربەست و لەبەردەمیدا داینا، واتە: بۆ نوێژە فەرزەکە[1].

## باسی نوێژکردن بەرەو وڵاغی سواری.

## ١٠٤ - بَابُ الصَّلاَةِ إِلَى الرَّاحِلَةِ.

٦٩٢- (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي إِلَى بَعِيرِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرەو وشترەکەی نوێژی کردووە. واتە وشترەکەی کردووە بە بەربەست.

---

[1]- وەك كڵاو لەسەر دەكرێت.

## باسی ئەگەر کەسێ نوێژی کرد بەرەو پایەو کۆڵەکە یان هەر شتێکی تری لەو شێوە، لە کوێیدا بێت؟

## ١٠٥ - بَابُ إِذَا صَلَّى إِلَى سَارِيَةٍ أَوْ نَحْوِهَا، أَيْنَ يَجْعَلُهَا مِنْهُ؟

٦٩٣ - (ضعيف) عَنْ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهَا، قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي إِلَى عُودٍ وَلاَ عَمُودٍ وَلاَ شَجَرَةٍ إِلاَّ جَعَلَهُ عَلَى حَاجِبِهِ الأَيْمَنِ أَوِ الأَيْسَرِ، وَلاَ يَصْمُدُ لَهُ صَمْدًا.

[المشكاة: ٧٨٣].

واتە: لە میقدادی کوڕی ئەسوەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: نەمدیوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژ بکات بەرەو دارێ یان کۆڵەکەیە یان درەختێ ئیللا خستونیەتە ئاستی بڕۆی راستیەوە یان ئاستی بڕۆی چەپیەوە، هەرگیز رێك و راست رووبەروویان نوێژی نەکردووە.

## باسی نوێژکردن بەرەو قسەکەران و کەسی خەوتو.

## ١٠٦ - بَابُ الصَّلاَةِ إِلَى الْمُتَحَدِّثِينَ وَالنِّيَام.

٦٩٤ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاس، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « لاَ تُصَلُّوا خَلْفَ النَّائِمِ، وَلاَ الْمُتَحَدِّثِ ».

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نوێژمەکەن بەرەو کەسی خەوتو، هەروەها کەسێکیش کە قسە بکات).

## باسی نزیکبونەوە لە بەربەست.

## ١٠٧ - بَابُ الدُّنُوِّ مِنَ السُّتْرَةِ.

٦٩٥ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ، فَلْيَدْنُ مِنْهَا، لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ».

واتە: سەهلی کوڕی (أَبِی حَثْمَةَ)ەوە هاتووە، فەرمودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە رووەو بەربەستێك نوێژی کرد، با لێی نزیك بێتەوە، نەوەك شەیتان نوێژەکەی پێ ببڕێت).

**٦٩٦ - (صحيح) عَنْ سَهْلٍ، قَالَ: وَكَانَ بَيْنَ مُقَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ مَمَرُّ عَنْزٍ.**

واتە: لە سەهلەوە هاتووە، کە وتویەتی: نێوانی شوێنی راوەستانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ نوێژکردن و دیواری مزگەوت کە دەکاتە قیبلەی بزنە ڕێیە دەبوو. واتە ئەوەندەی کە بزنێك پێیدا تێپەڕ ببێت.

**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْخَبَرُ لِلنُّفَيْلِيِّ.**

ئەبو داود دەڵێت: گۆ(لفظ)ی فەرمودەکە هی نوفەیلیە.

## باسی نوێژخوێن فەرمانی پێکراوە کە نەهێڵێت کەس بەر نوێژەکەیدا بڕوات.

## ١٠٨ – بَابُ مَا يُؤْمَرُ الْمُصَلِّى أَنْ يَدْرَأَ عَنْ الْممَرِّ بيْنَ يدَيْهِ.

٦٩٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّى، فَلاَ يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلْيَدْرَأْهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد و بەربەستی دانابوو با نەهێڵێت کەس بەردەمیدا بڕوات، هەتا دەتوانێت نەهێڵێت و دووری بخاتەوە ئەگەر وازی نەهێنا و نەگەڕایەوە باشەڕی لەگەڵدا بکات، چونکە ئەوە شەیتانە).

٦٩٨ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ، وَلْيَدْنُ مِنْهَا ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە رووەو بەربەستێك نوێژی کرد، با لێی نزیك بێتەوە).

٦٩٩ - (حسن صحيح) عَنْ أَبُو عُبَيْدٍ حَاجِبُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: رَأَيْتُ عَطَاءَ بْنَ يَزِيدَ اللَّيْثِيَّ قَائِمًا يُصَلِّي، فَذَهَبْتُ أَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَرَدَّنِي، ثُمَّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ لاَ يَحُولَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قِبْلَتِهِ أَحَدٌ فَلْيَفْعَلْ ».

واتە: لە ئەبو عوبەیدی (حَاجِب) سولەیمانەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عَطَاء)ی کوڕی (یَزِیدَ اللَّیْثِیَّ)م دی بە پێوە نوێژی دەکرد، ڕۆشتم بە بەر نوێژەکەیدا تێپەڕ ببم، بەرگری لێکردم و نەیهێشت بڕۆم، پاشان وتی: ئەبو سەعیدی خودری بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ لەئێوە توانی کە نەهێڵێ یەکێك گوزەر بکات لە نێوان خۆی و قیبلەیدا با نەهێڵێت).

٧٠٠ - (صحيح) عَنْ حُمَيْدٍ - يَعْنِي ابْنَ هِلاَلٍ - قَالَ: قَالَ أَبُو صَالِحٍ: أُحَدِّثُكَ عَمَّا رَأَيْتُ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ وَسَمِعْتُهُ مِنْهُ، دَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ عَلَى مَرْوَانَ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ

اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْ فِي نَحْرِهِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ ».

واتە: لە حومەید – واتە کوڕی هیلال - ەوە هاتووە کە وتویەتی: (أَبُو صَالِح) وتی: باسی ئەوەت بۆ بکەم کە چیم لەئەبو سەعید بینیوەو چیشم لەخۆی بیستووە، جارێ ئەبو سەعید چووە ژوورەوە بۆلای مەروان و وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەرەو بەربەستێك نوێژی دەکردو کردبووی بە پەردەی نێوان خۆی و خەڵکی تر، کەسێك ویستی لەوکاتەدا بە بەر نوێژەکەیدا تێپەڕێت، با نەهێڵێت و پاڵ بنێ بە سنگیەوە، جا ئەگەر ویستی هەر تێپەڕ ببێت با شەری لەگەڵ بکات، چونکە ئەوە شەیتان ئەو کارەی پێ دەکات.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: يَمُرُّ الرَّجُلُ يَتَبَخْتَرُ بَيْنَ يَدَيَّ وَأَنَا أُصَلِّي، فَأَمْنَعُهُ وَيَمُرُّ الضَّعِيفُ فَلاَ أَمْنَعُهُ.

ئەبو داود دەڵێت: سوفیانی (ثَوْرِیّ) وتی: کاتێ کە نوێژم دەکرد جاری وادەبوو کەسێك بە خۆبادان و لوت بەرزیەوە دەیدا بە بەر نوێژەکەمدا بەرگریم لێ دەکرد، بەڵام ئەگەر کەسێکی لاواز بوایە بەرگریم لێ نەدەکرد.

## باسی ڕێگری کراوە لەوەی
## بە بەردەم نوێژخوێندا دەڕوات.

## ١٠٩ - بَابُ مَا يُنْهَى عَنْهُ مِنَ الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي.

٧٠١ - (صحيح) عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ ». قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ شَهْرًا، أَوْ سَنَةً.

واتە: لە بوسری کوڕی سەعیدەوە هاتووە، کە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ناردویەتی بۆ لای ئەبو جوهەیم کە لێی بپرسێ: ئایا چی بیستووە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بەو کەسەی کە دەدات بە بەردەم نوێژخوێندا؟ ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێت ئەگەر بیزانێ بەوە چەند گوناهو تاوانی تووش دەبێ، ئەوا چل بە پێوە ڕابوەستایە زۆر باشتر بوو بۆی لەوەی کە بە بەردەمییدا بڕوات). (أَبُو النَّضْر) وتی: نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یا چل ساڵ ڕابوەستایە.

# باسەکانی ئەوەی نوێژ دەبڕێت و ئەوەی کە نایبڕێت.

# تفريع أبواب ما يقطع الصلاة وما لا يقطعها.

## باسی ئەوەی کە نوێژ دەبڕێت.

## ١١٠ - بَابُ مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ.

٧٠٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ حَفْصٌ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَقْطَعُ صَلاَةَ الرَّجُلِ». قَالاَ: عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ: « يَقْطَعُ صَلاَةَ الرَّجُلِ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ قِيدُ آخِرَةِ الرَّحْلِ، الْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ الأَسْوَدُ، وَالْمَرْأَةُ ». فَقُلْتُ: مَا بَالُ الأَسْوَدِ مِنَ الأَحْمَرِ، مِنَ الأَصْفَرِ، مِنَ الأَبْيَضِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: « الْكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ ».

واتە: (أَبِي ذَرّ) دەڵێت: (حَفْص) وتی: راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی پیاو دەبڕێت). وتیان لە سولەیمانەوە

هاتووە، کە وتویەتی: (أَبِی ذَرّ) وتی: (ئەگەر پیاوێ لەکاتی نوێژکردندا لەبەردەم جێگە سەجدەکەیدا شتێکی نەکردە بەربەست کە بە ئەندازەی قوتکەی دواوەی کۆپانە وشترێ بەرز بێت، ئەوا گوێدرێژ و، سەگی رەش و، ئافرەتی باڵغ، نوێژەکەی دەبڕن). وتم: سەگی رەش جیاوازی چییە لە سەگی سوور یان سەگی زەرد یا سەگی سپی بۆچی سەگی رەش نوێژی پیاو دەبڕێت، بەڵام سەگی سوور و زەرد و سپی نایبڕن؟ وتی: ئەی برازای خۆم ئەو پرسیارەی کە تۆ لە منت پرسی، منیش هەمان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرد، لەوەڵامدا فەرمووی: (سەگی رەش شەیتانە).

**٧٠٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ - رَفَعَهُ شُعْبَةُ - قَالَ: « يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: الْمَرْأَةُ الْحَائِضُ، وَالْكَلْبُ ».**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە – شوعبە فەرموودەکەی بە (مرفوع)ی هێناوە - کە فەرموویەتی: (ئافرەتی بێ نوێژ و، سەگ، نوێژ دەبڕن).

**٧٠٤ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، - قَالَ: أَحْسَبُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ: الْكَلْبُ، وَالْحِمَارُ، وَالْخِنْزِيرُ، وَالْيَهُودِيُّ، وَالْمَجُوسِيُّ، وَالْمَرْأَةُ، وَيُجْزِئُ عَنْهُ إِذَا مَرُّوا بَيْنَ يَدَيْهِ عَلَى قَذْفَةٍ بِحَجَرٍ ».**

[المشكاة: ٧٨٩].

واتــە: لــە ئیبنــو عەباســەوە رەزای خوایــان لــیّ بــیّ هــاتووە، وا ئــەزانم لــە پێغەمبــەرەوە صلی الله علیـه وسـلم گێڕاویەتیـەوە كـە فەرموویـەتی: (ئەگـەر كەســیّ لـەئێوە بـەبیّ بەربەسـت نوێـژ بكـات: سـەگ و، گوێدرێـژ و، بـەراز و، جولەكـەو، ئاگرپەرسـت و، ئـافرەتی بـالْغ، ئەگـەر بـە بـەر نوێژەكەیـدا تێپـەڕن نوێژەكەی دەبڕن، ئەگەر ئەمانە بەردەهاوێژیّ لەبەردەمیەوە بڕۆن قەیناكات).

٧٠٥ - (ضعيف) عَنْ يَزِيدَ بْنِ نِمْرَانَ، قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً بِتَبُوكَ مُقْعَدًا فَقَالَ: مَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا عَلَى حِمَارٍ وَهُوَ يُصَلِّ فَقَالَ: « اللَّهُمَّ اقْطَعْ أَثَرَهُ ». فَمَا مَشَيْتُ عَلَيْهَا بَعْدُ.

واتە: لە یەزیدی كوڕی نیمرانەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە تـەبوك پیـاوێكی ئیفلـیجم دی نەیـدەتوانی هەسـتێتە سـەرپیّ وتـی: بەسـواری گوێدرێژێكـەوە تێپەڕیم بە بەردەم پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەكـرد، فـەرمووی: (خودایـە شـوێنەواری رۆشـتنەكەی بـبڕە). ئـیتر لـەدوای نزاكـەی پێغەمبـەرەوە صلی الله علیه وسلم بە سواری گوێدرێژ نەڕۆیشتووم.

٧٠٦ - (ضعيف) عَنْ سَعِيدٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ زَادَ: فَقَالَ: « قَطَعَ صَلاَتَنَا، قَطَعَ اللَّهُ أَثَرَهُ ».

واتە: لە سەعیدەوە بە هەمان ماناو سەنەد هـاتووە، بـەلاّم ئەمـەی بـۆ زیـاد كرد، فەرمووی: (نوێژەكەی بڕین، خوا شوێنەواری رۆیشتنەكەی ببڕێت).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ أَبُو مُسْهِرٍ عَنْ سَعِيدٍ ، قَالَ فِيهِ: « قَطَعَ صَلاَتَنَا ».

ئەبو داود دەڵێت: ئەبو موسهەر لە سەعیدەوە گێڕاویەتیەوە، لە فەرموودەکەیدا هاتووە کە فەرموویەتی: (نوێژەکەی بڕین).

٧٠٧ - (ضعيف) عَنْ سَعِيدِ بْنِ غَزْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ نَزَلَ بِتَبُوكَ، وَهُوَ حَاجٌّ فَإِذَا رَجُلٌ مُقْعَدٌ، فَسَأَلَهُ عَنْ أَمْرِهِ؟ فَقَالَ: ﴿لَهُ﴾: سَأُحَدِّثُكَ حَدِيثًا فَلاَ تُحَدِّثْ بِهِ مَا سَمِعْتَ أَنِّي حَيٌّ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ بِتَبُوكَ إِلَى نَخْلَةٍ فَقَالَ: « هَذِهِ قِبْلَتُنَا ». ثُمَّ صَلَّى إِلَيْهَا، فَأَقْبَلْتُ وَأَنَا غُلاَمٌ أَسْعَى حَتَّى مَرَرْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا فَقَالَ: « قَطَعَ صَلاَتَنَا، قَطَعَ اللَّهُ أَثَرَهُ ». فَمَا قُمْتُ عَلَيْهَا إِلَى يَوْمِي هَذَا.

واتە: لە ئەبو سەعیدی کوڕی غەزوانەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە غەزوان لە تەبوك دابەزی نیەتی حەجکردنی هەبوو، گەشت بە پیاوێکی ئیفلیج کە نەیدەتوانی هەستێتە سەرپێ لەوبارەی حاڵیەوە لێی پرسی؟ ئەویش وتی: قسەیەکت بۆ دەگێڕمەوە هەتا من زیندووبم بۆ کەسی باس مەکە، بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە تەبوك لەلای دار خورمایەکدا دابەزی فەرمووی: (ئەم دار خورمایە قیبلەمانە)، ئینجا بەرەو دارخورماکە نوێژی کرد، پیاوە ئیفلیجەکە وتی: لەوکاتەدا منداڵ بووم ڕۆشتم بۆ لای و ئەوەندە

دەهاتم و دەچووم بەلایدا هەتا کەوتمە نێوان ئەو و دارخورماکە، فەرمووی: (نوێژەکەی بڕین، خوا شوێنەواری ڕۆشتنەکەی ببڕێت). لەو ڕۆژەوە ئیتر نەم توانیوە هەستمە سەرپێ و بڕۆم.

## باسی بەربەستی پێشنوێژ بەربەستە بۆ ئەوانەی کە لەدوایەوە نوێژ دەکەن.

## ١١١ – بَابُ سُتْرَةُ الإِمَامِ سُتْرَةُ مَنْ خَلْفَهُ.

٧٠٨ - (حسن صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: هَبَطْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ثَنِيَّةِ أَذَاخِرَ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ - يَعْنِي فَصَلَّى إِلَى جِدَارٍ - فَاتَّخَذَهُ قِبْلَةً وَنَحْنُ خَلْفَهُ، فَجَاءَتْ بَهْمَةٌ تَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَمَا زَالَ يُدَارِئُهَا حَتَّى لَصِقَ بَطْنُهُ بِالْجِدَارِ، وَمَرَّتْ مِنْ وَرَائِهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە بەرزایی (أَذَاخِر)ەوە دەهاتینە خوارەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم کاتی نوێژ هات - پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەرەو دیوارێك نوێژی دابەست – کردی بە قیبلەی خۆی و ئێمەش لەدوایەوە بووین، بەرخۆڵەیەك هاتە بەردەمی ئەوەندەی پاڵ بە بەرخۆڵەکەوە نا هەتا سکی لکاند بە دیوارەکەوە، ئینجا بەرخۆڵەکە هات لەدوایەوە تێپەڕی.

٧٠٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ يُصَلِّي، فَذَهَبَ جَدْيٌ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَتَّقِيهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکرد، کاریلەیە هات ویستی بە بەر نوێژەکەیدا تێپەڕ ببێت، دووری خستەوەو نەیهێشت تێپەڕ ببێت.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەگەر ئافرەت بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت.

## ١١٢ - بَابُ مَنْ قَالَ: الْمَرْأَةُ لاَ تَقْطَعُ الصَّلاَةَ.

٧١٠ - (صحيح دون قوله: وَأَنَا حَائِضٌ) عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: كُنْتُ بَيْنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، قَالَ شُعْبَةُ: أَحْسَبُهَا قَالَتْ: وَأَنَا حَائِضٌ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەنێوان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و قیبلەدا بووم، شوعبە وتی: وادەزانم وتیشی: من بێ نوێژ بووم.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهـا، لَـمْ يَـذْكُرُوا: « وَأَنَـا حَائِضٌ».

ئەبو داود دەڵێت: لە چەند رێگەیەکی ترەوە لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، بەڵام: (من بێ نوێژ بووم)ی تێدا باس نەکراوە.

٧١١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي صَلاَتَهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَهِيَ مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، رَاقِدَةً عَلَى الْفِرَاشِ الَّذِي يَرْقُدُ عَلَيْهِ، حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَهَا فَأَوْتَرَتْ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم شەونوێژی دەکرد، عائیشەش وەك تەرم دەکەوتە نێوان پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و قیبلەیەوە، لەسەر ئەو نوێنەش رادەکشاو دەخەوت کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لەسەری دەخەوت، هەتا کاتێ کە دەیویست نوێژی وەتر بکات لەخەو هەڵیدەسان، جا ئەویش نوێژی وەتری دەکرد.

٧١٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: بِئْسَمَا عَدَلْتُمُونَا بِالْحِمَارِ وَالْكَلْبِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ غَمَزَ رِجْلِي، فَضَمَمْتُهَا إِلَيَّ، ثُمَّ يَسْجُدُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: بڕیارێکی خراپتاندا کە ئێمەشتان لەنوێژ بڕیندا خستە ریزی گوێدرێژ و سەگەوە،

بێگومان پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی نوێژی دەكرد، منیش وەك تەرم لەبەردەمیدا دەكەوتم، كاتێ كە دەیویست سەجدە بەرێت ئەیژەن بە قاچمەوە، منیش قاچم هەڵدەكێشا، ئینجا سەجدەی دەبرد.

٧١٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها أَنَّهَا قَالَتْ:كُنْتُ أَكُونُ نَائِمَةً وَرِجْلاَيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ ضَرَبَ رِجْلَيَّ فَقَبَضْتُهُمَا ، فَسَجَدَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دەخەوتم لەكاتێكدا كە شەونوێژی دەكرد، قاچەكانم لای قیبلەیەوە بوو، كاتێ كە دەیویست سەجدە بەرێت دەیدا لە قاچم، منیش قاچەكانم كۆدەكردەوە، ئینجا ئەویش سەجدەی دەبرد.

٧١٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ فِي قِبْلَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُصَلِّي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَمَامَهُ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ - زَادَ عُثْمَانُ: غَمَزَنِي، ثُمَّ اتَّفَقَا - فَقَالَ: « تَنَحَّيْ ».

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: جاری وا هەبوو دەخەوتم وەك تەرم لەبەردەم قیبلەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم

دەکەوتم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکردو منیش لەبەردەمیا بووم، کاتێ کە دەیویست نوێژی وەتر بکات — (عُثْمَان) راوی فەرمووودەکە ئەمەشی بۆ زیاد کرد: ئەیژەن بە قاچمەوە، پاشان (عُثْمَان) و (قَعْنَبِيّ) کە دوو راوی فەرمووودەکەن هەردووکیان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە فەرمووی: (ئەی عائشە لەوێدا لاچۆ).

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەگەر گوێدرێژ بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت.

## ١١٣ – بَابُ مَنْ قَالَ: الْحِمَارُ لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ.

| |
|---|
| ٧١٥ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاِحْتِلاَمَ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنًى، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ فَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ، وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ أَحَدٌ. |

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: سواری گوێدرێژێك بوو بووم تەمەنم نزیکی باڵغ بوون ئەبوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە مینا بەرنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، بە بەردەم چەند ریزێکیشدا تێپەڕیم، پاشان گوێدرێژەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ و خۆم چوومە ناو ریزەکەوە، کەس ئینکاری ئەو کارەی نەکردم.

قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَهَذَا لَفْظُ الْقَعْنَبِيِّ وَهُوَ أَتَمُّ، قَالَ مَالِكٌ: وَأَنَا أَرَى ذَلِكَ وَاسِعًا إِذَا قَامَتِ الصَّلاَةُ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش گۆی (قَعْنَبِیّ)ە لە ریوایەتەکەی (عُثْمَان) تەواوترە. مالیك دەڵێت: من وای دەبینم بوارەکە فراوانە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە گوێدرێژ نوێژ نابرێت ئەگەر بدات بە بەر نوێژدا.

٧١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ، قَالَ: تَذَاكَرْنَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: جِئْتُ أَنَا وَغُلاَمٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَلَى حِمَارٍ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، فَنَزَلَ وَنَزَلْتُ، وَتَرَكْنَا الْحِمَارَ أَمَامَ الصَّفِّ، فَمَا بَالاَهُ، وَجَاءَتْ جَارِيَتَانِ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَدَخَلَتَا بَيْنَ الصَّفِّ، فَمَا بَالَى ذَلِكَ.

واتە: لە (أَبِي الصَّهْبَاء)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ لەلای ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ باسی ئەوەمان دەکرد کە چی بدات بە بەر نوێژدا نوێژ دەبرێت، ئیبنو عەباس وتی: من و غولامێکی هۆزی (عَبْد الْمُطَّلِب) بە سواری گوێدرێژێ هاتین، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد، ئەو دابەزی وە منیش دابەزیم، لەبەردەم ریزەکەدا گوێدرێژەکەمان بەرەڵا کرد، گوێی نەدا بە گوێدرێژەکە کە بدات بە بەر نوێژەکەدا، وە دوو کەنیزەکیش لە هۆزی (عَبْد الْمُطَّلِب) هاتن و چوونە نێوان ریزەکانەوە، گوێی نەدا بەوانیش کە بدەن بە بەر نوێژەکەدا.

٧١٧ - (صحيح) عَنْ مَنْصُورٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ، قَالَ: فَجَاءَتْ جَارِيَتَانِ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ اقْتَتَلَتَا، فَأَخَذَهُمَا، قَالَ عُثْمَانُ: فَفَرَّعَ بَيْنَهُمَا، قَالَ: دَاوُدُ: فَنَزَعَ إِحْدَاهُمَا مِنَ الأُخْرَى، فَمَا بَالَى ذَلِكَ.

واتە: لە (مَنْصُور)ەوە فەرموودەی ناوبراو بە هەمان سەنەد هاتووە، كە وتویەتی: دوو كەنیزەك لە هۆزی (عَبْدِ الْمُطَّلِب) هاتن و بوو بە شەڕیان، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گرتنی، (عُثْمَان) وتی: لێكی جیاكردنەوە، (دَاوُد) وتی: یەكێكیانی جیاكردەوە لەوی تریان، هەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوێی نەدا بەوانیش كە بدەن بە بەر نوێژخوێناندا.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: ئەگەر سەگ بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت.

## ١١٤ - بَابُ مَنْ قَالَ: الْكَلْبُ لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ.

٧١٨ - (ضعيف)[١] عَنْ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ فِي بَادِيَةٍ لَنَا وَمَعَهُ عَبَّاسٌ، فَصَلَّى فِي صَحْرَاءَ لَيْسَ بَيْنَ يَدَيْهِ سُتْرَةٌ، وَحِمَارَةٌ لَنَا وَكَلْبَةٌ تَعْبَثَانِ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَمَا بَالَى ذَلِكَ.

---

[١] - (صحيح)ەكەی ئەومیە بە ژمارە: ٧١٦ هاتووە.

واتە: لە (فَضْـل)ی كوڕی عەباسەوە رەزای خوايان لێ بێ هاتووە، كە وتويەتی: ئێمە لە بيابان بووين، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ لامان عەباسيشی لەگەڵ بوو، لە چۆڵەوانيدا نوێژی كرد لەبەردەميدا بەربەستی دانەنا، لەبەردەم نوێژەكەيدا گوێدرێژەكەی ئێمەو سەگێ پێكەوە ياريان دەكرد، گوێی پێ نەداو دەربەست نەبوو.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: هەر شتێك بڕوات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت.

## ١١٥ – بَابُ مَنْ قَالَ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ.

٧١٩ - (ضعيف دون قوله « وَادْرَءُوا » (صحيح) ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ، وَادْرَءُوا مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ ».

واتە: لە ئەبو سەعيدەوە هاتووە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (هەر شتێك بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت، هەرچی ويستی بە بەر نوێژەكەتاندا تێپەڕێت هەتا دەتوانن نەهێڵن، چونكە ئەوە شەيتانە).

٧٢٠ - (ضعيف) عَنْ أَبُو الْوَدَّاكِ، قَالَ: مَرَّ شَابٌّ مِنْ قُرَيْشٍ بَيْنَ يَدَيْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَهُوَ يُصَلِّي، فَدَفَعَهُ، ثُمَّ عَادَ، فَدَفَعَهُ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: إِنَّ الصَّلاَةَ لاَ يَقْطَعُهَا شَيْءٌ، وَلَكِنْ، قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «ادْرَءُوا مَا اسْتَطَعْتُمْ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ».

واته: لە ئەبو وەداکەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو سەعیدی خودری نوێژی دەکرد لاوێکی قورەیشی ڕۆیشت بە بەردەمیدا، ئەویش پاڵێکی پێوەناو نەیهێشت بڕوات، پاشان دووبارە هاتەوە، ئەویش دووبارە پاڵی پێوەنایەوە، دیسان هاتەوە، ئەویش پاڵی پێوەنایەوە، هەتا سێ جار، کاتێ کە سەلامی دایەوە وتی: هەر شتێك بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەتا دەتوانن نەهێڵن و دووری بخەنەوە چونکە ئەوە شەیتانە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِذَا تَنَازَعَ الْخَبَرَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نُظِرَ إِلَى مَا عَمِلَ بِهِ أَصْحَابُهُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ مِنْ بَعْدِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر دوو ڕیوایەت لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم بهاتایە دژ بەیەك بوونایە، سەیریان دەکرد هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێ لەدوای خۆی کاریان بەکامەیان کردووە کاریان بەوەیان دەکرد[1].

---

[1] - خاوەنی کتێبی (عون المعبود) دەڵێت: زۆربەی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێ لەسەر ئەو ڕایەن کە هەر شتێك بدات بە بەر نوێژدا نوێژ نابڕێت. (عون المعبود شرح سنن أبي داود: ١/ ٤٧١) علق عليه وخرج أحاديثه شيخ مشهور بن حسن.

# بەشێك لە باسەكانی نوێژ دابەستن.

# أبواب تفريع استفتاح الصلاة

## باسی دەست بەرزكردنەوە لەنوێژدا.

## ١١٦ - بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ.

٧٢١ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّلاَةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَبَعْدَ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ - وَقَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً: وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ، وَأَكْثَرُ مَا كَانَ يَقُولُ وَبَعْدَ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ - وَلاَ يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی كاتێ كە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە تا بەرامبەر هەردووشانی، وە كاتێ كە دەیویست بچێتە ركوعیشەوە، وە دوای ئەوەش كە سەری بەرزدەكردەوە لە ركوع - جارێ سوفیان وتی: كاتێ كە سەری بەرزدەكردەوە، بەڵام زۆرترین جار لەدوای ئەوەی كە سەری بەرزدەكردەوە لە ركوع هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە — وە لە نێوان دوو سەجدەكەدا بۆ سەردانەواندن و سەر بەرزكردنەوە دەستی بەرزنەدەكردەوە.

٧٢٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ وَهُمَا كَذَلِكَ، فَيَرْكَعُ، ثُمَّ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْفَعَ صُلْبَهُ رَفَعَهُمَا حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ، قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَلَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي السُّجُودِ، وَيَرْفَعُهُمَا فِي كُلِّ تَكْبِيرَةٍ، يُكَبِّرُهَا قَبْلَ الرُّكُوعِ حَتَّى تَنْقَضِيَ صَلَاتُهُ.

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە تا بەرامبەر هەردووشانی، پاشان (الله اكبر)ی دەكرد دەستەكانی هەر بەرز بوون، جا دەچووە ركوعەوە، ئینجا كە دەیویست پشتی ڕاستكاتەوە لەركوع هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە تا بەرامبەر هەردووشانی، پاشان دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەكەن. وە لە سەجدەدا دەستەكانی بەرزنەدەكردەوە، وە لەهەموو (الله اكبر) كردنێكدا هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە، پێش چوونە ركوع (الله اكبر)ی دەكرد بۆ چوونە ركوع، بەو شێوەیە هەتا نوێژەكەی تەواو دەكرد.

٧٢٣ - (صحيح) عَنْ أَبِى وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ إِذَا كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ الْتَحَفَ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، وَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فِى ثَوْبِهِ، قَالَ: فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ أَخْرَجَ يَدَيْهِ ثُمَّ رَفَعَهُمَا، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ سَجَدَ وَوَضَعَ وَجْهَهُ بَيْنَ كَفَّيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ أَيْضًا رَفَعَ يَدَيْهِ، حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ، قَالَ مُحَمَّدٌ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلْحَسَنِ بْنِ أَبِى الْحَسَنِ فَقَالَ: هِيَ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَهُ مَنْ فَعَلَهُ، وَتَرَكَهُ مَنْ تَرَكَهُ.

واتە: لە ئەبو وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژم کردووە کاتێ کە (الله اکبر)ی دەکرد دەستەکانی بەرزدەکردەوە، وتی: پاشان پۆشاکەکەی دەپێچا بەخۆیەوە، ئینجا بەدەستی راستی دەستی چەپی دەگرت، جا دەستەکانی دەکرد بەناو پۆشاکەکەیدا، وتی: کاتێ کە دەیویست رکوع بەرێت دەستەکانی دەردەهێناو بەرزی دەکردنەوە، وە کاتێ کە دەیویست سەری بەرزکاتەوە لە رکوع دەستەکانی بەرزدەکردەوە، پاشان سەجدەی دەبردو نێوچاوانی لەنێوان هەدوو لەپی دەستیدا دەخستە سەر زەوی، هەروەها کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوە لە سەجدە دەستەکانی بەرزدەکردەوە، بەو شێوەیە هەتا لەنوێژ دەبووەوە. موحەممەد دەڵێت: ئەمەم گێڕایەوە بۆ حەسەنی کوڕی (أَبِى الْحَسَن) ئەویش

وتـى: ئـەوە نويـژى پێغەمبـەرى خوايـە صلى الله عليـە وسـلم، ئـەوەى كـرد كـە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كردى، ئەوەشى نەدەكرد كە نەيدەكرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ هَمَّامٌ، عَنْ ابْـنِ جُحَـادَةَ، لَـمْ يَـذْكُرِ الرَّفْعَ مَعَ الرَّفْعِ مِنَ السُّجُودِ.

ئەبو داود دەڵێت: هومام ئەم فەرموودەى لـە (ابْـنِ جُحَـادَةَ)ەوە گێڕاوەتـەوە، بەڵام باسى دەست بەرزكردنەوەى نەكرد لەگەڵ سەربەرزكردنەوە لەسەجدەدا.

٧٢٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ الْجَبَّارِ بْنُ وَائِلٍ، حَـدَّثَنِي أَهْـلُ بَيْتِـي، عَنْ أَبِي، أَنَّهُ حَدَّثَهُمْ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ مَعَ التَّكْبِيرَةِ.

واتە: لە (عَبْدِ الْجَبَّار)ى كوڕى وائلەوە دەڵێت: خزمەكانم لە باوكمـەوە بۆيـان گێڕامـەوە، كـە بـاوكم پێغەمبـەرى خـواى صلى الله عليـە وسـلم ديـوە هـەردوو دەستى بەرزكردۆتەوە لەگەڵ (الله اكبر) كردنى نوێژدابەستندا.

٧٢٥ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَـنْ أَبِيـهِ، أَنَّـهُ أَبْصَـرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ، حَتَّى كَانَتَا بِحِيَالِ مَنْكِبَيْهِ، وَحَاذَى بَابُ هَامَيْهِ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ.

واتە: لە (عَبْدِ الْجَبَّار)ى كوڕى وائلـەوە، لەباوكيـەوە هـاتووە، كـە پێغەمبـەرى خواى صلى الله عليه وسلم ديوە لەكاتێكدا كە نوێژى دادەبەست هەردوو دەستى

بەرزکردەوە هەتا بەرامبەر هەردووشانی، وە هەردوو پەنجە گەورەشی تا بەرامبەر نەرمایی گوێچکەکانی، پاشان (الله اكبر)ی دەکرد.

٧٢٦ - (صحيح) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: قُلْتُ: لأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ يُصَلِّي! قَالَ: فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا سَجَدَ وَضَعَ رَأْسَهُ بِذَلِكَ الْمَنْزِلِ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَحَدَّ مِرْفَقَهُ الأَيْمَنَ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ ثِنْتَيْنِ وَحَلَّقَ حَلْقَةً، وَرَأَيْتُهُ يَقُولُ هَكَذَا: وَحَلَّقَ بِشْرٌ الإِبْهَامَ وَالْوُسْطَى، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ.

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: وتم چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەرتان صلى الله عليه وسلم نیشان بدەم کە چۆن نوێژی دەکرد؟ وائل وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەڵئەسا بۆ نوێژکردن، رووی دەکردە قیبلەو هەردوو دەستی بەرزکردەوە تا نەرمایی گوێچکەکانی،

پاشان بەدەستی راستی دەستی چەپی دەگرت و، کاتێ کە دەچووە رکوعیش بە هەمان شێوە بەرزی دەکردنەوە، پاشان هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆکانی دائەنا، کاتێ سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع هەردوو دەستی بەرزکردەوە، کاتێ کە سەجدەی دەبرد سەری لەنێوان هەدوو دەستیدا دەخستە سەر زەوی، پاشان قاچی چەپی رادەخست و دادەنیشت، دەستی چەپی لەسەر رانی چەپی دائەنا، ئەنیشکی راستی بە بەرزی رادەگرت لەسەر ئاستی رانی راستی، وە بە پەنجەی ناوەڕاستی پەنجە گەورەی دەگرت و دەیکردن بە هەڵقەیە، بیشر وتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینی بەم شێوەی دەکرد: بیشر پەنجە گەورەی و پەنجەی ناوەڕاستی کرد بە هەڵقەیەك و، پەنجەی شایەتومانی دەجولاند.

٧٢٧ - (صحيح) عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ فِيهِ: ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُّسْغِ وَالسَّاعِدِ، وَقَالَ فِيهِ: ثُمَّ جِئْتُ بَعْدَ ذَلِكَ فِي زَمَانٍ فِيهِ بَرْدٌ شَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّاسَ عَلَيْهِمْ جُلُّ الثِّيَابِ تَحَرَّكُ أَيْدِيهِمْ تَحْتَ الثِّيَابِ.

واتە: لە (عَاصِم)ی کوڕی کولەیبەوە، فەرمووودەکەی پێشوو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، لە فەرمووودەکەیدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی راستی لەسەر پشتی دەستی چەپی و مەچەك و قۆڵی دائەنا، راوی لە فەرمووودەکەیدا وتی: پاشان دوای ماوەیەکی زۆر هاتم زۆر سارد بوو، خەڵکەکەم دی پۆشاکەکانیان پێچابوو بە خۆیانەوەو لەژێر پۆشاکەکانیانەوە دەستیان دەجولاند.

٧٢٨ - (صحيح) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلاَةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حِيَالَ أُذُنَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُهُمْ، فَرَأَيْتُهُمْ يَرْفَعُونَ أَيْدِيَهُمْ إِلَى صُدُورِهِمْ فِي افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ، وَعَلَيْهِمْ بَرَانِسُ وَأَكْسِيَةٌ.

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم دیوە لەکاتێکدا کە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا بەرامبەر گوێچکەکانی، وتی: پاشان چووم بۆ لایان، بینینم لەکاتی نوێژی دابەستندا دەستیان بەرزدەکردەوە هەتا ئاستی سنگیان، وە (برنس) ئەو کڵاوەی کە بە پۆشاکەوەیە لەگەڵ پۆشاك(کساء)ەکانیان پۆشیبوو.

## باسی نوێژ دابەستن.

## ١١٩ - بَابُ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ.

٧٢٩ - (صحيح) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الشِّتَاءِ، فَرَأَيْتُ أَصْحَابَهُ يَرْفَعُونَ أَيْدِيَهُمْ فِي ثِيَابِهِمْ فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ لە وەرزی زستاندا چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، هاوەڵەکانیم بینی لەکاتی نوێژکردندا لەژێر پۆشاکەکانیانەوە دەستیان بەرزدەکردەوە.

٧٣٠ - (صحيح) قَالَ: أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالُوا: فَلِمَ فَوَاللَّهِ مَا كُنْتَ بِأَكْثَرِنَا لَهُ تَبَعًا وَلاَ أَقْدَمَنَا لَهُ صُحْبَةً؟، قَالَ: بَلَى، قَالُوا: فَاعْرِضْ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حَتَّى يَقِرَّ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ، فَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يَرْكَعُ وَيَضَعُ رَاحَتَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ يَعْتَدِلُ فَلاَ يَصُبُّ رَأْسَهُ وَلاَ يُقْنِعُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَقُولُ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ». ثُمَّ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ يَقُولُ: « اللَّهُ أَكْبَرُ ». ثُمَّ يَهْوِي إِلَى الأَرْضِ، فَيُجَافِي يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ وَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا، وَيَفْتَحُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ إِذَا سَجَدَ، وَيَسْجُدُ، ثُمَّ يَقُولُ: « اللَّهُ أَكْبَرُ ». وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ وَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ يَصْنَعُ فِي الأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا

مَنْكِبَيْهِ كَمَا كَبَّرَ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي بَقِيَّةِ صَلاَتِهِ حَتَّى إِذَا كَانَتِ السَّجْدَةُ الَّتِي فِيهَا التَّسْلِيمُ أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ مُتَوَرِّكًا عَلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ. قَالُوا: صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: ئەبو حومەید دەڵێت: من لەهەمووتان زیاتر شارەزام بە نوێـژکردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وتیان: لەبەرچی سوێند بە خوا نە لە ئێمە زیاتر شوێنکەوتەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبـەری صلى الله عليـه وسـلم، وە نە لە ئێمەش لەپێش تری بۆ هاوەڵێتی، وتی: بەڵێ وایە - بـەڵام مـن زیـاتر سەرنجی چۆنیەتی نوێژکردنی پێغەمبەری صلى الله عليـه وسـلم داوە - وتیـان: ئـادەی ئـەوەی دەیزانـی بۆمـان بـاس بکـەو نیشـانمانی بـدە؟ وتـی: کـاتێ کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسـلم هەڵئەسـا بـۆ نوێـژکردن هـەردوو دەسـتی بەرزدەکردەوە هەتا ئاسـتی نـەرمایی گوێچکەکانی، پاشـان (الله اکـبر)ی دەکـردو ڕێـك ڕادەوەسـتا هـەتا هـەموو جومگـەکانی دەچـوونەوە جێگـای خۆیـان، ئینجـا دەستی دەکرد بە خوێندن – واتە دوعـای نوێـژ دابەسـتن و خوێنـدنی سورەتی فاتیحـەو خوێنـدنی سـورەت و ئایـەتی تـریش -، پاشـان (الله اکـبر)ی دەکـردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی، ئینجا دەچووە ڕکوعەوەو هـەردوو لـەپی دەسـتی لەسـەر ئـەژنۆی دائـەنا، پاشان سـەر و پشـتی ڕێـك دەکـرد نـە سـەری بـەرزدەکردەوە لـە ئاسـتی پشـتی وە نـە سـەری شـۆڕی دەکردەوە بەرەو زەوی، ئینجا سـەری بـەرزدەکردەوەو دەیفـەرموو: (سَـمِعَ اللَّـهُ لِمَـنْ حَمِـدَهُ). واتـە: خـوای گـەورە بیسـەری سوپاسـگوزاری ئەوانەیـە سوپاسـی دەکەن. پاشان هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی و

رێك دەوەستا، ئینجا دەیفەرموو: (الله اكبر)، پاشان دادەبەزی بۆ سەر زەوی - و سەجدەی دەبرد - ، هەردوو دەستی لە لاتەنیشتەکانی دووردەخستەوە، ئینجا سەری بەرزدەکردەوەو قاچی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت، کاتێ کە سەجدەی دەبرد پەنجەکانی هەردوو قاچی دەکردنەوە، هەتا هەموو جومگەکانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، پاشان بە هەمان شێوە دەچووەوە سەجدەوە، ئینجا دەیفەرموو: (الله اكبر)، پاشان سەری بەرزدەکردەوەو قاچی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت هەتا هەموو جومگەکانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، پاشان لەرکاتی دووهەمیشدا بە هەمان شێوەی دەکرد، ئینجا کاتێ کە لەرکاتی دووهەم هەڵئەسایەوە (الله اكبر)ی دەکردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی وەك چۆن لەکاتی نوێژ دابەستندا (الله اكبر)ی دەکرد، پاشان لە باقی نوێژەکەیدا بە هەمان شێوەی دەکرد هەتا دەگەیشتە ئەو سەجدەیەی کە سەلامی تێدا دەدایەوە واتە تەحیاتی کۆتایی جا قاچی چەپی دەبردە پێشەوە بۆ ژێر قاچی راستی و ئەوی تریانی هەڵدەنا و لەسەر سمتی دادەنیشت، وتیان: راست دەکەیت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

٧٣١ - (صحيح دون قوله: «وَلاَ صَافِحٍ بِخَدِّهِ») عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو الْعَامِرِيِّ، قَالَ: كُنْتُ فِي مَجْلِسٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَذَاكَرُوا صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: فَذَكَرَ بَعْضَ هَذَا الْحَدِيثِ وَقَالَ: فَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ كَفَّيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ غَيْرَ مُقْنِعٍ

رَأْسَهُ وَلاَ صَافِحٍ بِخَدِّهِ، وَقَالَ: فَإِذَا قَعَدَ فِى الـرَّكْعَتَيْنِ قَعَدَ عَلَى بَطْنِ قَدَمِهِ الْيُسْرَى، وَنَصَبَ الْيُمْنَـى، فَـإِذَا كَانَ فِى الرَّابِعَةِ أَفْضَى بِوَرِكِهِ الْيُسْـرَى إِلَـى الأَرْضِ، وَأَخْرَجَ قَدَمَيْهِ مِنْ نَاحِيَةٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی عەمری عامریەوە هاتووە، كە وتویەتی: من لـە كۆڕی هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیـه وسلم بـووم، باسـی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبـەریان صـلی الله علیـه وسـلم دەكـرد، ئـەبو حومەیـد وتـی: باسـی هەندێ لەو فەرموودەیان كرد، وە وتـی: كـە ركوعیشـی دەبـرد هـەردوو دەسـتی لەهەردوو ئـەژنۆكانی گـیر دەكـرد، وە پەنجـەكانی هـەردوو دەسـتی دەكردنـەوە، پاشان پشتی خۆی دەچەماندەوە پشت و ملـی ڕێـك لەیـەك ئاسـت رادەگـرت نـە سـەری بـەرزدەكردەوەو نـە سـەری شـۆڕی دەكـردەوە بـەرەو زەوی، وە كـوڵمی نەدەكردە لای راست و چەپی، وە وتی: لەڕكاتی دووەمەمدا كاتێ كـە دادەنیشت بـۆ تـەحیات خوێنـدن لەسـەر بـەری پێـی چـەپی دادەنیشـت و، قاچـی راسـتی هەڵـدەنا، بـەڵام لەچـوارەم ڕكاتـدا كلـۆكی لای چـەپی دەخسـتە سـەر زەوی، هەردوو پێی لەلایەكەوە دەردەكرد.

٧٣٢ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، نَحْـوَ هَـذَا، قَـالَ: فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْـهِ غَيْـرَ مُفْتَـرِشٍ وَلاَ قَابِضِـهِمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِهِ الْقِبْلَةَ.

واتـە: لـە موحەممـەدی كـوڕی عـەمری كـوڕی (عَطَـاء)ەوە بـە هـەمان شـێوە هـاتووە، كـە وتویـەتی: كـاتێ كـە سـەجدەی دەبـرد باسـكی هـەردوو دەسـتی

رانەدەخست لەسەر زەوی و نەشی دەنووساندن بە خۆیەوە، بەڵکو هەردوو باڵی خۆی بڵاودەکردەوە، سنگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دادەناو نووکی پەنجەکانی قاچی روویان دەکردە قیبلە.

٧٣٣ - (ضعيف) عَنْ عَبَّاسٍ - أَوْ عَيَّاشِ - بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ أَبُوهُ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - ، وَفِي الْمَجْلِسِ أَبُو هُرَيْرَةَ وَأَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ وَأَبُو أُسَيْدٍ بِهَذَا الْخَبَرِ يَزِيدُ أَوْ يَنْقُصُ.، قَالَ فِيهِ: ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ - يَعْنِي مِنَ الرُّكُوعِ - فَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ». وَرَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ». فَسَجَدَ، فَانْتَصَبَ عَلَى كَفَّيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ وَصُدُورِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، ثُمَّ كَبَّرَ فَجَلَسَ فَتَوَرَّكَ وَنَصَبَ قَدَمَهُ الأُخْرَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَقَامَ وَلَمْ يَتَوَرَّكْ، ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ، حَتَّى إِذَا هُوَ أَرَادَ أَنْ يَنْهَضَ لِلْقِيَامِ قَامَ بِتَكْبِيرَةٍ، ثُمَّ رَكَعَ الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ، وَلَمْ يَذْكُرِ التَّوَرُّكَ فِي التَّشَهُّدِ.

واتە: عەباس - یان عەیاش - ی کوڕی سەهلی ساعیدی ئامادەی کۆڕێك بوو کە باوکیشی لێ بووە – بێگومان باوکی لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بووە -، هەروەها لەو کۆڕەدا ئەبو هورەیرە و ئەبو حومەید ساعیدی و

ئەبو ئوسەیدیش ئامادە بوون، - عیسای کوڕی (عبداللە) راوی فەرموودەکە - هەمان فەرموودەی گێڕایەوە بەڵام زیاد و کەمی هەبوو لە فەرموودەکەی پێشوو، - عیسای کوڕی (عبداللە) - لە فەرموودەکەیدا وتی: پاشان سەری بەرزدەکردەوە واتە لە رکوع فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەکەن، خوای گەورەو پەروەردگار سوپاس و ستایش بۆ تۆ. وە هەردوو دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: (الله اکبر) سەجدەی برد، لەپی هەردوو دەستی و هەردوو ئەژنۆیی و سنگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دانا لەکاتێکدا کە لە سەجدەدا بوو، پاشان (الله اکبر)ی کردو لەنێوان دوو سەجدەکەدا دانیشت تەوەروکی کرد واتە لەسەر کلۆکی لای چەپی دانیشت و قاچەکەی تری هەڵنا، پاشان (الله اکبر)ی کردو سەجدەی دووهەمی برد، ئینجا (الله اکبر)ی کردو تەوەروکی نەکرد، لەپاشدا - عیسای کوڕی (عبداللە) - فەرموودەکەی گێڕایەوە، وتی: ئینجا لەدوای دوو رکاتەکە دانیشت، هەتا کاتێ کە دەیویست هەستێتەوە (الله اکبر)ی دەکردو هەڵئەسایەوە، پاشان دوو رکاتەکەی تری کرد، - موحەممەدی کوڕی عەمر راوی فەرموودەکە - باسی تەوەروکی نەکرد لە تەحیاتی دووهەمدا.

٧٣٤ - (صحيح) عَنْ عَبَّاسُ بْنُ سَهْلٍ، قَالَ: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ وَأَبُو أُسَيْدٍ وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَذَكَرُوا صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَذَكَرَ بَعْضَ هَذَا -، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ كَأَنَّهُ قَابِضٌ عَلَيْهِمَا، وَوَتَّرَ يَدَيْهِ فَتَجَافَى عَنْ

جَنْبَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ فَأَمْكَنَ أَنْفَهُ وَجَبْهَتَهُ، وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ حَتَّى رَجَعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَأَقْبَلَ بِصَدْرِ الْيُمْنَى عَلَى قِبْلَتِهِ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى، وَكَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ.

واتە: عەباسی كوڕی سەهلەوە هاتووە، كە وتویەتی: ئەبو حومەید و ئەبو ئوسەید و سەهلی كوڕی سەعد و موحەممەدی كوڕی مەسلەمە كۆبوونەوەو باسی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم دەكرد، ئەبو حومەید وتی: من لەهەمووتان زیاتر شارەزام بە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، - هەندێ لە فەرموودەكەی گێڕایەوە - فولەیح راوی فەرموودەكە وتی: ئینجا چووە ركوعەوەو هەردوو لەپی دەستی لەسەر ئەژنۆی دانا وەك ئەوەی كە بیانگرێت، وە هەردوو دەستی لە لاتەنیشتەكانی دووردەخستەوە، پاشان دەچووە سەجدەوەو لوت و نێوچاوانی لەزەوی گیردەكرد، وە هەردوو دەستی لە لاتەنیشتەكانی دووردەخستەوە، لەپی هەردوو دەستی لە ئاستی شانەكانی دادەنا، ئینجا سەری بەرزدەكردەوە هەتا هەموو جومگەكانی دەچوونەوە جێگای خۆیان، بەو شێوەیە هەتا هەردوو سەجدەكەی ركاتی دووهەمی تەواو دەكرد، پاشان دادەنیشت و قاچی چەپی رادەخست، وە سنگی پەنجەكانی هەردوو پێی روو دەكردە قیبلەیەوە، وە لەپی دەستی راستی دادەنا لەسەر رانی راستی، وە لەپی دەستی چەپیشی دادەنا لەسەر رانی چەپی، وە پەنجەی شایەتومانی دەجولاند.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ، عُتْبَةُ بْنُ أَبِى حَكِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عِيسَى، عَنْ الْعَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ، لَمْ يَذْكُرِ التَّوَرُّكَ، وَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ فُلَيْحٍ، وَذَكَرَ الْحَسَنُ بْنُ الْحُرِّ نَحْوَ جِلْسَةِ حَدِيثِ فُلَيْحٍ وَعُتْبَةَ.

ئەبو داود دەڵێت: عوتبەی کوڕی ئەبو حەکیم، لە (عبداللە)ی کوڕی عیساوە، ئەویش لە عەباسی کوڕی سەهلەوە، ئەم فەرموودەی ریوایەت کردووە، بەڵام باسی تەوەروکی نەکرد، وەك فولەیح فەرموودەکەی گێڕایەوە، حەسەنی کوڕی حوڕیش وەك فولەیح و عوتبە فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٧٣٥ - (ضعيف) عَنْ الْعَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ، عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: وَإِذَا سَجَدَ فَرَّجَ بَيْنَ فَخِذَيْهِ غَيْرَ حَامِلٍ بَطْنَهُ عَلَى شَيْءٍ مِنْ فَخِذَيْه.

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی ساعدی، لە ئەبو حومەیدەوە، ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە دەچووە سەجدەوە هەردوو رانی دەکردنەوەو سکی لەسەر هیچ شوێنێکی رانی دانەدەنا.

٧٣٦ - (ضعيف وإنما يصح منه «وَضَعَ جَبْهَتَهُ بَيْنَ كَفَّيْهِ») عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فِي هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: فَلَمَّا سَجَدَ وَقَعَتَا

رُكْبَتَاهُ إِلَى الأَرْضِ قَبْلَ أَنْ تَقَعَ كَفَّاهُ، قَالَ: فَلَمَّا سَجَدَ وَضَعَ جَبْهَتَهُ بَيْنَ كَفَّيْهِ، وَجَافَى عَنْ إِبْطَيْهِ.

واته: له (عَبْدِ الْجَبَّار)ی کوڕی وائلەوە، لەباوکیەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: کاتێ کە سەجدەی دەبرد ئەژنۆکانی لەپێش لەپی دەستەکانیەوە دەخستە سەر زەوی، وائیل وتی: کاتێ کە سەجدەی دەبرد نێوچاوانی دەخستە نێوان لەپی هەردوو دەستی و، باسکەکانی دووردەخستەوە لەبن باڵەکانی.

قَالَ حَجَّاجٌ: ﴿وَ﴾قَالَ هَمَّامٌ: وَحَدَّثَنَا شَقِيقٌ، حَدَّثَنِي عَاصِمُ بْنُ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمِثْلِ هَذَا وَفِي حَدِيثِ أَحَدِهِمَا - وَأَكْبَرُ عِلْمِي أَنَّهُ حَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَادَةَ - وَإِذَا نَهَضَ نَهَضَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ وَاعْتَمَدَ عَلَى فَخِذَيْهِ.

واته: حەججاج دەڵێت: وە هەممام وتی: وە شەقیق بۆی گێڕامەوە، (عَاصِم) کوڕی کولەیب، ئەویش لەباوکیەوە بۆی گێڕامەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، وەك فەرموودەکەی وائیلی گێڕایەوە، لە فەرموودەکەی یەکێکیاندا –موحەممەدی کوڕی جەحادە و شەقیق – بێگومان ئەوەندەی من زانیاریم هەبێت ئەمە وتەی موحەممەدی کوڕی جەحادەیە - کاتێ کە هەڵئەسایەوە لەسەر ئەژنۆکانی هەڵئەسایەوەو پشتی بە رانەکانی دەبەست. واتە هێزی دەدایە سەر ڕانەکانی.

٧٣٧ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْفَعُ إِبْهَامَيْهِ فِي الصَّلَاةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە (عَبْدِ الْجَبَّار)ی کوڕی وائلەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خودام صلی الله علیه وسلم بینوە پەنجە گەورەی هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە هەتا ئاستی نەرمایی گوێچکەکانی.

٧٣٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَبَّرَ لِلصَّلَاةِ جَعَلَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ لِلسُّجُودِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (الله اكبر)ی دەکرد بۆ نوێژکردن واتە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزکردەوە تا بەرامبەر شانەکانی، کە دەچووە رکوعەو بە هەمان شێوەی دەکرد، وە کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع و دەیویست بچێتە سەجدەوە بە هەمان شێوەی دەکرد، وە کاتێ کە لەدووهەم رکات هەڵئەسایەوە هەر بە هەمان شێوەی دەکرد.

٧٣٩ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونٍ الْمَكِّيِّ، أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ - وَصَلَّى بِهِمْ - يُشِيرُ بِكَفَّيْهِ حِينَ يَقُومُ، وَحِينَ يَرْكَعُ، وَحِينَ يَسْجُدُ، وَحِينَ يَنْهَضُ لِلْقِيَامِ، فَيَقُومُ فَيُشِيرُ بِيَدَيْهِ، فَانْطَلَقْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: إِنِّي رَأَيْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ صَلَّى صَلاَةً لَمْ أَرَ أَحَدًا يُصَلِّيهَا! فَوَصَفْتُ لَهُ هَذِهِ الإِشَارَةَ، فَقَالَ: إِنْ أَحْبَبْتَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاقْتَدِ بِصَلاَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ.

واته: له (مَيْمُونٍ الْمَكِّيِّ)ەوه هاتووه، كه (عبدالله)ی كوڕی زوبێـری بینیـوه - بەرنوێـژی بـۆ دەكـردن – هـەردوو دەسـتی بـەرزكردەوه كـاتێ كـه نوێـژی دادەبەست، وه كاتێ كه دەچووه ركوعـەوه، وه كـاتێ كـه دەچـووه سـەجدەوه، وه كـاتێ كـه لـه سـەجده هەڵئەسـايەوه بـۆ ركـاتێكی تـر، هەڵئەسـايەوەو هـەردوو دەستی بەرزكردەوه، منیش چووم بۆ لای ئیبنـو عـەباس رەزای خوایـان لـێ بـێ پێم وت: (عبدالله)ی كوڕی زوبێرم بینی بەو شێوەیه نوێژی دەكرد هەتا ئێستا كەسم نـەدیوه بـەو شـێوەیه نوێـژی كردبێـت! باسـی چۆنیەتی بەرزكردنـەوەی هەردوو دەستیم بـۆ كـرد لـەو شـوێنانەدا، ئیبنـو عەباسـیش وتـی: ئەگـەر حـەز دەكەیت چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم ببینـی شـوێن نوێژكردنی (عبدالله)ی كوڕی زوبێر بكەوه.

٧٤٠ - (صحيح) عَنْ النَّضْرُ بْنُ كَثِيرٍ - يَعْنِـى السَّـعْدِىَّ - ، قَـالَ: صَلَّى إِلَى جَنْبِى عَبْدُ اللَّـهِ بْـنُ طَـاوُسٍ فِـى مَسْـجِدِ الْخَيْفِ، فَكَانَ إِذَا سَجَدَ السَّجْدَةَ الأُولَى فَرَفَـعَ رَأْسَـهُ مِنْهَا رَفَعَ يَدَيْهِ تِلْقَـاءَ وَجْهِـهِ، فَـأَنْكَرْتُ ذَلِـكَ فَقُلْـتُ لِوُهَيْبِ بْنِ خَالِدٍ، فَقَالَ: لَهُ وُهَيْبُ بْـنُ خَالِـدٍ: تَصْـنَعُ شَيْئًا لَمْ أَرَ أَحَدًا يَصْنَعُهُ؟ فَقَالَ: ابْـنُ طَـاوُسٍ: رَأَيْـتُ أَبِى يَصْنَعُهُ، وَقَالَ: أَبِى: رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَصْنَعُهُ، وَلاَ أَعْلَمُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَصْنَعُهُ.

واتە: لە (نَضْر)ی کوڕی (كَثِير)ەوە - واتە سەعدی - هاتووە، کە (عبداللە)ی کوڕی (طَاوُس) — ی کوڕی (کیسان الیماني) - لە مزگەوتی (خَيْف) — واتە لە مونا - لە تەنیشت منەوە نوێژی دەکرد، لە سەجدەی یەکەمدا کاتێ کە سەری بەرزکردەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی دەم و چاوی، منیش ئینکاری ئەو کارەم کردو بۆ وهەیبی کوڕی خالیدی - (باهلي) - م گێڕایەوە، وهەیب وتی: کارێکی وەهای کردووە هەتا ئێستا کەسم - لە زانایان - نەدیوە کاری لەو شێوەیە بکات؟ (ابْنُ طَاوُس) وتی: باوکمم دیوە ئەو کارەی کردووە، وە باوکیشم وتی: ئیبنو عەباسم دیوە ئەو کارەی کردووە، پێ نازانم ئیللا ئەوە نەبێت کە وتی: بێگومان پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم ئەو کارەی کردووە.

٧٤١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَيَرْفَعُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الصَّحِيحُ قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ، وَلَيْسَ بِمَرْفُوعٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كاتێ كە دەچووە ناو نوێژەوە (الله اكبر)ی دەكردو هەردوو دەستی بەرزكردەوە، وە كاتێ كە دەچووە ركوعەوە، هەروەها كاتێك كە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). وە كاتێ كە لە دووهەم ركات هەڵئەسایەوە هەردوو دەستی بەرزكردەوە — واتە لەدوای خوێندنی تەحیاتی یەكەم - ، سەنەدی فەرموودەكەشی بەرزكردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم. ئەبو داود دەڵێت: راستە ئەمە وتەی ئیبنو عومەرە، بەلاّم (مَرْفُوع) نیە - واتە سەنەدی فەرموودەكەی نەگەیاندۆتەوە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى بَقِيَّةُ أَوَّلَهُ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَأَسْنَدَهُ، وَرَوَاهُ الثَّقَفِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَوْقَفَهُ عَلَى ابْنِ عُمَرَ، وَقَالَ فِيهِ: وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ يَرْفَعُهُمَا إِلَى ثَدْيَيْهِ، وَهَذَا هُوَ الصَّحِيحُ.

ئەبو داود دەڵێت: بەشی یەكەمی فەرموودەكەی لە (عُبَيْد اللّه)ەوە گێڕاوەتەوەو بەرزیكردۆتەوە هەتا گەیاندویەتیەوە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وە (ثَّقَفِيّ) لە (عُبَيْد اللّه)ەوە ریوایەتی كردووە، بەلاّم لەسەر

ئیبنو عومەر رایوەستاند، (ثَّقَفِيّ) لە فەرموودەکەیدا وتی: کاتێ کە لە دووهەم رکات هەڵئەسایەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی مەمکەکانی، وە ئەمەش راست و دروستە.

قال أَبو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ اللَّيْـثُ بْـنُ سَـعْدٍ وَمَالِـكٌ وَأَيُّـوبُ وَابْـنُ جُـرَيْجٍ مَوْقُوفًا، وَأَسْنَدَهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَحْدَهُ عَنْ أَيُّوبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَيُّوبُ وَمَالِكٌ الرَّفْـعَ إِذَا قَـامَ مِـنَ السَّـجْدَتَيْنِ، وَذَكَرَهُ اللَّيْثُ فِي حَدِيثِهِ، قَالَ ابْـنُ جُـرَيْجٍ فِيـهِ: قُلْـتُ لِنَافِعٍ: أَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَجْعَلُ الأُولَى أَرْفَعَهُنَّ؟ قَـالَ: لاَ سَوَاءً. قُلْتُ: أَشِرْ لِي. فَأَشَارَ إِلَـى الثَّـدْيَيْنِ أَوْ أَسْـفَلَ مِنْ ذَلِكَ.

ئەبو داود دەڵێت: واتە: (لِّيْـث)ی کوڕی سەعد و مالیك و ئەیوب و ئیبنو جورەیج بە (موقـوف)ی گێڕاویانەتەوە واتە سەنەدی فەرموودەکەیان نەگەیاندۆتەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بەڵام تەنیا حەممادی کوڕی سەلەمە لە ئەیوبەوە سەنەدی فەرموودەکەی گەیاندۆتەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، وە ئەیوب و مالیك باسی دەست بەرزکردنەوەی کاتی هەستانەوە لە رکاتی دووهەمیان نەکرد، وە (لِّيْـث) لە فەرموودەکەیدا باسی کردووە، ئیبنو جورەیج لە فەرموودەکەیدا وتویەتی: وتم بە نافع: ئایا ئیبنو عومەر دەست بەرزکردنەوەی کاتی دابەستنی نوێژی بەرزتر بوو لە باقی دەست بەرزکردنەوەکانی تری؟ وتی: نەخێر هەموویان وەك یەك بوون. وتم: دەی نیشانم بدە، ئەویش دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی مەمکەکانی یان خوارتر.

٧٤٢ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، كَانَ إِذَا ابْتَدَأَ الصَّلاَةَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا دُونَ ذَلِكَ.

واتە: لە نافعەوە هاتووە، کاتێ کە (عبداللە)ی کوڕی عومەر دەستی دەکرد بە نوێژکردن هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی، وە کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوە رکوع لە ئاست شانەکانی خوارتر بەرزی دەکردەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَذْكُرْ « رَفَعَهُمَا دُونَ ذَلِكَ » أَحَدٌ غَيْرَ مَالِكٍ فِيمَا أَعْلَمُ.

ئەبو داود دەڵێت: (بەرزکردنەوەی خوارتر لە ئاست شانەکانی) جگە لە مالیك کەسی تر باسی نەکردووە ئەوەندەی کە من بیزانم.

## باسی ئەوەی کە دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم لەدوای دووهەم رکاتەوە هەڵئەسایەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوە.

## ١١٨ – بَابُ من ذكر أنه يرفع يديه إذا قام من الثنتين.

٧٤٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەدوای دووهەم ڕکاتەوە هەڵئەسایەوە (الله اکبر)ی دەکردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە – واتە لەدوای خوێندنی تەحیاتی یەکەم.

٧٤٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَيَصْنَعُ مِثْلَ ذَلِكَ إِذَا قَضَى قِرَاءَتَهُ وَأَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَيَصْنَعُهُ إِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَتِهِ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ كَذَلِكَ وَكَبَّرَ.

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کاتێ کە هەڵئەسا بۆ ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان (الله اکبر)ی دەکردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی، وە بە هەمان شێوەی دەکرد کاتێ کە لە قورئان خوێندن دەبۆوەو دەیویست بچێتە ڕکوعەوە، هەروەها بە هەمان شێوەی دەکرد کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوەو لە ڕکوع، لە هیچ شوێنێکی دانیشتنی نوێژدا دەستی بەرزنەدەکردەوە، وە کاتێ کە لەدوای دوو سەجدەکەوە هەڵئەسایەوە هەردوو دەستی بەرزکردەوەو (الله اکبر)ی دەکرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: فِي حَدِيثِ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ حِينَ وَصَفَ صَلاَةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، كَمَا كَبَّرَ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە فەرموودەكەی ئەبو حومەیدی ساعدی لەكاتێكدا كە باسی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەكات هاتووە، لەدوای تەحیاتی یەكەمەوە هەڵئەسایەوە (الله اكبر)ی دەكردو هەردوو دەستی بەرزكردەوە هەتا ئاستی شانەكانی، وەك چۆن (الله اكبر)ی دەكرد لەكاتی نوێژدابەستندا.

٧٤٥ - (صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا كَبَّرَ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، حَتَّى يَبْلُغَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ.

واتە: لە مالیكی كوڕی (حُوَيْرِث)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینی لەكاتی نوێژدابەستندا هەردوو دەستی بەرزكردەوە، وە كاتێ كە دەچووە ركوعەوە، وە كاتێ كە سەری بەرزدەكردەوە لە ركوع، هەتا دەگەیشتنە ئاستی سەروی گوێكانی.

٧٤٦ - (صحيح) عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَوْ كُنْتُ قُدَّامَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَرَأَيْتُ إِبْطَيْهِ. زَادَ ابْنُ مُعَاذٍ، قَالَ: يَقُولُ لاَحِقٌ: أَلاَ تَرَى أَنَّهُ فِي الصَّلاَةِ

﴿وَ﴾ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَكُونَ قُدَّامَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ وَزَادَ مُوسَى: يَعْنِي إِذَا كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيْهِ.

واتە: لە بەشیری کوڕی نەهیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو هورەیرە وتی: ئەگەر من لەپێش پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بوومایە کاتێ کە دەستی بەرزدەکردەوە بن باڵەکانیم دەبینی، (ابْنُ مُعَاذ) ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: لاحیق وتی: ئەی ئایا نابینی کە ئەبو هورەیرە لە نوێژدا بووە دەی ئیتر چۆن دەتوانێت لەپێش پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بێت - لەکاتێکدا کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێشنوێژ بێت و ئەبو هورەیرەش لەدوایەوە نوێژ بکات[١] - موساش ئەمەی بۆ زیاد کرد: واتە کاتێ کە(الله اکبر)ی دەکرد دەستی بەرزکردەوە.

٧٤٧ - (صحيح) عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ، فَكَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا رَكَعَ طَبَّقَ يَدَيْهِ بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ سَعْدًا فَقَالَ: صَدَقَ أَخِي، قَدْ كُنَّا نَفْعَلُ هَذَا، ثُمَّ أُمِرْنَا بِهَذَا، يَعْنِي الإِمْسَاكَ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ.

واتە: لە عەلقەمەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عبداللە)ی - کوڕی مەسعود - وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی فێردەکردین، (الله اکبر)ی

---

[١] (عبدالمحسن عباد) لە (شرح سنن أبی داود)دا دەڵێ: پێدەچێت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی سوننەتی کردبێت.

کـردو هـەردوو دەسـتی بـەرزکردەوە، کـاتێ کـە چـووە رکوعـەوە پەنجـەکانی هـەردوو دەسـتی کۆکردەوەو کردنـی بـە نێـوان هـەردوو ئەژنۆیـدا، وتـی: ئـەو هەواڵە گەیشتەوە بە سـەعد - ی کوڕی (أبـی وقـاص) - ئـەویش وتـی: براکـەم - واتـە (عبداللـە)ی کوڕی مەسعود - راسـت دەکـات، بێگومـان ئێمـەش ئاوەهامـان دەکـرد، پاشـان بەمـە فـەرمانمان پێکـرا، واتـە بـە دانـانی هـەردوو لـەپی دەسـت لەسەر هەردوو ئەژنۆ.

## باسی ئەوانەی کە باسی بەرزکردنەوەیان نەکردووە لەکاتی بەرزبونەوە لەڕکوع.

## ١١٩ – بَابُ مَنْ لَمْ يَذْكُرِ الرَّفْعَ عِنْدَ الرُّكُوعِ.

٧٤٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، قَـالَ: أَلاَ أُصَـلِّي بِكُـمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: فَصَـلَّى، فَلَمْ يَرْفَعْ يَدَيْهِ إِلاَّ مَرَّةً.

واتــە: لــە (عبداللــە)ی کــوڕی مەســعودەوە هــاتووە، کــە وتویــەتی: ئایــا پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــه وســلم چــۆن نوێــژی کــردووە بــەو شــێوەیە لەبەرچاوتان بۆتانی نەکەم؟ راوی وتی: نوێژەکەی کرد، بەڵام یەك جار نـەبێت ئیتر دەستەکانی بەرزنەدەکردنەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ مُخْتَصَرٌ مِنْ حَـدِيثٍ طَوِيـلٍ، وَلَـيْسَ هُـوَ بِصَحِيحٍ عَلَى هَذَا اللَّفْظِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە کورتەیەکە لە فەرموودەیەکی درێژ، بەڵام بەم گۆیە (صحیح) نیە.

٧٥٠ - (ضعيف) عَنْ الْبَرَاءِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَى قَرِيبٍ مِنْ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ لاَ يَعُودُ.

واتە: لە (بَرَاء)ەوە هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە هەتا نزیك ئاستی گوێکانی، پاشان ئیتر جارێکی تر دەستەکانی بەرزنەدەکردنەوە.

٧٥١ - (ضعيف) عَنْ يَزِيدَ، نَحْوَ حَدِيثِ شَرِيكٍ، لَمْ يَقُلْ: ثُمَّ لاَ يَعُودُ. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ لَنَا بِالْكُوفَةِ بَعْدُ، ثُمَّ لاَ يَعُودُ.

واتە: لە یەزیدەوە، وەك فەرموودەکەی شەریك هاتووە، بەڵام یەزید نەیوت: پاشان ئیتر جارێکی تر دەستەکانی بەرزنەدەکردنەوە. سوفیان وتی: دوای ئەوە لەکوفە پێی وتین: پاشان ئیتر جارێکی تر بەرزینەدەکردنەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ﴿وَ﴾ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ هُشَيْمٌ وَخَالِدٌ وَابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ يَزِيدَ لَمْ يَذْكُرُوا: ثُمَّ لاَ يَعُودُ.

ئەبو داود دەڵێت: هوشەیم و خالید و ئیبنو ئیدریس، ئەم فەرموودەیان لە یەزیدەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی: پاشان ئیتر جارێکی تر بەرزینەدەکردنەوەیان نەکرد.

٧٥٢ - (ضعيف) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ لَمْ يَرْفَعْهُمَا حَتَّى انْصَرَفَ.

واته: لە (بَراء)ی کوڕی عازبەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی کاتێ کە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە، پاشان جارێکی تر بەرزینەدەکردنەوە هەتا لەنوێژ دەبووەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِصَحِيحٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمووده (صحيح) نيه.

٧٥٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا.

واته: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بینی کاتێ کە نوێژی دادەبەست هەردوو دەستی بەرزدەکردنەوە بە درێژی.

## باسی دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەنوێژدا.

## ١٢٠ – بَابُ وَضْعِ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى فِي الصَّلاَةِ.

٧٥٤ - (ضعيف) عَنْ زُرْعَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: صَفُّ الْقَدَمَيْنِ، وَوَضْعُ الْيَدِ عَلَى الْيَدِ: مِنَ السُّنَّةِ.

واتە: لە زورعەی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە ئیبنو زوبەیرم بیستووە دەیوت: دانانی پێکان لەئاستی یەکتر بە ڕێکی، وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەنوێژدا: لەسوننەتی پێغەمبەری خودایە صلی الله علیه وسلم.

٧٥٥ - (حسن) عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى الْيُمْنَى، فَرَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی مەسعودەوە هاتووە، کە جارێ نوێژی دەکرد دەستی چەپی لەسەر دەستی ڕاستی دانابوو، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینی بەو شێوەویە دەستی ڕاستی (عبدالله)ی لەسەر دەستی چەپی دانا.

٧٥٦ - (ضعيف) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ: أَنَّ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: السُّنَّةُ وَضْعُ الْكَفِّ عَلَى الْكَفِّ فِي الصَّلاَةِ تَحْتَ السُّرَّةِ.

واتە: لە ئەبو جوحەیفەوە هاتووە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتویەتی: سونەتە لەنوێژدا دەستی راست لەسەر دەستی چەپ لەخوار ناوکەوە دابنرێت.

٧٥٧ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ جَرِيرٍ الضَّبِّيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يُمْسِكُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ عَلَى الرُّسْغِ فَوْقَ السُّرَّةِ.

واتە: لە ئیبنو جەریری (ضَبِّیّ)ەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلیم رەزای خوای لێ بێ بینی بە دەستی راستی مەچەکی دەستی چەپی گرت و لەسەروی ناوکیەوە داینان.

٧٥٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَخْذُ الأَكُفِّ عَلَى الأَكُفِّ فِي الصَّلاَةِ تَحْتَ السُّرَّةِ.

واتە: لە ئەبو وائلەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو هورەیرە وتی: لەنوێژدا سونەتە بە دەستی راست دەستی چەپ بگیرێت و لەخوار ناوکەوە دابنرێت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ يُضَعِّفُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ إِسْحَاقَ الْكُوفِيَّ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەلم بیستووە لاواز(ضعیف)ی فەرموودەكەی دایە پاڵ (عَبْدَ الرَّحْمَنِ)ی كوڕی ئیسحاقی كوفی كە یەكێكە لە راویەكانی فەرموودەكە.

٧٥٩ - (صحيح) عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَضَعُ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ يَشُدُّ بِهِمَا عَلَى صَدْرِهِ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ.

واتە: لە (طَاوُس)ەوە هاتووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژدا دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دادەناو، لەسەر سنگی دەیگرتن.

## باسی پاڕانەوەی سەرەتای نوێژ.

## ١٢١ - بَابُ مَا يُسْتَفْتَحُ بِهِ الصَّلاَةُ مِنَ الدُّعَاءِ.

٧٦٠ - (صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِى طَالِبٍ رَضِىَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ كَبَّرَ، ثُمَّ قَالَ: « وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِى فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ ﴿لِى﴾ إِلاَّ أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّى وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِى وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِى، فَاغْفِرْ لِى ذُنُوبِى جَمِيعًا، ﴿إِنَّهُ﴾ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، وَاهْدِنِى لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ، لاَ يَهْدِى لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّى سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِى يَدَيْكَ، ﴿وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ﴾، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ ». وَإِذَا رَكَعَ، قَالَ: « اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِى وَبَصَرِى

وَمُخِّي وَعِظَامِي وَعَصَبِي ». وَإِذَا رَفَعَ، قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ ». وَإِذَا سَجَدَ، قَالَ: « اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، فَأَحْسَنَ صُورَتَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، وَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ». وَإِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ، قَالَ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ، وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَالْمُؤَخِّرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ».

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەڵئەسا بۆ نوێژ (الله اكبر)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: (ڕوودەکەمە ئەو خودایە کە ئەم ئاسمانانەو زەوی دروستکردووە، من موسڵمانێکی پاك و بێ خەوشم و بە هیچ شێوەیە لە هاوبەش پەیداکەران نیم، بێگومان نوێژ و ئادابەکانی حەج و خواپەرستیم و ژیان و مردنم هەمووی هەر بۆ خوایە، کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، کە هیچ هاوبەش و هاوڕێیەکی بۆ نیە، وە بەمە فەرمانم پێکراوە، من یەکێکم لە موسڵمانان و یەکێکم لە فەرمانبەرانی خوا، خودایە تۆ پادشایت هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لەتۆ، تۆ پەروەردگارمی و منیش بەندەی تۆم، ستەمم لە نەفسم کردووەو دان دەنێم بە گوناهمدا سا خودایە لەهەموو

گوناهەکانم خۆشبە، بەڕاستی جگە لەتۆ کەس لەگوناه خۆش نابێت، هیدایـەتم بدە بۆ چاکترین ڕەوشت، کـەس هیدایـەت نـادات بـۆ چـاکترین ڕەوشـت و ئاکار جگـە لـەتۆ، کـردەوەی خـراپم لـێ دووربخـەرەوە کـەس کـردەوەی خـراپم لـێ دوورناخاتەوە جگە لەتۆ، خودایە (لَبَّيْـكَ) وەڵامـی دوای وەڵامـم هەیـە بـۆت لـە گوێڕایەڵیتداو (وَسَعْدَيْكَ) واتە: شوێنکەوتەی دوای شـوێنکەوتەم بـۆ دینەکـەت، چاکە هەمووی بەدەستی تۆیـەو خراپـەش نادەمـە پـاڵ تـۆ، مـن بـەتۆوە هـەم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، پاکی و بێگەردی و بڵندی بـۆ تۆیـە، داوای لێخۆشـبوونت لـێ دەکـەم و دەگەڕێمـەوە بـۆلات). کـاتێ کـە دەچـووە ڕکوعـەوە دەیفـەرموو: (خودایە! سەری بەندەیی بۆ تۆ دادەنەوێنم و ئەم ڕکوعەم لەبەر خاتری تۆیـە، وە خـۆم سپارد بـە تـۆ، خودایـە! گوێم، چاوم، مـۆخم، ئێسکم، ڕەگ و ڕیشـەم هـەموو سـەرکزو ملکەچـن بـۆ فـەرمانی تـۆ). کـاتێ کـە سـەری بـەرزدەکردەوە لەڕکوع دەیفەرموو: (خـوای گـەورە بیسـەری سوپاسگوزاری ئەوانەیـە سوپاسـی دەکەن، پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ، پڕ بە ئاسمانەکان و زەوی، پڕ بـە نێوانی ئەم دووانە، سەرەڕای ئەمانەیش پڕ بە هەر شتێکی تر کـە حـەزی تـۆی لەسەر بێت). وە کاتێ کە دەچووە سەجدەوە دەیفـەرموو: (خودایـە! سـەجدەم بۆ تۆ بردو، باوەڕم بە تۆ هێناو تەسلیمی تۆ بووم، ڕووم سەجدەی برد بـۆ ئـەو خوایەی کە بەدیهێناوەو وێنەی کێشاوەو بیستن و بینینی بۆ داڕشـتووە، گـەورە و پـیرۆزە ئـەو خوایـەی کـە چـاکترینی بەدیهێنەرانـە). وە کـاتێ کـە سـەلامی دەدایەوە لەنوێژ دەیفەرموو: (ئەی خودایە! لێم خۆشبە، لە گوناهی بەرو دوام، لـە گونـاهی ئاشـکراو نهێنـیم، لـەو تاوانانـەی کـە لـەخۆمم کـردووە، لـەو گوناهانەیش کە تۆ لەمن باشتر دەیـانزانی، پەروەردگارا! پێش خسـتن و پـاش خستن بەدەستی تۆیە، خودایەکی تر نیە بە حەق جگە لەتۆ).

٧٦١ - (حسن صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَيَصْنَعُ مِثْلَ ذَلِكَ إِذَا قَضَى قِرَاءَتَهُ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَيَصْنَعُهُ إِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَتِهِ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ كَذَلِكَ وَكَبَّرَ وَدَعَا.

واته: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە هەڵئەسا بۆ ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان (الله اكبر)ی دەکردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی، وە بە هەمان شێوەی دەکرد کاتێ کە لە قورئان خوێندن دەبۆوەو دەیویست بچێتە ڕکوعەوە، وە بە هەمان شێوەی دەکرد کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوەو لە ڕکوع، لە هیچ شوێنێکی دانیشتنی نوێژدا دەستی بەرزنەدەکردەوە، وە کاتێ کە لەدوای دوو سەجدەکەوە هەڵئەسایەوە هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە هەروەها (الله اكبر)ی دەکرد جا دەپاڕایەوە.

نَحْوَ حَدِيثِ عَبْدِ الْعَزِيزِ فِي الدُّعَاءِ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ الشَّيْءَ، وَلَمْ يَذْكُرْ « وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ ». وَزَادَ فِيهِ: وَيَقُولُ عِنْدَ انْصِرَافِهِ مِنَ الصَّلاَةِ « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَ﴿مَا﴾ أَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ».

واتە: وەك ئەو پاڕانەوەیەی كە لە فەرموودەكەی پێشوودا هاتووە كە (عَبْدِ الْعَزِيزِ) ریوایەتی كردووە، بەڵام شتێكی لێ زیاد و كەم كرد، وە باسی: « وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ »ی نەكرد، ئەمەشی بۆ زیاد كرد تێیدا، وە كاتێ كە سەلامی دەدایەوە لەنوێژ فەرمووی: (ئەی خودایە! لێم خۆشبە، لە گوناهی بەرو دوام، وە لە گوناهی ئاشكراو نهێنیم، تۆ خودای منی، هیچ خودایەك نیە بە حەق جگە لەتۆ).

٧٦٢ - (صحيح مقطوع) عَنْ شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، قَالَ: قَالَ لِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ وَابْنُ أَبِي فَرْوَةَ وَغَيْرُهُمَا مِنْ فُقَهَاءِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ: فَإِذَا قُلْتَ أَنْتَ ذَاكَ فَقُلْ: «وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ». يَعْنِي قَوْلَهُ: « وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ».

واتە: لە شوعەیبەوە كوڕی ئەبو حەمزەوە، هاتووە، كە وتویەتی: موحەممەدی كوڕی مونكەدەر و ئیبنو فەروە جگە لەوانیش لە فوقاهاكانی مەدینە پێیان وتم: ئەگەر تۆ ئەوەت وت لە جیاتی: (وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ). بڵێ: (وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ).

٧٦٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى الصَّلاَةِ وَقَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَتَهُ، قَالَ: « أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِالْكَلِمَاتِ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَقُلْ بَأْسًا ». فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ،

جِئْتُ وَقَدْ حَفَزَنِي النَّفَسُ، فَقُلْتُهَا، فَقَالَ: «لَقَدْ رَأَيْتُ اثْنَيْ عَشَرَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَرْفَعُهَا». وَزَادَ حُمَيْدٌ فِيهِ: «وَإِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ فَلْيَمْشِ نَحْوَ مَا كَانَ يَمْشِي، فَلْيُصَلِّ مَا أَدْرَكَهُ، وَلْيَقْضِ مَا سَبَقَهُ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، دەڵێت: جارێ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژمان دەکرد پیاوێ بە هەناسەبڕکێ هات بۆ نوێژ وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ). واتە: خوا لەهەموو شتێ گەورە ترە، سوپاس و ستایش بۆ خوا، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ. کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە فەرمووی: (کێ بوو ئەو قسانەی کرد؟ قسەیەکی خراپی نەکرد) پیاوێك وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو وتم، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دوانزە مەلائیکە پێشبڕکێیان بوو کە کامیان بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان). حومەید لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەگەر یەکێ لەئێوە هات بۆ نوێژ وەك ڕەوتی ئاسایی خۆی بڕوات و پەلەنەکات، ئەوەی پیا ڕاگەیشت لەگەڵ جەماعەت بیکات، ئەوەشی پیا ڕانەگەیشت لەدوای سەلامدانەوەی پێشنوێژ بۆ خۆی بیکات).

٧٦٤ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي صَلاَةً - قَالَ عَمْرٌو: لاَ أَدْرِي أَيَّ صَلاَةٍ هِيَ - فَقَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، ﴿وَ﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ

كَثِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً - ثَلاَثًا - أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، مِنْ نَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ، وَهَمْزِهِ ». قَالَ: نَفْثُهُ: الشِّعْرُ، وَنَفْخُهُ، الْكِبْرُ، وَهَمْزُهُ، الْمُوتَةُ.

[المشكاة: ٨١٧]، [الإرواء: ٣٤٢].

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مُطْعِم)ەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بینیوە نوێژێك لە نوێژەکانی دەکرد - عەمر وتی: نازانم کام لە نوێژەکان بوو - فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، ﴿وَ﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً). - سێ جار — واتە: خوا زۆر لەهەموو شتێ گەورە ترە، خوا زۆر لەهەموو شتێ گەورە ترە، خوا زۆر لەهەموو شتێ گەورە ترە، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوا، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوا، سوپاس و ستایشێکی زۆر بۆ خوا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا هەردەم بە بەیانیان و ئێواراندا. — سێ جار- (پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە شەیتانی نەفرین لێکراوی دوورخراو لە رەحمەتی خوا، لە هاندانی بۆ وتنی شیعری خراپ، لە فیز زلی و فشەکردنی، لە دەست لێ وەشاندنی).

٧٦٥ - (ضعيف) عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي التَّطَوُّعِ، ذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە نافعی کوڕی جوبەیرەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە لەنوێژی سوننەتدا دەیفەرموو، بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە.

٧٦٧ - (حسن) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْتَتِحُ صَلاَتَهُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ:كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَفْتَتِحُ صَلاَتَهُ « اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ أَنْتَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ».

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەچی شەونوێژی دەست پێ دەکرد؟ وتی: کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەڵئەسا بۆ شەونوێژ سەرەتا بەم پاڕانەوەیە دەستی پێ دەکرد: (خودایە! ئەی پەروەردگاری جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانا بە نهێنی و ئاشکراکان، تۆ حوکم دەکەیت لەنێوان بەندەکانتدا لەو شتەدا کە جیاوازن تیایدا. سا ڕێنمایم بکە بۆ ئەو حەقەی کە خەڵك تیایدا جیاوازن بە ئیزنی خۆت، چونکە خۆت کێت ویست ڕێنمایی دەکەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست).

٧٦٨ - (حسن) عَنْ عِكْرِمَةَ بِإِسْنَادِهِ - بِلاَ إِخْبَارٍ - وَمَعْنَاهُ، قَالَ: كَانَ إِذَا قَامَ بِاللَّيْلِ كَبَّرَ وَيَقُولُ.

واتە: لە عیکریمەوە بەهامان سەنەد و مانا هاتووە – بەبێ (أخبرني)، لە نوسخەیەکی تردا(أخبرني) هاتووە - کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەڵئەسا بۆ شەونوێژ (الله اکبر)ی دەکرد وە دەیفەرموو.

٧٦٩ - (حسن مقطوع) عَنْ مَالِكٍ، قَالَ: لاَ بَأْسَ بِالدُّعَاءِ فِي الصَّلاَةِ، فِي أَوَّلِهِ وَأَوْسَطِهِ وَفِي آخِرِهِ، فِي الْفَرِيضَةِ وَغَيْرِهَا.

واتە: لە مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پاڕانەوە لەنوێژدا خراپ نیە، ئیتر لە سەرەتاوە نوێژەوە بێت یان لەناوەڕاستەوە بێت یا لەکۆتاییەوە، لەنوێژی فەرزدا یان غەیری نوێژی فەرزدا.

٧٧٠ - (صحيح) عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ، قَالَ: كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، قَالَ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ». قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « مَنِ الْمُتَكَلِّمُ بِهَا آنِفًا ». فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَقَدْ رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلاَثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلَ».

واتە: لە ریفاعەی كوڕی رافیعی زورەقیەوە هاتووە، كە وتویەتی: جارێ ئێمە لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم نوێژمان دەكرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە سەری بەرزدەكردەوە لەركوع دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەكەن. پیاوێ لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم وتی: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ). واتە: خودایە! ئەی پەروەردگارا سوپاس و ستایش هەر شایستەی تۆیە، سوپاسێكی زۆری پاكی پیرۆزبێ. كاتێ كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەلامی دایەوە فەرمووی: (كێ بوو ئێستا ئە و وتانەی خوێند؟). پیاوێك وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بێگومان بینیم سی و ئەوەندە مەلائیكە پێشبڕكێیان بوو كە كامیان یەكەم كەس بینوسن).

٧٧١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ يَقُولُ: « اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ

حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەنیوە شەودا هەڵئەسا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: (خودایە! سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، تۆ نورو روناکی ئاسمانەکان و زەویت، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە تۆ هەڵسورێنەری ئاسمانەکان و زەویت، وە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتانەی کەتیایدان، تۆ حەقیت، وتەکەت حەقە، پەیمانەکەشت حەقە، وە گەیشتن بە تۆ حەقە، ئاگری دۆزەخ حەقە، بەهەشت حەقە، رۆژی قیامەت حەقە، خودایە من خۆم سپاردووە بە تۆ، باوەڕیشم بەتۆ هێناوە، پشتم بە تۆ بەستوە، گەڕامەتەوە بۆلای تۆ، بە پشتیوانی تۆ بەرپەرچی دوژمنانم دەدەمەوە، حوکمی کێشەی خۆم و ئەو کەسەی مل نادات بۆ حەق دێنمەوە بۆلای تۆ، سا لەو گوناهانەم خۆشبە کە پێشم خستوەو لەوانەش کەدوام خستوە، ئەوەی کە بە پەنهانی ئەنجامم داوەو ئەوەشی کەئاشکرام کردووە، هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لەتۆ).

٧٧٢ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي التَّهَجُّدِ يَقُولُ - بَعْدَ مَا يَقُولُ « اللَّهُ أَكْبَرُ » - ثُمَّ ذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واته: له ئيبنو عهباسهوه رهزای خوايان لیٚ بیٚ هاتووه، كه پیٚغهمبهری خوا صلى الله عليه وسلم له شهونوێژدا - لهدوای (اللّٰهُ أَكْبَر)هوه ئهم دوعايهی دهخوێند – پاشان بهههمان مانا فهرموودهكهی گێڕايهوه.

٧٧٣ - (حسن) عَنْ مُعَاذِ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَطَسَ رِفَاعَةُ، لَمْ يَقُلْ قُتَيْبَةُ رِفَاعَةُ، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ فَقَالَ: « مَنِ الْمُتَكَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ ». ثُمَّ ذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكٍ، وَأَتَمَّ مِنْهُ.

واته: له (مُعَاذ)ی كوڕی ريفاعهی كوڕی رافيعهوه، له باوكيهوه هاتووه، كه وتويهتی: جاریٚ ئێمه لهدوای پێغهمبهری خواوه صلى الله عليه وسلم نوێژمان دهكرد، ريفاعه پژمی، قوتهيبه نهيوت ريفاعه، وتم: (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، مُبَارَكًا عَلَيْهِ، كَمَا يُحِبُّ رَبُّنَا وَيَرْضَى). خودايه! ئهی پهروهردگارا سوپاس و ستايش ههر شايستهی تۆيه، سوپاسێكی زۆری پاكی پیرۆزبیٚ، پیرۆزبیٚ لهسهری بهو شێوهيهی كه خوای گهوره پێی خۆشهو پێی رازييه، كاتیٚ كه پێغهمبهری خوا صلى الله عليه وسلم سهلامی دايهوه فهرمووی: (كیٚ بوو لهنوێژدا ئهو قسهيهی كرد؟) پاشان بهههمان مانای فهرموودهكهی ماليكی گێڕايهوهو لهويش تهواوتر.

٧٧٤ - (ضعيف) عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، قَالَ: عَطَسَ شَابٌّ مِنَ الأَنْصَارِ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، حَتَّى يَرْضَى رَبُّنَا، وَبَعْدَ مَا يَرْضَى، مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « مَنِ الْقَائِلُ الْكَلِمَةَ؟ ». قَالَ: فَسَكَتَ الشَّابُّ، ثُمَّ قَالَ: «مَنِ الْقَائِلُ الْكَلِمَةَ فَإِنَّهُ لَمْ يَقُلْ بَأْسًا؟». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا قُلْتُهَا لَمْ أُرِدْ بِهَا إِلاَّ خَيْرًا، قَالَ: « مَا تَنَاهَتْ دُونَ عَرْشِ الرَّحْمَنِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ».

واتە: لە عامری کوڕی ڕەبیعەوە هاتووە، کە وتویەتی: لاوێك لە یاریدەدەران لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم پژمی لەکاتێکدا کە لەنوێژدا بوو، وتی: سوپاس و ستایش بۆ خوا، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ، کۆتایی نەیەت هەتا پەروەردگارمان ڕازی دەبێت و، دوای ئەوەش، لەپێناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پێی بەخشیوین لە دونیاو دوارۆژ، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە فەرمووی: (کێ بوو ئەو قسەیەی کرد؟). لاوەکە بێدەنگ بوو، پاشان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ بوو ئەو قسەیەی کرد بێگومان قسەیەکی خراپی نەکرد؟). لاوەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا تەنها مەبەستم خێر و چاکە بوو، فەرمووی: (هیچ شتێ بەرگری لێ نەکرد هەتا گەیشتە عەرشی خوای پەروەردگار). — کنایەیە بۆ وەرگیرانی کە ئەوەندە کردەوەیەکی چاکە - .

## باسی ئەوانەی پێیان وایە کە دەبێت سەرەتای نوێژ بە: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ». دەست پێ بکرێت.

## ١٢٢ - بَابُ مَنْ رَأَى الاِسْتِفْتَاحَ بِـ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ».

٧٧٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ كَبَّرَ ثُمَّ يَقُولُ: « سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ». ثُمَّ يَقُولُ: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ». - ثَلاَثًا - ثُمَّ يَقُولُ: « اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا ». - ثَلاَثًا - «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ ». ثُمَّ يَقْرَأُ.

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەڵئەسا بۆ شەونوێژ (اللّٰهُ أَكْبَر)ی دەکردو نوێژی دادەبەست، لەپاشدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ). واتە: خوایە تۆ پاك و بێگەردی سوپاس و ستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ. ئینجا دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ

إلاَّ اللَّهُ). واته: هیچ پەرستراوێكی بەهەق نیە كە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە. — سێ جار — لەپاشدا —دەیفەرموو: (اللَّـهُ أَكْبَـرُ كَـبِيرًا). سێ جـار — پـەنا دەگـرم بـە خـوای پـەروەردگار لـە شـەیتانی نـەفرین لێكـراوی دوورخراو لە ڕەحمەتی خوا، لە شێتی و فیـز زلی و هانـدانی بـۆ وتنـی شیعری خراپ. پاشان دەستی دەكرد بە خوێندن.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا الْحَدِيثُ يَقُولُونَ: هُوَ عَنْ عَلِـيِّ بْـنِ عَلِـيّ، عَـنْ الْحَسَنِ مُرْسَلاً، الْوَهَمُ مِنْ جَعْفَرٍ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرمودەناسـان دەڵێن ئـەم فـەرمووده: بـە (مرسـل)ی لـە عـەلی كـوڕی عەلیـەوە، لـە حەسـەنی (بصـری)ەوە هـاتووە، واتـە باسـی ئـەبی سـەعیدی خـودری تێـدا نـەهاتووە، (وەهم)ەكـە لـە جەعفەرەوەیـە، چـونكە حەسەنی (بصـری) فەرمودەكـەی گەیاندۆتـەوە سـەر پێغەمبـەر صلی الله علیـه وسلم.

٧٧٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّـلاَةَ، قَـالَ: « سُـبْحَانَكَ اللَّهُـمَّ وَبِحَمْـدِكَ، وَتَبَـارَكَ اسْـمُكَ، وَتَعَـالَى جَـدُّكَ، وَلاَ إِلَـهَ غَيْرُكَ».

واته: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لـێ بـێ هـاتووە، كـاتێ كـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دەسـتی دەكـرد بـە نوێـژكردن لەسـەرەتاوە دەیفـەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَـالَى جَـدُّكَ، وَلاَ إِلَـهَ غَيْـرُكَ). واتـە: خوایە تـۆ پـاك و بێگـەردی سوپاس و سـتایش شایستەی تۆیـە، نـاوت پـیرۆزەو

خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِالْمَشْهُورِ عَنْ عَبْدِ السَّلاَمِ بْنِ حَرْبٍ، لَمْ يَرْوِهِ إِلاَّ طَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ، وَقَدْ رَوَى قِصَّةَ الصَّلاَةِ عَنْ بُدَيْلٍ جَمَاعَةٌ لَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ شَيْئًا مِنْ هَذَا.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە کە لە (عَبْد السَّلاَم)ی کوڕی حەربەوە هاتووە بەناوبانگ نیە، جگە لە (طَلْق)ی کوڕی غەننام کەسی تر ریوایەتی نەکردووە، بەسەرهاتی ئەو نوێژە کۆمەڵێ لە بودەیلەوە گێڕاویانەتەوە بەڵام باسی شتی لەو شێوەیان نەکردووە.

## باسی بێدەنگ بوون و وەستانێکی کەم لەسەرەتای نوێژەوە.

## ١٢٣ - بَابُ السَّكْتَةِ عِنْدَ الافْتِتَاحِ.

٧٧٧ - (ضعيف) عَنْ الْحَسَنِ، قَالَ: قَالَ سَمُرَةُ: حَفِظْتُ سَكْتَتَيْنِ فِي الصَّلاَةِ سَكْتَةً إِذَا كَبَّرَ الإِمَامُ حَتَّى يَقْرَأَ، وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِنْ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ عِنْدَ الرُّكُوعِ، قَالَ: فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ، قَالَ: فَكَتَبُوا فِي ذَلِكَ إِلَى الْمَدِينَةِ إِلَى أُبَيٍّ فَصَدَّقَ سَمُرَةَ.

واتــە: لـە حەسـەنی - (بصــري) -ەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: سـەمورە وتــی: ئاگاداری دوو بێدەنگ بوون(سَكْتَة)م لەنوێژدا: یەکێکیان لەکاتێکدا کە پێشنوێژ (الله اکبر) دەکات و نوێـژ دادەبەسـتێت هـەتا ئەوکاتـەی کـە دەسـت دەکـات بـە خوێندنی سورەتی (فَاتِحَة)ە، ئەوی تریشیان لەکاتێکدا کە لە خوێندنی سـورەتی (فَاتِحَة)ە دەبێتەوە، وە خوێنـدنی سـورەتی پـێش چوونە رکوع، حەسـەن وتــی: عیمرانی کوڕی (حُصَيْن) قسەکەی سەمورەی نەسەلماندو ئینکاری کرد، حەسـەن وتی: لەوبارەوە نامەیان نوسی بۆ مەدینە بۆ ئوبەی - کـوڕی کـەعب - ئوبـەیش وەڵامی نامەکەی دایەوەو قسەکەی سەمورەی سەلماندو نوسی کە سەمورە راست دەکات و قسەکەی تەواوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَذَا قَالَ: حُمَيْدٌ فِي هَذَا الْحَدِيثِ وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِــنَ الْقِرَاءَةِ.

[الإرواء: ٥٠٥].

ئــەبو داود دەڵێــت: حومەیــد بــە هــەمان شــێوە لــەم فــەرموودەدا دەڵێــت: بێدەنگ بوون(سَكْتَة)یە لەکاتێکدا کە لە قورئان خوێندن دەبووەوە.

**٧٧٨ - (ضعيف) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَسْكُتُ سَكْتَتَيْنِ إِذَا اسْتَفْتَحَ، وَإِذَا فَــرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ كُلِّهَا.**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دووجار بێدەنگ دەبوو کەمێك دەوەستا: یەکێکیان لـەکاتی

دەست پێ کردنی نوێژدا، ئەوی تریشیان لەکاتێکدا کە بە تەواوی لە قورئان خوێندن دەبووەوە.

٧٧٩ - (ضعيف) عَنْ الْحَسَنِ، أَنَّ سَمُرَةَ بْنَ جُنْدُبٍ وَعِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ تَذَاكَرَا فَحَدَّثَ سَمُرَةُ بْنُ جُنْدُبٍ أَنَّهُ حَفِظَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَكْتَتَيْنِ، سَكْتَةً إِذَا كَبَّرَ، وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ)، فَحَفِظَ ذَلِكَ سَمُرَةُ، وَأَنْكَرَ عَلَيْهِ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ فَكَتَبَا فِي ذَلِكَ إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَكَانَ فِي كِتَابِهِ إِلَيْهِمَا، أَوْ فِي رَدِّهِ عَلَيْهِمَا أَنَّ سَمُرَةَ قَدْ حَفِظَ.

[الإرواء: ٨١٨].

واتە: لە حەسەنەوە هاتووە، کە سەمورەی کوڕی جوندوب و عیمرانی کوڕی (حُصَيْن) سەبارەت بە باسی بێدەنگ بوون و کەمێك وەستان (سَكْتَة) گفتوگۆیان دەکرد، سەمورەی کوڕی جوندوب گێڕایەوە کە ئاگاداری دوو (سَكْتَة)یە لەنوێژدا لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم لەبەری کردوون: یەکێکیان لەکاتی (الله اکبر)ی نوێژ دادەبەستندا، ئەوی تریشیان لەکاتێکدا کە لە خوێندنی (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ). دەبووەوە. سەمورە ئەمەی لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم لەبەرکردووە، عیمرانی کوڕی (حُصَيْن) قسەکەی سەمورەی نەسەلماندو ئینکاری کرد، حەسەن وتی: لەوبارەوە نامەیان نوسی بۆ ئوبەی کوڕی کەعب، ئوبەیش لە وەڵامی نامەکەیاندا نوسی کە

سەموره لەبەری کردووەو قسەکەی تەواوە.

٧٨٠ - (ضعيف) عَنْ سَمُرَةَ، قَالَ: سَكْتَتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ فِيهِ: قَالَ سَعِيدٌ: قُلْنَا لِقَتَادَةَ مَا هَاتَانِ السَّكْتَتَانِ؟ قَالَ: إِذَا دَخَلَ فِي صَلاَتِهِ، وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ، ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: وَإِذَا قَالَ: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ).

واته: لە سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئاگاداری دوو (سَكْتَة)م لەنوێژدا کە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم لەبەرم کردووە، لە فەرمودەکەیدا وتی: سەعید وتی: وتمان بە قەتادە ئەو دوو (سَكْتَة)یە کامانەن؟ وتی: کاتێ کە نوێژی دادەبەست، کاتێکیش کە لە قورئان خوێندن دەبووەوە، لە پاشاندا وتی: کاتێ کە دەیفەرموو: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ).

٧٨١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلاَةِ سَكَتَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ فَقُلْتُ لَهُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَرَأَيْتَ سُكُوتَكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، أَخْبِرْنِي مَا تَقُولُ؟ قَالَ: « اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَاىَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ أَنْقِنِي مِنْ خَطَايَاىَ كَالثَّوْبِ الأَبْيَضِ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای نوێژ دابەستن و پێش خوێندنی سورەتی فاتیحەوە ماوەیەکی کەم بێدەنگ دەبوو منیش پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دایك و باوکم بە قوربانت بن ئەو ماوەیە دەوەستیت لە نێوان نوێژ دابەستن و خوێندنی سورەتی فاتیحەدا چییە و پێم بڵێ چی تێدا دەفەرمویت؟ ئەویش فەرمووی: دەڵێم: (خوایە نێوان من و تاوانەکانم ئەوەندەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا دوور بخەرەوە، خوایە لە تاوانەکانم پاکم بکەرەوە وەك چۆن جل و بەرگی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەبێتەوە، خوایە تاوانەکانم بشۆرەوە بەئاوو بەفرو باران).

## باسی ئەوانەی کە پێیان وا نیە: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). بەدەنگی بەرز بخوێنرێت لە نوێژە ئاشکراکاندا.

## ١٢٤ - بَابُ مَنْ لَمْ يَرَ الْجَهْرَ بِـ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ).

**٧٨٢ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).**

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم و ئەبو بەکر و، عومەر و، عوسمان، هەر هەموویان سەرەتا قورئان خوێندنیان بە: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ). دەست پێ دەکرد.

٧٨٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْتَتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالْقِرَاءَةَ بِـ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)، وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا، وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ: «التَّحِيَّاتُ». وَكَانَ إِذَا جَلَسَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عَقِبِ الشَّيْطَانِ، وَعَنْ فِرْشَةِ السَّبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاَةَ بِالتَّسْلِيمِ.

واتە: لە خاتوو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەرەتا نوێژی بە (الله أكبر) دەست پێ دەكرد، وە قورئان خوێندنیشی بە: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ). كاتێ كە دەچووە ركوعەوە نە سەری بەرزدەكردەوە نە سەریشی نزم دەكردەوە، بەڵكو لەنێوان هەردووكیاندا، هەركاتێ سەری لە ركوع بەرز بكردایەتەوە نەئەچوو بۆ سەجدە، هەتا بە تەواوی راست نەوەستایە، هەركاتێ سەری لە سەجدە بەرز بكردایەتەوە نەئەچوو بۆ سەجدەی دووهەم، هەتا بە چاكی دانەنیشتایە، وە لەپاش هەموو دوو ركاتێ تەحیاتی دەخوێند، وە لەو كاتەدا پێی چەپی رادەخست و پێی راستی دەچەقاند بە زەویدا، دانیشتنی شەیتانی

قەدەغەکردووە - واتە نە (تورك) بکات وە نە (ئیفتراش) بەم شێوەیە کە هەردوو سمتی بخاتە سەر هەردوو پاژنە پێکانی و دانیشێ لەسەریان — بەرگری کردووە لەوەی کە مرۆڤ - لەکاتی سەجدەدا — دەستی راکێشێت وەکو دەست راکێشانی دڕندەکان، وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە سەلامدانەوە کۆتایی بەنوێژەکەی دەهێنا.

**٧٨٤ - (حسن) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ ». فَقَرَأَ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: « فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي فِي الْجَنَّةِ».**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بەم نزیکانە ئەم سورەتەم بۆ دابەزی). دەستی کرد بە خوێندنی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ... هەتا کۆتایی سورەتەکە). فەرمووی: (ئایا دەزانن (کَوثَر) چییە؟). وتیان خواو پێغەمبەرەکەی دەیزانن، فەرمووی: (بێگومان (کَوثَر) دەریایەکە لە بەهەشتدا خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم کە بۆ من بێت).

٧٨٥ - (ضعيف) عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها - وَذَكَرَ الإفْكَ -، قَالَتْ: جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ وَقَالَ: « أَعُوذُ بِالسَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾ ». الآيَةَ.

واتە: لە عوروەوە، لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، - عوروە باسی روداوی (الإِفْـك)ی دەكرد ئەو بوختانەی كە بۆ خاتوو عائیشەی دایكی باوەڕدارانیان هەڵبەست - عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوو، پەردە لەسەر دەم و چاوی لابرا - دوای ئەوەی كە وەحی بۆهات - فەرمووی: « أَعُوذُ بِالسَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾ ». واتە: بێگومان كەسانێ كەئەو بوهتانەیان - بۆ خاتوو عائیشە هەڵبەست - دەستەیە بوون لەخۆتان — با مونافیقیشیان تێدا بوو-.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، قَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ جَمَاعَةٌ عَنْ الزُّهْرِيِّ لَمْ يَذْكُرُوا هَذَا الْكَلَامَ عَلَى هَذَا الشَّرْحِ، وَأَخَافُ أَنْ يَكُونَ أَمْرُ الاسْتِعَاذَةِ مِنْ كَلَامِ حُمَيْدٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە (منكر)ە، كۆمەڵێك لە زوهریەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی ئەم قسەیان نەكردووە لەسەر ئەم رافەیە، دەترسم ئەمە قسەی حومەید بێت.

## باسی ئەوانەی کە پێیان وایە:
## (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)
## بەدەنگی بەرز بخوێنرێت لە نوێژە ئاشکراکاندا.

## ١٢٥ - بَابُ مَنْ جَهَرَ بِهَا.

٧٨٦ - (ضعيف) عَنْ يَزِيدَ الْفَارِسِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى بَرَاءَةَ - وَهِيَ مِنَ الْمِئِينَ - وَإِلَى الأَنْفَالِ - وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي - فَجَعَلْتُمُوهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ، وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا سَطْرَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)؟، قَالَ عُثْمَانُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِمَّا يَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَاتُ: فَيَدْعُو بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ لَهُ وَيَقُولُ لَهُ: « ضَعْ هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا ». وَتَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَةُ وَالآيَتَانِ، فَيَقُولُ مِثْلَ ذَلِكَ، وَكَانَتِ الأَنْفَالُ مِنْ أَوَّلِ مَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَتْ بَرَاءَةُ مِنْ آخِرِ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرآنِ،

وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهَةً بِقِصَّتِهَا فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا، فَمِنْ هُنَاكَ وَضَعْتُهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْراً: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ).

واته: له یەزیدی فارسیەوه هاتووه، کە وتویەتی: لە ئیبنو عەباسم ڕەزای خوایان لێ بێ بیستووه وتی: وتم بە پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان: هۆی چییە کە سورەتی(بَرَاءَة) لە سەد ئایەتەکانە، وە سورەتی(الأَنْفَال) لە سەد ئایەتەکان کەمترە کەچی لەریزبەندی حەوت سورەتە درێژەکەی قورئاندا دانراون و لەنێوانیاندا: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). نەنوسراوە؟ پێشەوا (عُثْمَان) وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایەتەکانی بۆ دادەبەزی: هەندێ لەوانەی کە وەحیان بۆ دەنوسیەوە بانگی دەکردن و پێی دەفەرموون: (ئەم ئایەتە لەو سورەتەدا دابنێن کە باسی ئەوەو ئەوە دەکات). هەروەها ئەگەر ئایەتێ یان دوو ئایەتی بۆ دابەزێنرایە هەمان شتی پێ دەفەرموون، بێگومان سورەتی (الأَنْفَال) یەکەم سورەت بوو کە لە مەدینە بۆی دابەزی، وە سورەتی (بَرَاءَة) دوایین سورەتی قورئان، بەسەرهاتەکانیان چون یەك بوو بۆیە وام دەزانی ئەمیش سەربە هەمان سورەتە، ئا لێرەدا بوو کە لەریزبەندی حەوت سورەتە درێژەکەی قورئاندا دانراون و لەنێوانیاندا: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). نەنوسراوە.

٧٨٧ - (ضعيف) عَنْ يَزِيدَ الْفَارِسِيِّ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ بِمَعْنَاهُ، قَالَ فِيهِ: فَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا أَنَّهَا مِنْهَا.

واتە: یەزیدی فارسی دەڵێ: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ بە هەمان مانا بۆی گێڕاینەوە، لە فەرموودەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەفاتی کرد بەڵام بۆی ڕرون نەکردینەوە سەربە هەمان سورەتە - واتە یەك سورەتن یان نا- .

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ الشَّعْبِيُّ وَأَبُو مَالِكٍ وَقَتَادَةُ وَثَابِتُ بْنُ عُمَارَةَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكْتُبْ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). حَتَّى نَزَلَتْ سُورَةُ النَّمْلِ، هَذَا مَعْنَاهُ.

ئەبو داود دەڵێت: ئیمام شەعبی و ئەبو مالیك و قەتادە و (ثَابِتُ)ی کوڕی عومارە دەڵێن: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرەتای سورەتەکانەوە: (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی نەنوسی هەتا سورەتی (النَّمْلِ)ی بۆ دابەزی. ئەمەش ماناکەیەتی.

٧٨٨ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَعْرِفُ فَصْلَ السُّورَةِ حَتَّى تُنَزَّلَ عَلَيْهِ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نێوانی سورەتەکانی لێك جیانەدەکردەوە هەتا (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی بۆ دابەزی.

## باسی نوێژێ كە درێژەی پێ نەدرێت لەبەر روداوێ.

## ١٢٦ - بَابُ تَخْفِيفِ الصَّلَاةِ لِلأَمْرِ يَحْدُثُ.

٧٨٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنِّى لأَقُومُ إِلَى الصَّلَاةِ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ، كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ ».

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی ئەبو قەتادەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (جاری وا هەیە كە دەست دەكەم بەنوێژ، دەمەوێت درێژەی پێ بدەم، بەڵام لەناو نوێژەكەدا دەنگی گریانی منداڵ دەبیستم كە دایكەكەی لەپشت منەوە بە جەماعەت نوێژ دەكات، ئیتر نوێژەكەم كورت دەكەمەوەو نوێژێكی رێك و پێكیان بۆ دەكەم و درێژەی پێ نادەم، لەبەرئەوەی دەزانم كە چەند ئەركێكی گرانە لەسەر دایكەكەی).

## باسی ئەوەی کە دەربارەی کەموکورتی نوێژ هاتووە.

## ١٢٧- بَابُ مَا جَاءَ فِي نُقْصَانِ الصَّلاَةِ.

٧٩٠ - (حسن) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُـولُ: « إِنَّ الرَّجُـلَ لَيَنْصَـرِفُ وَمَـا كُتِبَ لَهُ إِلاَّ عُشْرُ صَـلاَتِهِ. تُسْـعُهَا، ثُمُنُهَـا، سُـبُعُهَا، سُدُسُهَا، خُمُسُهَا، رُبُعُهَا، ثُلُثُهَا، نِصْفُهَا ».

واتــە: لــە عــەمماری كــوڕی یاســرەوە هــاتووە: كــە وتویــەتی: بیســتم لــە پێغەمبــەری خــوا صــلى الله علیــه وســلم دەیفــەرموو: (نوێــژخوێن كــاتێ لــە نوێژەكــەی بوویــەوە، بــەپێی خشــوع و گــەردن كەچــیەكەی پاداشــتی بــۆ دەنوسرێت: جا یان دەیەكی نوێژەكەی بۆ دەنوسرێت، یا نۆ یەكی، هەشت یەكی، حەوت یەكی، شەش یەكی، پێنج یەكی، چوار یەكی، سێیەكی، یان نیوەی بۆ دەنوسرێت).

## باسی درێژەپێنەدانی نوێژ.

## ١٢٨ – بَابُ ﴿فِي﴾ تَخْفِيفِ الصَّلاَةِ.

٧٩١ - (صحيح) عَنْ عَمْرٍو - ﴿وَ﴾سَمِعَهُ مِنْ جَابِرٍ- ﴿قَالَ﴾: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا - قَالَ مَرَّةً: ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي بِقَوْمِهِ - فَأَخَّرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً الصَّلاَةَ - وَقَالَ مَرَّةً: الْعِشَاءَ - فَصَلَّى مُعَاذٌ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ جَاءَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَقَرَأَ الْبَقَرَةَ، فَاعْتَزَلَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَصَلَّى: فَقِيلَ: نَافَقْتَ يَا فُلاَنُ، فَقَالَ: مَا نَافَقْتُ: فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ مُعَاذًا يُصَلِّي مَعَكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّمَا نَحْنُ أَصْحَابُ نَوَاضِحَ وَنَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، وَإِنَّهُ جَاءَ يَؤُمُّنَا فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَقَالَ: « يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟! أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟! اقْرَأْ بِكَذَا اقْرَأْ بِكَذَا ». قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: بِـ(سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) ، (وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ) ، فَذَكَرْنَا لِعَمْرٍو، فَقَالَ: أُرَاهُ قَدْ ذَكَرَهُ.

واتـە: لـە عـەمرەوە هـاتووە: - کـە لـە جـابری بیـستووە —وتویـەتی. (مُعَـاذ) لەگـەڵ پێغەمبـەردا صـلی الله علیـە وسـلم نوێـژی دەکـرد، پاشـان دەهاتـەوە بەرنوێژی بۆ دەکردین - جارێ وتی: دەهاتەوە پێشنوێژی بـۆ هۆزەکـەی دەکـرد – شـەوێکیان پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم صـلی الله علیـە وسـلم نوێـژێکی دواخست - جارێ وتی: نوێژی عیشای دواخست — جا (مُعَاذ) لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نوێژی کرد، پاشان هاتەوە پێشنوێژی بۆ هۆزەکەی کرد، بە خوێندنی سـورەتی (الْبَقَرَة) دەسـتی پـێ کـرد، پیـاوێ لـە ریزەکـە چـووەدەرەوەو بەتەنیا نوێژی کرد، وتیان: ئەی فلان کەس تۆ دوو ڕوویت کـرد، وتـی: نـەخێر دوو ڕوویـم نـەکردووە، پیاوەکـە چـوو بـۆلای پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم بەسـەرهاتەکەی بۆگێڕایـەوە وتـی: بێگومـان (مُعَـاذ) لەگـەڵ تـۆدا نوێـژ دەکات، پاشان دێتەوە پێشنوێژیمان بـۆ دەکـات ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم، ئێمـە خـاوەنی وشـتری ئـاودێرین و بـەهێزی بـازووی خۆمـان کاردەکـەین، (مُعَـاذ) پێشـنوێژی بـۆ کـردین و بـە خوێنـدنی سـورەتی (الْبَقَـرَة) دەستی پێ کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دووجـار لەسـەریەك فـەرمووی: (ئـەی (مُعَـاذ) ئایـا تـۆ خـەڵك تووشـی بـەلاو فیتنـە دەکـەیت و لـەدین دووریـان دەخەیتـەوە؟! سـورەتی ئـەوەو ئـەوە بخوێنـە). ئـەبو زوبـەیر وتـی: فـەرمووی: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى). بخوێنــە، (وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ). بخوێنــە، بەســەرهاتەکەمان گێڕایەوە بۆ عەمر، ئەویش وتی: وادەزانم جابر ناوی سورەتەکانیشی هێنا.

**٧٩٢ - (منكر بذكر المُسَافِرُ و صَلَاةُ المَغرِب) عَنْ حَزْمِ بْنِ أُبَيِّ بْـنِ كَعْبٍ: أَنَّهُ أَتَى مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، وَهُوَ يُصَلِّي بِقَوْمٍ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ - فِي هَذَا الْخَبَرِ - قَـالَ فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ**

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَا مُعَاذُ لاَ تَكُنْ فَتَّانًا فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ، وَالضَّعِيفُ، وَذُو الْحَاجَةِ، وَالْمُسَافِرُ».

واتە: لە حەزمی كوڕی ئوبەی كوڕی كەعبەوە هاتووە، كە (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەل هات، پێشنوێژی نوێژی شێوانی بۆ هۆزەكەی دەكرد — لەو بەسەرهاتەدا كە لە فەرموودەكەی پێشتردا باسكرا - وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی (مُعَاذ) بە خوێندنی ئەو ئایەتە زۆرانە مەبە بەهۆی ئەوەی كە خەڵك تووشی بەلاو فیتنە بكەی و لەدین دووریان خەیتەوە، چونكە ئەوانەی كە لەدواتەوە نوێژ دەكەن هەیانە بەساڵاچووە یان لاوازە یا ئیش و كاری زەروری هەیەو پەلەیەتی، یان موسافیرە.

٧٩٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِرَجُلٍ: « كَيْفَ تَقُولُ فِي الصَّلاَةِ ؟ ». قَالَ: أَتَشَهَّدُ وَأَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ، أَمَا إِنِّي لاَ أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ وَلاَ دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ ».

واتە: لە ئەبو (صَالِح)ەوە، لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە

پیاوێکی فەرمووە: (چی دەڵێیت لە نوێژدا؟) وتی: من تەحیات دەخوێنم و دەڵێم: خودایە! من داوای بەهەشتت لێ دەکەم، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ، بەڵام من لەم ورتە ورتەی تۆ و (معاذ) نازانم. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێمەش هەر لەدەورو بەری ئەوەداین). — واتە ئێمەش هەر داوای ئەوە دەکەین - .

**٧٩٤ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ - ذَكَرَ قِصَّةَ مُعَاذٍ - قَالَ: وَقَالَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - لِلْفَتَى: « كَيْفَ تَصْنَعُ يَا ابْنَ أَخِي إِذَا صَلَّيْتَ؟ »،. قَالَ: أَقْرَأُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَأَسْأَلُ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، وَإِنِّي لاَ أَدْرِي مَا دَنْدَنَتُكَ وَلاَ دَنْدَنَةُ مُعَاذٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « إِنِّي وَمُعَاذٌ حَوْلَ هَاتَيْنِ ».**

واتە: لە جابرەوە هاتووە - بەسەرهاتەکەی (مُعَاذ)ی گێڕایەوە، وتی: وە فەرمووی: واتە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە لاوێکی فەرموو: (ئەی کوڕی برام چی دەکەیت لە نوێژەکەتدا؟). وتی: من سورەتی فاتیحە دەخوێنم و دەڵێم: خودایە! من داوای بەهەشتت لێ دەکەم، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ، بەڵام من ئەم ورتە ورتەی تۆ و (معاذ) نازانم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ( من و (معاذ)یش هەر لەدەورو بەری ئەوەداین).

٧٩٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ وَإِذَا صَلَّى لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێك لەئێوە پێشنوێژی كرد بۆ موسڵمانان با درێژەی پێ نەدات، چونكە ئەوانەی لەدوایەوەن هەیانە لاوازە یان نەخۆشە یا بەساڵاچووە، بەڵام ئەگەر تەنها بوو چەندە توانای هەیە درێژەی پێ بدات).

٧٩٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ السَّقِيمَ، وَالشَّيْخَ الْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێك لەئێوە پێشنوێژی كرد بۆ موسڵمانان با درێژەی پێ نەدات، چونكە ئەوانەی لەدوایەوەن هەیانە نەخۆشە یان بەساڵاچووە، یا ئیش و كاری زەروری هەیە.

## باسی ئەوەی کە سەبارەت بە قورئان خوێندن لەنوێژی نیوەڕۆدا هاتووە.

## ١٢٩ - بَابُ ﴿مَا جَاءَ فِى الْقِرَاءَةِ فِى﴾ الظُّهْرِ.

٧٩٧ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: فِى كُلِّ صَلاَةٍ يُقْرَأُ، فَمَا أَسْمَعَنْا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْمَعْنَاكُمْ، وَمَا أَخْفَى عَلَيْنَا أَخْفَيْنَا عَلَيْكُمْ.

واتە: لە (عَطَاء)ی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو هورەیرەوە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەهەموو نوێژێکدا قورئانی دەخوێند، جا ئەوەی بە ئاشکرا بیخوێندایە ئێمەش بە ئاشکرا دەمانخوێند، ئەوەی بە نهێنی بیخوێندایە ئێمەش بە نهێنی دەمانخوێند.

٧٩٨ - (صحيح) عَنْ أَبِى قَتَادَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى بِنَا فَيَقْرَأُ فِى الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِى الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يُطَوِّلُ الرَّكْعَةَ الأُولَى مِنَ الظُّهْرِ وَيُقَصِّرُ الثَّانِيَةَ، وَكَذَلِكَ فِى الصُّبْحِ.

واتە: لە ئەبی قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەرنوێژی بۆ دەکردین، لەدوو رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا سورەتی فاتیحە و دوو سورەتی تری دەخوێند، وە هەندێ جار گوێمان لەو ئایەتانە دەبوو کە دەیخوێندن، ئەو سورەتەی کە لە رکاتی یەکەمدا دەیخوێند درێژتر بوو لەو سورەتەی کە لە رکاتی دووەمدا دەیخوێند، هەروەها لەنوێژی بەیانیشدا بەهەمان شێوەی دەکرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَذْكُرْ مُسَدَّدٌ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً.

ئەبو داود دەڵێت: موسەددەد باسی سورەتی فاتیحە و سورەتی تری نەکرد.

٧٩٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، بِبَعْضِ هَذَا، وَزَادَ فِي الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَزَادَ عَنْ هَمَّامٍ: قَالَ: وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مَا لاَ يُطَوِّلُ فِي الثَّانِيَةِ، وَهَكَذَا فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ، وَهَكَذَا فِي صَلاَةِ الْغَدَاةِ.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی ئەبی قەتادەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە هەندێ لە فەرموودەی ناوبراوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: لە دوو رکاتەکەی تریشدا سورەتی فاتیحەی دەخوێند، حەسەن لە هەممامەوە گێڕاویەتیەوە، ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە رکاتی یەکەمدا سورەتی درێژ تری دەخوێند لە سورەتی رکاتی دووەم، وە هەروەها لەنوێژی عەسردا، وە هەروەها لەنوێژی بەیانیشدا.

٨٠٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: فَظَنَنَّا أَنَّهُ يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يُدْرِكَ النَّاسُ الرَّكْعَةَ الأُولَى.

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی ئەبی قەتادەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: وامان دەزانی كە ئەو بەو درێژە پێ دانەی دەیەوێت خەڵكەكە بگەن بە ركاتی یەكەمدا.

٨٠١ - (صحيح) عَنْ أَبِى مَعْمَرٍ، قَالَ: قُلْنَا لِخَبَّابٍ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِى الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْنَا بِمَ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ ذَاكَ، قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ.

واتە: لە ئەبو مەعمەرەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: وتمان بە خەبابی كوڕی ئەرەت: ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند؟ وتی: بەڵێ، وتمان: ئێوە بەچیدا دەتانزانی؟ وتی: بە جوڵانەوەی ریشیدا.

٨٠٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى أَوْفَى: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُومُ فِى الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ وَقْعَ قَدَمٍ.

واتە: لە (عبداللّٰە)ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم ئەوەندەی درێژە دەدا بە رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ هەتا کەس نەدەما بێت بۆ نوێژی جەماعەت گوێمان لەدەنگی پێی بێت.

## باسی درێژەنەدان بە قورئان خوێندنی دوو رکاتەکەی تر.

## ١٣٠ – بَابُ تَخْفِيفِ الأُخْرَيَيْنِ.

٨٠٣ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِسَعْدٍ: قَدْ شَكَاكَ النَّاسُ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: أَمَّا أَنَا فَأَمُدُّ فِي الأُولَيَيْنِ، وَأَحْذِفُ فِي الأُخْرَيَيْنِ، وَلاَ آلُو مَا اقْتَدَيْتُ بِهِ مِنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: عومەر رەزای خوای لێ بێ بە سەعدی وت: خەڵکی - کوفە - لە هەموو شتێکدا شکاتیان لێت هەیە تەنانەت لە نوێژیشدا، سەعدیش وتی: بەنیسبەت منەوە لە نوێژە چوار رکاتیەکاندا درێژە دەدەم بە قورئان خوێندنی دوو رکاتەکانی یەکەم، بەڵام دوو رکاتەکانی تر کورت دەکەمەوە، لەوەشدا ئیقتیدام کردووە بە نوێژی پێغەمبەری خواوە صلی اللە علیە وسلم واتە ئەوم کردووە بە سەرمەشق و پێشەنگی خۆم. پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: ئێمەش هەروا گومانمان پێ دەبردی.

٨٠٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: حَزَرْنَا قِيَامَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ قَدْرَ ثَلاَثِينَ آيَةً، قَدْرَ (الم تَنْزِيلُ) السَّجْدَةِ، وَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الأُخْرَيَيْنِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ، وَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الأُولَيَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ، عَلَى قَدْرِ الأُخْرَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ، وَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الأُخْرَيَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە نوێژە چوار رکاتیەکاندا ئەندازەی وەستانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ قورئان خوێندن لەدوو رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا ئەوەندەی خوێندنی سی ئایەت دەبوو، بە ئەندازەی خوێندنی: (الم تَنْزِيلُ)ی سورەتی (السَّجْدَة)ە، وە ئەندازەی وەستانی بۆ قورئان خوێندن لە دوو رکاتەکانی کۆتاییدا هێندەی نیوەی دوو رکاتی یەکەم دەبوو — بە قەد واتە پانزە ئایەت- وە ئەندازەی وەستانی بۆ قورئان خوێندن لەدوو رکاتی یەکەمی نوێژی عەسردا هێندەی دوو رکاتی کۆتایی نوێژی نیوەڕۆ دەبوو، ئەندازەی وەستانی لەدوو رکاتی کۆتایی نوێژی عەسردا هێندەی نیوەی دوو رکاتی یەکەمی دەبوو.

# باسی ئەندازەی قورئان خوێندن لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا.

## ١٣١ - بَابُ قَدْرِ الْقِرَاءَةِ فِي صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ.

٨٠٥ - (حسن صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ، وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ، وَنَحْوِهِمَا مِنَ السُّوَرِ.

واته: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا سورەتی: (وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ). و (وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ) و، وێنەی ئەم سورەتانەی دەخوێند.

٨٠٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ صَلَّى الظُّهْرَ، وَقَرَأَ بِنَحْوٍ مِنْ (وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ) وَالْعَصْرَ كَذَلِكَ، وَالصَّلَوَاتِ كَذَلِكَ، إِلاَّ الصُّبْحَ، فَإِنَّهُ كَانَ يُطِيلُهَا.

واته: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا نوێژی نیوەڕۆی

دەکرد، وێنەی ئەم سورەتانەی دەخوێند: سورەتی: (وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ). لە نوێژی عەسریشدا هەروەها، وە لە نوێژەکانی تریشدا هەروەها وێنەی ئەم سورەتانەی دەخوێند، جگە لەنوێژی بەیانی کە درێژەی پێ دەدا.

| |
|---|
| ٨٠٧ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَجَدَ فِي صَلاَةِ الظُّهْرِ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ، فَرَأَيْنَا أَنَّهُ قَرَأَ تَنْزِيلَ السَّجْدَةِ. |

[المشكاة: ١٠٣١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى لە نوێژی نیوەڕۆدا سەجدەی قورئان خوێندن(تلاوة)ی برد، پاشان لە سەجدە هەستایەوەو چووە ڕکوعەوە، بینیمان سورەتی (السَّجْدَة)ەی خوێند.

| |
|---|
| ٨٠٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فِي شَبَابٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، فَقُلْنَا لِشَابٍّ مِنَّا: سَلِ ابْنَ عَبَّاسٍ أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ فَقَالَ: لاَ، لاَ، فَقِيلَ لَهُ: فَلَعَلَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي نَفْسِهِ؟ فَقَالَ: خَمْشًا، هَذِهِ شَرٌّ مِنَ الأُولَى، كَانَ عَبْدًا مَأْمُورًا بَلَّغَ مَا أُرْسِلَ بِهِ، وَمَا اخْتَصَّنَا دُونَ النَّاسِ بِشَيْءٍ إِلاَّ بِثَلاَثِ خِصَالٍ: أَمَرَنَا |

أَنْ نُسْبِغَ الْوُضُوءَ، وَأَنْ لاَ نَأْكُلَ الصَّدَقَةَ، وَأَنْ لاَ نُنْزِيَ الْحِمَارَ عَلَى الْفَرَسِ.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی (عُبَيْدِ اللَّهِ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: من و کۆمەڵێك لە لاوانی هۆزی هاشم چووین بۆلای ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ، بە یەکێ لەو لاوانەمان وت: لە ئیبنو عەباس بپرسە کە ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند؟ وتی: نەخێر، نەخێر، پێیان وت: دە پێی بڵێ: بەڵکو بە نهێنی خوێندبێتی؟ ئیبنو عەباس دوعای لێ کرد کە دەم و چاوی و پێستی بڕوشێت وتی: ئەمەیان خراپترە لە یەکەمیان؟ واتە بە نهێنی خوێندنی خراپترە لە نەخوێندنی، بێگومان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەندەیەکی فەرمان پێکراو بوو ئەوەی کە بۆی دەهات دەیگەیاند بە خەڵك، لە هیچ شتێکدا ئێمەی بنەماڵەی خۆی لەو خەڵکە جیای نەکردووەتەوە تەنها لەسێ شتدا نەبێت: فەرمانی پێکردووین کە دەستنوێژ بە جوانی و بەتەواوی بگرین، وە لە خێر و سەدەقە نەخۆین، هەروەها گوێدرێژ نەپەڕێنین لە ماین بۆ وەچە.

٨٠٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لاَ أَدْرِي أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ أَمْ لاَ؟.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: نازانم کە ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند یان نا؟.

## باسی ئەندازەی قورئان خوێندن لەنوێژی شێواندا.

## ١٣٢ - بَابُ قَدْرِ الْقِرَاءَةِ فِى الْمَغْرِبِ.

٨١٠ - (صحيح) عَـنْ ابْـنِ عَبَّـاسٍ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْـلِ بِنْـتَ الْحَـارِثِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ: (وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا). فَقَالَـتْ: يَـا بُنَـيَّ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِى بِقِرَاءَتِـكَ هَـذِهِ السُّـورَةَ إِنَّهَـا لآخِـرُ مَـا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِهَا فِـى الْمَغْرِبِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە (أُمَّ الْفَضْـلِ)ی کچی (حَارِث) واتە دایکی گوێی لێ بوو سورەتی: (وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا)ی دەخوێند، وتی: کوڕی خۆم! بە خوێندنی ئەم سورەتە ئەوەت یادخستمەوە کە دواهەمین سورەت بوو گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی شێواندا دەیخوێند.

٨١١ - (صحيح) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِالطُّورِ فِى الْمَغْرِبِ.

واتە: لە جوبەیری كوڕی (مُطْعِـم)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژی شێواندا سورەتی (وَالطُّـور)ی دەخوێند.

٨١٢ - (صحيح) عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، قَالَ: قَالَ لِي زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: مَا لَكَ تَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِقِصَارِ الْمُفَصَّلِ وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِطُولَى الطُّولَيَيْنِ؟ قَالَ: قُلْتُ: مَا طُولَى الطُّولَيَيْنِ؟ قَالَ: الأَعْرَافُ، ﴿وَالأُخْرَى الأَنْعَامُ﴾، ﴿قَالَ﴾: وَسَأَلْتُ أَنَا ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ؟ فَقَالَ: لِي مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ: الْمَائِدَةُ وَالأَعْرَافُ.

واتە: لە مەروانی كوڕی حەكەمەوە هاتووە، كە وتویەتی: زەیدی كوڕی (ثابت) پێی وتم: چییە تۆ تەنها سورەتە كورتەكان دەخوێنی لەنوێژی شێواندا لەكاتێكدا كە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە لەنوێژی شێواندا یەكێ لە دوو سورەتە هەرە درێژەكەی دەخوێند؟ وتی: دوو سورەتە هەرە درێژەكە كامانەن؟ وتی: یەكێكیان سورەتی: (الأَعْـرَافُ)ە، ئەوی تریشیان سورەتی: (الأَنْعَام)ە، وتی: منیش لەوبارەوە لە ئیبنو ئەبی مولەیكەم پرسی؟ لەلایەن خۆیەوە پێی وتم: مەبەست لە دوو سورەتە هەرە درێژەكە: (الْمَائِـدَة)ە و (الأَعْرَاف)ە.

## باسی ئەوەی كە پێی وایە قورئانی كەم بخوێنرێت لەنوێژی شێواندا.

## ١٣٣ - بَابُ مَنْ رَأَى التَّخْفِيفَ فِيهَا.

٨١٣ - (صحيح مقطوع) عَنْ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ الْمَغْرِبِ بِنَحْوِ مَا تَقْرَءُونَ (وَالْعَادِيَاتِ) وَنَحْوِهَا مِنَ السُّوَرِ.

واتە: لە هیشامی كوڕی عورووەوە هاتووە، كە باوكی لەنوێژی شێواندا ئەوەندەی كە ئێوە سورەتی (وَالْعَادِيَات) بخوێنن ئەوەندە قورئانی دەخوێند، هەروەها وێنەی ئەم سورەتانە، واتە سورەتە كورتەكانی دەخوێند.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ ذَاكَ مَنْسُوخٌ، وَهَذَا أَصَحُّ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە سورەتی درێژ خوێندن لە نوێژی شێواندا (نسخ) بۆتەوە، وە ئەمەش راست ترینە.

٨١٤ - (ضعيف) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُ قَالَ: مَا مِنَ الْمُفَصَّلِ سُورَةٌ، صَغِيرَةٌ وَلاَ كَبِيرَةٌ، إِلاَّ وَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَؤُمُّ النَّاسَ بِهَا فِي الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریـەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە سورەتە (مُفَصَّل)کاندا چ کورت بێت یان درێژ، هیچ سورەتێ نەماوە کە لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم نەبیستبێ پێشنوێژی پێ نەکردبێت بۆ خەڵك لە نوێژە فەرزەکاندا.

٨١٥ - (ضعيف) عَنْ أَبِى عُثْمَانَ النَّهْدِىِّ: أَنَّهُ صَلَّى خَلْفَ ابْنِ مَسْعُودٍ الْمَغْرِبَ فَقَرَأَ بِـ: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ).

واتە: لە ئەبو (عُثْمَان)ی نەهدیەوە هاتووە، کە لەدوای ئیبنو مەسعودەوە نوێژی شێوانی کردووە، ئیبنو مەسعود سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ)ی خوێند.

## باسی کەسێ لەڕکاتی یەکەمدا سورەتێ بخوێنێ و لەڕکاتی دووەمیشدا هەمان سورەت بخوێنێتەوە.

## ١٣٤ - بَابُ الرَّجُلِ يُعِيدُ سُورَةً وَاحِدَةً فِى الرَّكْعَتَيْنِ.

٨١٦ - (حسن) عَنْ رَجُلٍ مِنْ جُهَيْنَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِى الصُّبْحِ (إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ). فِى الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا فَلاَ أَدْرِى أَنَسِىَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَمْ قَرَأَ ذَلِكَ عَمْدًا.

واتە: پیاوێکی هۆزی جوهەینـەیی دەڵێـت: گوێم لـێ بـوو پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم لە هەردوو رکاتەکەی نوێـژی بەیانیـدا هـەر سورەتی: (إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ)ی خوێند، جا نازانم ئایا پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم لەبیری چوو یا بەئەنقەست ئەوەی کرد.

## باسی قورئان خوێندن لەنوێژی بەیانیدا.

## ١٣٥ - بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الْفَجْرِ.

| |
|---|
| ٨١٧ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، قَـالَ: كَـأَنِّي أَسْـمَعُ صَـوْتَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِـي صَـلاَةِ الْغَـدَاةِ: (فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ). |

واتە: لە عەمری کوڕی (حُرَيْـث)ەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: ئێسـتاش دەڵێـی گوێم لەدەنگی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم کە لە نوێژی بەیانیدا سـورەتی: (فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ)ی دەخوێند.

# باسی کەسێ لەنوێژەکەیدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێ.

## ١٣٨ – بَابُ مَنْ تَرَكَ الْقِرَاءَةَ فِي صَلَاتِهِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ.

٨١٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: أُمِرْنَا أَنْ نَقْرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَمَا تَيَسَّرَ.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە فەرمانمان پێ کرابوو لەنوێژدا سورەتی فاتیحەو چەند بتوانین لەسورەتەکانی تر بخوێنین.

٨١٩ - (منكر) عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اخْرُجْ فَنَادِ فِي الْمَدِينَةِ: أَنَّهُ لاَ صَلاَةَ إِلاَّ بِقُرْآنٍ، وَلَوْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَمَا زَادَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (برۆ بەناو شاری مەدینەدا جاڕبدەو بڵێ: بێگومان هەرکەس لە نوێژەکەیدا قورئان نەخوێنێ ئەوە نوێژی نەکردووە، ئەگەرچی سورەتی فاتیحەش بێت یان زیاتر لە سورەتی فاتیحە).

٨٢٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أُنَادِيَ أَنَّهُ: (لاَ صَلاَةَ إِلاَّ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَمَا زَادَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردم کە جاڕبدەم و بڵێم: بێگومان هەرکەس لە نوێژەکەیدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێت ئەوە نوێژی نەکردووە، ئەگەر لەوەش زیاتر قورئانی خوێند ئەوە چاکترە).

٨٢١ - (صحيح) عَنْ أَبَا السَّائِبِ مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ، فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ ». قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ! إِنِّي أَكُونُ أَحْيَانًا وَرَاءَ الإِمَامِ، قَالَ: فَغَمَزَ ذِرَاعِي وَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا يَا فَارِسِيُّ فِي نَفْسِكَ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، فَنِصْفُهَا لِي، وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اقْرَءُوا يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ

ٱلْعَـٰلَمِينَ )، يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: حَمِدَنِي عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: (ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ). يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ( مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ). يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: مَجَّدَنِي عَبْدِي يَقُولُ الْعَبْدُ: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ). ﴿يَقُولُ اللَّهُ﴾: فَهَذِهِ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، يَقُولُ الْعَبْدُ: ( ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ). ﴿يَقُولُ اللَّهُ﴾: فَهَؤُلاَءِ لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ».

واتە: لە ئەبا سائیبی مەولای هیشامی کوڕی زوهرەوە هاتووە، کە وتویەتی: گوێم لێ بوو ئەبو هورەیرەوە دەیوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە نوێژەکەیدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێت ئەوە نوێژەکەی ناکامڵە، ناکامڵە، ناکامڵە، تەواو نیە). وتی: وتم ئەی ئەبو هورەیرە! هەندێ جار لەدوای پێشنوێژەوەم سورەتی فاتیحە چۆن بخوێنم، وتی: قۆڵی گرتم و وتی: ئەی فارسی بە نهێنی بۆ خۆت بیخوێنە، چونکە خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (خوای گەورە دەفەرموێت: نوێژم دابەش کردووە لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا، نیوەی بۆ منەو، نیوەکەی تریشی بۆ بەندەکەمە، ئەوەی بەندەکەم داوای دەکات پێی دەبەخشم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (بخوێنن، کاتێ کە بەندە دەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ﴾. واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوای

خاوەنی هەموو جیهانیان و بوونەوەر، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم. کاتێ کە بەندە دەڵێت: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾. واتە: بەخشندەو میهرەبانە ئەو خوایەی کانگای رەحمەت و سۆزو بەزەییە، خوای گەورەش دەفەرموێت: بەندەکەم مەدح و سەنای کردم. کاتێ کە دەڵێت: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾. واتە: خاوەن و سەرداری رۆژی قیامەت، خوای گەورە دەفەرموێت: سەرنج بدەن ئەوەتا بەندەکەم بەخاوەن دەسەڵات و شکۆمەندم دەزانێت.. کاتێك دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾. واتە: خودایە عیبادەت هەر بۆ تۆ دەکەم، داوای کۆمەکی هەر لە تۆ دەکەم، پشت و پەنام هەر تۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم راست دەکات ئەوەتە بەکردارو بەگوفتار هەر من دەپەرستێت و هەر منیش بە پشتیوان دەزانێت. تائێرە بەینی من و بەندەکەم بوو، بۆ بەندەکەم هەیە داوا بکات، کاتێك دەڵێ: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. خوای گەورە دەفەرموێت ئەمە بۆ بەندەکەمە، ئەوەی داوای کرد پێی دەبەخشم.

**٨٢٢ - (صحيح دون قوله: «فصاعدا» الخ) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَصَاعِدًا». قَالَ: سُفْيَانُ: لِمَنْ يُصَلِّي وَحْدَهُ.**

واتە: لە عوبادەی کوڕی (صَّامِت)ەوە هاتووە، کە فەرمودەکەی گەیاندوەتەوە سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لە نوێژەکەیدا سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری قورئان لەسەروی ئەویشەوە نەخوێنێ ئەوە

نوێژەکەی دروست نیە). سوفیان وتی: بۆ کەسێ کە بە تەنیا نوێژ بکات.

٨٢٣ - (ضعيف) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: كُنَّا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ فَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ فَلَمَّا فَرَغَ، قَالَ: « لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ ». قُلْنَا: نَعَمْ، هَذًا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « لاَ تَفْعَلُوا إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَإِنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا ».

واتە: لە عوبادەی کوڕی (صَّامِت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانیمان دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قورئان خوێندنەکەی لەسەر قورس بوو، کە لە نوێژەکەی بووەوە، فەرمووی: (لەوانەیە بەدوای پێشنوێژەکەتاندا قورئان بخوێنن؟) وتمان: بەڵێ، بۆ ئەوەی بگەین بە تۆدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! فەرمووی: (ئەوە مەکەن تەنها سورەتی فاتیحە بخوێنن، چونکە هەر کەسێك لە نوێژدا سورەتی فاتیحە نەخوێنێت، ئەو نوێژەی بە نوێژ بۆ دانانرێت).

٨٢٤ - (ضعيف) عَنْ نَافِعِ بْنِ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: نَافِعٌ: أَبْطَأَ عُبَادَةُ ﴿بْنُ الصَّامِتِ﴾ عَنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَأَقَامَ أَبُو نُعَيْمٍ الْمُؤَذِّنُ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى أَبُو نُعَيْمٍ بِالنَّاسِ، وَأَقْبَلَ عُبَادَةُ وَأَنَا مَعَهُ حَتَّى صَفَفْنَا خَلْفَ

أَبِى نُعَيْمٍ، وَأَبُو نُعَيْمٍ يَجْهَرُ بِالْقِرَاءَةِ، فَجَعَلَ عُبَادَةُ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ لِعُبَادَةَ: سَمِعْتُكَ تَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، وَأَبُو نُعَيْمٍ يَجْهَرُ، قَالَ: أَجَلْ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْضَ الصَّلَوَاتِ الَّتِى يَجْهَرُ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ، قَالَ: فَالْتَبَسَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، وَقَالَ: « هَلْ تَقْرَؤُونَ إِذَا جَهَرْتُ بِالْقِرَاءَةِ ». فَقَالَ بَعْضُنَا: إِنَّا نَصْنَعُ ذَلِكَ، قَالَ: « فَلاَ، وَأَنَا أَقُولُ مَا لِى يُنَازِعُنِى الْقُرْآنُ فَلاَ تَقْرَؤُوا بِشَىْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ، إِذَا جَهَرْتُ إِلاَّ بِأُمِّ الْقُرْآنِ ».

واتە: لە نافعی کوڕی مەحمودی کوڕی ربیعی (الأَنْصَارِیّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ عوبادەی کوڕی (صَّامِت) لەنوێژی بەیانی دواکەوت، ئەبو نوعەیمی بانگبێژ هەستا قامەتی کردو، بەرنوێژی کرد بۆ خەڵکەکە، من و عوبادە رۆشتین هەتا ریزمان بەست لەدوای ئەبو نوعەیمەوە، جا ئەبو نوعەیم بە ئاشکرا قورئانی دەخوێند، عوبادەش لەدوایەوە سورەتی فاتیحەی خوێند، کە لە نوێژەکەی بوەوە بە عوبادەم وت: گوێم لێ بوو سورەتی فاتیحەت دەخوێند، لەکاتێکدا کە ئەبو نوعەیم بە ئاشکرا سورەتی فاتیحەی خوێند، وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەرنوێژی هەندێ لەو نوێژانەی بۆ دەکردین کە بە ئاشکرا قورئانیان تێدا دەخوێندرێت، وتی: بەهۆی قورئان خوێندنی ئەوانەی کە لەدوایەوە بوون قورئان خوێندنەکەی لێ تێکچوو، کە لە نوێژەکەی بوەوە، لای کردەوە بەلاماندا و فەرمووی: (ئایا قورئان دەخوێنن لەکاتێکدا کە من بە ئاشکرا قورئان دەخوێنم؟) هەندێکمان وتمان:

بەڵێ، بۆ ئەوەی بگەین بە تۆدا ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم!
فەرمووی: (منیش دەڵێم ئەوە بۆچی بەربەرەكانێ و دژایەتیم دەكەن لە قورئان خوێندندا؟ لەكاتێكدا كە من بە ئاشكرا قورئان دەخوێنم ئێوە هیچ شتێ لە قورئان مەخوێنن جگە لە سورەتی فاتیحە).

٨٢٥ - (ضعيف) عَنْ عُبَادَةَ نَحْوَ حَدِيثِ الرَّبِيعِ بْنِ سُلَيْمَانَ، قَالُوا: فَكَانَ مَكْحُولٌ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ سِرًّا، قَالَ مَكْحُولٌ: اقْرَأْ بِهَا فِيمَا جَهَرَ بِهِ الإِمَامُ، إِذَا قَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَسَكَتَ سِرًّا فَإِنْ لَمْ يَسْكُتِ اقْرَأْ بِهَا قَبْلَهُ، وَمَعَهُ، وَبَعْدَهُ، لاَ تَتْرُكْهَا عَلَى كُلِّ حَالٍ.

واتە: عوبادەی كوڕی (صَّامِت) وەك فەرموودەكەی رەبیعی كوڕی سولەیمانی گێڕایەوە، قوتابیەكانی وتیان: مەكحول لەهەموو ركاتێكی نوێژی شێوان و نوێژی عیشاو نوێژی بەیانیدا بەنهێنی سورەتی فاتیحەی دەخوێند، مەكحول وتی: لەكاتێكدا كە پێشنوێژ بە ئاشكرا سورەتی فاتیحەی خوێندو بێدەنگ بوو ئێوەش بە نهێنی لەدوایەوە سورەتی فاتیحە بخوێنن، ئەگەر بێدەنگیش نەبوو ئێوەش لەپێشیەوە یان لەگەڵ ئەودا یا لەدوایەوە بیخوێنن، لەهەموو حاڵەتێكدا بیخوێنن و وازی لێ مەهێنن.

## باسی ئەوەی کە پێی وایە سورەتی فاتیحە بخوێنرێت ئەگەر پێشنوێژ بە ئاشکرا نەیخوێند.

## ١٣٧ - بَابُ مَنْ رَأى الْقِرَاءَةَ إِذَا لَمْ يَجْهَرْ.

٨٢٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةٍ جَهَرَ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ، فَقَـالَ: « هَلْ قَرَأَ مَعِي أَحَدٌ مِنْكُمْ آنِفًا؟ ». فَقَالَ رَجُلٌ: نَعَمْ يَـا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُـرْآنَ؟ ». قَالَ: فَانْتَهَى النَّاسُ عَنْ الْقِرَاءَةِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ بِالْقِرَاءَةِ مِنَ الصَّلَوَاتِ، حِينَ سَـمِعُوا ذَلِـكَ مِـنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتـە: لـە ئـەبو هـورەیرەوە رەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە یەکێك لە نوێـژە ئاشکراکاندا قورئـانی دەخوێنـد کـاتێ کـە تـەواو بـوو فـەرمووی: (ئایـا کـەس لەگـەڵ منـدا قورئـانی خوێنـد؟). پیاوێـك وتـی: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم! فـەرمووی: (منـیش دەڵـێم ئـەوە بۆچـی بەربـەرەکانێ و دژایـەتیم دەکـەن لـە

قورئان خوێندندا؟). وتی: كە خەڵكەكە ئەوەیان بیست لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم ئیتر وازیانهێنا لە قورئان خوێندن لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله علیە وسلم لە نوێژە ئاشكراكاندا.

٨٢٧ - (صحيح) عَنْ أَبو هُرَيْرَةَ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةً نَظُنُّ أَنَّهَا الصُّبْحُ، بِمَعْنَاهُ إِلَى قَوْلِهِ: « مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ؟ ». قَالَ مُسَدَّدٌ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ مَعْمَرٌ: فَانْتَهَى النَّاسُ عَنْ الْقِرَاءَةِ فِيمَا جَهَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: ابْنُ السَّرْحِ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ مَعْمَرٌ: عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَانْتَهَى النَّاسُ. وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الزُّهْرِيُّ مِنْ بَيْنِهِمْ: قَالَ سُفْيَانُ: وَتَكَلَّمَ الزُّهْرِيُّ بِكَلِمَةٍ لَمْ أَسْمَعْهَا، فَقَالَ مَعْمَرٌ: إِنَّهُ قَالَ: فَانْتَهَى النَّاسُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیە وسلم بەرنوێژی یەكێ لە نوێژە فەرزەكانی بۆ كردین وابزانم نوێژی بەیانی بوو، بەهەمان مانای پێشوو فەرموودەكەی گێڕایەوە هەتا وتەكەی: (منیش دەڵێم ئەوە بۆچی بەربەرەكانێ و دژایەتیم دەكەن لە قورئان خوێندندا؟). موسددەد لە فەرموودەكەیدا وتی: مەعمەر وتویەتی: دوای ئەوەی ئیتر خەڵكەكە وازیانهێنا لە قورئان خوێندن لەكاتێكدا كە پێغەمبەر صلى الله علیە وسلم بە ئاشكرا بیخوێندایە. وە ئیبنو سەرح لە فەرموودەكەیدا وتی:

مەعمەر وتی: لە زوهریەوە هاتووە، کە ئەبو هورەیرە وتویەتی: ئیتر خەڵکەکە وازیانهێنا. (عبداللـه)ی کوڕی موحەممەدی زوهری کە لەناویاندا بوو وتی: سوفیان وتی: زوهری – لەدوای: (مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرآنَ) - قسەیەکی کرد من هەرگیز نەمبیستووە، مەعمەر وتی: زوهری وتی: ئیتر خەڵکەکە وازیانهێنا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ الزُّهْرِيِّ، وَانْتَهَى حَدِيثُهُ إِلَى قَوْلِهِ « مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ ». وَرَوَاهُ الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، قَالَ فِيهِ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَاتَّعَظَ الْمُسْلِمُونَ بِذَلِكَ، فَلَمْ يَكُونُوا يَقْرَءُونَ مَعَهُ فِيمَا يَجْهَرُ بِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

ئەبو داود دەڵێت: لە زوهرییەوە هاتووە، فەرموودەکەی زوهری لێرەدا کۆتایی هات « مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ ». وە ئەوزاعی لە زوهرییەوە گێڕاویەتیەوە لە فەرموودەکەیدا وتویەتی: زوهری وتی: موسڵمانان پەندیان لێ وەرگرت، ئیتر وازیانهێنا لە قورئان خوێندن لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لە نوێژە ئاشکراکاندا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ يَحْيَى بْنِ فَارِسٍ، قَالَ: قَوْلُهُ «فَانْتَهَى النَّاسُ »: مِنْ كَلاَمِ الزُّهْرِيِّ.

ئەبو داود دەڵێت: گوێم لێ بوو موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی فارس وتی: وتەکەی: «ئیتر خەڵکەکە وازیانهێنا»: لە وتەی زوهرییە.

## باسی ئەوەی کە پێی وایە سورەتی فاتیحە بخوێنرێت ئەگەر پێشنوێژ بە ئاشکرا نەیخوێند.

## ١٣٨ - بَابُ مَنْ رَأَى الْقِرَاءَةَ إِذَا لَمْ يَجْهَرْ.

٨٢٨ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ فَجَاءَ رَجُلٌ فَقَرَأَ خَلْفَهُ: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: « أَيُّكُمْ قَرَأَ؟ ». قَالُوا رَجُلٌ! قَالَ: «قَدْ عَرَفْتُ أَنَّ بَعْضَكُمْ خَالَجَنِيهَا».

واتە: لە عیمرانی کوڕی (حُصَيْن)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆی دەکردن پیاوێ هات و لەدوایەوە بەدەنگی بەرز سورەتی: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى)ی خوێند، کە لەنوێژ بووەوە فەرمووی: (کێ بوو قورئانی دەخوێند؟). هاوەڵان وتیان: پیاوێك بوو، فەرمووی: (دەمزانی هەندێ لە ئێوە هەیە لێم تێك دەدات واتە سەرقاڵم دەکات بەدەنگ بەرزکردنەوەکەی لەکاتی قورئان خوێندندا).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ أَبُو الْوَلِيدِ فِي حَدِيثِهِ، قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: أَلَيْسَ قَوْلُ سَعِيدٍ: أَنْصِتْ لِلْقُرْآنِ؟ قَالَ: ذَاكَ إِذَا جَهَرَ بِهِ. وَقَالَ ابْنُ كَثِيرٍ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ: قُلْتُ لِقَتَادَةَ: كَأَنَّهُ كَرِهَهُ؟ قَالَ: لَوْ كَرِهَهُ نَهَى عَنْهُ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەبو وەلید لە فەرموودەکەیدا وتی: بە قەتادەم وت: (أَنْصِتْ لِلْقُرْآنِ) واتە گوێ بگرن لە قورئان بە بێدەنگی. ئایا ئەمە وتەی سەعید نیە؟ وتی: ئەوە لەکاتێکدایە پێشنوێژ بەدەنگی بەرز قورئانی بخوێنێت، (ابْنُ كَثِيرٍ) لە فەرموودەکەیدا دەڵێت: وتی: بە قەتادەم وت: وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی ناخۆش بێت لەدوای پێشنوێژەوە قورئان بخوێنرێت ئاوەها بوو؟ وتی: نەخێر ئەگەر پێی ناخۆش بوایە قەدەغەی دەکرد.

**٨٢٩ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمُ الظُّهْرَ، فَلَمَّا انْفَتَلَ قَالَ: « أَيُّكُمْ قَرَأَ بِ(سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، فَقَالَ: « ﴿قَدْ﴾ عَلِمْتُ أَنَّ بَعْضَكُمْ خَالَجَنِيهَا ».**

واتە: لە عیمرانی کوڕی (حُصَيْن)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەکردن، کە لەنوێژ بووەوە فەرمووی: (کێ بوو سورەتی: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی دەخوێند؟). پیاوێك وتی: من بووم، فەرمووی: (دەمزانی هەندێ لە ئێوە هەیە لێم تێك دەدات واتە سەرقاڵم دەکات بەدەنگ بەرزکردنەوەکەی لەکاتی قورئان خوێندندا).

## باسی ئەگەر نەخوێندەوار و عەجەمی توانای لەبەرکردنی قورئانیان نەبوو چی بخوێنن لە جیاتیدا کە بەسیان بێت و پاداشتی لەسەر وەربگرن.

## ١٣٩ - بَابُ مَا يُجْزِئُ الأُمِّيَّ وَالأَعْجَمِيَّ مِنَ الْقِرَاءَةِ.

٨٣٠ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَفِينَا الأَعْرَابِيُّ وَالأَعْجَمِيُّ فَقَالَ: « اقْرَءُوا، فَكُلٌّ حَسَنٌ وَسَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَامُ الْقِدْحُ، يَتَعَجَّلُونَهُ وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ ».

واتە: لە جابری کوڕی (عبداللە)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم هات بۆ لامان، ئێمەش کۆمەڵێ لە هاوەڵان قورئانمان دەخوێند عەجەمی و دەشتەکیمان لەناودا بوو، فەرمووی: (بخوێنن، قورئان خوێندنی هەمووتان چاکە، کۆمەڵانێ پەیدا دەبن زۆر بەجوانی و ڕێك و پێکی قورئان دەخوێنن وەك چۆن داری تیر ڕێز دەکرێت پێش ئەوەی سەری پێوە بکرێت، بەڵام قورئانەکە لەپێناوی بەرژەوەندی و پاداشتی دنیایدا دەخوێنن، نەك بە هیوای پاداشتی دوارۆژ).

٨٣١ - (حسن صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا وَنَحْنُ نَقْتَرِئُ، فَقَالَ: « الْحَمْدُ لِلَّهِ، كِتَابُ اللَّهِ وَاحِدٌ، وَفِيكُمُ الأَحْمَرُ، وَفِيكُمُ الأَبْيَضُ، وَفِيكُمُ الأَسْوَدُ، اقْرَءُوهُ قَبْلَ أَنْ يَقْرَأَهُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَوَّمُ السَّهْمُ، يَتَعَجَّلُ أَجْرَهُ، وَلاَ يَتَأَجَّلُهُ ».

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هات بۆ لامان، ئێمەش قورئانمان دەخوێند، فەرمووی: (سوپاس و ستایش بۆ خوا قورئانەکەی خوا یەکە، کەچی ئێوە تێتاندایە سورە، هەتانە سپییە، تێشتاندایە رەشە، بیخوێننەوە پێش ئەوەی کۆمەڵانێ بیخوێننەوە بەجوانی و رێك و پێکی وەك چۆن تیر رێز دەکرێت، بەڵام قورئان خوێندنەکەیان لەپێناوی بەرژەوەندی و پاداشتی دنیایدایە، نەك بە هیوای پاداشتی دوارۆژ).

٨٣٢ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْئًا، فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِئُنِي مِنْهُ، فَقَالَ: « قُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا لِلَّهِ ﴿عَزَّ وَجَلَّ﴾، فَمَا لِي؟ قَالَ:

« قُلِ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي، وَاهْـدِنِي ». فَلَمَّا قَامَ قَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَمَّا هَذَا فَقَدْ مَلأَ يَدَهُ مِنَ الْخَيْرِ ».

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتووە، کە وتویـەتی: پیـاوێ هاتـە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئێستا بەم دەست و بردە ناتوانم هیچ لە قورئان لەبەر بکەم، کەواتە شتێکم فێر بکە لەجیاتی قورئان بیخوێنم، فەرمووی: بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَـرُ، وَلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ). پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە زیکر و یادی خوایە بۆ ئەوە، ئەی چی بۆ من؟ فەرمووی: بڵێ: (اللَّهُمَّ ارْحَمْنِـي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي، وَاهْدِنِي). واتە: خودایە لێم خۆش ببەو بـەزەییت هـەبێ بـۆم و، رۆزیم بدەو، لەش ساغم بکەو، رێنمایم بکە بۆ رێی راسـت. جـا پیاوەکـە کـە هەسـتا بـڕوا وشـە بـە وشـە بـە پەنجـەکانی هـەردوو دەسـتی دەیـژماردن هـەر وشەیەکی دەوت و پەنجەیەکی دەنوقاندو دەیوت: ئەمـە یـەك، ئەمـە دوو ... تـا دوایـی، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (بـەڵێ ئـەم پیـاوە هەردوو دەستی خۆی پڕکرد لە خێر و چاکە).

٨٣٣ - (ضعيف موقـوف) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، قَالَ: :كُنَّا نُصَلِّي التَّطَوُّعَ نَدْعُو قِيَامًا وَقُعُودًا، وَنُسَبِّحُ رُكُوعًا وَسُجُودًا.

واتە: لـە جـابری کـوڕی (عبداللـە)وە هـاتووە، کـە وتویـەتی: ئێمـە کـاتێ کـە نوێـژی سـوننەتمان دەکـرد بەدانیشـتن و بـەپێوە دەپاڕاینـەوەو، لـەرکوع و سەجدەشدا تەسبیحاتمان دەکرد.

٨٣٤ - (ضعيف مقطوع) عَنْ حُمَيْدٍ، مِثْلَهُ، لَمْ يَذْكُرِ التَّطَوُّعَ، قَالَ: كَانَ الْحَسَنُ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ إِمَامًا أَوْ خَلْفَ إِمَامٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَيُسَبِّحُ وَيُكَبِّرُ وَيُهَلِّلُ قَدْرَ قَاف وَالذَّارِيَاتِ.

واتە: لە حومەیدەوە، بە هەمان مانا هاتووە، بەڵام باسی نوێژی سوننەتی نەکرد، وتی: حەسەنی – (بصری) - پێشنوێژی بکردایە یان لەدوای پێشنوێژەوە بوایە لەنوێژی نیوەڕ و عەسردا سورەتی فاتیحەی دەخوێند، بە ئەندازەی خوێندنی هەردوو سورەتی (قاف) و (الذَّارِيَات) (سبحان الله) و (الله اكبر) و (لا اله الا الله)ی دەخوێند.

## باسی تەواوکردنی (الله اكبر)ەکانی نوێژ

## ١٤٠ – بَابُ تَمَامِ التَّكْبِيرِ.

٨٣٥ - (صحيح) عَنْ مُطَرِّفٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ أَنَا وَعِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ خَلْفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَكَانَ إِذَا سَجَدَ كَبَّرَ، وَإِذَا رَكَعَ كَبَّرَ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ، فَلَمَّا انْصَرَفْنَا أَخَذَ عِمْرَانُ بِيَدِي وَقَالَ: لَقَدْ صَلَّى هَذَا قَبْلُ، أَوْ قَالَ: لَقَدْ صَلَّى بِنَا هَذَا قَبْلَ صَلَاةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە (مُطَرِّف)وە هاتووە، کە وتویەتی: من و عیمرانی کوڕی (حُصَيْن) لەدوای پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ نوێژمان دەکرد، کاتێ کە دەچووە سەجدەوە (الله اکبر)ی دەکرد، کاتێ کە دەچووە ڕکوعەوە(الله اکبر)ی دەکرد، لەدوای دووەم ڕکات کە هەڵئەسایەوە (الله اکبر)ی دەکرد، کاتێ کە لەنوێژ بووینەوە عیمران دەستی گرتم و وتی: ئەم نوێژەی پێشەوا عەلی نوێژی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم یادخستمەوە، یان وتی: ئەم نوێژە وەك نوێژی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو.

٨٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ صَلاَةٍ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ وَغَيْرِهَا: يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ يَقُولُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْجُلُوسِ فِي اثْنَتَيْنِ، فَيَفْعَلُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَنْصَرِفُ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَقْرَبُكُمْ شَبَهًا بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِنْ كَانَتْ هَذِهِ لَصَلاَتُهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە لەهەموو نوێژێکی فەرز و غەیری

فەرزیشدا (الله اكبر)ی دەكرد، كاتێ كە هەڵئەسا بۆ نوێـژكردن رێـك رادەوەسـتاو (الله اكبر)ی دەكرد، كاتێ كە دەچووە ركوعەوە (الله اكبر)ی دەكرد، ئینجـا پشـتی بەرزدەكردەوەو دەیفـەرموو: (سَمِعَ اللّٰـهُ لِمَـنْ حَمِـدَهُ). پاشـان كـە ریـك دەبـۆوە دەیفـەرموو: (رَبَّنَـا وَلَـكَ الْحَمْـدُ). پـێش ئـەوەی بچـێتە سـەجدەوە، ئینجـا دەیفــەرموو: (الله اكــبر) كــاتێ كــە دائەنەویــەوە بــۆ ســەجدە، لەپاشــاندا دەیفەرمووەوە: (الله اكبر)، كاتێ كە سەری بەرزدەكردەوە لەسەجدە، ئینجا كاتێ هەڵئەسایەوە لەهەردوو سەجدەكەدا دەیفەرموو: (الله اكبر)، لەهەموو ركاتێكدا بەوشێوەیەی دەكرد هەتا لەنوێژ بووەوە، كاتێ كە ئەبو هورەیرە لەنوێـژ بـووەوە وتی: بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە نوێژی من لەنوێژی هەمووتان زیاتر لەنوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچێت، بێگومـان پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو شێوەیە نوێژی دەكرد هەتا دونیای بەجێهێشت.

**٨٣٧ - (ضعيف) عَنْ ابْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْـزَى ، عَـنْ أَبِيـهِ، أَنَّـهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ وَكَـانَ لاَ يُتِمُّ التَّكْبِيرَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَعْنَاهُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَـهُ مِـنَ الرُّكُـوعِ وَأَرَادَ أَنْ يَسْـجُدَ لَـمْ يُكَبِّـرْ، وَإِذَا قَـامَ مِـنَ السُّجُودِ لَمْ يُكَبِّرْ.**

واتە: لـە (ابْـنِ عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ بْـنِ أَبْـزَى)وە لـە باوكیـەوە هـاتووە، كـە لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێـژی كـردووە، (الله اكبر)ەكـانی تـەواو نەدەكرد. ئەبو داود دەڵێت: واتە كاتێ كـە سـەری بـەرزدەكردەوە لـە ركـوع (الله اكبر)ی نەدەكرد، وە كاتێ كە دەیوست بچـێتە سـەجدەوە (الله اكـبر)ی نـەدەكرد، وە كاتێ كە لە سەجدە سەری بەرزدەكردەوە (الله اكبر)ی نەدەكرد.

## باسی چۆنیەتی دانانی هەردوو ئەژنۆی لەپێش هەردوو دەستیەوە.

## ١٤١ - بَابُ كَيْفَ يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ

٨٣٨ - (ضعيف) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَجَدَ وَضَعَ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ، وَإِذَا نَهَضَ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ.

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: واتە: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینوە کاتێ کە دائەنەویەوە بۆ سەجدە بردن ئەژنۆکانی لە پێش دەستەکانیەوە دەخستە سەر زەوی، وە کاتێ کە هەڵئەسایەوە دەستەکانی لەپێش ئەژنۆکانیەوە بەرزدەکردنەوە.

٨٣٩ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ حَدِيثَ الصَّلَاةِ، قَالَ: فَلَمَّا سَجَدَ وَقَعَتَا رُكْبَتَاهُ إِلَى الأَرْضِ قَبْلَ أَنْ تَقَعَ كَفَّاهُ، قَالَ هَمَّامٌ: وَحَدَّثَنَا شَقِيقٌ ﴿قَالَ﴾: حَدَّثَنِي عَاصِمُ بْنُ كُلَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِ هَذَا، وَفِي حَدِيثِ أَحَدِهِمَا - وَأَكْبَرُ عِلْمِي أَنَّهُ فِي

حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَـادَةَ -: وَإِذَا نَهَـضَ نَهَـضَ عَلَـى رُكْبَتَيْهِ وَاعْتَمَدَ عَلَى فَخِذِهِ.

واتە: لە (عَبْدِ الْجَبَّار)ی کوڕی وائلەوە، لەباوکیەوە، ئەویش لـە پێغەمبـەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە، وتی: کاتێ کە سـەجدەی دەبـرد ئـەژنۆکانی لـەپێش لـەپی دەسـتەکانیەوە دەخسـتە سـەر زەوی، هـەممام وتـی: شـەقیق گێڕایـەوە، وتـی: لـە (عاصـم)ی کـوڕی کولەیبـەوە، لەباوکیـەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليـه وسـلم، بەهـەمان شـێوە فەرموودەکـەی پێشـووی گێڕایـەوە، لـە فـەرموودەی یەکێکیانـدا – ئەوەنـدەی مـن زانیـاریم دەربـارەی هـەبێت لـە فـەرموودەی موحەممـەدی کوڕی جـەحادەدا هـاتووە، کـە کاتێ هەڵئەسایەوە لەسەر ئەژنۆکانی هەڵئەسایەوەو هێزی دەدایە سەر رانی.

٨٤٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَـا يَبْـرُكُ الْبَعِيرُ، وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە سـەجدەی بـرد بـا وەکو وشتر نەکات، بەڵکو دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بخاتە سەر زەوی.

٨٤١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ فِي صَـلاَتِهِ فَيَبْـرُكُ كَمَـا يَبْرُكُ الْجَمَلُ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە فێری ئەوە بووە لەنوێژدا کە سەجدەی برد ئەژنۆکانی پێش دەستەکانی دەخاتە سەر زەوی وەك چۆن وشتر ئەژنۆکانی پێش دەستەکانی دەخاتە سەر زەوی.

## باسی بەرزبوونەوە لەکاتی تاکەکاندا.

## ١٤٢ – بَابُ النُّهُوضِ فِي الْفَرْدِ.

٨٤٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: جَاءَنَا أَبُو سُلَيْمَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ إِلَى مَسْجِدِنَا فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُصَلِّي بِكُمْ وَمَا أُرِيدُ الصَّلاَةَ، وَلَكِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، قَالَ: قُلْتُ لأَبِي قِلاَبَةَ: كَيْفَ صَلَّى؟ قَالَ: مِثْلَ صَلاَةِ شَيْخِنَا هَذَا - يَعْنِي عَمْرَو بْنَ سَلِمَةَ إِمَامَهُمْ - ، وَذَكَرَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الآخِرَةِ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى قَعَدَ ثُمَّ قَامَ.

واتە: لە ئەبو قەلابەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو سولەیمان مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث) هات بۆ مزگەوتەکەمان وتی: سوێند بە خوا من نوێژێکتان بۆ دەکەم بەڵام مەبەستم نوێژکردن نیە، بەڵکو دەمەوێت نیشانتان بدەم کە پێغەمبەری

خوام صلى الله عليه وسلم بينيوه چۆن نوێژی کردووه، ئەیوب راوی فەرموودەکە وتی: وتم بە ئەبو قەلابە - مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث) - چۆن نوێژی دەکرد؟ وتی: وەك ئەم شێخەمان نوێژی دەکرد- واتە وەك عەمری کوڕی سەلەمە کە پێشنوێژیان بوو — جا ئەبو قەلابە باسی مالیکی کرد کە چۆن کاتێ سەری بەرزدەکردەوە لە سەجدەی دووهەم رکاتی یەکەم کەمێ دادەنیشت ئینجا هەڵئەسایەوە سەرپێ.

٨٤٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: جَاءَنَا أَبُو سُلَيْمَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ إِلَى مَسْجِدِنَا، فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُصَلِّي وَمَا أُرِيدُ الصَّلاَةَ، وَلَكِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، قَالَ: فَقَعَدَ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، حِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الآخِرَةِ.

واتە: لە ئەبو قەلابەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو سولەیمان مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث) هات بۆ مزگەوتەکەمان وتی: سوێند بە خوا من نوێژێکتان بۆ دەکەم بەڵام مەبەستم نوێژکردن نیە، بەڵام دەمەوێت نیشانتان بدەم کە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بينيوه چۆن نوێژی دەکرد، ئەبو قەلابە وتی: - مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث) - لە سەجدەی کۆتایی رکاتی یەکەمدا کاتێ کە سەری بەرزدەکردەوە کەمێ دادەنیشت، ئینجا هەڵئەسایەوە.

٨٤٤ - (صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلاَتِهِ، لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا.

واتە: لە مالیکی کوڕی (حُوَیْرِث)ەوە هاتووە، کە چاوی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەوتووە، کاتێ کە نوێژی دەکرد لەکاتی تاکەکاندا — واتە رکاتی یەکەم و سێیەم — ، هەڵنەئەسایەوە هەتا ڕێک دادەنیشت ئینجا هەڵئەسایەوە.

## باسی دانیشتن(الإِقْعَاءِ)[1] لەنێوان دوو سەجەدەکاندا.

## ١٤٣ - بَابُ الإِقْعَاءِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

٨٤٥ - (صحيح) عَنْ أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ طَاوُسًا يَقُولُ: قُلْنَا لابْنِ عَبَّاسٍ فِي الإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ فِي السُّجُودِ؟ فَقَالَ: هِيَ السُّنَّةُ، قَالَ: قُلْنَا: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرَّجُلِ، فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ: هِيَ سُنَّةُ نَبِيِّكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

---

[1] - (الإِقْعَاءِ) لێرەدا مەبەست لەوەیە لەنێوان دوو سەجدەکەدا سەری پەنجەکانی هەردوو پێ ڕووەو قیبلە لەسەر زەوی بچەقێنرێ و هەردوو سمت بخرێتە سەر هەردوو پاژنەی پێ.

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە هاتووە، كە لە (طَاوُس)ی بیستووە دەیوت: بۆ دانیشتن(الإِقْعَاءِ) لەسەر هەردوو پاژنەی پێ لەكاتی دانیشتنی نێوان دوو سەجدەكاندا لە ئیبنو عەباسمان رەزای خوایان لێ بێ پرسی؟ وتی: ئەوە سوننەتە، (طَاوُس) وتی: وتمان: وای دەبینین ئەمە بۆ پیاو زەحمەت بێت و خۆ ماندوو كردنی تێدایە؟ ئیبنو عەباس وتی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەكەتانە صلى الله عليه وسلم.

## باسی نوێژخوێن كاتێ كە سەر بەرزدەكاتەوە لەركوع چی دەڵێت؟

## ١٤٤ – بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ.

٨٤٦ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ الْحَسَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ يَقُولُ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ ».

واتە: لە عوبەیدی كوڕی حەسەنەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە (عبداللە)ی كوڕی ئەبی ئەوفام بیستووە دەیوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە سەری بەرزدەكردەوە لەركوع دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا

لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ). واتە: خوای گەورە ستایشی ئەو كەسەی بیست كە ستایشی كردو سوپاسگوزاری بوو، خوای پەروەردگارمان سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، پڕ بە ئاسمانەكان و پڕ بە زەوی، پڕ بەو شتەی خۆت ویستت لێ بێت.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَشُعْبَةُ بْنُ الْحَجَّاجِ: عَنْ عُبَيْدٍ أَبِي الْحَسَنِ: هَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ فِيهِ: بَعْدَ الرُّكُوعِ، قَالَ سُفْيَانُ: لَقِينَا الشَّيْخَ عُبَيْدًا أَبَا الْحَسَنِ بَعْدُ فَلَمْ يَقُلْ فِيهِ: (بَعْدَ الرُّكُوعِ).

ئەبو داود دەڵێت: (سُفْيَان الثَّوْرِيّ) و شوعبەی كوڕی حەجاج ئەم فەرموودەیان لە ئەبی حەسەنەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام فەرموودەكە ئەم پاڕانەوەی تێدا نیە: لەدوای ركوع، سوفیان وتی: لەدوایدا گەیشتین بە شێخ عوبەید ئەبا حەسەن باسی ئەم پاڕانەوەی نەكرد: لەدوای ركوع.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي عِصْمَةَ، عَنْ الأَعْمَشِ، عَنْ عُبَيْدٍ، قَالَ: «بَعْدَ الرُّكُوعِ».

ئەبو داود دەڵێت: شوعبە لە (أَبِي عِصْمَةَ)ەوە، لە ئەعمەشەوە، لە عوبەیدەوە گێڕاویەتیەوە، كە فەرمویەتی: (لەدوای ركوع) ئەم پاڕانەوە دەخوێنرێت.

٨٤٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: - حِينَ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ - : « اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَاءِ » -

قَالَ مُؤَمَّلٌ: (مِلْءَ السَّمَوَاتِ) - وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ ». زَادَ مَحْمُودٌ: « وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ »، ثُمَّ اتَّفَقُوا: - « وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ ». قَالَ بِشْرٌ: « رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ ». لَمْ يَقُلْ مَحْمُودٌ: « اللَّهُمَّ ». قَالَ: « رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ».

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَاءِ). (مُؤَمَّل) راوی فەرموودەكە وتی: (مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ). مەحمود راوی فەرموودەكە ئەمەشی بۆ زیاد كرد: (وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ). پاشان رێكەوتن لەسەر ئەمە: (وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ). بیشر راوی فەرموودەكە وتی: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). مەحمود (اللَّهُمَّ)ەی نەوت. بەڵكو وتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

٨٤٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا قَالَ الإِمَامُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: کاتێ کە پێشنوێژ وتی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ).ئێوەش بڵێن: (اللّٰهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). چونکە ئەو کەسەی وتەکەی لەگەڵ وتەی مەلائیکەکانی پەروەردگاردا یەك بکەوێت، ئەوا خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی رابردووی خۆش دەبێت.

٨٤٩ -(حسن مقطوع) عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: لاَ يَقُولُ الْقَوْمُ خَلْفَ الإِمَامِ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَلَكِنْ يَقُولُونَ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ.

واتە: لە عامرەوە کە وتویەتی: خەڵك لەدوای پێشنوێژەوە نالێن: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). بەڵكو دەڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ).

## باسی پاڕانەوە لە نێوان دوو سەجدەکەدا.

## ١٤٥- بَابُ الدُّعَاءِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

٨٥٠ - (حسن) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا دەیفەرموو: خوایە لێم خۆش ببەو، بەزەییت هەبێ بۆم و، لەش ساغم بکەو، رێنمایم بکەو رۆزیم بدە.

## باسی سەر بەرزكردنەوەی ئافرەتان لە سەجدەدا ئەگەر لەگەڵ پێشنوێژ بوون.

## ١٤٦ – بَابُ رَفْعِ النِّسَاءِ إِذَا كُنَّ مَعَ الإِمَامِ رُءُوسَهُنَّ مِنَ السَّجْدَةِ.

٨٥١ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ مِنْكُنَّ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلاَ تَرْفَعْ رَأْسَهَا حَتَّى يَرْفَعَ الرِّجَالُ رُءُوسَهُمْ».كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَيْنَ مِنْ عَوْرَاتِ الرِّجَالِ.

واتە: لە (أَسْمَاء)ی كچی ئەبو بەكرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەوەی بڕوای بە خواو بە دوارۆژ هەیە، با سەری لە سەجدە بەرزنەكاتەوە هەتا پیاوان سەریان بەرزدەكەنەوە). لەبەر ئەوەی نەوەكا چاویان بكەوێت بە عەورەتی پیاوان.

## باسی ماوەی هەستانەوە لە رکوع و دانیشتنی لەنێوان دوو سەجدەکەدا.

## ١٤٧ - بَابُ طُولِ الْقِيَامِ مِنَ الرُّكُوعِ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

٨٥٢ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ سُجُودُهُ وَرُكُوعُهُ وَقُعُودُهُ، وَمَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ.

واتە: لە (بَـرَاءِ)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رکوعەکەی و سەجدەکەی و دانیشتنی لەنێوان دوو سەجدەکەدا، هەموویان نزیک بوون لەیەکەوە.

٨٥٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: مَا صَلَّيْتُ خَلْفَ رَجُلٍ أَوْجَزَ صَلَاةً مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي تَمَامٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَالَ: « سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ». قَامَ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَوْهَمَ، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَسْجُدُ، وَكَانَ يَقْعُدُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَوْهَمَ.

واتە: لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: لەدوای هیچ كەسێكەوە نوێژم نەكردووە نوێژەكەی كورت تر و تەواو تر بێت لەنوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەركاتێ لە نوێژدا دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). ئەوەندە دەمایەوە هەتا كەسی وا هەبوو دەیوت: بێ ئاگا بووەو سەهوی كردووە، پاشان (الله أكبر)ی دەكردوو سەجدەی دەبرد، ئەوەندە دائەنیشت لە نێوان سەجدەكاندا تا وامان گومان دەكرد بێ ئاگا بووە.

٨٥٤ - (صحيح) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: رَمَقْتُ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَقَالَ: أَبُو كَامِلٍ: رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فِي الصَّلَاةِ، فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ كَرَكْعَتِهِ، وَسَجْدَتِهِ ﴿كَرَكْعَتِهِ وَسَجْدَتِهِ﴾ وَاعْتِدَالَهُ فِي الرَّكْعَةِ كَسَجْدَتِهِ، وَجِلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ وَسَجْدَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالِانْصِرَافِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ.

واتە: لە بەرائی كوڕی عازبەوە هاتووە، كە وتویەتی: لە نوێژدا سەرنجی موحەممەدم دا صلی الله علیه وسلم – ئەبو كامل وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وەستانەكەیم دی، ركوعەكەیم دی، هەستانەوەی دوای ركوعەكەیم دی، سەجدەكەی و، دانیشتنی نێوان سەجدەكان و، سەجدەكەی تریش و، دانیشتنی نێوان سەلام دانەوەو رۆیشتنی هەموویان نزیك بوون لەیەكەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مُسَدَّدٌ: فَرَكْعَتَهُ، وَاعْتِدَالَهُ بَيْنَ الرَّكْعَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالانْصِرَافِ، قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ.

ئەبو داود دەڵێت: موسەددەد وتی: رکوعەکەی و، هەستانەوەی دوای رکوعەکەی و، سەجدەکەی و، دانیشتنی نێوان سەجدەکانی و، سەجدەکەی و دانیشتنی نێوان سەلام دانەوەو رۆیشتنی هەموویان نزیك بوون لەیەکەوە.

## باسی نوێژی کەسیٚ کە بەتەواوی پشتی راست نەکاتەوە لە رکوع و سەجدەدا.

## ١٤٨ - بَابُ صَلاَةِ مَنْ لاَ يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ.

٨٥٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:«لاَ تُجْزِئُ صَلاَةُ الرَّجُلِ حَتَّى يُقِيمَ ظَهْرَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ ».

واتە: لە ئەبو مەسعودی بەدریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کەسێك نوێژی تەواو و دروست نیەو لەسەری ناکەوێت هەتا پشتی راست نەکاتەوە لە رکوع و سەجدەکانیدا).

٨٥٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ السَّلاَمَ وَقَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ». فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى كَمَا كَانَ صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ ». ثُمَّ قَالَ: « ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ». حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا فَعَلِّمْنِي. قَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ اجْلِسْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕۆشتە مزگەوتەوە، پیاوێك هاتە ناو مزگەوت نوێژی کرد و پاشان چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سڵاوی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد).

ئینجا پیاوەکە گەڕایەوە بە هەمان شێوە نوێژەکەی کردەوەو هاتەوە بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و سڵاوی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد). هەتا سێ جار پیاوەکەی گەڕاندەوە بەو شێوەیە، پاشان پیاوەکە وتی: بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە لەوە چاکتر نازانم، دەی تۆ فێرم بکە، ئەویش فەرمووی: (کاتێ کە هەستای بۆ نوێژ نیەت بێنەو(الله أكبر) بکە پاشان چەندت بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەرتە بیخوێنە، پاشان بچۆ بەرکوعدا و هێندە بوەستە هەتا جەستەت لە جوڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرز بەرەوە تا بەتەواوی راست دەبیتەوە، پاشان سەجدە ببەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، پاشان بەرزبەرەوە تا بە دانیشتویی ئارام دەبیت، پاشان سەجدە بەرەوەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، جا بەم شێوەیە هەموو نوێژەکەت ئەنجام بدە.

قَالَ الْقَعْنَبِيُّ: عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَقَالَ: فِي آخِرِهِ: « فَإِذَا فَعَلْتَ هَذَا فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُكَ وَمَا انْتَقَصْتَ مِنْ هَذَا شَيْئًا فَإِنَّمَا انْتَقَصْتَهُ مِنْ صَلاَتِكَ ». وَقَالَ: فِيهِ: « إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ ».

واتە: قەعنەبی وتی: لە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدی مەقبورییەوە، لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە لە کۆتایی فەرمودەکەدا فەرمووی: (ئەگەر ئەوانەت هەموو ئەنجامدا ئەوا نوێژەکەت تەواوە، وە ئەگەر شتێکت لێ ئەنجام نەدا ئەوا نوێژەکەت بەتەواوی ئەنجام نەداوە). وتی: کاتێك هەستای بۆ نوێژ بە جوانی دەستنوێژ بگرە.

٨٥٧ - (صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَحْيَى بْنِ خَلاَّدٍ، عَنْ عَمِّهِ، أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ - فَذَكَرَ نَحْوَهُ - قَالَ فِيهِ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنَّهُ لاَ تَتِمُّ صَلاَةٌ لأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ حَتَّى يَتَوَضَّأَ فَيَضَعَ الْوُضُوءَ ». - يَعْنِي مَوَاضِعَهُ - « ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَحْمَدُ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ وَيُثْنِي عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ بِمَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَرْكَعُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ، ثُمَّ يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَسْجُدُ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيُكَبِّرُ، فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ ».

واتە: لە عەلی کوڕی یەحیای کوڕی خەلادەوە، لە مامیەوە هاتووە، کە جارێ پیاوێك هاتە ناو مزگەوت، راوی بە هەمان شێوە فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە، تێیدا وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ( بێگومان نوێژی هیچ کەسێك راست و دروست و تەواو نیە هەتا دەستنوێژ بە تەواوی نەگرێت). – واتە هەتا ئەندامەکانی دەستنوێژ بە جوانی نەشوات – (پاشان (الله أكبر) بکات و سوپاس و ستایشی خوا بکات و سورەتی فاتیحە بخوێنێ و چەندەی بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەریەتی بیخوێنێت، پاشان (الله أكبر) بکات و بچێ بەرکوعدا و هێندە بوەستێ هەتا جومگەکانی دەچنەوە

جێگای خۆیان و جەستەی لە جوڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرز بێتەوە بڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). هەتا بەتەواوی راست دەبیتەوە، پاشان (الله أكبر) بكات و سەجدە ببات و هێندە بمێنێتەوە هەتا جومگەکانی ئارام دەگرن، ئینجا (الله أكبر) بكات و سەری بەرزبكاتەوە لەسەجدە هەتا رێك دەبێتەوە، پاشان (الله أكبر) بكات و سەجدە ببات و هێندە بمێنێتەوە هەتا جومگەکانی ئارام دەگرن، پاشان (الله أكبر) بكات و سەری بەرزبكاتەوە لەسەجدە، ئەگەر بەم شێوەیە نوێژەکەی ئەنجام بدات ئەو کاتە نوێژەکەی راست و دروست و تەواوە.

٨٥٨ - (صحيح) عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ - بِمَعْنَاهُ - قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِنَّهَا لاَ تَتِمُّ صَلاَةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ بِرَأْسِهِ، وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ اللَّهَ تَعالَى وَيَحْمَدُهُ، ثُمَّ يَقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أُذِنَ لَهُ فِيهِ وَتَيَسَّرَ ». - فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ حَمَّادٍ قَالَ: - ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَسْجُدُ، فَيُمَكِّنُ وَجْهَهُ - قَالَ هَمَّامٌ: وَرُبَّمَا قَالَ: « جَبْهَتَهُ» - مِنَ الأَرْضِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَسْتَوِي قَاعِدًا عَلَى مَقْعَدِهِ وَيُقِيمُ صُلْبَهُ - فَوَصَفَ الصَّلاَةَ هَكَذَا أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، حَتَّى فَرَغَ - لاَ تَتِمُّ صَلاَةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يَفْعَلَ ذَلِكَ ».

واتە: لە ریفاعەی كوڕی رافیعەوە ئەم فەرموودە بە هەمان مانا هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (بێگومان نوێژی هیچ كەسێك راست و دروست و تەواو نیە هەتا بەو شێوەیەی كە خوای گەورە فەرمانی كردووە دەستنوێژ نەگرێت، دەم و چاوی بشوات لەگەڵ هەردوو دەستەكانی هەتا ئەنیشكەكانی و مەسحی سەری بكات و، هەردوو پێی هەتا قولەپێكانی بشوات و، (پاشان (الله أكبر) بكات و سوپاس و ستایشی خوا بكات و سورەتی فاتیحە بخوێنێ و چەندەی بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەریەتی بیخوێنێ). - بە هەمان شێوە فەرموودەكەی وەك فەرموودەكەی حەماد گێڕایەوەو، وتی - پاشان (الله أكبر) بكات و سەجدە بەرێت و ناوچاوی لەسەر زەوی جێگیر بكات، هەمام وتی: لەوانەیە فەرمووی: (تەوێڵی) بخاتە سەر زەوی هەتا جومگەكانی دەچنەوە جێگای خۆیان و جەستەی لە جوڵە دەكەوێت، ئینجا (الله أكبر) بكات و هەستێتەوە لە جێگای خۆی و پشتی رێك راست بكاتەوە - بەو شێوەیە وەسفی چوار ركات نوێژی كرد، هەتا لێ بوویەوە- كەواتە نوێژی هیچ كەسێك لەئێوە راست و دروست و تەواو نیە هەتا بەو شێوەیە نوێژ نەكات.

٨٥٩ - (حسن) عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: « إِذَا قُمْتَ فَتَوَجَّهْتَ إِلَى الْقِبْلَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَبِمَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَقْرَأَ، وَإِذَا رَكَعْتَ فَضَعْ رَاحَتَيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ وَامْدُدْ ظَهْرَكَ - وَقَالَ: - إِذَا سَجَدْتَ فَمَكِّنْ لِسُجُودِكَ، فَإِذَا رَفَعْتَ فَاقْعُدْ عَلَى فَخِذِكَ الْيُسْرَى».

واتـە: لـە ریفاعـەی کـوڕی رافیعـەوە، ئـەم بەسـەرهاتە هـاتووە، فـەرمووی: (کـاتێ هەسـتای بـۆ نوێـژ روو بکـەرە قیبلـەو (الله أکـبر) بکـە، پاشـان سـورەتی فاتیحە بخوێنەو ئەوەندە خوا حەز بکات قورئـان بیخوێنـە، کاتێ کە چوویتە رکوعەوە بەری هەردوو دەستت لەسەر هەردوو ئەژنۆت دابنێ و پشتت درێژکە – وە فەرمووی: (ئەگەر سەجدەت برد ئەندامەکانی سەجدەت لە زەوی جێگیر بکە، کاتێ کە راست بویتەوە لەسەر رانی چەپت دانیشە).

٨٦٠ - (حسن) عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: «إِذَا أَنْتَ قُمْتَ فِي صَـلاَتِكَ فَكَبِّرِ اللَّهَ تَعَـالَى، ثُـمَّ اقْـرَأْ مَـا تَيَسَّـرَ عَلَيْـكَ مِـنَ الْقُرْآنِ». - وَقَالَ فِيهِ: - « فَـإِذَا جَلَسْـتَ فِـي وَسَـطِ الصَّلاَةِ فَاطْمَئِنَّ، وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى، ثُمَّ تَشَـهَّدْ، ثُمَّ إِذَا قُمْتَ فَمِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى تَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِكَ ».

واتە: لە ریفاعەی کوڕی رافیعەوە ئەم بەسەرهاتە هاتووە، فەرمووی: (کـاتێ کە تۆ هەستای بۆ نوێژ روو بکەرە قیبلـەو خـوای گـەورە بـە بـەرز و شـکۆمەند راگرە (الله أکبر) بکە، پاشان سورەتی فاتیحە بخوێنەو ئەوەنـدە خـوا حـەز بکـات قورئان بیخوێنە). کـاتێ کـە چوویتە رکوعـەوە بـەری هـەردوو دەسـتت لەسـەر هـەردوو ئـەژنۆت دابـنێ و پشـتت درێژکـە – وە تێیـدا فـەرمووی - (ئەگـەر لـە ناوەڕاسـتی نوێژەکەتـدا دانیشـتی ئـارام بگـرەو رانـی چـەپت رابخـەو لەسـەری دانیشە، پاشان تەحیات بخوێنەوە، ئینجا کاتێ کە هەستایتەوە بە هەمان شێوە، هەتا هەموو نوێژەکەت تەواو دەکەیت).

٨٦١ - (صحيح) عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَصَّ هَذَا الْحَدِيثَ، قَالَ فِيهِ: « فَتَوَضَّأْ كَمَا أَمَرَكَ اللَّهُ ﴿جَلَّ وَعَزَّ﴾ ثُمَّ تَشَهَّدْ، فَأَقِمْ، ثُمَّ كَبِّرْ، فَإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرَأْ بِهِ، وَإِلاَّ فَاحْمَدِ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ وَكَبِّرْهُ وَهَلِّلْهُ ». - وَقَالَ فِيهِ: - « وَإِنِ انْتَقَصْتَ مِنْهُ شَيْئًا، انْتَقَصْتَ مِنْ صَلاَتِكَ ».

واتە: لە ریفاعەی کوڕی رافیعەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرموودەکەی گێڕایەوە، تێیدا فەرمووی: (دەستنوێژ بگرە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووی، پاشان تەحیات بخوێنە، هەستە، پاشان (الله أكبر) بکە، ئەگەر قورئانت دەزانی قورئان بخوێنە ئەگینا (الحمد لله) و (الله أكبر) و (لا إله إلا الله) بڵێ. وە تێیدا فەرمووی: (ئەگەر شتێکت لێ ئەنجام نەدا، ئەوا نوێژەکەت بەتەواوی ئەنجام نەداوە).

٨٦٢ - (حسن) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ، وَافْتِرَاشِ السَّبُعِ، وَأَنْ يُوَطِّنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ فِي الْمَسْجِدِ كَمَا يُوَطِّنُ الْبَعِيرُ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی کردبوو دەنوك بە زەویدا بدرێت لەنوێژدا وەك

قەلەڕەش، پاڵكەوتن وەك دڕندە، پیاوێك شوێنێك لەمزگەوتدا بۆخۆی دیاری بكات لەوشوێنە دانەبێ نوێژ نەكات، وەك چۆن وشتر لە شوێنی خۆیدا نەبێت پاڵ ناكەوێت.

٨٦٣ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ الْبَرَّادِ، قَالَ: أَتَيْنَا عُقْبَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَنْصَارِيَّ أَبَا مَسْعُودٍ، فَقُلْنَا لَهُ حَدِّثْنَا عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَامَ بَيْنَ أَيْدِينَا فِي الْمَسْجِدِ، فَكَبَّرَ، فَلَمَّا رَكَعَ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَجَعَلَ أَصَابِعَهُ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ، وَجَافَى بَيْنَ مِرْفَقَيْهِ، حَتَّى اسْتَقَرَّ كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقَامَ حَتَّى اسْتَقَرَّ كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ جَافَى بَيْنَ مِرْفَقَيْهِ حَتَّى اسْتَقَرَّ كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَجَلَسَ حَتَّى اسْتَقَرَّ كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ، فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ أَيْضًا، ثُمَّ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ مِثْلَ هَذِهِ الرَّكْعَةِ، فَصَلَّى صَلاَتَهُ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي.

واتە: لە سالمی كوڕی بەڕادەوە هاتووە، كە وتویەتی: چوین بۆ لای عوقبەی كوڕی عەمری (الأَنْصَارِيَّ أَبَا مَسْعُود) پێمان وت: باسی چۆنیەتی نوێژكردنی

پێغەمبەری خودامان صلی الله علیه وسلم بۆ بکە؟ ئەویش لەبەردەماندا هەستا لەناو مزگەوتدا، (الله اکبر)ی کردو نوێژی دابەست، کاتێ کە چووە رکوعەوە ناولەپی هەردوو دەستی لەسەر هەدوو ئەژنۆی داناو پەنجەکانی لە خوار ئەژنۆیەوە، ئەنیشکەکانی دوورخستەوە لە لاتەنیشتەکانی، هەتا هەموو ئەندامەکانی چوونەوە جێگای خۆیان و جەستەی ئارام بوویەوە پاشان وتی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). هەستایەوە لە رکوع و رێك راوەستا هەتا هەموو ئەندامەکانی چوونەوە جێگای خۆیان و جەستەی ئارام بوویەوە، پاشان (الله اکبر)ی کردو دابەزی بۆ سەر زەوی و سەجدەی بردو بەری هەردوو دەستی خستە سەر زەوی، ئەنیشکەکانی دوورخستەوە لە لاتەنیشتەکانی، هەتا هەموو ئەندامەکانی چوونەوە جێگای خۆیان و جەستەی ئارام بوویەوە، پاشان سەری بەرزکردەوەو دانیشت هەتا هەموو ئەندامەکانی چوونەوە جێگای خۆیان و جەستەی ئارام بوویەوە، هەروەها به هەمان شێوە سەجدەی دووهەمی برد، ئینجا وەك ئەو رکاتە چوار رکات نوێژی کردو، نوێژەکەی تەواو کردو لێ بوویەوە، پاشان وتی: پێغەمبەری خودامان صلی الله علیه وسلم بینی بەم شێوەیە نوێژی دەکرد.

## باسی فەرموودەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: هەر نوێژێك خاوەنەکەی بە تەواوی ئەنجامی نەدابوو، لە نوێژە سوننەتەکانی بۆی تەواو دەکرێت.

## ١٤٩ – بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ « كُلُّ صَلاَةٍ لاَ يُتِمُّهَا صَاحِبُهَا تَتِمُّ مِنْ تَطَوُّعِهِ».

٨٦٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ حَكِيمٍ الضَّبِّيِّ، قَالَ: خَافَ مِنْ زِيَادٍ - أَوِ ابْنِ زِيَادٍ - فَأَتَى الْمَدِينَةَ، فَلَقِيَ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: فَنَسَبَنِي فَانْتَسَبْتُ لَهُ، فَقَالَ: يَا فَتَى، أَلاَ أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا؟ قَالَ: قُلْتُ بَلَى رَحِمَكَ اللَّهُ - قَالَ يُونُسُ: أَحْسِبُهُ ذَكَرَهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمُ الصَّلاَةُ، قَالَ: يَقُولُ رَبُّنَا جَلَّ وَعَزَّ لِمَلاَئِكَتِهِ - وَهُوَ أَعْلَمُ - انْظُرُوا فِي صَلاَةِ عَبْدِي: أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا، فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً، وَإِنْ كَانَ انْتَقَصَ مِنْهَا شَيْئًا، قَالَ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ

تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ، قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ، ثُمَّ تُؤْخَذُ الأَعْمَالُ عَلَى ذَاكُمْ ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی حەکیمی (ضَبِّی)ەوە هاتووە، کە لە زیاد – یان ئیبنو زیاد – ترساوە بۆیە چوو بۆ مەدینە، لەوێ گەیشت بە ئەبو هورەیرە، ئەبو هورەیرە وتی: خۆت بناسێنە بزانم کێ و کوڕی کێی؟ ئەویش خۆی پێ ناساند، هەروەها ئەبو هورەیرە وتی: ئەی لاو ئایا فەرمودەیەکت بۆ نەگێڕمەوە، وتم بەڵێ بۆم بگێڕەرەوە ڕەحمەتی خودات لێ بێ، یونس ڕاوی فەرمودەکە وتی: وابزانم گەیاندیەوە سەر پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم واتە بە (مرفوع)ی بۆی گێڕایەوە: فەرمووی: (یەکەم شتێ لە کردەوەکان کە لە قیامەتدا بەندەی لەسەر موحاسەبە دەکەن نوێژە، وتی: خوای گەورە دەفەرموێت: - لەکاتێکدا کە خۆی ئاگادارە و دەیزانێت – تەماشای نوێژەکانی بەندەکەم بکەن بزانن بە تەوای و بەبێ کەموکوڕی ئەنجام داون یان نوێژەکانی کەموکوڕیان هەیە؟ ئەگەر نوێژەکانی پەسەند و تەواو بوون ئەوا بە تەواوی بۆی دەنوسرێت، خۆ ئەگەر شتێ کەموکوڕیان هەبوو، ئەوا دەفەرموێت: تەماشا بکەن بزانن ئایا ئەم بەندەیەی من نوێژی سوننەتی هەیە واتە سوننەتەکانی نوێژی جێبەجێ کردووە؟ جا ئەگەر هەیبوو، ئەوا دەفەرموێت: ناتەواوی فەرزەکانی ئەم بەندەیەم لە سوننەتەکانی تەواو بکەن، ئیتر هەموو کردەوەکانی تریشی بەم شێوەیە لێ وەردەگیرێت).

٨٦٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِنَحْوِهِ.

واتە: ئەبو هورەیرە، بە هەمان شێوە ئەم فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم گێڕاوەتەوە.

٨٦٦ - (إسناده صحيح) عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بِهَذَا الْمَعْنَى - قَالَ: « ثُمَّ الزَّكَاةُ مِثْلُ ذَلِكَ، ثُمَّ تُؤْخَذُ الأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ ».

واتە: تەمیمی داری، بە هەمان مانا ئەم فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوە، کە فەرمویەتی: (پاشان زەکاتیشی بە هەمان شێوە، ئینجا هەموو کردەوەکانی تریشی لەسەر ئەم شێوەیە لێ وەردەگیرێت).

## باسەکانی رکوع و سەجدەوە دانانی هەردوو دەست لەسەر هەردوو ئەژنۆ.

## ١٥٠- بَابُ تَفْرِيعِ أَبْوَابِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَوَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ.

٨٦٧ - (صحيح) عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، فَجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ فَنَهَانِي عَنْ ذَلِكَ، فَعُدْتُ فَقَالَ: لاَ تَصْنَعْ هَذَا، فَإِنَّا كُنَّا نَفْعَلُهُ، فَنُهِينَا عَنْ ذَلِكَ، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضَعَ أَيْدِيَنَا عَلَى الرُّكَبِ.

واتە: لە (مُصْعَب)ی کوڕی سەعدەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە تەنیشت باوکم نوێژم کرد، هەردوو ناولەپم لکاند بەیەکەوە، خستمە نێوان هەردوو ئەژنۆم –

لەکاتی رکوعدا- باوکم بەرگری ئەوەی لێکردم وتی: ئێمەش لەپێشەوە وامان دەکرد - بەڵام - فەرمانمان پێدرا، کە دەستەکانمان لەسەر ئەژنۆکانمان دابنێین.

**٨٦٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: إِذَا رَكَعَ أَحَدُكُمْ فَلْيَفْرِشْ ذِرَاعَيْهِ عَلَى فَخِذِهِ، وَلْيُطَبِّقْ بَيْنَ كَفَّيْهِ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى اخْتِلاَفِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: واتە: لە (عبدالله)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەگەر کەسێ لە ئێوە چووە رکوعەوە با دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی رابخات و، هەردوو ناولەپی بلکێنێ بەیەکەوەو بیانخاتە نێوان هەردوو ئەژنۆیەوە، وەك ئەوەی کە چاوم لە پەنجەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێت.

## باسی نوێژخوێن لە رکوع و سەجدەکەیدا چی دەڵێت؟

## ١٥١ – بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ.

**٨٦٩ - (ضعيف) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ). قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ ». فَلَمَّا نَزَلَتْ: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى). قَالَ: « اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ ».**

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ). واتە: بەپاکی یادی پەروەردگاری

گەورەی خۆت بکە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: لەڕکوعدا بیڵێن، وە کاتێ کە ئەم ئایەتەش هاتەخوارەوە: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى). بەپاکی یادی پەروەردگاری هەرمبڵندت بکە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: لە سەجدەدا بیڵێن.

٨٧٠ - (ضعيف) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ - بِمَعْنَاهُ — زَادَ: قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَكَعَ، قَالَ: « سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ ». ثَلاَثًا، وَإِذَا سَجَدَ، قَالَ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى وَبِحَمْدِهِ ». ثَلاَثًا.

واتە: عوقبەی کوڕی عامر - بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕاوەتەوە- بەڵام ئەمەشی بۆ زیاد کردوە وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەچووە رکوعەوە سێ جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ). واتە: تەسبیحات و پاکی و بێگەردی شایستەی پەروەردگاری مەزن و شکۆمەندی منەو سوپاسیشی دەکەم. وە کاتێکیش کە دەچووە سەجدەوە سێ جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى وَبِحَمْدِهِ). واتە: تەسبیحات و پاکی و بێگەردی شایستەی پەروەردگاری بەرز و بڵندی منەو سوپاسیشی دەکەم.

٨٧١ - (صحيح) عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: « سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ». وَفِي سُجُودِهِ: « سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى ». وَمَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَّ وَقَفَ عِنْدَهَا فَسَأَلَ، وَلاَ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلاَّ وَقَفَ عِنْدَهَا فَتَعَوَّذَ.

واتە: لە (حُذَيْفَة)ەوە هاتووە، كە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژی كردووە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ركوعدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ). وە لەسەجدەدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى). كاتێ كە دەگەیشت بە ئایەتی رەحمەت دەوەستاو دەپاڕایەوە، وە كاتێكیش كە دەگەیشت بە ئایەتێ شوێنی پەناگرتن بوایە بە خوای پەروەردگار، پەنای پێ دەگرت.

**٨٧٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: « سُبُّوحٌ، قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ».**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ركوع و سەجدەكەیدا دەیفەرموو: (سُبُّوحٌ، قُدُّوسٌ، رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ). واتە: خودایە تەسبیحات و پیرۆزی بۆ تۆیە پەروەردگاری مەلائیكەكان و روح.

**٨٧٣ - (صحيح) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، قَالَ: قُمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً، فَقَامَ فَقَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ: لاَ يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَّ وَقَفَ فَسَأَلَ، وَلاَ يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلاَّ وَقَفَ فَتَعَوَّذَ، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ بِقَدْرِ قِيَامِهِ، يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: « سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ ». ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ**

قِيَامِهِ، ثُمَّ قَالَ: فِي سُجُودِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ بِآلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَرَأَ سُورَةً سُورَةً.

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە هاتووە، کە وتویەتی: شەوێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم هەستام، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة)، بەسەر هیچ ئایەتێکی رەحمەتدا تێ نەدەپەڕی هەتا دەوەستاو دەپاڕایەوەو داوای رەحمەتی دەکرد، وە بەسەر هیچ ئایەتێکی سزادا تێ نەدەپەڕی هەتا دەوەستاو پەنای بە خوا دەگرت، وتی: پاشان دەچووە رکوعەوە بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی دەمایەوە، لە رکوعەکەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ). واتە: پاك و بێگەردە ئەو زاتەی کە خاوەنی هێز و دەسەڵاتەو خاوەنی موڵك و گەورەیی و عەزەمەتە. وتی: پاشان دەچووە سەجدەوەو بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی دەمایەوە، لە سەجدەکەیدا بە هەمان شێوەی دەفەرموو، ئینجا هەستایەوە بۆ رکاتی دووهەم و سورەتی (آلِ عِمْرَان)ی خوێند، پاشان هەر رکاتەو سورەتێکی دەخوێند.

٨٧٤ - (صحيح) عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فَكَانَ يَقُولُ: « اللَّهُ أَكْبَرُ - ثَلَاثًا - ذُو الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ». ثُمَّ اسْتَفْتَحَ، فَقَرَأَ الْبَقَرَةَ، ثُمَّ رَكَعَ، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِ، وَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ ». ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ

الرُّكُوعِ، فَكَانَ قِيَامُهُ نَحْوًا مِنْ رُكُوعِهِ يَقُولُ: « لِرَبِّيَ الْحَمْدُ ». ثُمَّ سَجَدَ، فَكَانَ سُجُودُهُ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِ، فَكَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى ». ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، وَكَانَ يَقْعُدُ فِيمَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ نَحْوًا مِنْ سُجُودِهِ، وَكَانَ يَقُولُ: « رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي ». فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فَقَرَأَ فِيهِنَّ الْبَقَرَةَ، وَآلَ عِمْرَانَ، وَالنِّسَاءَ، وَالْمَائِدَةَ، - أَوِ الأَنْعَامَ - شَكَّ شُعْبَةُ.

واتە: لە (حُذَيْفَة)ەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لە شەونوێژدا بینیوە دەیفەرموو: (الله أَكْبَرُ - سێ جار - ذُو الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ)، پاشان نوێژی دابەست و دەستی كرد بە خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة)، ئینجا دەچووە ركوعەوە، ركوعەكەی بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەكەی بوو، لە ركوعەكەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ). پاشان سەری بەرزكردەوە لە ركوع و هەستایەوە بە پێوە وەستانەكەی بە ئەندازەی ركوعەكەی بوو، دەیفەرموو: (لِرَبِّيَ الْحَمْدُ). ئینجا دەچووە سەجدەوە، سەجدەكەی بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەكەی بوو، لە سەجدەكەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى). پاشان سەری بەرزدەكردەوە لەسەجدە، لەنێوان دوو سەجدەكەدا هێندەی سەجدە بردنەكەی دادەنیشت و دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي). واتە: پەروەردگارم لێم خۆش ببە، پەروەردگارم لێم خۆش ببە. چوار ركات نوێژی كرد سورەتی (الْبَقَرَة) و (آلِ

عِمْرَان) و (النِّسَاءَ) و (الْمَائِدَةَ) و – یان (الأَنْعَام) - ی تێدا خوێندن. شوعبە گومانی هەبوو.

## باسی پاڕانەوە لەڕكوع و لەسەجدەدا.

## ١٥٢ – بَابُ ﴿فِي﴾ الدُّعَاءِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ.

٨٧٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نزیكترین جێگە كە بەندە لە پەروەردگاریەوە نزیك بێت، ئەو كاتەیە كە لە سەجدەدا بێت، كەواتە لەوكاتەدا زۆر بپاڕێنەوە).

٨٧٦ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَشَفَ السِّتَارَةَ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ: يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ، وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ: فَعَظِّمُوا

الرَّبَّ فِيهِ، وَأَمَّا السُّجُودُ: فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم - لەو كاتەدا كە نەخۆش بوو لەماڵەوە – پەردەی لاداو تەماشای كرد خەڵك لە پشتی ئەبو بەكرەوە ریزیان بەستووە – بۆ نوێژ – فەرمووی: (ئەی خەڵكینە موژدەدەرانی پێغەمبەرایەتی نەماون – ئەمە ئاماژەیە بە كۆچی خۆی – بێجگە لە خەوی چاك، كە موسڵمان خۆی دەیبینێ، یان خەڵكی تر پێوەی دەبینن، ئاگادار بن من رێگریم لێكراوە لەوەی، كە لەركوع و سەجدەدا قورئان بخوێنم، جا لە ركوعدا خوا بە گەورە دابنێن، واتە ئەو وشانە بەكاربهێنن، كە بەڵگەی دەسەڵات و گەورەیی خوایە، لە سەجدەدا زۆر بپارێنەوە چونكە لەو جێگادا شایستەیە كە دوعاو نزاكانتان لێ وەرگیرێت).

٨٧٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: « سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ».

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆرجار لە ركوع و سەجدەكەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي). واتە: خودایە تۆ خودایەكی پاك و بێگەردی، ئەی پەروەردگارم! كە من تەسبیح و سوپاس و ستایشی تۆ دەكەم، خودایە لێم خۆشبە.

٨٧٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ». زَادَ ابْنُ السَّرْحِ: « عَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەجدەکەیدا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ). واتە: خوایە لەهەموو گوناهەکانم خۆش ببە، گەورە و بچوکی، سەرەتاو کۆتایی. (ابْنُ السَّرْحِ) ئەمەشی بۆ زیاد کرد: (عَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ). واتە: ئاشکرای و پەنهانی.

٨٧٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها، قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَلَمَسْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ سَاجِدٌ وَقَدَمَاهُ مَنْصُوبَتَانِ، وَهُوَ يَقُولُ: « أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ ».

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەوێك لەسەر جێگای خەوتن پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم لێ وون بوو، منیش بۆی گەڕام لە مزگەوت بوو دەستم کەوت لە بەری پێی کە هەڵی کردبوو لە سەجدەدا دەیفەرموو: (خودایە ! من پەنا بە ڕازیبوونت دەگرم لە خەشم و

فینت، پەنا بە لێبوردنەكانت دەگرم لە سزاكانت، پەنا دەگرم بەخۆت لە خۆت، من نازانم سوپاس و ستایشی تۆ بكەم، تۆ ئاواى كە ستایشی خۆتت كردووە).

## باسی پاڕانەوە لەنوێژدا.

## ١٥٣ – بَابُ الدُّعَاءِ فِي الصَّلاَةِ.

٨٨٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو فِي صَلاَتِهِ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ». فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ؟! فَقَالَ: « إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ ».

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژەكەیدا دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (خودایە پەنات پێ دەگرم لە سزای سەختی گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە بەلاو فیتنەی دەججال، پەنات پێ دەگرم لە بەلاو فیتنەی ژیان و مردن. پەنات پێ دەگرم لە گوناھ و قەرزاری). قسەكەرێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەند زۆر پەنا دەگریت بە خوا لە خراپەی قەرزاری؟! ئەویش فەرمووی: (پیاو ئەگەر قەرزار بوو قسە دەكات تووشی درۆ دەبێت، بەڵێن و پەیمانیش دەدات و بەجێی ناهێنێت).

٨٨١ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى لَيْلَى، عَـنْ أَبِيـهِ، قَـالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى صَلاَةِ تَطَوُّعٍ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: « أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّـارِ، وَيْلٌ لأَهْلِ النَّارِ ».

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبِی لَيْلَی)ەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە تەنیشت پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم نوێژی سوننەتم دەکرد، گوێم لێ بوو دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (خودایە پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای سەختی ئاگر، وەیل بۆ خەڵکانی ناو ئاگری دۆزەخ).

٨٨٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الصَّلاَةِ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِىٌّ فِـى الصَّلاَةِ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِى وَمُحَمَّدًا، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ لِلأَعْرَابِىِّ: « لَقَدْ تَحَجَّرْتَ وَاسِعًا ». يُرِيدُ رَحْمَـةَ اللَّـهِ عَزَّ وَجَلَّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا بۆ نوێژکردن، ئێمەش لەگەڵی هەستاین، عەرەبێکی دەشتەکی لەنوێژدا وتی: خودایە بەزەیت بێتەوە بە من و موحەممەد دا، لەگەڵ ئێمەدا بەزەیت بە هیچ کەسێکی تردا نەیەتەوە، کاتێ کە پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم سەلامی دایەوە بە کابرای دەشتەکی فەرمووی: (بەڕاستی فراوانەکەت کەمکردەوە) واتە رەحمەتی فراوانی خوات کەمکردەوە.

٨٨٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَرَأَ: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى). قَالَ: « سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى)ی دەخوێند دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى).

٨٨٤ - (صحيح) عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُصَلِّي فَوْقَ بَيْتِهِ، وَكَانَ إِذَا قَرَأَ: (أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى). قَالَ: سُبْحَانَكَ، فَبَلَى. فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە موسای کوڕی ئەبو عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لەسەر بانی ماڵەکەی نوێژی دەکرد، کاتێ کە (أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى) ی دەخوێند دەیوت: (سُبْحَانَكَ). وتی: لەو بارەوە لێم پرسی؟ وتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ أَحْمَدُ: يُعْجِبُنِى فِى الْفَرِيضَةِ أَنْ يَدْعُوَ بِمَا فِى الْقُرْآنِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی: پێم خۆشە لەنوێژی فەرزدا بە دەقی قورئان بپاڕێنەوە.

## باسی ئەندازەی مانەوە لەڕکوع و لەسەجدەدا.

## ١٥٤ - بَابُ مِقْدَارِ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ.

٨٨٥ - (صحيح) عَنْ السَّعْدِىِّ ، عَنْ أَبِيهِ - أَوْ عَنْ عَمِّهِ - قَالَ: رَمَقْتُ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى صَلاَتِهِ فَكَانَ يَتَمَكَّنُ فِى رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ قَدْرَ مَا يَقُولُ «سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ». ثَلاَثًا.

واتە: لە سەعدیەوە، لە باوکیەوە، یان لە مامیەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەرنجی نوێژی پێغەمبەرم دا صلی الله علیه وسلم لە رکوع و سەجدەکەیدا بە ئەندازەی ئەوەندەی کە سێ جار بڵێی: (سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ) ئارامی دەگرت و دەمایەوە.

٨٨٦ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا رَكَعَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، وَذَلِكَ أَدْنَاهُ، وَإِذَا سَجَدَ فَلْيَقُلْ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى، ثَلاَثًا، وَذَلِكَ أَدْنَاهُ.

واته: لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعوودەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لە ئێوە کاتێ کە چووە رکوعەوە سێ جار بڵێت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ). ئەوە لای خوارویەتی، وە کاتێ کە چووە سەجدەوە سێ جار بڵێت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى). وە ئەوەش لای خوارویەتی.

٨٨٧ - (ضعيف) عَنْ إِسْمَاعِيلُ بْنُ أُمَيَّةَ، سَمِعْتُ أَعْرَابِيًّا يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ قَرَأَ مِنْكُمْ: (وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ). فَانْتَهَى إِلَى آخِرِهَا: ( أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ). فَلْيَقُلْ: بَلَى وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ، وَمَنْ قَرَأَ: (لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ). فَانْتَهَى إِلَى: (أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰ). فَلْيَقُلْ بَلَى، وَمَنْ قَرَأَ: (وَالْمُرْسَلاَتِ).

فَبَلَغَ: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾. فَلْيَقُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ، قَالَ: إِسْمَاعِيلُ: ذَهَبْتُ أُعِيدُ عَلَى الرَّجُلِ الأَعْرَابِيِّ وَأَنْظُرُ لَعَلَّهُ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي أَتَظُنُّ أَنِّي لَمْ أَحْفَظْهُ؟! لَقَدْ حَجَجْتُ سِتِّينَ حَجَّةً مَا مِنْهَا حَجَّةٌ إِلاَّ وَأَنَا أَعْرِفُ الْبَعِيرَ الَّذِي حَجَجْتُ عَلَيْهِ!

[المشكاة: ٨٦٠].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی وتی: بیستم لە ئەبو هورەیرە دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: هەرکەس لە ئێوە سورەتی: (وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ)ی خوێند هەتا کۆتایی سورەتەکە: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾. با بڵێت: (بَلَى وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ)، وە هەرکەس سورەتی: (لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ)ی خوێند هەتا کۆتایی سورەتەکە: (أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ). با بڵێت: (بَلَى)، وە هەرکەس سورەتی: (وَٱلْمُرْسَلَٰتِ)ی خوێندو گەیشتە: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾. با بڵێت: (آمَنَّا بِاللَّهِ).

ئیسماعیل دەڵێت: چووم بۆلای دەشتەکیەکە بۆ ئەوەی دووبارە فەرموودەکەم بۆ بگێڕێتەوە، بزانم داخۆ هەڵەی تێدا ناکات و بە جوانی لەبەریەتی، دەشتەکیەکە وتی: برازای خۆم وەها دەزانی بە جوانی لەبەرم نەکردووە، بەڕاستی شەست حەجم کردووە هەر حەجەو ئەزانم بە سواری چ وشترێ کردوومە.

## باسی کەسێ هات بۆ نوێژی جەماعەت پێشنوێژ لەسەجدەدا بوو چی بکات؟

## ١٥٥ - بَابُ فِي الرَّجُلِ يُدْرِكُ الإِمَامَ سَاجِدًا كَيْفَ يَصْنَعُ؟

| |
|---|
| ٨٨٩ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا، وَلاَ تَعُدُّوهَا شَيْئًا، وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ». |

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەرکاتێ هاتن بۆ نوێژ ئەگەر ئێمە سەجدەمان بردبوو ئێوەش سەجدە بەرن، بەلاَم بە ڕکاتی دامەنێن، هەرکەس گەیشت بە رکوع ئەوە ئەو رکاتەی بۆ حیساب کراوە.

## باسی سەبارەت بە ئەندامەكانی سەجدە.

## ١٥٦ – بَابُ أَعْضَاءِ السُّجُودِ.

٨٩٠ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « أُمِرْتُ - قَالَ: حَمَّادٌ: أُمِرَ نَبِيُّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ، وَلاَ يَكُفَّ شَعْرًا وَلاَ ثَوْبًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە، - حەماد وتی: فەرمان كراوە بە پێغەمبەرەكەتان صلی الله علیه وسلم – كە لەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرێت، وە جل و بەرگی و قژیشی كۆنەكاتەوە– لە حاڵەتی سەجدە بردندا- .

٨٩١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « أُمِرْتُ ». - وَرُبَّمَا، قَالَ: أُمِرَ نَبِيُّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ آرَابٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: فەرمانم پێكراوە، - یان فەرمووی: فەرمان كراوە بە پێغەمبەرەكەتان صلی الله علیه وسلم – كە لەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرێت.

٨٩٢ - (صحيح) عَنْ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « إِذَا سَجَدَ الْعَبْدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبْعَةُ آرَابٍ: وَجْهُهُ، وَكَفَّاهُ، وَرُكْبَتَاهُ، وَقَدَمَاهُ ».

واتە: لە عەباسی كوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیە وسلم بیستووە فەرموویەتی: كاتێ كە بەندەیە سەجدە دەبات حەوت ئەندامی لەگەڵی سەجدە دەبەن ئەوانیش: ناوچاوان و، بەری هەردوو دەست و، هەردوو ئەژنۆو، هەردوو پێكانیەتی.

٨٩٣ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، رَفَعَهُ، قَالَ: « إِنَّ الْيَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ وَإِذَا رَفَعَ فَلْيَرْفَعْهُمَا ».

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: دەستەكان سەجدە دەبەن هەروەك چۆن ڕوومەت سەجدە دەبات، جا ئەگەر یەكێك لە ئێوە ڕوومەتی دانا با دەستەكانیشی دابنێت، ئەگەر بەرزی كردەوە با دەستەكانیشی بەرزبكاتەوە.

## باسی سەجدە بردن لەسەر لوت و ناوچەوان

## ١٥٧ - بَابُ السُّجُودِ عَلَى الأَنْفِ وَالْجَبْهَةِ.

٨٩٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُئِيَ عَلَى جَبْهَتِهِ، وَعَلَى أَرْنَبَتِهِ، أَثَرُ طِينٍ مِنْ صَلاَةٍ صَلاَّهَا بِالنَّاسِ.

دووبارەیە بەژمارە: (٩١١) هاتووە.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، كاتێ كە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پێش نوێژی دەكرد بۆ خەڵك شوێنەواری قوڕ بە ناوچاوانی و سەری لوتیەوە دەبینرا.

٨٩٥ - (صحيح) عَنْ مَعْمَرٍ نَحْوَهُ.

واتە: لە مەعمەرەوە فەرمودەكەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە.

## باسی چۆنیەتی سەجدەبردن.

## ١٥٨ – بَابُ صِفَةِ السُّجُودِ.

٨٩٦ - (ضعيف) عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: وَصَفَ لَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ، فَوَضَعَ يَدَيْهِ، وَاعْتَمَدَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ عَجِيزَتَهُ، وَقَالَ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە هاتووە، کە وتویەتی: بەرائی کوڕی عازب وەسفی چۆنیەتی سەجدەبردنی بۆ کردین، جا هەردوو دەستی دانا، هێزی دایە سەر ئەژنۆکانی و، بەشی خوارەی پشتی بەرزکردەوە، جا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە سەجدەی دەبرد.

٨٩٧ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَفْتَرِشْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ الْكَلْبِ».

واتە: لە سەجدەکانتاندا ڕێك و ڕاست بن و، با هیچ کەسێ لە ئێوە دەستەکانی ڕانەخات هەروەك چۆن سەگ دەستەکانی ڕادەخات.

٨٩٨ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا سَجَدَ جَافَى بَيْنَ يَدَيْهِ، حَتَّى لَوْ أَنَّ بَهْمَةً أَرَادَتْ أَنْ تَمُرَّ تَحْتَ يَدَيْهِ مَرَّتْ.

واتە: لە (مَيْمُونَـةَ)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ دەچووە سەجدەوە دەستەکانی بەرزدەکردنەوە لە زەوی و لە لاتەنیشتەکانی دووری دەخستنەوە بەشێوەیەك ئەگەر بەرخۆلەیەك بیویستایە بە ژێر باڵیدا تێپەڕ ببێ تێپەڕ دەبوو.

٨٩٩ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ خَلْفِهِ فَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ وَهُوَ مُجَخٍّ قَدْ فَرَّجَ ﴿بَيْنَ﴾ يَدَيْهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: چووم بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەجدەدا بوو لە پشتیەوە سپیایی بن باڵیم بینی ئەوەندە سکی بەرزکردبووەو باسکەکانی دوور خستبونەوە لە لاتەنیشتەکانی.

٩٠٠ - (حسن صحيح) عَنْ أَحْمَرُ بْنُ جَزْءٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ إِذَا سَجَدَ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ حَتَّى نَأْوِيَ لَهُ.

واته: له ئەحمەری کوڕی جەزئی هاوەڵی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە دەستەکانی دوور دەخستەوە لە لاکانی کە سەجدەی دەبرد ئێمە دڵمان بۆی دەسووتا.

٩٠١ - (حسن) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَفْتَرِشْ يَدَيْهِ افْتِرَاشَ الْكَلْبِ، وَلْيَضُمَّ فَخِذَيْهِ ».

واته: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە دەستەکانی رانەخات هەروەك چۆن سەگ دەستەکانی رادەخات، باسکی نەنوسێنێت بەخۆیەوە.

## باسی روخسەت لەمەدا لەبەر حاڵەتی زەرورەت.

## ١٥٩ - بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ لِلضَّرُورَةِ.

٩٠٢ - (ضعيف) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: اشْتَكَى أَصْحَابُ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَشَقَّةَ السُّجُودِ عَلَيْهِمْ ﴿إِذَا انْفَرَجُوا﴾، فَقَالَ: «اسْتَعِينُوا بِالرُّكَبِ».

واتــە: لــە ئــەبو هــورەیرەوە هــاتووە، کــە هــاوەڵان شــکایەتی زەحمــەت و ناڕەحەتی دوور خستەوەی باسکەکانیان لـە لاتەنیشـتەکانیان لەسـەجدەدا کـرد، ئەویش فەرمووی: (هێز بدەنە سەر ئەژنۆکانتان).

## باسی سەبارەت بە دانانی دەست لەسەر کەلەکە وە (الإِقْعَاء).

## ١٦٠ - بَابُ فِي التَّخَصُّرِ وَالإِقْعَاءِ.

٩٠٣ - (صحيح) عَنْ زِيَادِ بْنِ صُبَيْحٍ الْحَنَفِـيِّ، قَـالَ: صَـلَّيْتُ إِلَـى جَنْبِ ابْنِ عُمَرَ، فَوَضَعْتُ يَدَيَّ عَلَـى خَاصِـرَتَيَّ فَلَمَّـا صَلَّى، قَالَ: هَذَا الصَّلْبُ فِي الصَّلاَةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْهُ.

واتە: لە زیادی کوڕی (صُبَيْحٍ الْحَنَفِـيّ)ەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: لەتەنیشـت عومەرەوە ڕمزای خوای لێ بێ نوێژم دەکرد، دەستم لەسەر کەلەکەم دانـا، کـاتێ کە لەنوێژ بویەوە وتی: ئەوە شێوە لەخاچدانە لەنوێژدا، بێگومـان پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی لێ کردووە.

## باسى گريان لە نوێژدا.

## ١٦١ – بَابُ الْبُكَاءِ فِى الصَّلاَةِ.

٩٠٤ - (صحيح) عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى وَفِى صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الرَّحَى مِنَ الْبُكَاءِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە (مُطَرِّف)ەوە، لەباوكيەوە هاتووە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوام صلى الله عليه وسلم دى نوێژى دەكرد لەبەر كوڵى گريان دەنكى سنگى دەتگوت وێزەى ئاشە.

## باسى خراپى وەسوەسەو داڵغە لێدان لە نوێژدا.

## ١٦٢ – بَابُ كَرَاهِيَةِ الْوَسْوَسَةِ وَحَدِيثِ النَّفْسِ فِى الصَّلاَةِ.

٩٠٥ - (حسن) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِىِّ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يَسْهُو فِيهِمَا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ».

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس بەچاکی دەستنوێژ بگرێ، پاشان دوو رکات نوێژی بێ سەهو بکات، خوای گەورە لە گوناهی رابردووی خۆش دەبێت).

**٩٠٦ - (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ يُقْبِلُ بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ عَلَيْهِمَا، إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ».**

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر کەسێك لە ئێوە بە جوانی و بەتەواوی دەستنوێژێك بگرێت، پاشان هەستێ بەگەردنکەچی و بە خشوعەوە روو بکاتە خواو دوو رکات نوێژ بکات ئیللا ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت).

## باسی راستکردنەوە بۆ پێشنوێژ لە نوێژدا.

## ١٦٣ – بَابُ الْفَتْحِ عَلَى الإِمَامِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٠٧ - (حسن) عَنْ الْمُسَوَّرِ بْنِ يَزِيدَ الْمَالِكِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ: يَحْيَى: وَرُبَّمَا، قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَقْرَأُ فِي الصَّلاَةِ، فَتَرَكَ شَيْئًا لَمْ يَقْرَأْهُ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تَرَكْتَ آيَةَ كَذَا وَكَذَا! فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « هَلاَّ أَذْكَرْتَنِيهَا ».

واتە: لە میسوەری کوڕی یەزیدی مالیکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم – یەحیا دەڵێ: یان وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: لە نوێژدا قورئانی دەخوێند، شتێکی پەڕاند و نەیخوێند، پیاوێ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو ئایەتە و ئەو ئایەتەت نەخوێند! پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بۆچی یادت نەخستمەوە؟.

﴿و﴾قَالَ: سُلَيْمَانُ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ: كُنْتُ أُرَاهَا نُسِخَتْ.

سولەیمان لە فەرموودەکەیدا وتی: وام دەزانی نەسخ بۆتەوە بۆیە نەمخوێند.

(صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﴿بْنِ عُمَرَ﴾، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلاَةً فَقَرَأَ فِيهَا، فَلُبِسَ عَلَيْهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ لأُبَيٍّ: « أَصَلَّيْتَ مَعَنَا ». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « فَمَا مَنَعَكَ؟ ».

واتە: لە (عبدالله) — ی كوڕی عومەر- ەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژێكی كرد، جا كاتێ كە قورئانی تێدا خوێند لێی تێك چوو، كە لە نوێژەكەی بویەوە، بە (أبي) فەرموو: ئایا لەگەڵ ئێمە نوێژت كرد؟ ئەویش وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی چی قەدەغەی لێ كردی كە یادم بخەیتەوە.

## باسی قەدەغەكردنی تەلقین.

## ١٦٤ – بَابُ النَّهْيِ عَنْ التَّلْقِينِ.

٩٠٨ - (ضعيف) عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « يَا عَلِيُّ لاَ تَفْتَحْ عَلَى الإِمَامِ فِي الصَّلاَةِ ».

واتە: لە ئیمام عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەی عەلی ئەگەر پێشنوێژ لە نوێژدا هەڵەیەكی كرد ئاگاداری مەكەرەوە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو إِسْحَاقَ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ الْحَارِثِ إِلاَّ أَرْبَعَةَ أَحَادِيثَ لَيْسَ هَذَا مِنْهَا.

ئـەبو داود دەڵێـت: ئـەبو ئیسـحاق تـەنها چـوار فـەرمودەی بیسـتووە لـە (حَارِث) ئەم فەرمودەش یەکێك نیە لەوان.

## باسی لاکردنەوە لە نوێژدا.

## ١٦٥ – بَابُ الالْتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٠٩ - (ضعيف) عَنْ أَبُو ذَرٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: « لاَ يَزَالُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مُقْبِلاً عَلَى الْعَبْدِ وَهُوَ فِي صَلاَتِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، فَإِذَا الْتَفَتَ انْصَرَفَ عَنْهُ ».

واتە: لـە (أَبُو ذَرّ)ی هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی: بەنـدەی خـوا هـەتا لـە نوێـژدا بێـت خـوای گـەورە بەرامبەریـەتی بەمـەرجێ ئـاوڕ نەداتـەوە، کـاتێ کـە لایکـردەوە خـوا رووی لـێ وەردەگێڕێ.

٩١٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها ، قَالَت: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَـنْ الْتِفَـاتِ الرَّجُـلِ فِـي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: « إِنَّمَا هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّـيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الْعَبْدِ ».

واتـە: لـە عائیشـەوە رەزای خـوای لـێ بـێ هـاتووە، کـە وتویـەتی: سـەبارەت بەلاکردنـەوەی نوێـژخوێن پرسـیارم کـرد لـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه

وسلم؟ ئەویش فەرمووی: (ئەوە دزین و رفاندنێکە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێ).

## باسی سەجدە لەسەر لوت.

## ١٦٦ - باب السُّجُودِ عَلَى الأَنْفِ.

٩١١ - (صحيح) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رُئِىَ عَلَى جَبْهَتِهِ، وَعَلَى أَرْنَبَتِهِ، أَثَرُ طِينٍ مِنْ صَلاَةٍ صَلاَّهَا بِالنَّاسِ.

دووبارەیە بەژمارە: (٨٩٤) هاتووە.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پێش نوێژی دەکرد بۆ خەڵك شوێنەواری قورِ بە ناوچاوانی و سەری لوتیەوە دەبینرا.

## باسی سەیرکردن لە نوێژدا.

## ١٦٧ – بَابُ النَّظَرِ فِي الصَّلاَةِ.

٩١٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ - قَالَ: عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ - قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْجِدَ، فَرَأَى فِيهِ نَاسًا يُصَلُّونَ رَافِعِي أَيْدِيهِمْ إِلَى السَّمَاءِ - ثُمَّ اتَّفَقَا - فَقَالَ: «لَيَنْتَهِيَنَّ رِجَالٌ يَشْخَصُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ - قَالَ: مُسَدَّدٌ: «فِي الصَّلاَةِ - أَوْ لاَ تَرْجِعُ إِلَيْهِمْ أَبْصَارُهُمْ».

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە - وتی (عُثْمَان)ی کوڕی ئەبو شەیبە راوی فەرمودەکە وتی: شێخەکەم جەریر – وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە ناو مزگەوتەوە هەندێ کەسی بینی دەستیان بەرزکردبۆوە بۆ ئاسمان، ئەبو مەعاویە راوی فەرمودەکە باسی ئەمەی نەکرد – پاشان جەریر و ئەبو مەعاویە هەماهەنگ بوون لەسەر ئەوەی – کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوانەی لە نوێژدا چاو بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان). – موسەددەد وتی: لە ئەبو معاویەوە هاتووە: کە فەرمووی: (لە نوێژدا) – یان دەبێ واز لەم کارە ناشیرینە بێنن، یا بێگومان چاویان کوێر دەبێت).

٩١٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ فِي صَلاَتِهِمْ ؟!». فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ فَقَالَ: « لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ ».

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەبەرچی هەندێ کەس لە نوێژدا چاو بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان؟!) لەوبارەوە گەلێ بەتوندی هەڕەشەی کردو، فەرمووی: (دەسبەردار دەبن و واز لەوکارە دەهێنن ئەوا باشە، ئەگینا بێگومان چاویان کوێر دەبێت).

٩١٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، قَالتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلاَمٌ فَقَالَ: « شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ، وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ ».

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگدا نوێژی دەکرد، کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە فەرمووی: (ئەم بەرگە بەرنەوە بۆ ئەبو جەهم و، بەرگێکی سادە بۆ من بهێنن، چونکە خەیاڵی بردم لە نوێژدا).

٩١٥ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ - بِهَذَا الْخَبَرِ - قَالَ: وَأَخَذَ كُرْدِيًّا كَانَ لأَبِي جَهْمٍ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْخَمِيصَةُ كَانَتْ خَيْرًا مِنَ الْكُرْدِيِّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ ئەم هەواڵە هاتووە، كە وتویەتی: بەرگێكی كوردی وەرگرت لە ئەبو جەهم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرگە رەنگاو رەنگەكە لەم كوردیە باشتر بوو.

## باسی روخسەت لەمەدا.

## ١٦٨ – بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٩١٦ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ ابْنِ الْحَنْظَلِيَّةِ، قَالَ: ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ - يَعْنِي صَلاَةَ الصُّبْحِ - فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَهُوَ يَلْتَفِتُ إِلَى الشِّعْبِ.

واتە: لە سەهلی كوڕی (حَنْظَلِيَّة)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: قامەت دەكرا بۆ نوێژ – واتە بۆ نوێژی بەیانی - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەكرد ئاوڕی دەدایەوە بەرەو شیوەكە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَانَ أَرْسَلَ فَارِسًا إِلَى الشِّعْبِ مِنَ اللَّيْلِ يَحْرُسُ.

ئەبو داود دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوارێكی ناردبوو بۆ شیوەكە بۆ ئەوەی پاسەوانی بكات لەشەودا.

## باسی کردنی کارێك لەنوێژدا.

## ١٦٩ – بَابُ الْعَمَلِ فِي الصَّلَاةِ.

٩١٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەكرد (أُمَامَةَ)ی كچی زەینەبی كچی خۆی - كە دەكاتە كچەزای - بەسەر شانەوە بوو كاتێ كە سەجدەی دەبرد دایدەنا، كاتێكیش كە هەڵئەسایەوە هەڵی دەگرت.

٩١٨ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ جُلُوسٌ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْمِلُ أُمَامَةَ بِنْتَ أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ - وَأُمُّهَا زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَهِيَ صَبِيَّةٌ يَحْمِلُهَا عَلَى عَاتِقِهِ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ

عَلَى عَاتِقِهِ يَضَعُهَا إِذَا رَكَعَ، وَيُعِيدُهَا إِذَا قَامَ، حَتَّى قَضَى صَلاَتَهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ بِهَا.

واته: له عهمری کوڕی سولەیمی زورەقیەوە هاتووە، کە لە ئەبو قەتادەی بیستووە وتویەتی: ئێمە لە مزگەوتدا دانیشتبوین پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەژوورەکەی خۆیەوە هاتەدەرەوە بۆ ناومان لەوکاتەدا (أُمَامَة)ی کچی ئەبو (عَاص)ی کوڕی رەبیع کە منداڵ بوو بەسەر شانیەوە بوو - دایکی (أُمَامَة)ش زەینەبی کچی خۆی بوو- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی کرد ئەویش بەسەر شانیەوە بوو کاتێ کە دەچووە رکوعەوە دایدەنا، کاتێکیش کە هەڵئەسایەوە هەڵی دەگرتەوە، بەو شێوەیەی کرد هەتا لە نوێژەکەی بویەوە.

٩١٩ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ الأَنْصَارِيَّ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي لِلنَّاسِ وَأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِي الْعَاصِ عَلَى عُنُقِهِ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا.

واته: له عهمری کوڕی سولەیمی زورەقیەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە ئەبو قەتادەی (أَنْصَارِيّ)م بیستووە دەیوت: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی بەرنوێژی دەکرد بۆ خەڵك (أُمَامَة)ی کچی ئەبو (عَاص) بەسەر ملیەوە بوو کاتێ کە سەجدەی دەبرد دایدەنا.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَمْ يَسْمَعْ مَخْرَمَةُ مِنْ أَبِيهِ إِلاَّ حَدِيثًا وَاحِدًا.

ئـەبو داود دەڵێـت: مەخرەمـە راوی فەرمودەکـە تـەنها یـەك فـەرمودەی لـە باوکی بیستووە.

٩٢٠ - (ضعيف) عَنْ أَبِى قَتَادَةَ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلصَّلاَةِ فِى الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ - وَقَدْ دَعَاهُ بِلاَلٌ لِلصَّلاَةِ - إِذْ خَرَجَ إِلَيْنَا وَأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِى الْعَاصِ بِنْتُ ابْنَتِهِ عَلَى عُنُقِهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى مُصَلاَّهُ، وَقُمْنَا خَلْفَهُ وَهِىَ فِى مَكَانِهَا الَّذِى هِىَ فِيهِ، قَالَ: فَكَبَّرَ، فَكَبَّرْنَا، قَالَ: حَتَّى إِذَا أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَرْكَعَ أَخَذَهَا فَوَضَعَهَا، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ سُجُودِهِ، ثُمَّ قَامَ، أَخَذَهَا فَرَدَّهَا فِى مَكَانِهَا، فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ بِهَا ذَلِكَ فِى كُلِّ رَكْعَةٍ حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ[1].

واتـە: لـە ئـەبو قـەتادەی هـاوەڵی پێغەمبـەری خـواوە صلى الله عليـه وسـلم هاتووە، کە وتویـەتی: جارێ ئێمـە دانیشـتبوین چاوەڕێی پێغەمبـەری خوامـان

---

[1] - فەرمودەکە (صحيح)ە بەڵام بەبێ ومرم گرتووە لەکتێبی (عون المعبود شرح سنن أبی داود: (١/ ١٤) چاپی ٢٠٠٩ی (مكتبة المعارف) علق عليه وخرج أحاديثه شيخ مشهور بن حسن آل سلمان.

صلى الله علیـه وسـلم دەکـرد بـۆ ئـەوەی بێـت و بەرنوێـژی نوێـژی نیـوەڕۆ یـان عەسرمان بۆ بکات – لەکاتێکدا کە بیلال بانگی کردبوو کە بێت بـۆ نوێـژ واتـە بانگی دابوو – پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم لەژوورەکەی خۆیەوە هاتەدەرەوە بـۆ ناومـان لەوکاتـەدا (أُمَامَـةَ)ی کچـی ئـەبو (عَـاص) کـە دەکاتـە کچـەزای خـۆی بەسەر شان و ملیەوە بوو، لەجێگا نوێژەکەی خۆیدا راوەستا ئێمەش لەدوایـەوە کچـەزاکەی هـەر لەشـوێنی خۆیـدا بـوو، راوی وتـی: (الله أکـبر)ی کـردو نوێـژی دابەسـت، ئێمـەش (الله أکبر)مـان کـردو نوێـژمان دابەسـت، راوی وتـی: کـاتێ کـە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسـلم دەویسـت رکـوع بـەرێت دایـدەنا، دەچـووە کوعـەوەو سـەجدەی دەبـرد، کـە لـە سـەجدە دەبـووەوە، ئینجـا هەڵئەسـایەوە دەیخستـەوە جێگاکەی خۆی، بەردەوام لە هەموو رکاتەکاندا بەو شـێوەیەی کـرد واتە بەسەر شان و ملیەوە بوو هەتا لە نوێژەکەی بویەوە.

| |
|---|
| ٩٢١ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اقْتُلُوا الأَسْوَدَيْنِ فِى الصَّـلاَةِ: الْحَيَّـةَ، وَالْعَقْرَبَ ». |

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: دوو رەشەکان بکوژن لە نوێژدا: دووپشك و، مار.

| |
|---|
| ٩٢٢ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِىَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ أَحْمَدُ - يُصَـلِّى وَالْبَـابُ عَلَيْهِ مُغْلَقٌ فَجِئْتُ فَاسْتَفْتَحْتُ - قَالَ أَحْمَدُ: فَمَشَى - |

فَفَتَحَ لِي، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُصَلاَّهُ. وَذَكَرَ أَنَّ الْبَابَ كَانَ فِي الْقِبْلَةِ.

واتە: لە عوروەوە هاتووە، کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم – نوێژی دەکرد – ئەحمەد وتی: دەرگاکە بەروویدا داخرابوو لەدەرگام دا – ئەحمەد وتی هات - دەرگاکەی کردەوە، پاشان گەڕایەوە جێگاکەی خۆی. لە عوروە گێڕایەوە کە دەرگاکە لای قیبلەوە بووە.

## باسی وەڵامدانەوەی سەلام لەنوێژدا.

## ١٧٠ – بَابُ رَدِّ السَّلاَمِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٢٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ سَلَّمْنَا عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا، وَقَالَ: « إِنَّ فِي الصَّلاَةِ لَشُغْلاً ».

واتە: لە (عبدالله) – ی کوڕی مەسعود - ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکرد، ئێمەش سەلامان لێ دەکرد وەڵامی دەداینەوە، بەڵام کاتێ کە لەلای نەجاشی گەڕاینەوە سەلامان لێ کرد وەڵامی نەداینەوە، فەرمووی: (بەڕاستی نوێژ رێ لەقسەکردن دەگرێت).

٩٢٤ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ، وَنَأْمُرُ بِحَاجَتِنَا، فَقَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ السَّلاَمَ، فَأَخَذَنِي مَا قَدُمَ وَمَا حَدُثَ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحْدِثُ مِنْ أَمْرِهِ مَا يَشَاءُ، وَإِنَّ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ قَدْ أَحْدَثَ مِنْ أَمْرِهِ أَنْ لاَ تَكَلَّمُوا فِي الصَّلاَةِ». فَرَدَّ عَلَيَّ السَّلاَمَ.

واتە: لە (عبدالله) - ی کوڕی مەسعود - ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە لەنوێژدا سەلاممان لە یەکتر دەکرد، ئەگەر پێویستیەکیشمان ببوایە فەرمانمان دەکرد بەوانەی کە لە دەورمانن بۆمان جێبەجێ بکەن، چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا نوێژی دەکرد، سەلامم لێ کرد وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، منیش هەرچی خەم و پەژارەی کۆن و تازەیە لەلام کۆبووەو خەفەت دایگرتم، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەنوێژ بویەوە فەرمووی: (بەڕاستی خوای گەورە بەویستی خۆی ئەحکام و فەرمانەکانی نوێ دەکاتەوە، بیەوێ هەر فەرمانێ جێگیر بکات جێگیری دەکات، بیەوێ هەر فەرمانێ نەسخ بکاتەوە نەسخی دەکاتەوە، خوای گەورە فەرمانی کردووە بەوەی لەنوێژدا قسە نەکرێت - واتە پێشتر لەنوێژدا قسەدەکراو وەڵامی سەلام دەدرایەوە بەڵام پاشان نەسخ کرایەوەو نەهی لێ کرا). ئینجا وەڵامی سەلامەکەی دامەوە.

٩٢٥ - (صحيح) عَنْ صُهَيْبٍ أَنَّهُ قَالَ: مَرَرْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ إِشَارَةً. قَالَ: وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: إِشَارَةً بِأُصْبُعِهِ.

واتە: لە (صُهَيْب)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: دام بەلای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد، سەلامم لێ کرد، بە ئیشارەت وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، (نابل) راوی فەرموودەکە وتی: وابزانم راوی وتی: بە پەنجە ئیشارەتی کرد.

٩٢٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: أَرْسَلَنِي نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى بَعِيرِهِ، فَكَلَّمْتُهُ، فَقَالَ لِي بِيَدِهِ هَكَذَا، ثُمَّ كَلَّمْتُهُ، فَقَالَ لِي بِيَدِهِ هَكَذَا، وَأَنَا أَسْمَعُهُ يَقْرَأُ وَيُومِئُ بِرَأْسِهِ، قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: « مَا فَعَلْتَ فِي الَّذِي أَرْسَلْتُكَ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أُكَلِّمَكَ إِلاَّ أَنِّي كُنْتُ أُصَلِّي ».

واتە: لە جابرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناردمی بۆ لای (بَنِي الْمُصْطَلِق)، کاتێ کە هاتمەوە بۆلای بەسەر وشترێکەوە نوێژی دەکرد، قسەم لەگەڵ کرد بەدەست ئیشارەتی بۆ کردم، پاشان قسەم لەگەڵ کرد بەدەست ئیشارەتی بۆ کردم، گوێم لێی بوو هەر قورئانی دەیخوێند بەسەر ئیشارەتی دەکرد، کاتێ کە لەنوێژ بویەوە، فەرمووی: (ها چیت کرد لەبارەی ئەوەی کە بۆم ناردبووی؟ بەڕاستی هیچ شتێ رێگری ئەوەی

لێ نەکردم کە قسەت لەگەڵ نەکەم تەنها ئەوە نەبێت کە نوێژم دەکرد).

٩٢٧ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى قُبَاءَ يُصَلِّي فِيهِ، قَالَ: فَجَاءَتْهُ الأَنْصَارُ فَسَلَّمُوا عَلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّي، قَالَ: فَقُلْتُ لِبِلاَلٍ: كَيْفَ رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ حِينَ كَانُوا يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّي؟ قَالَ: يَقُولُ هَكَذَا: وَبَسَطَ كَفَّهُ، وَبَسَطَ جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ كَفَّهُ، وَجَعَلَ بَطْنَهُ أَسْفَلَ، وَجَعَلَ ظَهْرَهُ إِلَى فَوْقٍ.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرچوو بۆ مزگەوتی قوبا بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکات، جا لەوکاتەدا کە نوێژی دەکرد هەندێ لە یاریدەدەران(أنصار) هاتن بۆ لای و سڵاویان لێ کرد، وتی: بە بیلالم وت: ئەی چۆن پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەڵامی ئەدانەوە لەنوێژدا کاتێ کە سەلامیان لێ کرد؟ وتی: ئاوای دەکرد - واتە بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردن - وە دەستی دەکردەوە، جەعفەری کوڕی عەون دەستی کردەوە، وە ناوی دەستی کردە ژێرەوە، وە پشتی دەستی کردە سەرەوە واتە بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردن.

٩٢٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « لاَ غِرَارَ فِي صَلاَةٍ وَلاَ تَسْلِيمٍ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەموکورتی نیە لەنوێژ و سەلام دانەوەدا). (غِرَارَ) لەنوێژدا بەدوو شێوە مانا کراوەتەوە یەکەمیان ئەوەیە: رکوع و سەجدەکەی تەواو نەبێت، دووهەمیان ئەوەیە: کە گومانی هەبێت ئایا سێ رکاتی کردووە یان چوار دەست بگرێت بە زۆرەکەوەو واز لە دڵنیایی بێنێت و لە نوێژ بێتەوە بە گومانەوە، وە (غِرَار) لە سەلامدانەوەدا واتە: وەك ئەوەی یەکێ بڵێت: (السلام عليكم ورحمة الله) ، ئەویش بڵێت: (عليكم السلام ورحمة الله)، کورتی نەکاتەوەو بەس بڵێت: (السلام عليكم) یان (عليكم).

قَالَ أَحْمَدُ: يَعْنِي - فِيمَا أُرَى - أَنْ لاَ تُسَلِّمَ وَلاَ يُسَلَّمَ عَلَيْكَ، وَيُغَرِّرُ الرَّجُلُ بِصَلاَتِهِ فَيَنْصَرِفُ وَهُوَ فِيهَا شَاكٌّ.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: - ئەوەی دەبینرێت ئەوەیە کە — سەلام لەکەس نەکەیت و کەسیش سەلامت لێ نەکات، وە نوێژخوێن بە کەموکورتی نوێژەکەی بکات و لە نوێژ بێتەوەو گومانی هەبێت کە ئایا سێ رکاتی کردووە یان چوار.

٩٢٩ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، - قَالَ: أُرَاهُ رَفَعَهُ - قَالَ: « لاَ غِرَارَ فِى تَسْلِيمٍ وَلاَ صَلاَةٍ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە - مەعاویەی کوڕی هیشام راوی فەرمودەکە وتی: وابزانم سوفیان فەرمودەکەی بەرزکردۆتەوە - کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کەموکورتی نیە لە سەلام دانەوەو لەنوێژدا).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ ابْنُ فُضَيْلٍ عَلَى لَفْظِ ابْنِ مَهْدِيٍّ وَلَمْ يَرْفَعْهُ.

ئەبو داود دەڵێت: (ابْنُ فُضَيْلٍ) لەسەر گۆ(لفظ)ی مەهدی بە: « لاَ غِرَارَ فِي صَلاَةٍ وَلاَ تَسْلِيمٍ ». ریوایەتی کردووە بەڵام بەرزی نەکردۆتەوە واتە لەسەر ئەبو هورەیرە وەستاوە.

## باسی وەڵامدانەوەی کەسێك کە بپژمێ لەنوێژدا بە: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ).

## ١٧١ - بَابُ تَشْمِيتِ الْعَاطِسِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٣٠ - (صحيح) عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَرَمَانِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَاثُكْلَ أُمِّيَاهُ مَا شَأْنُكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ؟ فَجَعَلُوا يَضْرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُمْ يُصَمِّتُونِي، قَالَ عُثْمَانُ: فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُسَكِّتُونِي، لَكِنِّي سَكَتُّ. ﴿قَالَ﴾: فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بِأَبِي وَأُمِّي مَا ضَرَبَنِي وَلاَ كَهَرَنِي وَلاَ سَبَّنِي - ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ لاَ يَحِلُّ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ هَذَا، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ

وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ ». أَوْ كَمَا، قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّا قَوْمٌ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ، وَقَدْ جَاءَنَا اللَّهُ بِالإِسْلاَمِ، وَمِنَّا رِجَالٌ يَأْتُونَ الْكُهَّانَ. قَالَ: « فَلاَ تَأْتِهِمْ ». قَالَ قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَتَطَيَّرُونَ. قَالَ: « ذَاكَ شَىْءٌ يَجِدُونَهُ فِى صُدُورِهِمْ فَلاَ يَصُدُّهُمْ ». قَالَ قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَخُطُّونَ. قَالَ: «كَانَ نَبِىٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ يَخُطُّ، فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ فَذَاكَ ». قَالَ قُلْتُ: جَارِيَةٌ لِى كَانَتْ تَرْعَى غُنَيْمَاتٍ قِبَلَ أُحُدٍ وَالْجَوَّانِيَّةِ، إِذِ اطَّلَعْتُ عَلَيْهَا إِطْلاَعَةً، فَإِذَا الذِّئْبُ قَدْ ذَهَبَ بِشَاةٍ مِنْهَا، وَأَنَا مِنْ بَنِى آدَمَ آسَفُ كَمَا يَأْسَفُونَ، لَكِنِّى صَكَكْتُهَا صَكَّةً فَعَظَّمَ ذَاكَ عَلَىَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: أَفَلاَ أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: « ائْتِنِى بِهَا ». ﴿قَالَ﴾: فَجِئْتُهُ بِهَا فَقَالَ: «أَيْنَ اللَّهُ؟». قَالَتْ: فِى السَّمَاءِ. قَالَ: « مَنْ أَنَا؟ ». قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: « أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ ».

واتە: لە مەعاویەی کوڕی حەکەمی (السُّلَمِیّ)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژم دەکرد پیاوێ لە

نوێژخوێنان پژمی، منیش وتم: (يَرْحَمُكَ اللَّـهُ). واتـه: خـوا رەحمـت پـێ بكـات، کەچی خەڵکەکە چاویان تێبڕیم و خێسەیان لێ کردم، وتم: لە باری دایکم بچم یان ئای بۆ رۆڵەرۆی دایکم، ئەوە چیتانە وەها سەیرم دەکەن؟ هەموو دەسـتیان کێشا بە ڕانیاندا، زانیم کە دەیانەوێت بێدەنگم بکەن، بێدەنگ بـووم، (عُثْمَـان) وتی: هەرکە بینینم دەیانەوێت بێدەنگم بکەن، بێدەنگ بووم، - وتـی - کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم لەنوێژەکەی بویـەوە، دایـك و بـاوکم بـە قوربانی بێت هەرگیز نە لەوەو پێش وە نە لەوەو دوا مامۆستای وەهام نـەدیوە لە پەروەردەدا لەو باشتر بێت، سوێند بە خوا نەسەرزەنشتی کردم، نە لێـی دام، نە قسەی پێ وتم، فەرمووی: (ئـەم نوێـژە بـۆ ئـەوە ناشـێت کـە قسـەی خـەڵکی تێکەڵ ببێت، بەڵکو بریتیە لە (تەسبیح) و (تەکبیر) و قورئان خوێنـدن). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من نزیکم لەسەردەمی نەفامیـەوە، خوای گەورە ئیسلامی هێنا، لـەناو ئێمـەدا کەسانێك دەچـوونە لای فاڵچیـەکان، فەرمووی: (تۆ مەچۆ بۆ لایان). دەڵێ: وتم: کەسانێکمان هەبوو رەشبین دەبوون بە فرینی باڵندە. فەرمووی: (ئەوە شتێك بوو لە دڵیانـدا دروسـت دەبـوو بـەڵام رێـی نـەدەگرت لـەو کـارەی کـە دەیانویسـت بیکـەن). دەڵـێ: وتم: کەسـانێکی تریشـمان هـەبوو هێڵیـان لەزەویـدا دەکێشـا. فـەرمووی: (پێغەمبـەرێ لـە پێغەمبەرانی خوا هێڵی دەکێشا هەرکەس لەگەڵ هێڵەکەیدا یـەك بگرێـت ئـەوە چاکە). دەڵێ: وتم: کەنیزەکێکم هەبوو شوانی مەڕەکانم بوو لە شوێنێکی نزیك مەدینەوە دەیلەوەڕاندن، جارێکیان چووم کە دیم گورگێـك مـەڕێکی لـە رانەکـە فڕاند، منیش پیاوێکم لـە ئادەمیزادەکان، خـەم دەخـۆم وەك چـۆن خـەڵکی تـر خەم دەخۆن، بۆیە زلەیـەکم پێـدا کێشا، ئینجا هاتم بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم - هەواڵەکەم بـۆ گێڕایـەوە – ئـەویش ئـەو کـارەی زۆر لەسەر گەورە کردم، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم! ئایـا ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: (بیهێنـە بـۆ لام). بـۆم هێنـا پێـی فـەرموو: (خـوا لـە کوێیە؟). وتی: لە ئاسماندایە، فەرمووی: (ئازادی بکە چونکە ئیماندارە).

٩٣١ - (ضعيف) عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ، قَالَ: لَمَّا قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُلِّمْتُ أُمُورًا مِنْ أُمُورِ الإِسْلاَمِ، فَكَانَ فِيمَا عُلِّمْتُ أَنْ قِيلَ لِي: « إِذَا عَطَسْتَ فَاحْمَدِ اللَّهَ، وَإِذَا عَطَسَ الْعَاطِسُ فَحَمِدَ اللَّهَ، فَقُلْ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ »،. قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا قَائِمٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ، فَحَمِدَ اللَّهَ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، رَافِعًا بِهَا صَوْتِي، فَرَمَانِي النَّاسُ بِأَبْصَارِهِمْ حَتَّى احْتَمَلَنِي ذَلِكَ، فَقُلْتُ: مَا لَكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ بِأَعْيُنٍ شُزْرٍ، قَالَ: فَسَبَّحُوا، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ، قَالَ: « مَنِ الْمُتَكَلِّمُ ». قِيلَ هَذَا الأَعْرَابِيُّ، فَدَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: لِي: « إِنَّمَا الصَّلاَةُ لِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَذِكْرِ اللَّهِ جَلَّ وَعَزَّ فَإِذَا كُنْتَ فِيهَا فَلْيَكُنْ ذَلِكَ شَأْنَكَ ». فَمَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَطُّ أَرْفَقَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە مەعاویەی كوڕی حەكەمی (السُّلَمِيّ)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: كاتێ كە چووم بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زۆر شت لە كاروباری ئیسلام فێربووم، یەكێ لەو شتانەی كە فێری بووم ئەوە بوو پێی فەرمووم: (ئەگەر پژمیت سوپاس ستایشی خوا بكە واتە: بڵێ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ).

ئەگەر یەکێك پژمی وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ). تۆش بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ). جارێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم راوەستا بووم نوێژم دەکرد پیاوێ لە نوێژخوێنان پژمی وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ). منیش بەدەنگی بەرز وتم: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ). کەچی خەڵکەکە چاویان تێبڕیم سەیرکردنەکەیان تورەی کردم و پێم ناخۆش بوو، وتم: ئەوە چیتانە بۆ خێسەم لێ دەکەن؟ وتیان: (سبحان الله) بکە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژەکەی بویەوە، فەرمووی: (ئەوە کێ بوو قسەی کرد؟). وتیان: ئەو پیاوە دەشتەکیە بوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بانگی کردم بۆ لای خۆی و پێی فەرمووم: (نوێژکردن بریتیە لە قورئان خوێندن و یادی خواو پاڕانەوە، ئەگەر لەنوێژدا بووی لەسەر ئەو حاڵەتە بە - واتە قورئان بخوێنەو یادی خوا بکە- ). هەرگیز مامۆستایەکم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەرخۆو نەرمونیان تر بێت.

## باسی وتنی (آمین) لەدوای پێشنوێژەوە.

## ١٧٤ - بَابُ التَّأْمِينِ وَرَاءَ الإِمَامِ.

| |
|---|
| ٩٣٢ - عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَرَأَ: (وَلاَ الضَّالِّينَ).، قَالَ: « آمِينَ ». وَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ. |

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە (وَلاَ الضَّالِّين)ی دەخوێند دەیفەرموو: (آمین). دەنگیشی بەرزدەکردەوە.

٩٣٣ - (حسن صحيح) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ: أَنَّهُ صَلَّى خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَهَرَ بِآمِينَ، وَسَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ خَدِّهِ.

واتە: لە وائلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، کە لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم نوێژی کردووە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە دەنگی بەرز (آمين)ی خوێند، وە بەلای راست و چەپیدا سەلامی دایەوە، دەڵێ: سەلامدانەوەکەی بە شێوەیە بوو سپیایی کوڵمیم بینی.

٩٣٤ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا تَلاَ: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ)، قَالَ: « آمِينَ ». حَتَّى يَسْمَعَ مَنْ يَلِيهِ مِنَ الصَّفِّ الأَوَّلِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ)ی دەخوێند دەیفەرموو: (آمین)، ئەوەندە دەنگی بەرزدەکردەوە هەتا ئەوانەی کە لەدوایەوە بوون لەڕیزی یەکەمدا گوێیان لێی دەبوو.

٩٣٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا، قَالَ: الإِمَامُ (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا

ٱلضَّآلِّينَ ). فَقُولُوا: « آمِينَ ». فَإِنَّهُ مَـنْ وَافَـقَ قَوْلُـهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کاتێك کە پێشنوێژ وتـی: (غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ). ئێوەش بڵێن: (آمین). چونکە ئامینی هەر کەسێك لەگەڵ ئامینی مەلائیکە ڕێك بکەوێت، خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووری.

٩٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: « إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَـنْ وَافَـقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِـهِ ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: « آمِينَ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: کاتێك کە پێشنوێژ وتـی: (آمـین) ئێـوەش بیڵێن، چـونکە ئـامینی هـەر کەسـێك لەگـەڵ ئـامینی مەلائیکـە ڕێـك بکـەوێت، خـوای گـەورە لـە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووری. ئیبنـو شـیهاب دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیە وسلم خۆشی دەیفەرموو: (آمین).

٩٣٧ - (ضعيف) عَنْ بِلاَلٍ أَنَّهُ قَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ لاَ تَسْـبِقْنِي: « بِآمِينَ ».

واتە: لە بیلالەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە خوێندنی (آمین)دا پێشم مەکەوە.

٩٣٨ - (ضعيف) عَنْ صُبَيْحِ بْنِ مُحْرِزٍ الْحِمْصِيِّ، حَدَّثَنِي أَبُو مُصْبِحٍ الْمَقْرَائِيُّ، قَالَ: كُنَّا نَجْلِسُ إِلَى أَبِي زُهَيْرٍ النُّمَيْرِيِّ ، وَكَانَ مِنَ الصَّحَابَةِ فَيَتَحَدَّثُ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ فَإِذَا دَعَا الرَّجُلُ مِنَّا بِدُعَاءٍ، قَالَ: اخْتِمْهُ بِآمِينَ، فَإِنَّ آمِينَ مِثْلُ الطَّابَعِ عَلَى الصَّحِيفَةِ، قَالَ أَبُو زُهَيْرٍ: أُخْبِرُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ قَدْ أَلَحَّ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَوَقَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَمِعُ مِنْهُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَوْجَبَ إِنْ خَتَمَ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: بِأَيِّ شَيْءٍ يَخْتِمُ؟ فَقَالَ: «بِآمِينَ، فَإِنَّهُ إِنْ خَتَمَ بِآمِينَ، فَقَدْ أَوْجَبَ». فَانْصَرَفَ الرَّجُلُ الَّذِي سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَى الرَّجُلَ فَقَالَ: اخْتِمْ يَا فُلاَنُ بِآمِينَ وَأَبْشِرْ.

واتە: لە (صُبَيْح)ی کوڕی (مُحْرِزٍ الْحِمْصِيّ) هاتووە، کە وتویەتی: (أَبُو مُصْبِحٍ الْمَقْرَائِيّ)ی بۆی گێڕاوەوە وتی: لە کۆڕی ئەبو زوهەیری نومەیری دا

دانیشتبوین کە یەکێ بوو لە هاوەڵان جوانترین فەرمایشتی دەفەرموو، لەوکاتەدا پیاوێ لە ئێمە پاڕایەوە، ئەبو زوهەیر وتی: کۆتایی بە (آمِین) بێنە، چونکە وەك مۆری سەر پەڕەی کاغەز وەهایە، جا ئەبو زوهەیر وتی: لەوبارەوە هەواڵتان بدەمێ: شەوێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەرچووین، گەیشتین بە پیاوێ زۆر بەکوڵ دەپاڕایەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم راوەستاو گوێی لێ گرت، فەرمووی: (ئەگەر کۆتایی پێ بێنێت دوعاکەی قبوڵ دەبێت و بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر دەکات). پیاوێ لە قەومەکە وتی: بەچی کۆتایی پێ بێنێت، فەرمووی: (بە (آمِین)، چونکە ئەگەر بە (آمِین) کۆتایی پێ بێنێت دوعاکەی قبوڵ دەبێت و بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر دەکات). ئەو پیاوەی کە پرسیارەکەی کرد لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رۆشت بۆ لای پیاوەکەو وتی: ئەی فلان بە (آمِین) کۆتایی پێ بێنە، مژدەشی دایە کە ئەگەر بە (آمِین) کۆتایی پێ بێنێت بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

## باسی بە بەری دەست دان لەپشتی دەست لەناو نوێژدا.

## ١٧٣ - بَابُ التَّصْفِيقِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٣٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (وتنی: (سبحان الله) بۆ پیاوانەو، بە بەری دەست دان

له پشتی دهست بۆ ئافرهتانه). - واته ئهگهر شتێ رویدا لهناو نوێژدا ئهوا بۆ ئاگادارکردنهوه سوننهته: پیاوان بڵێن: (سبحان الله)، وه ئافرهتانیش به بهری دهستیان بدهن له پشتی دهستیان.

٩٤٠ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَهَبَ إِلَى بَنِى عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِى بَكْرٍ رضى الله عنه فَقَالَ: أَتُصَلِّى بِالنَّاسِ فَأُقِيمَ، قَالَ: نَعَمْ. فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ فِى الصَّلاَةِ، فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِى الصَّفِّ، فَصَفَّقَ النَّاسُ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لاَ يَلْتَفِتُ فِى الصَّلاَةِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ، فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنِ امْكُثْ مَكَانَكَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَيْهِ فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِى الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: « يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذْ أَمَرْتُكَ؟».، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ لاِبْنِ أَبِى

قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمْ مِنَ التَّصْفِيحِ؟! مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ، فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصْفِيحُ لِلنِّسَاءِ ».

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە، کە وتویەتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوو بۆ ناو هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف، بۆ ناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە، کاتی نوێژ بوو، بانگدەر کە بیلال بوو هات بۆلای پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ وتی: ئەگەر بانگ بدەم بەرنوێژی دەکەی بۆ خەڵك؟ فەرمووی: بەڵێ، جا کە پێشەوا ئەبو بەکر نوێژی دابەست پاش کەمێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەوە، هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکە یەکە دڕی بە ریزەکاندا هەتا خۆی گەیاندە ریزی یەکەم لەوێ وەستا، خەڵکەکە بە بەری دەستیان دایان لە پشتی دەستیان، ئەبو بەکریش عادەتی نەبوو لابکاتەوە بەڵام کە بینی خەڵکەکە ئەوەندە بە بەری دەستیان دەدەن لە پشتی دەستیان، ئەویش ئاوڕی دایەوە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بینی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی بۆ کرد: کە لەشوێنی خۆت بمێنەرەوەو نوێژەکەمان بۆ تەواوکە، پێشەوا ئەبو بەکر لە خۆشیدا دەستی بەرزکردەوەو سوپاس و ستایشی خوای کرد لەسەر فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، پاشان ئەبو بەکر هاتەدواوە بۆ ناو ریزەکەو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە پێشەوە کاتێ کە لەنوێژ بوویەوە فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر چی رێگری لێ کردی لەجێی خۆت بمێنیتەوە کاتێ کە فەرمانم پێ

کردی؟). ئەبو بەکر وتی: بۆ کوڕی ئەبو قوحافە ناگونجێت لەپێش پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم نوێژ بکات. جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە خەڵکەکەی فەرموو: (ئەوە چی بوو ئەوەندە بە بەری دەستتان داتان لە پشتی دەستان؟ هەرکەسێ لەناو نوێژەکەیدا شتێکی لێ رووبدا با (سبحان الله) بکات. کاتێ کە (سبحان الله)ی کرد پێشنوێژ ئاوڕی لێ دەداتەوە، چونکە بە بەری دەست دان لە پشتی دەست لەناو نوێژدا بۆ ئافرەتانە).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا فِى الْفَرِيضَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمە بۆ نوێژی فەرزە.

٩٤١ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِى عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَاهُمْ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَقَالَ لِبِلاَلٍ: « إِنْ حَضَرَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ وَلَمْ آتِكَ فَمُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ ». فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ أَذَّنَ بِلاَلٌ، ثُمَّ أَقَامَ ثُمَّ أَمَرَ أَبَا بَكْرٍ فَتَقَدَّمَ ، قَالَ فِى آخِرِهِ: « إِذَا نَابَكُمْ شَىْءٌ فِى الصَّلاَةِ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْيُصَفِّحِ النِّسَاءُ ».

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە، کە وتویەتی: کێشەو ئاژاوە لە نێوان هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف دا رویدا، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەواڵەکەی پێگەیشت لەدوای نوێژی نیوەڕۆ چوو بۆ ناویان بۆ ناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە بە بیلالی فەرموو: (ئەگەر کاتی نوێژی عەسر هاتە پێشەوەو نەهاتمەوە بانگ بدەو بڵێ بە ئەبو بەکر با پێشنوێژی بکات بۆ

خەڵكەكە). جا كاتى نوێـژى عەسـر هاتـە پێشـەوە بـيلال و بـانگى دا، پاشـان قامەتى كردوو فەرمانى كرد بە ئـەبو بـەكر كـە پێشنوێژى بكات، ئـەبو بـەكر چووە پێشەوە، لە كۆتايى فەرموودەكەدا فەرمووى: (ئەگەر لـەناو نوێـژدا شـتێك روويدا با پياوان (سبحان الله) بكەن و، ئافرەتانيش بە بەرى دەستيان بـدەن لـە پشتى دەستيان).

٩٤٢ - (صحيح مقطوع) عَنْ عِيسَى بْنِ أَيُّوبَ، قَالَ قَوْلُهُ: « التَّصْفِيق لِلنِّسَاءِ » تَضْرِبُ بِأُصْبُعَيْنِ مِنْ يَمِينِهَا عَلَى كَفِّهَا الْيُسْرَى.

واتە: لە عيساى كوڕى ئەيوبـەوە هـاتووە، كـە وتويـەتى: مانـاى وتـەى: (بـە بـەرى دەسـت دان لـە پشـتى دەسـت لـەناو نوێـژدا بـۆ ئافرەتانـە). ئەوەيـە كـە ئافرەت بە بەرى پەنجەكانى دەستى راستى بكێشێت بە پشتى دەستى چەپيدا.

## باسى ئيشارەت لەنوێژدا.

## ١٧٤ – بَابُ الإِشَارَةِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٤٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُشِيرُ فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە ئەنەسى كوڕى ماليكەوە هاتووە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژدا ئيشارەتى دەكرد.

٩٤٤ - (ضعيف والفقرة الأولى في الحديث صحيحة) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ - يَعْنِي فِي الصَّلاَةِ - وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ، مَنْ أَشَارَ فِي صَلاَتِهِ إِشَارَةً تُفْهَمُ عَنْهُ فَلْيَعُدْ لَهَا ». يَعْنِي الصَّلاَةَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (وتنی (سبحان الله) بۆ پیاوانە – واتە لەناو نوێژدا - بە بەری دەستیش دان لە پشتی دەست لەناو نوێژدا بۆ ئافرەتانە، هەرکەسێ لەناو نوێژەکەیدا ئیشارەت بکات واتە ئیشارەتێ کە بۆ تێگەیاندن بێت دەبێ بیکاتەوە). واتە: نوێژەکەی بکاتەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ وَهَمٌ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە (وَهَم)ە.

## باسی سڕین و پاککردنەوەی بەردو چەو لەنوێژدا.

## ١٧٥ – بَابُ فِي مَسْحِ الْحَصَى فِي الصَّلاَةِ.

| |
|---|
| ٩٤٥ - (ضعيف) عَنْ أَبَا ذَرّ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلاَةِ، فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ، فَلاَ يَمْسَحِ الْحَصَى». |

واتـە: لـە (أَبَـا ذَرّ)ەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویەتی: کاتێ یـەکێ لـە ئێـوە هەسـتا بـۆ نوێـژ میهرەبـانی خـوا ڕووی تـێ دەکات، با بەردو چەو نەسڕێت.

| |
|---|
| ٩٤٧ - (صحيح) عَنْ مُعَيْقِيبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: « لاَ تَمْسَحْ وَأَنْتَ تُصَلِّي، فَإِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَـاعِلاً فَوَاحِدَةً، و تَسْوِيَةَ الْحَصَى ». |

واتە: لە موعەیقیبـەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویەتی: (بەردو چەوی بەردەمت مەسڕە کاتێ کـە نوێـژ دەکـەیت، ئەگـەر هەر پێویست بوو یەکجار دەستی پێدا بهێنە بۆ سڕین و پاککردنەوەی).

## باسى كەسێك نوێژ بكات
## دەست بخاتە سەر كەلەكەى.

## ١٧٦ - بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّى مُخْتَصِرًا.

| |
|---|
| ٩٤٧ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الاخْتِصَارِ فِى الصَّلاَةِ. |

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە هاتووە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم نەهى كردووە لەوەى پياو لەكاتى نوێژكردندا دەستەكانى دابنێ لەسەر يان لە ئاستى كەلەكەى.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِى يَضَعُ يَدَهُ عَلَى خَاصِرَتِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: واتە دانانى دەستى لەسەر كەلەكەى.

## باسی کەسێك هێز بداتە سەر داردەستێ لەنوێژدا.

## ١٧٧ - بَابُ الرَّجُلِ يَعْتَمِدُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى عَصًا.

٩٤٨ - (صحيح) عَنْ هِلَالِ بْنِ يِسَافٍ، قَالَ: قَدِمْتُ الرَّقَّةَ: فَقَالَ لِي بَعْضُ أَصْحَابِي: هَلْ لَكَ فِي رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟، قَالَ قُلْتُ: غَنِيمَةٌ، فَدَفَعْنَا إِلَى وَابِصَةَ، قُلْتُ لِصَاحِبِي: نَبْدَأُ فَنَنْظُرُ إِلَى دَلِّهِ فَإِذَا عَلَيْهِ قَلَنْسُوَةٌ لَاطِئَةٌ ذَاتُ أُذُنَيْنِ وَبُرْنُسُ خَزٍّ أَغْبَرُ، وَإِذَا هُوَ مُعْتَمِدٌ عَلَى عَصًا فِي صَلَاتِهِ، فَقُلْنَا بَعْدَ أَنْ سَلَّمْنَا؟ فَقَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ قَيْسٍ بِنْتُ مِحْصَنٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا أَسَنَّ وَحَمَلَ اللَّحْمَ اتَّخَذَ عَمُودًا فِي مُصَلَّاهُ يَعْتَمِدُ عَلَيْهِ.

واتە: لە هیلالی کوڕی یسافەوە هاتووە، کە وتویەتی: چووم بۆ (الرَّقَّة) — کە شوێنێکە لە وڵاتی شام — هەندێ لە هاوەڵانم پێیان وتم: حەز دەکەیت بگەیت بە دیداری یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم؟ وتی: وتم: بەڵێ دیداری غەنیمەتە، ڕۆشتین بۆلای (وَابِصَة)، بە هاوڕێکەمم وت: ومرن با سەیری شکڵ و شێوەی جوان و بە ویقاری بکەین کە چەندە خاکیە کاتێ کە چووینە

ژوورەوە بـۆلای بینیمـان (قەلەنسـوە)کلاوێکی لەسـەردا یـە هـەموو سـەری داپۆشـیوە، وە (بـرنس)[١]ێکـی ڕەنـگ خـاکی لەبـەردا بـوو، نوێـژی دەکـرد لەنوێژەکەیـدا هێـزی دابـووە سـەر داردەسـتەکەی، کـاتێ کـە لەنوێـژ بویـەوە سلاومان لێ کرد، دەربارەی هێز دانە سەر داردەستەکی لێمان پرسی؟ وتی: ئـوم قەیسی کچی (مِحْصَن) بۆی گێڕامەوەو وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەساڵا چوو بێ هێز و قەڵەو بوو لەشوێنی نوێژەکەی کۆڵەکەیەکی بۆ خۆی دانابوو لەنوێژدا دەستی پێوە دەگرت و هێزی دەدایە سەری.

## باسی قەدەغەکردنی قسەکردن لەنوێژدا.

## ١٧٨ – بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْكَلاَمِ فِي الصَّلاَةِ.

٩٤٩ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: كَانَ أَحَـدُنَا يُكَلِّـمُ الرَّجُـلَ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلاَةِ فَنَزَلَتْ: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَـانِتِينَ). فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنْ الْكَلاَمِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە، کە وتویـەتی: هەریـەکێ لـە ئێمـە پێشتر لەنوێژدا قسەی لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی دەکرد هە تا ئایەتی: (وَقُومُوا لِلّٰهِ قَانِتِينَ). واتە: وە لەنوێژدا بوەستن بـۆ خـوا بەگـەردن کەچـی (بـێ قسـەکردن). هاتەخوارەوە ئیتر فـەرمانمان پێـدرا کـە قسـە لەگـەڵ یـەك نەکـەین و بێـدەنگ بین، وە قسەکردنمان لێ قەدەغەکرا.

---

[١] - (برنس) هەر پۆشاکێك کە سەر کلاوی پێوە لکێندرابێ. قاموسی رستە: ١/ ١٢٨. نوسـینی ماموستا مەلا مەحمودی گەلالی.

## باسی كەسیٚ كە بەدانیشتنەوە نوێژ بكات.

## ١٧٩ - بَابُ فِي صَلاَةِ الْقَاعِدِ.

٩٥٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: حُدِّثْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «صَلاَةُ الرَّجُلِ قَاعِدًا نِصْفُ الصَّلاَةِ ». فَأَتَيْتُهُ فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي جَالِسًا، فَوَضَعْتُ يَدَيَّ عَلَى رَأْسِي، فَقَالَ: «مَا لَكَ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو؟». قُلْتُ: حُدِّثْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّكَ قُلْتَ: «صَلاَةُ الرَّجُلِ قَاعِدًا نِصْفُ الصَّلاَةِ». وَأَنْتَ تُصَلِّي قَاعِدًا، قَالَ: «أَجَلْ، وَلَكِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ».

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ هاتووە، كە وتویەتی: بۆیان گێڕامەوە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی كەسێك كە بە دانیشتنەوە نوێژەكەی ئەنجام بدات پاداشتەكەی نیوەی نوێژی كەسێكە كە نوێژەكەی بە پێوە بكات). منیش چووم بۆلای دەبینیم بە دانیشتنەوە نوێژ دەكات، دەستم خستە سەر سەرم، فەرمووی: (ئەوە چیتە ئەی (عبداللە)ی كوڕی عەمر؟). وتم: بۆیان گێڕامەوە كە تۆ فەرمووتە: (نوێژی كەسێك كە بە دانیشتنەوە نوێژەكەی ئەنجام بدات پاداشتەكەی نیوەی نوێژی كەسێكە كە نوێژەكەی بە پێوە بكات). كەچی تۆش بە دانیشتنەوە نوێژ دەكەی، فەرمووی: (بەڵیٚ، بەڵام من وەك هیچ یەكیٚ لە ئێوە نیم).

٩٥٢ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ قَاعِدًا، فَقَالَ: «صَلَاتُهُ قَائِمًا أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهِ قَاعِدًا، وَصَلَاتُهُ قَاعِدًا عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاتِهِ قَائِمًا، وَصَلَاتُهُ نَائِمًا عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلَاتِهِ قَاعِدًا».

واتە: عیمرانی کوڕی (حُصَیْن)، سەبارەت بە نوێژی کەسێك کە بە دانیشتنەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسی؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەو نوێژەی کە بە پێوە ئەنجامی دەدات ئەوە چاکترە لەو نوێژەی کە بە دانیشتنەوە ئەنجامی دەدات، وە ئەو نوێژەی کە بە دانیشتنەوە ئەنجامی دەدات ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژەی هەیە کە بەپێوە ئەنجامی دەدات، وە ئەو نوێژەی کە بە راکشانەوە ئەنجامی دەدات ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژەی هەیە کە بە دانیشتنەوە ئەنجامی دەدات).

٩٥٣ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: كَانَ بِيَ النَّاصُورُ فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: « صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ ».

واتە: لە عیمرانی کوڕی (حُصَیْن)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: نەخۆشی (النَّاصُور)م هەبوو پرسیارم لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد سەبارەت بە نوێژکردنم؟ ئەویش فەرمووی: (بە پێوە نوێژەکانت ئەنجام بدە، ئەگەر توانات

نەبوو بە دانیشتنەوە ئەنجامیان بدە، دیسان ئەگەر ئەگەر توانات نەبوو لەسەر لا ئەنجامیان بدە).

٩٥٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ جَالِسًا قَطُّ، حَتَّى دَخَلَ فِي السِّنِّ فَكَانَ يَجْلِسُ فِيهَا فَيَقْرَأُ، حَتَّى إِذَا بَقِيَ أَرْبَعُونَ أَوْ ثَلاَثُونَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَهَا ثُمَّ سَجَدَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم نەدیوە لە شەونوێژەكانیدا بە دانیشتنەوە قورئان بخوێنێت هەتا بە ساڵدا چوو، ئەوكاتە دادەنیشت و قورئانی تێدا دەخوێند هەتا سی یان چل ئایەتی دەما، جا هەڵئەسا بە پێوە تەواوی دەكرد پاشان سەجدەی دەبرد.

٩٥٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي جَالِسًا، فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، وَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرُ مَا يَكُونُ ثَلاَثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَهَا وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ.

واتە: لە خاتوو عائیشەی خێزانی پێغبەرەوە صلی الله علیە وسلم هاتووە، کە پێغبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە دانیشتنەوە نوێژەکەی ئەنجام دەدا، بە هەمان شێوە خوێندنەوەکەشی، هەتا سی یان چل ئایەتی دەما، جا هەڵئەسا بە پێوە ئەو ئایەتانەی تەواو دەکردن، پاشان دەچووە رکوعەوە، پاشان دەچووە سەجدەوە، ئینجا لەڕکاتی دووهەمیشدا بەو شێوەی دەکرد.

٩٥٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهـا ، قَالَتْ:كَـانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي لَيْلاً طَـوِيلاً قَائِمًـا، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِدًا، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا رَكَعَ قَائِمًا، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِدًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شەوانێکی درێژ نوێژی بە پێوە دەکرد، شەوانێکی درێژی تری بە دانیشتنەوە ئەنجام دەدا، ئەگەر بە پێوە نوێژی بکردایە ئەوا بە پێوە رکوعی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی ئەنجام بدایە ئەوا بە دانیشتنەوە رکوعی دەبرد.

٩٥٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ أَكَـانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ يَقْـرَأُ السُّـورَةَ فِـي رَكْعَةٍ؟، قَالَتِ الْمُفَصَّـلَ، قَـالَ: قُلْـتُ: فَكَـانَ يُصَـلِّي قَاعِدًا، قَالَتْ:حِينَ حَطَمَهُ النَّاسُ.

واتــە: لــە (عبداللــە)ی کــوڕی شــەفیقەوە هــاتووە، کــە وتویــەتی: لــە خــاتوو عائیشــەم پرســی کــە ئایــا پێغبــەری خــوا صــلی الله علیــه وســلم لەڕکاتێکــدا ســورەتێکی دەخوێنــد، وتــی: بــەڵێ لــە ســورەتە (مُفَصَّــل)ەکــان — واتــە ئــەو سورەتانەی کە لەدوای سورەتی قاف(ق)ەوە دێـن - ، وتـی: وتم بـە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ، کاتێ کە پیر بوو لەناویانداو خەڵك ماندویان کرد.

## باسی چۆنیەتی دانیشتن لە تەحیاتدا.

## ١٨٠ – بَابُ كَيْفَ الْجُلُوسُ فِي التَّشَهُّدِ.

٩٥٧ - (صحيح) عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، قَالَ: قُلْتُ لأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ يُصَلِّي فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا بِأُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَحَدَّ مِرْفَقَهُ الأَيْمَنَ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ ثِنْتَيْنِ وَحَلَّقَ حَلْقَةً، وَرَأَيْتُهُ يَقُولُ هَكَذَا: وَحَلَّقَ بِشْرٌ الإِبْهَامَ وَالْوُسْطَى وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ.

واتە: لە وائلی كوڕی حوجرەوە هاتووە، كە وتویەتی: وتم چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەرتان صلى الله عليه وسلم نیشان بدەم كە چۆن نوێژی دەكرد؟ وتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەڵئەسا بۆ نوێژكردن، رووی دەكردە قیبلەو هەردوو دەستی بەرزكردەوە تا نەرمایی گوێچكەكانی، پاشان بەدەستی راستی دەستی چەپی دەگرت، كاتێ كە دەچووە ركوعیش بە هەمان شێوە بەرزی دەكردنەوە، پاشان هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆكانی دائەنا، كاتێ سەری بەرزدەكردەوە لە ركوع هەردوو دەستی بەرزكردەوە، كاتێ كە سەجدەی دەبرد سەری لەنێوان هەدوو دەستیدا دەخستە سەر زەوی، پاشان قاچی چەپی رادەخست و دادەنیشت، دەستی چەپی لەسەر رانی چەپی دائەنا، ئەنیشكی راستی بە بەرزی رادەگرت لەسەر ئاستی رانی راستی، وە بە پەنجەی ناوەڕاستی پەنجە گەورەی دەگرت و دەیكردن بە هەڵقەیە، بیشر وتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینی بەم شێوەی دەكرد: بیشر پەنجە گەورەی و پەنجەی ناوەڕاستی كرد بە هەڵقەیەك و، پەنجەی شایەتومانی دەجوڵاند.

**٩٥٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: سُنَّةُ الصَّلاَةِ أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ الْيُمْنَى، وَتَثْنِيَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى.**

واتە: لە (عبداللە)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: سوننەت لەنوێژدا ئەوەیە: پێی راستت هەڵنێی بە شێوەیە سەری پەنجەكان روو بكەنە قیبلە، وە پێی چەپت راخەیت.

**٩٥٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: مِنْ سُنَّةِ الصَّلاَةِ أَنْ تُضْجِعَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى وَتَنْصِبَ الْيُمْنَى.**

واتە: لە (عبداللە)ى كوڕى عومەرەوە ڕەزاى خوايان لێ بێ هاتووە، كە وتويەتى: سوننەت لەنوێژدا ئەوەيە: پێى چەپت ڕاخەيت پێى ڕاستت هەڵنێى بە شێوەيە سەرى پەنجەكان ڕوو بكەنە قيبلە.

٩٦٠ - عَنْ يَحْيَى بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ.

واتە: لە يەحياوە فەرموودەكەى پێشوو بە هەمان سەنەد هاتووە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ: عَنْ يَحْيَى أَيْضًا مِنَ السُّنَّةِ كَمَا قَالَ: جَرِيرٌ.

ئەبو داود دەڵێت: لە حەمادى كوڕى زەيدەوە، هەروەها لە يەحياوە (مِنَ السُّنَّةِ) هاتووە، هەروەك جەرير دەڵێت.

٩٦١ - (صحيح) عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ أَرَاهُمُ الْجُلُوسَ فِي التَّشَهُّدِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە يەحياى كوڕى سەعيدەوە هاتووە، كە قاسمى كوڕى موحەممەد دانيشتنى تەحياتى پێ نيشاندان جا فەرموودەكەى گێڕايەوە.

٩٦٢ - (ضعيف) عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ افْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى حَتَّى اسْوَدَّ ظَهْرُ قَدَمِهِ.

واتە: لە ئيبراهيمى - كوڕى يەزيدى نەخەعى ئيمامى خەڵكى كوفە - ەوە

هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە بۆ تەحیات دادەنیشت پێی چەپی رادەخست ئەوەندە لەسەری دادەنیشت هەتا پشتی پێی دەگۆڕا بە مەیلەو رەش.

## باسی (تَوَرُّكْ) لە رکاتی چوارەمدا.

## ١٨١ – بَابُ مَنْ ذَكَرَ التَّوَرُّكَ فِي الرَّابِعَةِ.

٩٦٣ - (صحيح) قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالُوا فَاعْرِضْ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، قَالَ: وَيَفْتَحُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ إِذَا سَجَدَ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ أَكْبَرُ وَيَرْفَعُ وَيَثْنِى رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا، ثُمَّ يَصْنَعُ فِي الأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، قَالَ: حَتَّى إِذَا كَانَتِ السَّجْدَةُ الَّتِى فِيهَا التَّسْلِيمُ، أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَقَعَدَ مُتَوَرِّكًا عَلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ - زَادَ أَحْمَدُ – قَالُوا: صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّى، وَلَمْ يَذْكُرَا فِي حَدِيثِهِمَا الْجُلُوسَ فِي الثِّنْتَيْنِ كَيْفَ جَلَسَ.

واتە: ئەبو حومەید وتی - بەو هاوەڵانەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە لەدەوری بوون - : من لەهەمووتان زیاتر شارەزام بە نوێژکردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتیان: ئادەی بۆمان باس بکەو نیشانمان بدە، جا

فەرمووودەکەی گێڕایەوە، وتی: کە سەجدەی دەبرد پەنجەکانی هەردوو قاچی دەکردنەوە، ئینجا دەیفەرموو: (الله اكبر)، پاشان سەری بەرزدەکردەوەو قاچی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت، پاشان لە باقی نوێژەکەیدا بە هەمان شێوەی دەکرد، ئینجا فەرمووودەکەی گێڕایەوە، وتی: هەتا دەگەیشتە ئەو سەجدەیەی کە سەلامی تێدا دەدایەوە واتە تەحیاتی کۆتایی جا قاچی چەپی دەبردە پێشەوە بۆ ژێر قاچی راستی و ئەوی تریانی هەڵدەنا و لەسەر لای چەپی دادەنیشت - ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەمەشی بۆ زیاد کرد - وتیان: راست دەکەیت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەو شێوەیە نوێژی دەکرد. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و موسەددەد کە دوو راوی فەرمودەکەن لە فەرمودەکەیاندا باسی چۆنیەتی دانیشتن لەسەر سمتیان نەکرد کە چۆن دانیشتووە.

٩٦٤ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَبَا قَتَادَةَ، قَالَ: فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الأَخِيرَةِ، قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَجَلَسَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی (عَطَاء)ەوە، کە لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دانیشتبووە، بە هەمان شێوە فەرمودەکەی گێڕایەوە، بەڵام باسی ئەبو قەتادەی نەکرد - کە یەکێك بووە لەوانەی فەرمودەکەی پێشووی لێ بیستراوە - وتی: لەڕکاتی

دووهەمـدا کـاتێ کـە دادەنیشـت بـۆ تـەحیات خوێنـدن لەسـەر پێـی چـەپی دادەنیشت، بەڵام لەچوارەم ڕکاتدا قاچی چەپی دەبردە پێشەوە بۆ ژێر راستی و ئەوی تریانی هەڵدەنا و لەسەر سمتی دادەنیشت.

٩٦٥ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو الْعَـامِرِيِّ، قَـالَ: كُنْـتُ فِـي مَجْلِـسٍ بِهَـذَا الْحَـدِيثِ، قَـالَ فِيـهِ: فَـإِذَا قَعَـدَ فِـي الرَّكْعَتَيْنِ، قَعَدَ عَلَى بَطْـنِ قَدَمِــهِ الْيُسْـرَى، وَنَصَـبَ الْيُمْنَى، فَإِذَا كَانَتِ الرَّابِعَةُ أَفْضَى بِوَرِكِهِ الْيُسْرَى إِلَى الأَرْضِ، وَأَخْرَجَ قَدَمَيْهِ مِنْ نَاحِيَةٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عـەمری عامریـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: مـن لەو دانیشتنەدا ئامادە بووم، لە فەرمودەکەیدا وتـی: لـەڕکاتی دووهەمـدا کـاتێ کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن لەسەر بەری پێی چەپی دادەنیشت و، قاچی راستی هەڵدەنا، بەڵام لەچوارەم ڕکاتـدا کلۆکی لای چەپی دەخسـتە سـەر زەوی، هەردوو پێی لە لایەکەوە دەردەکرد- واتە لەلای راستەوە - .

٩٦٦ - (ضعيف) عَنْ عَبَّاسٍ أَوْ عَيَّاشِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ أَبُوهُ فَذُكِرَ فِيهِ، قَالَ: فَسَجَدَ، فَانْتَصَبَ عَلَى كَفَّيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ وَصُدُورِ قَدَمَيْهِ وَهُـوَ سَـاجِدٌ، ثُـمَّ كَبَّرَ فَجَلَسَ فَتَوَرَّكَ وَنَصَبَ قَدَمَـهُ الأُخْـرَى، ثُـمَّ كَبَّـرَ،

فَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَقَامَ، وَلَمْ يَتَوَرَّكْ، ثُمَّ عَادَ فَرَكَعَ الرَّكْعَةَ الأُخْرَى، فَكَبَّرَ كَذَلِكَ ثُمَّ جَلَسَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ، حَتَّى إِذَا هُوَ أَرَادَ أَنْ يَنْهَضَ لِلْقِيَامِ قَامَ بِتَكْبِيرٍ، ثُمَّ رَكَعَ الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ، فَلَمَّا سَلَّمَ سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ.

واتە: لە عەباس یان عەیاشی کوڕی سەهلی ساعیدیەوە هاتووە، کە ئامادەی کۆڕێك بوو باوکیشی لێ بوو لە فەرمودەکەیدا گێڕایەوەو وتی: سەجدەی برد، لەپی هەردوو دەستی و هەردوو ئەژنۆیی و سنگی پەنجەکانی هەردوو پێی لەسەر زەوی دانا لەکاتێکدا کە لە سەجدەدا بوو، پاشان (الله اکبر)ی کردو لەنێوان دوو سەجدەکەدا دانیشت تەوەروکی کرد واتە لەسەر کلۆکی لای چەپی دانیشت و قاچەکەی تری هەڵنا، پاشان (الله اکبر)ی کردو سەجدەی دووهەمی برد، ئینجا (الله اکبر)ی کردو تەوەروکی نەکرد، ئینجا گەڕایەوە رکاتێکی تری کرد وەك رکاتەکەی پێشوو، هەروەها (الله اکبر)ی کرد، پاشان لەدوای دوو رکاتەکە دانیشت بۆ تەحیاتی یەکەم، هەتا کاتێ کە دەیویست هەستێتەوە (الله اکبر)ی دەکردو هەڵئەسایەوە، پاشان دوو رکاتەکەی تری دەکرد، کاتێ کە سەلامی دایەوە بەلای راست و چەپدا سەلامی دایەوە.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَذْكُرْ فِي حَدِيثِهِ مَا ذَكَرَ عَبْدُ الْحَمِيدِ فِي التَّوَرُّكِ وَالرَّفْعِ إِذَا قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە فەرمودەکەیدا باسی تەوەروك و کاتێ کە هەڵئەسایەوە بۆ دوو رکاتەکەی تری نەکرد، هەروەك کە (عَبْدُ الْحَمِيدِ) باسی کرد.

٩٦٧ - (صحيح) عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ، قَالَ: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ وَأَبُو أُسَيْدٍ وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ، وَلَمْ يَذْكُرِ الرَّفْعَ إِذَا قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ وَلاَ الْجُلُوسَ، قَالَ: حَتَّى فَرَغَ ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَأَقْبَلَ بِصَدْرِ الْيُمْنَى عَلَى قِبْلَتِهِ.

واتە: عەباسی کوڕی سەهلەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو حومەید و ئەبو ئوسەید و سەهلی کوڕی سەعد و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کۆبوونەوە، جا راوی فەرمودەکەی پێشووی گێڕایەوە، بەڵام باسی دەست بەرزکردنەوەی هەستانەوە لە رکاتی دووهەم لەگەڵ دانیشتنی تەوەروك بۆ تەحیاتی دووهەمی نەدەکرد، راوی وتی: هەتا هەردوو سەجدەکەی رکاتی دووهەمی تەواو دەکرد، پاشان دادەنیشت و قاچی چەپی رادەخست، وە سنگی پێی روو دەکردە قیبلە.

## باسی تەحیات خوێندن.

## ١٨٢ - بَابُ التَّشَهُّدِ.

٩٦٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: كُنَّا إِذَا جَلَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ، قُلْنَا: السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ قَبْلَ عِبَادِهِ، السَّلاَمُ عَلَى فُلاَنٍ وَفُلاَنٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لاَ

تَقُولُوا السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ، وَلَكِنْ إِذَا جَلَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، فَإِنَّكُمْ إِذَا قُلْتُمْ ذَلِكَ أَصَابَ كُلَّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِى السَّمَاءِ وَالأَرْضِ - أَوْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ - أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ لْيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَيَدْعُو بِهِ )).

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی مەسعودەوە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم دادەنیشتین لەنوێژدا دەمانوت: سەلام لەسەر خوا بێت لەپێش بەندەکانی، سڵاو لەسەر فلان و فلان، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: مەڵێن: (السَّلاَمُ عَلَى الله). واتە: سەلام لەسەر خوا بێت، چونکە (الله) بۆ خۆی سەلامە، بەڵکو کاتێ کە یەکێکتان دادەنیشێ بۆ تەحیات با بڵێت: (التَّحِيَّاتُ لله، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ). واتە: ئەو وشانەی کە واتای سەلام و موڵك و مانەوەیە هەمووی بۆ خوای پەروەردگارە، وە ئەو پاڕانەوانەی کە مەبەست لێی بە گەورە زانینی خوای پەروەردگارە هەر شایستەی ئەوەو، هیچ کەسی تر جگە لەو شایستەی ئەوە نیە، هەروەها کام قسەیە جوان و شیرینە بوترێت شایانی ئەوە، سڵاوت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر لەگەڵ ڕەحمەت و میهرو بەرەکاتی خوایی دا، سڵاوی خوا لەسەر ئێمەو لەسەر هەموو بەندە چاك و ساڵحەکانی خوای گەورە. چونکە ئەگەر

ئــەوەتان وت ئــەوا هــەموو بەنــدە چــاك و ســاڵحەكانی ئاسمانــەكان و زەوی دەگرێتەوە – یان هەموو بەندە چاك و ساڵحەكانی نێوان ئاسمانـەكان و زەوی دەگرێتەوە – شایەتی دەدەم كە هیچ فریاد رەسێك نیـە شایەنی پەرسـتن بێـت جگە لەو خوایەی كە تـاك و تەنیایـە، هـەروەها شـایەتی دەدەم كـە موحەممـەد صلى الله عليه وسلم فروستادەی خوایە و لە لایەن ئەوەوە رەوانە كراوە.

**٩٦٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كُنَّا لاَ نَدْرِي مَا نَقُولُ إِذَا جَلَسْنَا فِي الصَّلاَةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ عَلِمَ فَذَكَرَ نَحْوَهُ.**

واتە: لە (عبداللـه)ەوە، كـە وتویـەتی: ئێمـە كـاتێ كـە دادەنیشـتین لەنوێـژدا نەماندەزانی چی بڵێین، هـەتا پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم لەلایـەن خوای گەورەوە فێر كرا، جا بە هەمان شێوە فەرمودەكەی پێشووی گێڕایەوە.

**(ضعيف) قَالَ شَرِيكٌ: وَحَدَّثَنَا جَامِعٌ - يَعْنِي ابْنَ شَدَّادٍ - عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، بِمِثْلِهِ، قَالَ: وَكَانَ يُعَلِّمُنَا كَلِمَاتٍ، وَلَمْ يَكُنْ يُعَلِّمُنَاهُنَّ كَمَا يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ: « اللَّهُمَّ أَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِنَا، وَأَصْلِحْ ذَاتَ بَيْنِنَا، وَاهْدِنَا سُبُلَ السَّلاَمِ، وَنَجِّنَا مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ، وَجَنِّبْنَا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَبَارِكْ لَنَا فِي أَسْمَاعِنَا، وَأَبْصَارِنَا، وَقُلُوبِنَا، وَأَزْوَاجِنَا، وَذُرِّيَّاتِنَا،**

وَتُبْ عَلَيْنَـا ، إِنَّـكَ أَنْـتَ التَّـوَّابُ الـرَّحِيمُ، وَاجْعَلْنَـا شَـاكِرِينَ لِنِعْمَتِـكَ، مُثْـنِينَ بِهَـا ، قَابِلِيهَـا ، وَأَتِمَّهَـا عَلَيْنَا».

شـورەیك وتـی: (جَـامِع) - واتـە ئیبنـو شـەداد – لـە ئـەبو وائلـەوە، لـە (عبدالله)ەوە، بە هەمان شێوە فەرموودەكەی گێڕایـەوە، وتـی: چـەند وشـەیەكی فێركـردین كـە پێشـتر نەمانـدەزانین وەك چۆن تـەحیاتی فێركـردین: خودایـە دڵەكانمان یەكبخە، نێوانمان چاك بكە، خودایـە هیدایـەتمان بـدە بـۆ رێگاكـانی ئاشـتی، خودایـە هیدایـەتمان بـدە بـۆ رێگاكـانی ئاشـتی، خودایـە لـە تـاریكی رزگارمـان بكـەو بمانخـەرە رونـاكی، دوورمانخـەرەوە لەهـەموو خراپەكارییـەكی نهێنـی و ئاشـكرا، خودایـە بەرەكـەت بخـەرە گـوێ و چـاوو دڵ و خێـزان و نەوەكانمان، خودایە لێمان خۆشببە، چونكە بەڕاستی تـەنها تـۆ لێبـوردەو بـە بەزەیی و بە روحمی، خودایە بمانخەیتە ریزی ئەو كەسانەی كە سوپاسگوزاری نیعمەتەكانی تۆن، خودایە وامان لێ بكە رازی ببین پێیان، ئەوەنـدەی ترمـان بدەیتێ و نیعمەتەكانت تەواو بكە لەسەرمان.

٩٧٠ - (شاذ بزيادة (إذا قلت) والصواب أنه من قول ابن مسعود موقوفاً عليه) عَنْ الْقَاسِمِ بْنِ مُخَيْمِرَةَ، قَالَ: أَخَذَ عَلْقَمَةُ بِيَدِي، فَحَدَّثَنِي أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ أَخَذَ بِيَدِهِ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ بِيَدِ عَبْدِ اللَّهِ فَعَلَّمَهُ التَّشَهُّدَ فِي الصَّلَاةِ، فَذَكَرَ مِثْلَ دُعَاءِ حَدِيثِ الْأَعْمَشِ « إِذَا قُلْتَ هَذَا ، أَوْ قَضَيْتَ هَذَا ، فَقَدْ

قَضَيْتَ صَلاَتَكَ إِنْ شِئْتَ أَنْ تَقُومَ فَقُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَقْعُدَ فَاقْعُدْ ».

واتە: لە قاسمی كوڕی موخەیمیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: عەلقەمە دەستی گرتم و بۆی گێڕامەوە، كە (عبداللە)ی كوڕی مەسعود دەستی گرتووە، وە پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم دەستی (عبداللە)ی گرتووەو تەحیاتی لەنوێژدا فێركردووە، جا راوی وەك تەحیاتەكەی فەرمودەكەی ئەعمەشی گێڕایەوە كە باسكرا: (ئەگەر دانیشتی و ئەم تەحیاتەت (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ ...). هەتا كۆتایی خوێند، ئەوا بەتەواوی نوێژەكەت ئنجامداوە، ئەگەر ئارەزوت هەبوو هەستیتەوە هەستە، ئەگەر ئارەزوت هەبوو دانیشی دانیشە).

٩٧١ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي التَّشَهُّدِ: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الصَّلَوَاتُ، الطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ». قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: زِدْتُ فِيهَا وَبَرَكَاتُهُ. «السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ». قَالَ ابْنُ عُمَرَ: زِدْتُ فِيهَا وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ. «وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ ئەم شێوە تەحیاتەی لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوە: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الصَّلَوَاتُ، الطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ). موجاهید راوی

فەرموودەكە وتی: ئیبنو عومەر وتی: من (وَبَرَكَاتُهُ)م بۆ زیاد كرد، (السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). ئیبنو عومەر وتی: من (وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ)م بۆ زیاد كرد: (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

٩٧٢ - (صحيح) عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ، قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ، فَلَمَّا جَلَسَ فِي آخِرِ صَلاَتِهِ، قَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أُقِرَّتِ الصَّلاَةُ بِالْبِرِّ وَالزَّكَاةِ، فَلَمَّا انْفَتَلَ أَبُو مُوسَى أَقْبَلَ عَلَى الْقَوْمِ فَقَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا، فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، قَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا، فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، قَالَ: فَلَعَلَّكَ يَا حِطَّانُ أَنْتَ قُلْتَهَا، قَالَ: مَا قُلْتُهَا، وَلَقَدْ رَهِبْتُ أَنْ تَبْكَعَنِي بِهَا، ﴿قَالَ﴾: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا قُلْتُهَا، وَمَا أَرَدْتُ بِهَا إِلاَّ الْخَيْرَ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَمَا تَعْلَمُونَ كَيْفَ تَقُولُونَ فِي صَلاَتِكُمْ؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَنَا فَعَلَّمَنَا، وَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا فَقَالَ: « إِذَا صَلَّيْتُمْ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَرَأَ: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ) فَقُولُوا آمِينَ يُجِبْكُمُ اللَّهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ

يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ »،، قَالَ: رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا، قَالَ: سَمِعَ اللَّـهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، يَسْمَع اللَّـهُ لَكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى، قَالَ: عَلَى لِسَـانِ نَبِيِّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ، فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَسْـجُدُ قَـبْلَكُمْ، وَيَرْفَـعُ قَبْلَكُمْ »،، قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: « فَتِلْكَ بِتِلْكَ، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ، فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ: « التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّـلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وَبَرَكَاتُـهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ ». لَـمْ يَقُلْ أَحْمَدُ « وَبَرَكَاتُهُ ». وَلاَ قَالَ: « وَأَشْهَدُ »،، قَـالَ: « وَأَنَّ مُحَمَّدًا ».

واته: له (حِطَّان)ی كوڕی (عبدالله)ی ڕەقاشیەوە هاتووە، كە وتویەتی: ئەبو موسای ئەشعەری بەرنوێژی بۆ كردین، كاتێ كە دانیشت بۆ تەحیاتی كۆتایی، پیاوێ لە قەومەكە وتی: نوێژ كراوە بەهاوتای چاكەو زەكات، كاتێ كە ئەبو موسا لەنوێژ بویەوە ڕووی كردە خەڵكەكەو وتی: كێ بوو ئاواو ئاوای وت، خەڵكەكە بێ دەنگ بوون و كەس وەڵامی نەدایەوە، دیسان وتی: كێ بوو ئاواو

ئـاوای وت، خەڵکەکـە بـێ دەنـگ بـوون و کـەس وەڵامـی نەدایـەوە، وتـی: ئـەی (حِطّان) لەوانەیە تۆ وتبێتت، وتی: من نـەموتووە، ترسـام سەرزەنشـتم بکـەیت، (حِطّان) وتی: پیاوێ لە قەومەکە وتی: مـن وتم، مەبەستیشـم تـەنها خێـر بـوو، ئەبو موسا وتی: ئایا دەزانن لەنوێژەکانتاندا دەڵێن چی؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم وتـاری بـۆ دایـن و فێـری کـردین، رێگـەو رێبـازی دینـی بـۆ رونکردینـەوە، فـەرزەکان و واجباتـەکان و سـوننەتەکان و موسـتەحەبەکانی نوێژەکانی فێرکردین، فەرمووی: (کـاتێ کـە ویسـتتان نوێـژی جەماعـەت بکـەن ریزەکانتان ریك بکەن، با یەکێکتان بەرنوێژیتان بـۆ بکـات، ئەگـەر (الله اکـبر)ی کرد، ئێوەش بەدوایـدا (الله اکبر) بکـەن، کـاتێ کـە: (غَيْـرِ الْمَغْضُـوبِ عَلَـيْهِمْ وَلاَ الضَّـالِّين). خوێنـد، ئێـوەش بڵـێن: (آمـين). خـوای گـەورە پاڕانـەوەکانتان قبـوڵ دەکات، کاتێ کە (الله اکـبر) کـردو چـووە رکوعـەوە، ئێـوەش بەدوایـدا (الله اکـبر) بکـەن و بچـنە رکوعـەوە، چـونکە پێشـنوێژ لـەپێش ئێـوەوە رکـوع دەبـات وە لەپێش ئێوەشەوە سەر بەرزدەکاتەوە لە رکوع، پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسلم فەرمووی: (ئەوە بە ئەوە، کاتێ کە وتـی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِـدَهُ). ئێـوەش بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَـكَ الْحَمْـدُ). خـوای گـەورە بیسـەرتان دەبێـت، چـونکە خـوای پەروەردگار لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی فەرموویەتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِـدَهُ). کـاتێ کـە (الله اکبر) کـردو سـەجدەی بـرد، ئێـوەش (الله اکـبر) بکـەن و سـەجدە بەرن، چونکە پێشـنوێژ لـەپێش ئێـوەوە سـەجدە دەبـات وە لـەپێش ئێوەشـەوە سەر بەرزدەکاتەوە لە سەجدە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فـەرمووی: (ئەوە بـە ئـەوە، ئەگـەر نوێـژخوێن دانیشـت بـۆ تـەحیاتی یەکـەم یـان دووهـەم یەکەم وتەی ئەوە بێت بڵێ: (التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ). ئەحمـەد (وَبَرَكَاتُـهُ)ی نـەوت، وە (وَأَشْهَدُ)ی نەوت، لەجیاتیدا وتی: (وَأَنَّ مُحَمَّدًا).

٩٧٣ - (صحيح) عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ، بِهَذَا الْحَدِيثِ زَادَ: « فَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا». وَقَالَ فِي التَّشَهُّدِ بَعْدَ: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ» زَادَ « وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ».

واتە: لە (حِطّان)ی کوڕی (عبداللە)ی رەقاشیەوە بە هەمان شێوە فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (کاتێ کە پێشنوێژ قورئانی خوێند بێدەنگ بن). هەروەها لە تەحیاتدا لەدوای: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)وە (وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ)ی بۆ زیاد کرد.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَوْلُهُ « فَأَنْصِتُوا ». لَيْسَ بِمَحْفُوظٍ لَمْ يَجِئْ بِهِ إِلاَّ سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ.

ئەبو داود دەڵێت: «فَأَنْصِتُوا». لەهیچ کەسێکەوە لەبەرنەکراوەو نەگێڕدراوەتەوە، ئیللا لە سولەمانی تەیمیەوە نەبێت کە لەم فەرمودەدا هێناویەتی.

٩٧٤ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ، كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ، وَكَانَ يَقُولُ: « التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ،

أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەحیاتی فێردەکردین وەك چۆن قورئانی فێردەکردین، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: ئەو وشانەی کە واتای سەلام و موڵك و مانەوەیە هەمووی بۆ خوای پەروەردگارە، وە ئەو پاڕانەوانەی کە مەبەست لێی بە گەورە زانینی خوای پەروەردگارە هەر شایستەی ئەوەو، هیچ کەسی تر جگە لەو شایستەی ئەوە نیە، هەروەها کام قسەیە جوان و شیرینە بوترێت شایانی ئەوە، سڵاوت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر لەگەڵ رەحمەت و میهرو بەرەکاتی خوایی دا، سڵاوی خوا لەسەر ئێمەو لەسەر هەموو بەندە چاك و ساڵحەکانی خوای گەورە، شایەتی دەدەم کە هیچ فریاد رەسێك نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لەو خوایەی کە تاك و تەنیایە، هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد صلى الله عليه وسلم فروستادەو بەندەی خوایە و لە لایەن ئەوەوە رەوانە کراوە.

٩٧٥ - (ضعيف) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، أَمَّا بَعْدُ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ فِي وَسَطِ الصَّلاَةِ أَوْ حِينَ انْقِضَائِهَا: «فَابْدَءُوا قَبْلَ التَّسْلِيمِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ وَالصَّلَوَاتُ وَالْمُلْكُ لِلَّهِ، ثُمَّ سَلِّمُوا عَلَى الْيَمِينِ، ثُمَّ سَلِّمُوا عَلَى قَارِئِكُمْ وَعَلَى أَنْفُسِكُمْ».

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە هاتووە، لەدوایدا: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردین بەوەی کە لە دانیشتینی یەکەمدا بووین بۆ تەحیات خوێندن یان لە دانیشتینی دووهەمدا بووین پێش سەلامدانەوە دەست بکەین بە تەحیات خوێندن و بڵێین: ئەو وشانەی کە واتای سەلام و موڵك و مانەوەیە هەمووی بۆ خوای پەروەردگارە، کام قسەیە جوان و شیرینە بوترێت شایانی ئەوە، وە ئەو پاڕانەوانەی کە مەبەست لێی بە گەورە زانینی خوای پەروەردگارە هەر شایستەی ئەوە، دەسەڵات و پاشایەتی هەر شایستەی ئەوە، پاشان سەلام لەوانەی لای راست بکەین، ئینجا سەلام لە پێشنوێژ بکەین و سەلام لەیەکتر بکەین.

## باسی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەدوای تەحیات.

## ١٨٣ - بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ التَّشَهُّدِ.

**٩٧٦ - (صحيح) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، قَالَ: قُلْنَا أَوْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَرْتَنَا أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ، وَأَنْ نُسَلِّمَ عَلَيْكَ، فَأَمَّا السَّلَامُ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ، قَالَ: «قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَآلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ».**

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە هاتووە، کە وتویەتی: وتمان یان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانت پێ کردووین کە چۆن سەڵاواتت لەسەر بدەین یان سەلامت لێ بکەین، سەبارەت بە سەلام بەڕاستی زانیمان، ئەدی سەڵاوات لێدان چۆنە؟ فەرمووی: بڵێن: ئەی خوایە بەرەکەتی خۆت برژێنە بەسەر موحەممەد و ئالی موحەممەد دا، وەك چۆن رژاندووتە بەسەر ئالی ئیبراهیم دا، ئەی خوایە خەیر و بەرەکەتی خۆت بۆ سەر موحەممەد و ئالی موحەممەد زیاد بکە، وەك چۆنت کردووە بۆ ئالی ئیبراهیم، بەڕاستی تۆ سوپاسکراو و گەورەیت.

**٩٧٧ - (صحيح) عَنْ شُعْبَةَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: « صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ».**

واتە: لە شوعبەوە فەرموودەکە بەم شێوەیە هاتووە: « صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ ».

**٩٧٨ - (صحيح) عَنْ الْحَكَمِ بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا، قَالَ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ».**

واتە: لە حەکەمەوە فەرموودەکە بەم شێوەیە هاتووە: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

(صحيح) قَالَ أَبو دَاوُدَ: رَوَاهُ الزُّبَيْرُ بْنُ عَدِيّ، عَـنْ ابْـنِ أَبِـي لَيْلَـى، كَمَا رَوَاهُ مِسْعَرٌ إِلاَّ أَنَّهُ، قَالَ: «كَمَـا صَـلَّيْتَ عَلَـى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيـدٌ مَجِيـدٌ، وَبَـارِكْ عَلَـى مُحَمَّـدٍ». وَسَاقَ مِثْلَهُ.

ئەبو داود دەڵێت: لە زوبێری کوڕی عەدییەوە، لە ئیبنو ئەبی لەیلاوە هاتووە، وەك چۆن لە میسعەرەوە هاتووە تەنها ئەوەندە نەبێت کە زوبەیر وتی: (كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ). جا وەك مەسعەر باقی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

**٩٧٩ - (صحيح) عَنْ أَبو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، أَنَّهُمْ قَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّهِ! كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَـالَ: «قُولُـوا اللَّهُـمَّ صَـلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِـهِ، كَمَـا صَـلَّيْتَ عَلَـى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّـدٍ وَأَزْوَاجِـهِ وَذُرِّيَّتِـهِ، كَمَـا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».**

واتە: لە ئەبو حومەیدی ساعدیەوە عوجرەوە هاتووە، کە وتویان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن سەڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

٩٨٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ، قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللَّهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «قُولُوا». فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، زَادَ فِي آخِرِهِ: «فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ».

واتـە: لـە ئـەبو مەسعودی (أَنْصَارِيّ)ەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: لـە کـۆڕی سـەعدی کـوڕی عوبـادەدا دانیشـتبووین پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم هات بۆ لامان، بەشیری کوڕی سـەعد پێـی وت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم خوای گەورە فەرمانی پێ کـردووین کـە سـڵاوات لەسـەر تـۆ بـدەین، چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ ئەویش ئەوەندە بێدەنگ بوو هەتا وتمان خۆزگە ئەم پرسیارەی لـێ نـەدەکرد، پاشـان فـەرمووی: (بڵێن). جـا راوی باسـی مانـای فەرموودەکـەی کـەعبی کـوڕی عـوجرەی گێڕایـەوە کـە پێشـتر باسکرا، بـەڵام لـە کۆتاییدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

٩٨١ - (حسن) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: «قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ».

واتە: لە عوقبەی کوڕی عەمرەوە بەم شێوەیە هاتووە، فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ).

**٩٨٢ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَكْتَالَ بِالْمِكْيَالِ الأَوْفَى إِذَا صَلَّى عَلَيْنَا أَهْلَ الْبَيْتِ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وَأَزْوَاجِهِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَذُرِّيَّتِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەرکەس بیەوێت بەربەی چاك بپێوێ واتە خێر و پاداشتی زۆری دەستکەوێت کاتێ کە سلاوات لەسەر ئێمە ئال و بەیت بدات با بڵێت: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وَأَزْوَاجِهِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَذُرِّيَّتِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

## باسی لەدوای تەحیات چی دەوترێت.

## ١٨٤ – بَابُ مَا يَقُولُ بَعْدَ التَّشَهُّدِ.

٩٨٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ الآخِرِ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ».

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەرکەسێ لە ئێوە کە لە تەحیاتی کۆتایی بووەوە پەنا بەخوا بگرێت لەم چوارە: (لە سزای ئاگری دۆزەخ ، وە لە سزای سەختی گۆڕ، وە لە بەڵاو فیتنەی ژیان و مردن، هەروەها لە بەڵاو فیتنەی دەججال).

٩٨٤ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ بَعْدَ التَّشَهُّدِ: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ

مِنْ فِتْنَـةِ الـدَّجَّالِ، وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ فِتْنَـةِ الْمَحْيَـا وَالْمَمَاتِ ».

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای تەحیات دەیفەرموو: (خودایە پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای ئاگری دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای سەختی گۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای سەختی گۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە بەڵاو فیتنەی دەججال، هەروەها پەنا دەگرم بەتۆ لە بەڵاو فیتنەی ژیان و مردن.

٩٨٥ - (صحيح) عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ عَلِيّ، أَنَّ مِحْجَنَ بْنَ الأَدْرَعِ حَدَّثَـهُ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْـجِدَ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ قَضَـى صَـلاَتَهُ وَهُـوَ يَتَشَـهَّدُ وَهُـوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ يَا اللَّهُ، الأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّـذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِى ذُنُوبِى، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، قَـالَ: فَقَـالَ: « قَـدْ غُفِرَ لَهُ قَدْ غُفِرَ لَهُ ». ثَلاَثًا.

واتە: لە (حَنْظَلَة)ی كوڕی عەلیەوە هاتووە، كە میحجەنی كوڕی ئەدرەع بۆی گێڕاوەتەوەو وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە ناو مزگەوتەوە بینی پیاوێ خەریكە لەنوێژ دەبێتەوە خەریكی تەحیات خوێندن بوو دەیوت: خودایە ئەی خوای تاك و تەنیا، ئەی جێی نیاز و هیواو ئومێدی هەموو كەسێ، ئەی ئەو كەسەی كە نیازی بەهیچ كەسێ نیە وە هەموو كەسێ نیازی بەو هەیە، ئەی ئەو كەسەی كە نە كەسی لێ بووەو نە خۆشی لەكەس

بـووەو نــە کەسـێ هاوتــای دەکـات، داوات لـێ دەکـەم بــە میهرەبـانی خـۆت لــە گوناهەکانم خۆش ببی، بەڕاسـتی هـەرتۆ لێبـوردەی میهرەبـانی، وتـی: سـێ جـار لەسەریەك فەرمووی: (ئەمە خوا لێی خۆش بوو، ئەمە خوا لێی خۆش بوو).

## باسی خوێندنی تەحیات بە نهێنی.

## ١٨٥ – بَابُ إِخْفَاءِ التَّشَهُّدِ.

٩٨٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفَى التَّشَهُّدُ.

واتە: لە (عبدالله)ی - کوڕی مەسعود- ەوە هاتووە، کە وتویەتی: سوننەت لەنوێژدا ئەوەیە بە نهێنی تەحیات بخوێنرێت.

## باسی ئاماژەکردن بە پەنجەی شایەتمان لە تەحیاتدا.

## ١٨٨ – بَابُ الإِشَارَةِ فِي التَّشَهُّدِ.

٩٨٧ - (صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُعَاوِيِّ، قَالَ: رَآنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَأَنَا أَعْبَثُ بِالْحَصَى فِي الصَّلاَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ نَهَانِي وَقَالَ: اصْنَعْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ، فَقُلْتُ: ﴿وَ﴾كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ؟ قَالَ: كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى.

واتە: لە عەلی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی موعاویەوە هاتووە، کە وتویەتی: (عبدالله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ منی لەنوێژدا بینی یاریم بە بەردو چەو دەکرد، کاتێ کە لەنوێژ بوویەوە رێگری لێ کردم و وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆنی دەکرد تۆش ئاوەها بکە، وتم: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆنی دەکرد؟ وتی: کاتێ کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن لەپی راستی دائەنا لەسەر رانی راستی، وە هەموو پەنجەکانی دەنوقاند جگە لە پەنجەی شایەتمانی، وە ئاماژەی بەو پەنجەیەی دەکرد کە لە دوای پەنجە گەورەکەی دێت واتە پەنجەی شایەتمانی، وە لەپی چەپیشی لەسەر رانی چەپی دائەنا.

٩٨٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَعَدَ فِي الصَّلاَةِ جَعَلَ قَدَمَهُ الْيُسْرَى تَحْتَ فَخِذِهِ الْيُمْنَى وَسَاقِهِ، وَفَرَشَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ. وَأَرَانَا عَبْدُ الْوَاحِدِ وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ.

واتە: لە (عبداللە)ی کوڕی زوبێرەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن پێی چەپی دەخستە ژێر پێی راستیەوەو، پێی راستی رادەخست، دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی چەپی دائەنا، وە دەستی راستی لەسەر رانی راستی دائەنا، ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانی دەکرد. (عَبْدُ الْوَاحِد)مان بینی ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانی دەکرد.

٩٨٩ - (شاذ بقوليه: « ولاَ يُحَرِّكُهَا ») عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ ذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُشِيرُ بِأُصْبُعِهِ إِذَا دَعَا، وَلاَ يُحَرِّكُهَا.

واتە: لە (عبدالله)ی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە تەحیاتی دەخوێند ئاماژەی بەپەنجەی شایەتمانی دەکرد بەڵام نەیدەجوڵاند.

(صحيح)، قَالَ: ابْنُ جُرَيْجٍ، وَزَادَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرٌ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو كَذَلِكَ وَيَتَحَامَلُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى.

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێت: عومەری کوڕی دینار ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: عامر لە باوکیەوە - واتە (عبداللە)ی کوڕی زوبێر - بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دیوە بە هەمان شێوە تەحیاتی دەخوێند واتە ئاماژەی بەپەنجەی شایەتمانی دەکرد بەڵام نەیدەجوڵاند، وە دەستی چەپیشی لەسەر رانی چەپی دائەنا.

٩٩٠ - (حسن صحيح) عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: لاَ يُجَاوِزُ بَصَرُهُ إِشَارَتَهُ. وَحَدِيثُ حَجَّاجٍ أَتَمُّ.

واتە: لە عامری کوڕی (عبداللە)ی کوڕی زوبێرەوە، لە باوکیەوە بە هەمان

شێوە فەرموودەكەی پێشوی گێڕاوەتەوە، وتی: ئامـاژەی بەپەنجەی شـایەتمانی دەكـردو چـاوی تـێ دەبـڕی. بـەڵام فەرموودەكـەی حـەجاج تـەواو تـرە واتـە فەرمودەكەی پێشوو.

٩٩١ - (ضعيف) عَنْ مَالِكِ بْنِ نُمَيْرٍ الْخُزَاعِىِّ ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاضِعًا ذِرَاعَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، رَافِعًا أُصْبُعَهُ السَّبَّابَةَ قَدْ حَنَاهَا شَيْئًا.

واتـە: لـە مـالیكی كـوڕی نومـەیری خوزاعیـەوە، لـە باوكیـەوە هـاتووە، كـە وتویەتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینوە دانیشتبوو بۆ تـەحیات باسكی راستی خستبووە سەر رانی راستی و، پەنجەی شـایەتمانی بـەرزكردبۆوەو كـەمێ چەماندبوویەوە.

## باسی كەراهیەتی هێزدانە سەر دەست لەنوێژدا

## ١٨٧ – بَابُ كَرَاهِيَةِ الاعْتِمَادِ عَلَى الْيَدِ فِى الصَّلاَةِ

٩٩٢ - (صحيح إلا لفظ الأخير فإنه شاذ) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ - أَنْ يَجْلِسَ الرَّجُلُ فِى الصَّلاَةِ وَهُوَ مُعْتَمِدٌ عَلَى يَدِهِ. وَقَالَ ابْنُ شَبُّوَيَةَ: نَهَى أَنْ يَعْتَمِدَ الرَّجُلُ

عَلَى يَدِهِ فِي الصَّلاَةِ، وَقَالَ ابْنُ رَافِعٍ: نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ وَهُوَ مُعْتَمِدٌ عَلَى يَدِهِ، وَذَكَرَهُ فِي بَابُ الرَّفْعِ مِنَ السُّجُودِ. وَقَالَ ابْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ: نَهَى أَنْ يَعْتَمِدَ الرَّجُلُ عَلَى يَدَيْهِ إِذَا نَهَضَ فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە – ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی – لەوەی کەسێك دانیشێ لەنوێژداو هێز بداتە سەر دەستی. وە (ابْنُ شَبُّوَيَة) دەڵێت: نەهی کردووە لەوەی کەسێك لەنوێژدا هێز بداتە سەر دەستی. وە ئیبنو رافع دەڵێت: نەهی کردووە لەوەی کەسێك لەنوێژدا هێز بداتە سەر دەستی. ئەم فەرمودەی لەباسی سەربەرزکردنەوە لە سەجدەدا هێناوە، وە (ابْنُ عَبْدِ الْمَلِك) دەڵێت: نەهی کردووە لەوەی کەسێك هێز بداتە سەر هەردوو دەستی لەکاتی هەستانەوە لەنوێژدا.

٩٩٣ -(صحيح) عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: سَأَلْتُ نَافِعًا عَنْ الرَّجُلِ يُصَلِّي وَهُوَ مُشَبِّكٌ يَدَيْهِ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: تِلْكَ صَلاَةُ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ.

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئومەییەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بە کەسێك لەنوێژدا پەنجەکانی دەستێکی بکات بەناو پەنجەکانی دەستەکەی تریدا لە نافعم پرسی؟ ئەویش وتی: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ وتی: ئەوە نوێژی غەزەب لێ گیراوەکانە واتە جولەکەکان.

٩٩٤ - (حسن) عَنْ ابْـنِ عُمَـرَ، أَنَّـهُ رَأَى رَجُـلاً يَتَّكِـئُ عَلَـى يَـدِهِ الْيُسْرَى، وَهُوَ قَاعِدٌ فِي الصَّلاَةِ - وَقَـالَ: هَـارُونُ بْـنُ زَيْدٍ سَاقِطًا عَلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ، ثُمَّ اتَّفَقَا - فَقَالَ: لَهُ: لاَ تَجْلِسْ هَكَذَا فَإِنَّ هَكَذَا يَجْلِسُ الَّذِينَ يُعَذَّبُونَ.

واته: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پیاوێکی بینیوە هێزی دابووە سەر دەستی چەپی، لەکاتێکدا کە لەنوێژدا دانیشتبوو بۆ تەحیات خوێندن – وە هارونی کوڕی زەید وتی: کەوتبوو بەلای چەپیدا، جا هەردووکیان هارونی کوڕی زەیدو موحەممەدی کوڕی سەلەمە کە راوی فەرمودەکەن هاودەنگن لەسەر باقی فەرمودەکە - ئیبنو عومەر بە پیاوەکەی وت: بەو شێوەیە دامەنیشە چونکە ئەم دانیشتنە دانیشتنی ئەوانەن کە سزادەدرێن.

## باسی دانیشتنی کەم لەتەحیاتی یەکەمی سێ رکاتی و چوار رکاتیدا

## ١٨٨ – بَابُ فِي تَخْفِيفِ الْقُعُودِ.

٩٩٥ - (ضعيف) عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي الـرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَـيْنِ كَأَنَّـهُ عَلَـى الرَّضْفِ، قَالَ: قُلْنا: حَتَّى يَقُومَ ؟ قَالَ: حَتَّى يَقُومَ.

[المشكاة: ٩١٥].

واتە: لە ئەبو عوبەیدەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە کاتێ کە بۆ تەحیاتی یەکەم دادەنیشت دەتوت لەسەر بەردی سورکراوە ئەوەندە بە پەلە بوو، شوعبە راوی فەرموودەکە وتی: وتمان: هەتا هەڵئەسایەوە؟ وتی: هەتا هەڵئەسایەوە.

## باسی سەلامدانەوە

## ١٨٩ - بَابُ فِي السَّلَامِ

٩٩٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ: « السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ ».

واتە: لە (عبدالله) - ی کوڕی مەسعود — ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە شێوەیە بەلای راست و چەپیدا سەلامی دەدایەوە، کە سپیایی کوڵمی دەبینرا، دەیفەرموو: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

٩٩٧ - (صحيح) عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ». وَعَنْ شِمَالِهِ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ».

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وائلەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژم دەکرد، بەلای راستیدا سەلامی دایەوەو فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ). هەروەها بەلای چەپیدا سەلامی دایەوەو فەرمووی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ).

٩٩٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ أَحَدُنَا، أَشَارَ بِيَدِهِ مِنْ عَنْ يَمِينِهِ، وَمِنْ عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا صَلَّى، قَالَ: « مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يُومِي بِيَدِهِ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمْسٍ، إِنَّمَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ، أَوْ أَلاَ يَكْفِي أَحَدَكُمْ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ يُسَلِّمُ عَلَى أَخِيهِ مَنْ عَنْ يَمِينِهِ، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهِ ».

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئێمە ئەگەر لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم نوێژمان بکردایە کەسێکمان سەلامی بدایەتەوە بەدەستی ئاماژەی دەکرد بۆ ئەوانەی کە لەلای راستیەوەن، هەروەها بۆ ئەوانەش کە لەلای چەپیەوەن، کاتێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: ئەوە چیەتی یەکێ لە ئێوە کاتێ کە سەلامی دایەوە ئاماژە بەدەستی دەکات دەڵێی لە کلکی ماینی چەمووشە، بەملاو لادا رایدەوەشێنێ و ئاماژەی پێ دەکات؟ ئەگەر یەکێك لە ئێوە سەلامی دایەوە ئەوەندەی بەسە، یان ئایا تەنها ئەوەندەی بەس نیە کە ئاوەها بکات: بە پەنجەکانی ئاماژە بکات سەلام بکات لەبراکەی لەلای راستیەوەو لەلای چەپەوە.

٩٩٩ - (صحيح) عَنْ مِسْعَرٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ: «أَمَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ - أَوْ أَحَدَهُمْ - أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فَخِذِهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى أَخِيهِ مَنْ عَنْ يَمِينِهِ، وَمَنْ عَنْ شِمَالِهِ».

واتە: لە مەسعەرەوە بە هەمان سەند و مانا هاتووە، كە وتویەتی: (ئەگەر یەكێك لە ئێوە سەلامی دایەوە تەنها ئەوەی بەسە كە دەستی لەسەر رانی دابنێ، پاشان بەلای راستا سەلام لەبراكانی بكات هەروەها بەلای چەپیشا سەلام لەبراكانی بكات.

١٠٠٠ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ رَافِعُو أَيْدِيهِمْ - قَالَ زُهَيْرٌ: أُرَاهُ قَالَ: فِي الصَّلَاةِ – فَقَالَ: « مَا لِي أَرَاكُمْ رَافِعِي أَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمْسٍ، اسْكُنُوا فِي الصَّلَاةِ ».

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاتە ناومان خەڵكەكە دەستەكانیان بەرزكردبۆوە – زوهەیر وتی: وای دەبینم كە وتی لەنوێژدا – فەرمووی: (ئەوە چیتانە دەتانبینم لەنوێژدا دەستەكانتان بەرزكردۆتەوە دەڵێی كلكی ماینی چەمووشە، ئارام بگرن لە نوێژدا).

# ناوەرۆك



**بە پشتیوانی خوای گەورە لێرەدا بەرگی یەکەم**
**تەواو بوو چاوەڕێی بەرگەکانی تربن.**

